# ڕەنجی فەرهادەکان






دوکتۆر هەژار عوسمان مەعروف

# ناوی کتێب: ڕەنجی فەرهادەکان

بـــابــــــەت: بیرەوەری

نـــــوسەر: دوکتۆر هەژار عوسمان مەعروف

بـــــــەرگ: د. ڕێبوار سەعید

دیـــزایـــن: ئومێد محەمەد

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٠

تـــیـــــراژ: ١٠٠٠ دانە

نــــــــرخ: ٦٠٠٠ دینار

چـــــــاپ: چاپخانەی کارۆ

لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٠٨٥ )ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

بیرەوەری

# ڕەنجی فەرهادەکان

دوکتۆر هەژار عوسمان مەعروف

٢٠٢٠

# پێرست

## سەرەتاکان....

ڕەچەڵەکناسی (Genealogy) لە مێژوی مرۆڤایەتی دا بوارێکی کۆنی زانینە کە دەگەڕێت بە دوای ڕەگ و ریشەی تاک و بنەماڵەکاندا. بەهای مرۆڤ هیچ پەیوەندیەکی نیە بەوەی باوک و دایک و بنەماڵەکەی کێن، بەڵکو تەنیا پەیوەندیی بە کار و ئاکاری کەسەکە خۆیەوە هەیە لە ژیانی تایبەتی و لە ژیانی گشتیی ئەو کۆمەڵەی تێیدا دەژی. بەڵام ڕەچەڵەکناسی بێ سود نیە، بۆ نمونە مرۆڤ دەتوانێ لاسایی کارە باشەکانی باوباپیری خۆی بکاتەوە، یا پزیشک بۆ دەسنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشی دەتوانێ سود لە زانیاریی تەندروستیی خزم و کەسی پلە یەک و دو و تا سێی نەخۆش وەربگرێت. منیش بە کورتی بنەماڵەکەم بە خوێنەر دەناسێنم بەتەنیا بۆ ئەوەی بزانێت لە چ ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیدا ژیاوم و چی کاری تێکردوم. بنەماڵەی ئێمە لە سەری باوکم و دایکمە وە لە شاری سلێمانی و ناوچەکانی سەر بە هەڵەبجە و دەشتی شارەزور و دەربەندیخان و کەلار، بنەماڵەیەکی ئاینیی ناسراوە. باوکم (عوسمان) حاجی و شێخ و مەلا و سۆفییەک بو وازی لە دونیا هێنابو، جلی سپیی لەبەردەکرد گوایە موحەمەدی پێغەمبەری ئیسلام جلی سپیی لەبەرکردوە وئەمیش پیڕەویی ئەو دەکات. باوکی باوکم (شێخ مەعروفی نێرگسەجاڕ) یەکێ بوە لە حەوت خەلیفەکەی شێخی سیراجەدینی نەقشبەندی، مەلا عبدالكريم ی مدرس لە کتێبی (یادی مەردان) و (علمائنا في خدمة الدين) باسی ژیانی کردوە. دایکی شێخ مەعروف (پیرۆزخان) کچی مەحمود بەگی ساحیب قڕان بوە. دایکی باوکم (حەبیبە) خوشکەزای (شێخ سەعیدی حەفید) بوە. دایکم (سۆبیە) کچی شێخ محمد سەعیدی کوڕەزای (مەولەوی) ی شاعیرە. دایکی دایکم (فاتمە) کچی (محەمەدی سان ئەحمەد ی شەمێرانی) یە.

ئێمە لە پێشدا لە ماڵێکدا کرێچی بوین کە دەکەوێتە یەکێ لە کۆڵانەکانی جادەی (سابونکەران). ماڵەکەمان پێک هاتبو لە دو ژور (کەلەگی و پشتیوان) و هەیوانێک و ژورێکی بچوکی (گەنجینە) بۆ هەڵگرتنی دانەوێڵە و خۆراک، من لەو ماڵە دا لە ڕۆژی دو ی یەکی ١٩٥٤ لەدایک بوم. لە ساڵی ١٩٦١، دوماڵ خوار (مزگەوتی سەلیم بەگ) ی ئێستا خانوی خۆمانمان لە سەر پارچە زەویەکی ٣١٠ مەتری دروستکرد کە لە ٤ ژور و حەوشەیەکی گەورە پێکهاتبو. یەکەم جار لە قوتابخانەی (فەیسەلییە) چومە مەکتەب، دواتر بە هۆی ڕوخاندنی قوتابخانەکەمان (ئێستا کراوە بە بازاڕی عەسری) گواستیانینەوە بۆ قوتابخانەی مەڵکەندی و ئینجا بۆ قوتانخانەی (تەتبیقاتی

سلێمانی) کە شەشی سەرەتاییم تێدا تەواوکرد. لە (قوتابخانەی ناوەندیی شۆڕش) قۆناغی ناوەندیم تەواوکرد و گوازرامەوە بۆ(ئامادەیی سلێمانی).

## هەتا نەیبینی نازانی چیە!

فارس یش دەڵێن بیستن کەی دەبێتە بینین (شنیدن کی بود مانند دیدن). نمرەکانم ساڵ بە ساڵ باشتردەبون، لە پێنجی ئامادەیی تێکڕای نمرەکانم لە سەدا نەود بو، بیرم کردەوە ئەگەر لە شەشی ئامادەییش ئاوا نمرەی بەرز بهێنم ئەوا دەبمە ئەندازیار. من ئیتر لە تەمەنی پازدە ساڵیەوە ئاشنایەتیم بە بیری چەپ و سۆشیالیزم پەیداکردبو، هاوسۆزیی تەواوم لەگەڵ چینە چەوساوەکانی کۆمەڵ هەبو، بەخۆمم وت دەبێتە ئەندازیار و بۆئەوەی لە ماندوبون و ئێش و ئازاری کرێکاران تێبگەیت دەبێت یەک دو هەفتە کرێکاری بکەیت. (وەستا ئەحمەدە سور) ی دراوسێمان ڕازیبونی خۆی نیشاندا. لە چاوەڕوانیی ئەوەی داخو سبەی کرێکاریەکەم چۆن دەبێت، شەوەکەی وا نائارام و هوروژابوم هەتا بەیانی خەوم لێنەکەوت. بەیانی زو لەگەڵ وەستا ئەحمەد لە بەردەرکی سەرا کولێرە و شیری گەرممان خوارد و چوینە سەر ئیشەکەمان کە تەلارێکی دو نهۆمیی زانکۆی سلێمانی بو. پێنج ڕۆژی یەکەم تاسە چیمەنتۆی گیراوەم بەسەر پەیژەدا سەردەخست و دەمدایە دەستی وەستا ئەحمەد، لە شەشەم ڕۆژەوە گواستمیانەوە بۆ لای (خەلف) ە کەی، خەلفە لە سەرو کرێکارەوەیە و لە خوار وەستاوەیە. ئەو خەلفەیە بێبەزەییانە بلۆکی گەورەی بە پلیکانە دا پێ سەردەخستم بۆ نهۆمی دو، جارێک بە هۆی ماندوبونی زۆرەوە خەریک بو بە بلۆکەکەی سەرشانمەوە لە نهۆمی دوە وە بکەومە خوارێ، زۆر ترسام و بۆ ڕۆژی دوایی ئیتر نەگەڕامەوە سەر کارەکەم.

## ئازاد و ڕەنگاوڕەنگ

براکانم (حسەین عوسمان نێرگسەجاڕی و دوکتۆر ڕەوف عوسمان) کە لە من گەورەترن، لە بری قوڵبونەوە لە جیهانی ئاین دا، ئەوان چونە ناو جیهانی سیاسەت و ئەدەب و بیری سۆشیالیزم و کوردایەتی. ئێمەش برا بچوکەکانیان (یاسین، عەلی، من، ئاسۆ) بەدوای ئەواندا ڕۆیشتین نەک بەدوای باوکمان دا! حسەین و ڕەوف مارکسی بون، مستەفا چاوڕەش لە بیرەوەیەکانیا باسی تێکۆشانی حسەینی برامی کردوە.

ماڵە تازەکەمان لە ساڵەکانی ١٩٦٠ دا بە قەراخ شار حساب دەکرا. بە هۆی خەباتی سیاسیی براکانمەوە خەڵکی جۆراجۆر دەهاتنە ماڵی ئیمە. لە دوای ٨ ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ وە کە بەعسیەکان و دواتر کە قەومیەکان بە سەرۆکایەتیی (عەبدولسەلام عارف) دەسەلاتیان گرتە دەست، ماڵەکەمان بوبوە یەکێ لە مەکۆکانی کۆبونەوەی حیزبی شیوعی. زۆرجار جل و بەرگ و پێویستیی پزیشکی و هەندێ جاریش چەک و جارناجاریش هاوڵاتیی عەرەبی سەر بە حیزبی شیوعی کە لە بەغدا و شوێنەکانی ترەوە لە دەست بەعس و قەومیەکان هەڵدەهاتن، لەماڵی ئێمەوە لە ڕێی شاخی گۆیژەوە دەنێردرانە ناو شۆڕشی ئەیلول. ئەم دۆخە هیچ کاری خراپی نەکردە سەر خوێندنەکەم، ئەوە بو شەشی ئامادەیی بەشی زانستیم لە سەر ئاستی سلێمانی بە پلەی سێهەم تەواوکرد. لە ساڵی ١٩٧٢ لە کۆلیجی پزیشکیی زانکۆی بەغداد وەرگیرام و لە مانگی ٦ ی ١٩٧٨ خوێندنی پزیشکیم تەواوکرد. لە کاتی منداڵی و مێرمنداڵیم دا برا گەورەکانم ڕاستەوخۆ هیچیان لە سەر سیاسەت بۆ باس نەدەکردین، بۆیە منی منداڵیش لە جیهانی منداڵیی خۆمدا بوم، کەسەکانم دەبینی دەهاتن و دەچون بەڵام نەم دەپرسی کێن و لە ماڵەکەمان چی دەگوزەرێ. من لەگەڵ منداڵانی هاویاریمدا شوێنی مزگەوتی سەلیم بەگ کە پێمان دەوت کەلاوەکە و هەروەها کۆلانەکەمان کە هێشتا قیرتاونەکرابو کردبوە یاریگە و زۆرتر سەرقاڵ بوم بە گاڵتە و گەمە و یاریەکانی ئەو سەردەمە کە بریتیبون لە: فوتبۆڵێن و بالە و باسکە، هەڵماتێن وچاڵ چاڵێن، میزراحێن و تولتولێن وهەلوکێن، چاوشارکێ و بوژانەوە و یەکەوگۆتەکە، هەروەها بە ئەستونی کارەبا هەڵگەڕان و بە تەل و قەید دروستکردنی ئۆتومبیل و لێخوڕینی بەسەر شۆستە و جادەکاندا، یا سواری بۆلبرین و پاسکیل کە بەکرێ دەمانگرت. یەکێ لە یاریە ترسناکەکان خۆهەڵواسین بو بە دوای عەرەبانەی دوئەسپی دا، زۆر جار کابرای عەرەبانچی بە قامچیی ئەسپەکەی لە عەرەبانەکەی دوردەخستینەوە، سەیربو باشە ئێمەی منداڵ کە دوچل ئێسقان وچەند کیلۆگۆشتێکی کەمی بێ دوگ و بەز بوین چی زیانێکمان بە ئەسپ و عەرەبانەکەیان دەگەیاند کە ئاوا دڵڕەقانە بە قامچی سزایان دەدایین؟ یاریەکی ناسک کە برێک خەیاڵ و هونەری پێویست بو دروستکردنی کۆللارە بو بە کاغەز و قامیش، کاتێک تەوامان دەکرد دەچوینە سەربان و ئینجا بە دەزویەک دەمان فڕاند بە ئاسمانی شیندا. بە سرێش لە تیلماسکە کاغەز بازنەیەکمان دروست دەکرد بە دەوری دەزوی کۆللارەکە پێی دەوترا (پۆستە) کە بە جولاندنی خێرا و ڕاتەکاندنی دەزوەکە وردەوردە بەرەو سەرەوە ڕوەوئاسمان بەرزدەبۆوە و بە

شانازیەوە بە یەکتریمان دەوت ئەها پۆستەم نارد بۆ کۆللارەکەم! یاریەک یا گاڵتە و گەپێکی تریشمان بریتی بو لە تورەکردنی ئەو پیاوانەی گەڕەکەکەمان کە مڕ و موچ و تورە و وشک و ڕەق بون بەرامبەر ئێمەی منداڵی بزێو و بەرچاوان، نازانم بۆچی چێژمان لە تورەبونیان دەبینی؟ یەکێ لەو گاڵتانەی کە پێیانمان دەکرد ئەوەبو کە دنیا تازە تاریک دەبو دەزویەکی رەشمان دەبەست بە چەکوشی لێدانی دەرگای ماڵەکەوە و ئینجا سەرە دەزوەکەی ترمان دەبرد بۆ شوێنێکی تاریکی بەرامبەر دەرگاکە بۆ ئەوەی نەبینرێین، بە ڕاکێشان و ڕاتەکاندنی دەزوەکە دەکەوتینە دەرگالێدانی یەک لە دوای یەک، کابرا دەهاتە دەرەوە کەسی نەدەبینی و دەچوەوە ژورەوە، ئیتر ئاوا چەند جارێک ئەمە دوبارەدەبوەوە و ئێمەش لەو دورەوە قاقا پێدەکەنین پێی، ئەوەندە بەرز کە لە کۆتاییدا پێی دەزانین و ئینجا فڕکان فڕکانی ئەوەی بمانگرێت و لێمان بدات دەستی پێدەکرد، من هەرگیز بەر لێدان نەکەوتم، لاقم درێژ و ناوقەدباریک وەک ئاسک لە تاریکیی کۆڵانەکاندا خۆم بزردەکرد!

## شیعە و شیوعی

لە دوای ٧ ی شوباتی ١٩٦٣ وە، ڕاوکردن و ڕاونانی ئەندامانی حیزبی شیوعی لە لایەن نەتەوەپەرست و بەعسیەکانەوە لە بەغدا و خواروی عێراق دەستیپێکرد. ئەوانەی لە کوشتن و گرتن ڕزگاریان بو، بەرەو کوردوستان هەڵهاتن، هەندێکیان خۆیان لە شارەکان شاردەوە وهەندێکی تریان پەنایان بۆ شاخ و چەم و دۆڵەکانی کوردوستان هێنا و بون بە پێشمەرگە (پ.م) ی حیزبی شیوعیی عێراق (حشع). جارێکیان دو کەس لەو شیوعیە عەرەبە ڕاکردوانە لە ماڵەکەی ئێمە خۆیان شاردبۆوە، دیارە باوکیشم لە وتووێژ لەگەڵیان بۆی دەرکەوتبو کە شیوعین و شیعەیشن. باوکم سونی یەکی شافیعی بو، ئەو وەک زۆربەی سونیەکان گومانی هەبو لە ئیسلامبونی شیعە، یا گاڵتەی بە ئیسلامبونی شیعە دەکرد و پێیانی دەوت «شیعە ڕافزین و سیغەی ژن دەکەن کە حەرامە»، ئەو بێگومان شیوعیشی بە کافر دەزانی. باوکم وەک ئەرکی ئاینیی خۆی ئێوارەیەک بە نهێنی دەچێتە ناوەندی پۆلیسی گەڕەک و بە ئەفسەری ئێشکگر دەڵێ کە بە هۆی کورە شیوعیەکەمەوە دو عەرەبی شیوعی لە ماڵەکەمان خۆیان شاردۆتەوە. بە ڕێکەوت مفەوەزێکی پۆلیس بە ناوی (عەبدوڵای مەلا سەید غەفور) گوێی لە شکاتەکەی باوکم دەبێت، عەبدوڵا خۆی شیوعی دەبێت و هاوڕێی

حسەینی برام دەبێ، عەبدوڵا ئەفسەرەکە قەناعەت پێدەکات کە زانیاریەکەی باوکم بە هەند وەرنەگرێ. ئینجا هەر ئەو شەوە دەچێت بۆ ماڵمان و ئاگاداری حسەین دەکات لە ڕوداوەکە، ئەمیش بە پەلە دوعەرەبەکە دابەشدەکات بە سەر دو ماڵی تردا. ئەو دو چەکەشی لەماڵمان شاردرابونەوە دەبرێن بۆ ماڵێکی تر، کتێبە قاچاخەکانیش وەک جارەکانی تر، دایکم دەیکات بە خۆراکی تونی حەمام و تەنوری نانکردنەکەمان.

## توانەوە لە ناو ئایندا!

باوکم مرۆڤێکی زۆر بەسۆز وبە بەزەیی و خێرخواز و نەرم و نیان بو. شەوانە گڵۆپی ژورەکەی دەکوژانەوە، لە بەر تیشکی چرا کزەکەیدا لە کاتی وتنەوەی شیعرە بەسۆزەکانی پاشای شیعری سۆفیگەریی کوردی (مەحوی) و شیعرەکانی (مەولەوی) دانەی مرواریی ئەشکە بەسۆزەکەی بە ڕیشە سپیەکەیدا تک تک دەهاتە خوار، ئینجا وردە وردە خەو دەیبردەوە و خەوی لێدەکەوت. باوکم هەندێ جار بەدزیی دایکمەوە بەیانیان زو کە دەچو بۆ نوێژ، هەر شتێکی زیاد لە خۆراک و پێویستیەکانی تری ماڵ لە جل و بەرگ و پێخەف بەردەستی بکەوتایە، بەشێکی لێ جیادەکردنەوە و دەیبرد بۆ موسوڵمانێکی هەژار لە نوێژکەرانی هاوڕێی لە مزگەوتی (حاجی سەید حەسەن) و مزگەوتی (قازی - حاجی شێخ ئەمینی خاڵ) کە نزیکی ماڵەکەمان بون. باوکم کە دەگەڕایەوە لە مزگەوت و پێکەوە نانی بەیانیمان دەخوارد، بزە و زەردەخەنەیەک ڕوی دادەپۆشی، دایکم یەکسەر دەیزانی چی ڕویداوە و بە باوکمی دەوت «چیە شێخ عوسمان هەمدیسان پەنت داوە؟ «.

بە زستانان کە ڕیشۆڵە لە برسا و لەو سەرما هەڵلەرزیوەکان پەنایان بۆ دەهێناین ولە سەر بەفەری حەوشەکەمان کۆمەڵیان دەبەست، باوکم بە دەفرێک دانەوێڵەوە چاوەڕیی دەکردن و لە بەر خۆیەوە پێی دەوتن ئەی بەخێربێن بان چاوان، ئینجا هەمو دانەوێڵەکەی بۆ ڕۆدەکردن و لەوە چێژی دەبینی کاتێک ڕیشۆڵەکان بە هەڵپەوە خۆیان تێردەکرد.

باوکم سروشتی خۆی ئاوا بە ڕەحم و بەخشندە بو، بەزەیی بە گیانلەبەراندا دەهاتەوە، دۆستی درەخت و شینایی بو، خۆی درەختەکانی حەوشەکەمانی ئاودەدا و خزمەتیانی دەکرد. بەڵام تێگەیشتن و تەفسیری دەمارگیرانە بۆ ئاین و پابەندبونی کەتیرەئاسا بە دەقە ئاینیەکانەوە هەندێ جار سەری لێ تێکدەدا و کاری هەڵەی

پێدەکرد، دەنا کەسێتیەکی ئاوا بیوەی و بە بەزەیی چۆن دڵی دێنێ بچێتە لای پۆلیس و هەواڵ لە کوڕی خۆی بدات؟ دیارە بەو کارەی ویستویەتی خۆی لە گوناهی شاردنەوەی (دو شیوعیی کافر) پاک بکاتەوە! نمونەی تر لە چەسپان و نوسانی باوکم بە دەقە ئاینیەکاندا و توانەوە تێیاندا: کە خانومان دروستکرد ویستمان پارەی بانکی حکومەت وەرگرین، باوکم دەیوت حەرامە چونکە دەبێت سود بدەین بە بانکەکە. پەنامان بۆ خەتیبی سلێمانی (شێخ محمدی قەرەداخی) برد، ئەو توانی قەناعەت بە باوکم بکات کە حەرام نیە، قەرزەکەمان وەرگرت و خانومان پێ دروستکرد. دواتر لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا باوکم دەیویست خانوەکەمان ببەخشێت بە ئەوقاف و بەمە بمانکات بە کرێچی، بێگومان بەگوێمان نەکرد و نەمان هێشت سەربگرێ.

## یەك گیان لە دو جەستەدا !

دایکم (سۆیبە خان) هەرچەندە ژنێکی نەخوێندەوار بو بەڵام زۆر زیرەک و پێشکەوتنخواز و خاوەن کەسێتیەکی بەهێز بو، هەندێ لە شیعرە بەسۆزەکانی مەولەویی باپیرەی لەبەر بو، لە بری ئەوەی بە دڵی باوکم ڕێگای کۆنی مزگەوت و فەقێیەتی بگرینە بەر، دایکم ڕێگای قوتابخانە و زانکۆی بە کوڕەکانی گرتەبەر، دایکم بە باوکمی دەوت «شێخ عوسمان منداڵی منیش دەبێت وەک منالی ئەو عالەمە بێت، یا دەیانخەینە مەکتەب یا لات دانانیشم». بەڵام بەداخەوە دایکم نەیتوانی دو خوشکەکەمان (خەدیجە و عائیشە) بخاتە قوتابخانە، لە مەیاندا شەڕەکە چارەنوسساز بو، باوکم سەرکەوت! حاجی شێخی باوکم لە تەمەنی حەوت ساڵیەوە مەلای قورئانخوێنی تایبەتیی بۆ عائیشەی خوشکم گرت، فێری قورئان خوێندنی کرد و هەمو قورئانی پێ تەواوکرد. خەدیجە ش بوبە شاگردی دایکم، ژنێکی ماڵ و دایکێکی میهرەبان و کۆمەڵایەتیی پێرفێکتی لێدەرچو. لە بنەماڵەکەماندا خەدیجە ڕۆڵی (ڕاوێژکاری کۆمەڵایەتی) وەرگرتبو، هەستی بە ئێش و کێشە تایبەتیەکانی ژنان دەکرد، هەندێ جار گلەیی لە باوکم دەکرد کە نەیخستۆتە قوتابخانە. ئەو دەیزانی کێ نەخۆشە و کێ دەستکورتە و دەبێت یارمەتیی بدەین. دایکم پشتگیریی تەواوی لە حسەینی برام دەکرد لە زۆربەی کارە کۆمەڵایەتی و سیاسییە کانیدا، جاروباریش بوێرانە دەچوە پێشەوە ی شەڕ و ململانێکان. دایکم لەگەڵ حسەینی برامدا وردە وردە بەرەیەکی بێدەنگی بەهێزیان پێکهێنابو کە باوکم چاری نەدەکردن، بە شێوەیەکی پراکتیکی ئەوان ڕابەرایەتیی خێزانەکەیان دەکرد!

## توانەوە لە ناو خەڵکدا!

(حسەین) ی برام تەمەنی حەوت ساڵ بو کە باوکم جلی فەقێیەتیی لەبەرکرد و بردی بۆ خانەقای بیارە بۆ خوێندنی ئاینی. (حسەین) دوای چوار پێنج ساڵ فەقێیەتی لە بیارە و هەڵەبجە و (ئەحمەدبرندە) و (سەیسوێنان) و سلێمانی، وردە وردە هەستی بە کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی دەوروبەرەکەی کرد و تێکەڵی جیهانی سیاسەت و بزوتنەوەی چەپ بو. ئەمە بوە هۆی ئەوەی وازی لە فەقێیەتی هێنا و بە خوێندنی شەو قوتابخانەی ئامادەیی تەواوکرد، دوای ژنهێنان پەیمانگەی ئابوری و کارگێڕیی لە زانکۆی سلێمانی تەواوکرد و لە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە دامەزرا. کە لە ١٩٨٠ کاندا کرا بە بەڕێوەبەری (ماڵی خوێندکاران – دار الطلبة)، بوبە باوکێکی میهرەبان بۆ چەندین خوێندکاری خەڵکی گوندەکان. حسەین کە لە دوای ڕاپەڕین بەرپرسیاریتیی لە بەشی پلاندانانی بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی سلێمانی وەرگرت، بە هاوکاریی ڕێکخراوی پەروەردە و زانست و کەلچەری نەتەوە یەکگرتوەکان (UNESCO) توانیان چەند قوتابخانەیەک لە گوندەکانی بناری شـارەزور، بۆ نمونە گوندی (جەرداسنە) و (گوندە) ی ناوچەی نەورۆڵی بکەنەوە. کاتێک خزمانی لادێ بە هۆی نەخۆشیەوە دەهاتنە ماڵمان، ئەو دەیبردنە لای پزیشک و ڕێنماییە پزیشکیەکانی پێ پیادەدەکردن. لەگەڵ هەمو ئەو چالاکیانەدا حسەین کادیری پێشکەوتوی حیزبی شیوعیی عێراقیش (حشع) بو. دوای کەرتبونی ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٦٨ بۆ (قیادەی مەرکەزی(و)لوجنەی مەرکەزی)، کەسێکی سەربە (قیادەی مەرکەزی) بێ پێشەکی خۆی دەکات بە ناو کۆبونەوەیەکی حیزبیدا کە حسەین بەرپرسی بوە، کەسەکە بێ هیچ ڕونکردنەوە یەک پێیان دەڵێ ئێوە لە ئێستاوە ئیتر(قیادەی مەرکەزی) ن، حسەین یش ڕەخنەئامێز و بە تەوسەوە پێی دەڵێ:هاوڕێ بۆ ئێمە (قطیع) ین، واتا مێگەلین؟ دوای ئەم ڕوداوە و ڕوداوە توندوتیژەکانی نێوان ئەو دو کەرتەی حیزب، حسەین ی هەستیار و ڕۆشنبیر وازیهێنا لە هەمو جۆرەکانی حیزبایەتی. حسەین ڕویکردە جیهانی ئەدەب و فکر و وەرگێران و نوسین، بە چەندین بەرهەم بە زمانی کوردی و عەرەبی لەم جیهانە فراوانەدا ئەسپی خۆی تـاودا. فەرمون بەشێک لە چامەی (مەزاتخانە) کە شیعرێکی نیشتمانی و چینایەتیە، کاک حسەین لە گۆڤاری (هیوا) دا لە ساڵی ١٩٥٩بڵاوی کردۆتەوە:

**مەزاتخانەکەی ناو مەزاتخانەی**
**گەورەی نیشتمان تیا بەدی ئەکەی**
**فرمێسک برسێتی تەرمی پێکەنین**
**بێنیشی لەسەر لێوی مەرگ لەرزین**
**مەزاتخانەیە شانۆی شارەکەم**
**شاری زاماری لێو بەبارەکەم**
**نوسەری چیرۆک برسێتیهێنە**
**پێنوسی دەستی ئێسقان و خوێنە**
**لە چێشتەنگاوا لە مەزاتخانە**
**خەڵکە تەمسیلە گورج ئازایانە**
**بڕۆن ڕوداوی چیرۆک ببینن**
**خۆتان سیخناخکەن لە شۆڕش و ڤین**
**وەحشی برسێتی ئەی برسێتی هێن**
**ئەی وڵات بە خوێن بە ئاوی چاو چێن**
**تۆ مەزاتخانە لات سینەمایە**
**خوێنڕشتنی گەل لە لات ڕەوایە**
**تۆ کاسی خوێنی چەشی فرمێسکی**
**تۆ سەماکەری سەر لاشە و ئێسکی**
**بورکانی شۆڕش ڤیی لێهیناوی**
**کەی ئەمە مانە بە ئاوە ماوی**

حسەین پێش شەست ساڵ باسی (مەزاتخانەی گەورەی نیشتمان) دەکات، باسی (وەحشی برسێتی) و بێکاری و جیاوازیی چینایەتی دەکات. حسەین لە ساڵی ٢٠١٢ لە هەفتەنامەی (هاوڵاتی) بە ناوێکی خوزراوەوە لە سەر بەتاڵان فرۆشتنی نەوتی کوردوستان و برسیکردنی خەڵکەکەی، بابەتی (نەوتە بێ خێرەکەی کوردوستان) بڵاودەکاتەوە. دادوەرێکی سەر بە پارتی لە هەولێرتەلەفون بۆ (کەمال ڕەوف) ی سەرنوسەری هاوڵاتی دەکات و دەیەوێ ناونیشانی نوسەری بابەتەکە بزانێ بۆ ئەوەی سکاڵای یاسایی دژی حسەین تۆماربکات. کەمال کە هاوڕێی کاک حسەین و منیشە، داواکەی پشتگوێ دەخات. کاک حسەین ئێستا تەمەنی ٨٧ ساڵە، لە سەر هەمان

ڕێی نیشتمانپەروەری و دیموکراتخوازی و دادپەروەری و هیومانیزم بەردەوامە.

کاک حسەین بۆ بەرهەم و چالاکیەکانی لە بواری ڕۆشنبیری و ئەدەبی و پەروەردەدا خەلاتی پێزانینی حکومەتی هەرێمی کوردوستای پێدرا.

## کۆگایەك لە وزەی ژیان !

ڕەوف کە خوێندکار بو لە زانکوی بەغداد چوە ناو قیادەی مەرکەزی وپاش ماوەیەک بە هۆی تیرۆری بەعس و مەترسیی ڕاستەوخۆ لە سەر ژیانی، لە سیاسەت و حیزبایەتی دورکەوتەوە. دوای وەرگرتنی بەکالوریوس لە زمانی عەرەبی، بە مامۆستای زمانی عەرەبی لە قوتابخانەی ئامادەیی سلێمانی دامەزرا. مامۆستا ڕەوف لەو نەوە نوێیەی مامۆستا بو کە لە بری شێوازی سزادان و تەریقکردنەوەی خوێندکاران شێوازی دیموکراتی و هاوڕێیانەیان بەکاردەهێنا و لە بۆنەی گونجاودا بڕێک گاڵتە و گەپیشیان لەگەڵ خوێندکاران دەکرد، ئەم شێوازەی پەروەردە و فێرکردن لە سەرەتای ساڵەکانی ۱۹۷۰ دا ڕچەشکێن و تازە بو. ڕەوف دواتر بوبە سەرپەرشتیاری پسپۆڕی. ڕەوف دوای ڕاپەڕین کرا بە بەڕێوەبەری گشتیی بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیری لە سلێمانی؛ دوای تەواوکردنی ماستەر، بە هەڵبژاردن بوبە سەرۆکی بەشی عەرەبی لە کۆلیجی زمان لە زانکۆی سلێمانی ؛ پاشان دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە بەغداد دوکتۆرای تەواو کرد. ڕەوف وەک نوسەر لە بواری ڕەخنە و کۆڵینەوەی ئەدەبیدا بە زمانی کوردی و عەرەبی بە چەندین بەرهەم خۆی بە دنیای ڕۆشنبیریی کوردی ناساند، پاشان بۆ دو خول هەڵبژێردرا بە سەرۆکی بنکەی ئەدەبی و ڕۆناکبیریی گەلاوێژ. ڕەوف دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە سەر پشکی یەکێتیی نیشتمانی کوردوستان (ینک) لە دو خولی پەرلەمانی عیراقدا بوبە ئەندامێکی چالاکی پەرلەمان و جارێک بوبە سەرۆکی لیژنەی پەروەردە و جارێکیش بوبە سەرۆکی لیژنەی ڕوناکبیری و ڕاگەیاندنی ئەو پەرلەمانە. ڕەوف لەسەر ئەزمونی کاری پەرلەمانیی خۆی کتێبێکی دانا. لەگەڵ دروستبونی بزوتنەوەی گۆڕان ڕەوف پەیوەندیی بەو بزوتنەوەیەوە کرد و هەڵبژێردرا بە سەرۆکی جڤاتی گشتیی بزوتنەوەی گۆڕان، پاشان لە ساڵی ۲۰۱۷ دا لە هەڵبژاردنێکی ئازادی جڤاتی گشتی دا بۆ هەمان پۆست لە لایەن ئەندامانی جڤاتەکەوە هەڵبژێردرایەوە و بەوە بوبە ئەندامی یەکەم خولی خانەی ڕاپەڕاندنی بزوتنەوەی گۆڕان.

## به کوردوستان، به گۆڕی شێخ مەحمود!

یاسین ی برام پیشەی بەرگدرویتی فێربو. لە کاتێکدا وەک هەرزە کارێک لە مەکتەبی شەو دەبێت، پەیوەندی دەکات بە پارتی دیموکراتیَ کوردوستان (پدک) وە و دەبێت بە ئەندامی ئەو حیزبە. لە سالی ١٩٥٩ دا کە شیوعیەکان لە کوردوستان و عێراقدا زۆر بەهێز بون، یاسین چەند جارێک توشی شەڕدەبێت لەگەڵیان. یاسین لەسەر داوای (پدک) لە ساڵی ١٩٦٤ بوبە پێشمەرگە (پ.م) لە ناوچەی هەڵەبجە و شارەزور. یاسین لە سەر دەریاچەی دەربەندیخان نزیکی گوندی (ئیمامی زامن) و (پردی توەقوت) دەیکەن بە بەرپرسیاری گومرگی شورش بۆ ئەو کالایانەی لە نێوان ئێران و عێراقدا ئاڵ وگۆڕ دەکرێن، دوای دوسێ مانگ (حەمە شەمێرانی) ی فەرماندەی سەربازیی دەسڕۆیشتوی ناوچەکە بە سەرسامیەوە سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ دەستپاکیی کاک یاسین دەردەبڕێ بۆ ئەوەی کە لەو دوسێ مانگەی ئەم بەرپرسی گومرگەکەیە داهاتەکەی چەند ئەوەندە زیادیکردوە. ڕۆژێک لێپرسراوی دەسگای (پاراستن) ی دەڤەری هەڵەبجە بانگی یاسین دەکات بۆ (بیارە) بۆ سزادانی لە سەر ئەوەی کە ئەم بەردەوام لە بری ئەوەی سوێند بە سەری (مەلا مستەفای بارزان) بخوات سوێند بە (کوردوستان و گۆڕی شێخ مەحمودی حەفید) دەخوات! حەمە شەمێرانی جگە لەوەی ڕێزی تایبەتیی بنەماڵەکەمان دەگرێ هەروەها لە پاکی و دڵسۆزیی یاسین بۆ شۆڕش زۆر دڵنیایە بۆیە یاسین لە لێپرسینەوە و سزای نارەوای پاراستن رزگاردەکات. یاسین کە بە پاکی وبێگەردی خەباتی دەکرد، بە هۆی ڕەفتاری نارەوا و خراپی هەندێک لە لێپرسراوەکانی شۆڕشی ئەیلول وردە وردە دڵی لە خەبات سارد دەبێتەوە و لە گەڵ دەسپێکی شەڕی براکوژی لە ساڵی١٩٦٦ دا وازی لە پێشمەرگایەتی و لە حیزبایەتی هێنا. لە کاتی مالاوایی دا (حەمە شەمێرانی) بە یاسین دەڵێت: «خۆزگەم بە خۆت، ئەوەی تۆ دەیکەیت من ناتوانم بیکەم چونکە بە هۆی شۆڕشەوە دوژمنایەتیی زۆرم بۆ دروستبوە، بۆیە خۆم چوار براکەم دەبێت هەر بە چەکداری بمێنینەوە و لەم شەڕی براکوژیەدا کە دەستی پێکردوە دەبێت بمێنینەوە و بیکەین». یاسین دوای راپەڕین و باڵادەستبونی پارتی، ژن و منداڵ زۆر پێی دەڵێن با خانەنشینیی شۆڕشی ئەیلول و مافەکانی تر(زەوی و....) وەبگرێ کە مافی یاسایی خۆیەتی. یاسین کاتێک بوی دەردەکەوێ ئەگەر خانەنشینیی پارتی وەربگرێ دەبێت پابەندبێت بە ئەرک و داواکانی پارتی، بۆیە لە پێناویی ئازادیی خۆیدا دەستی لەو مافەی هەڵگرت و هەرگیز موچەی هیچ حیزب و حکومەتێکی وەرنەگرت و هەر بە کەسابەتی ئازاد توانیی ژیانێکی سەربەرزانەی زۆرباش پێکبێنێ.

## کەمێك دور لە سیاسەت و حیزبایەتی

عەلیی برام هەڵگری بیری نەتەوەیی بو، دوای تەواوکردنی خوێندن و دامەزراندنی وەک کارمەند، لە بەهاری ١٩٧٤ پەیوەندی بە ڕیزەکانی شۆڕشەوە کرد و هەتا ئاشبەتاڵ مایەوە.

ئاسۆ کە برای بچوکمانە دوای تەواوکردنی کۆلیجی ئەندازیاریی کارەبا بە ناچاری بۆ چەند مانگێک بو بە سەرباز ، لە ساڵی ١٩٨٢ لە سەربازی هەڵهات و لە ڕێی ئێرانەوە خۆی گەیاندە ئەڵمانیا و لەوێ گیرسایەوە وخێزانی پێکهێنا. ئاسۆ دواتر هەستی بە برێک گوناه و شەرم دەکرد لە بەر ئەوەی کە نەبوە بە پێشمەرگە و کوردوستانی بەجێهێشتوە. ئاوا نیشتمان خۆشەویست بو و پێشمەرگایەتی شکۆ و شانازی بو، ئاوا بو ئەو سەردەمە!

## ڕوداوێکی مێژویی

من هەر لە هەرزەکاریمەوە بینەر و بیسەری وتووێژە سیاسی و فیکری و ئاینیە گەرموگوڕەکانی ناوخێزانەکەمان و دەوروبەرمان بوم. من زۆر زو کەوتمە خوێندنەوەی کتێبی ئەدەبی وسیاسی و مێژویی و فیکری. کە بەیانی ڕێکەوتنی شۆڕشی ئەیلول بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفای بارزانی لەگەڵ ڕژێمی سەدام لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ڕاگەیەندرا، من لە ٤ی ئامادەیی بوم. ئەو ڕێکەوتنە لە سەرتاسەری کوردوستانا کرانەوەیەکی سیاسی ورۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی گەورەی بەدوای خۆیدا هێنا. هیوا و ئومێدێکی گەورەی خستە دڵی خەڵکەوە، هەستی خۆبەشتزانیی ئینسانی کوردی زۆر بەهێزکرد، شەڕە بەردەوامەکان تەواو، ئیتر سەرەی چێژوەرگرتن بو لە ئاشتی و تەبایی و ژیان بە هەمو واتا قوڵەکانیەوە. ئەو ڕێکەوتنە بۆ من ڕوداوێکی زۆر گرنک بو، ڕێکەوتنی ١١ ی ئازار دەسپێکی وەرچەرخانێکی چۆنایەتی بو لە ژیانی مندا. ئیتر من هەر خوێندکارە عاقڵە زیرەکە سەعیکەرەکە نەبوم. بەڵکو ڕوداوە سیاسیەکان و ڕوداوەکانی ژیانی گشتی لە هەمو کوردوستانا دەیجوڵاندم و سەرنجی ڕادەکێشام. لە ناو خێزانەکەماندا تووی هەستی گشتیی سیاسی و نەتەوایەتی و چینایەتی لە ڕۆحمدا پێشتر هەر لە منداڵیمەوە چێنرا بو. ڕێکەوتنی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ئۆکسجین و ئاو و خۆراکی زیاتری کرد بەسەر ئەو تووەدا و لە خاک هێنایەدەر بۆ ژێر خۆری ئازادیە کاتیەکەی ئەو ساڵانە. کەرکوک جێی ناکۆکیی توندی نێوان کورد و حیزبی بەعس بو، خاڵێکی ڕێکەوتنەکە ئەوە بو سەرژمێری لە کەرکوک بکرێ بۆ زانینی ئەوەی کێ

زۆرایەتیە لەو شارە. بڕیاربو خولێکی ڕاهێنان بکرێتە وە بۆ سەدان قوتابیی کوردی خۆبەخش بۆ چاودێری و پاراستنی سەرژمێریەکە لە فرت و فێڵی بەعس. هەستی تازە ڕواوی نەتەوایەتم پالی پێوەنام بچمە ڕیزی ئەو خوێندکارە خۆبەخشانەوە،بەلام سەرژمێریەکە نەکرا. لەسالی ١٩٧٢ کە چومە شەشی ئامادەیی، (ک.) ی هاوڕێم داوای لێکردم بچمە ناو (یەکێتیی قوتابیانی کوردوستان) و لەوێشەوە بۆ ناو پارتی. وەک پالنەر (ک.) ئومێد و بەلێنی ئەوەی خستە پێشم کە پارتی دەمنێرێت بۆ ئەوروپا بۆ خوێندن. ئەم داوا خەلەتێنەر و نادروستە، کە دیاربو هی مامۆستا پارتیەکانی سەرو خۆی بو، تازەنەمامی ناسکی هەستی نەتەوایەتیمی ژاکاند،بۆیە بێ دودلی ڕەتمکردەوە.

## تۆ ناتەوێت، ئەو یەخەت دەگرێت!

دواتر کە سالی ١٩٧٢ لە کۆلیجی پزیشکیی زانکۆی بەغداد وەرگیرام، هەر لە سەرەتای خوێندن و ژیانم لە بەغداد سەرنجم دا زۆربەی کۆلهەلگر و بۆیاخچیە هەژارەکانی سەر شوستەی جادەکانی بەغداد کوردبون، بە تایبەتی کوردی فەیلی. بەڕای من ئەوسا وئێستاش کاتێک کەسێک قاچی دەخاتە سەر سندوقە بچوکەکەی بەر دەم بۆیاخچیەک و پێلاوەکەی نزیکدەبێتەوە لە دەموچاوی، ئەمە جۆرێکە لە بێڕێزی کردن بە مرۆڤ! دیمەنی بەردەوامی ئەو کۆلهەلگر و بۆیاخچییانە گەلێک ئازاریان دەدام و پرسیاریان لا دروستدەکردم. ژیانی کولەمەرگیی ئەم ئینسانە چەوساوانە و ژینگەی سیاسیی گشتی لە ژێر سایەی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی دژ بە کورد دا، بونە هۆی ئەوەی نەمامی بیری چینایەتی و بیری نەتەوایەتیی پێشکەوتنخوازم پتر بگەشێتەوە و بالابکات. ڕۆژنامەی (برایەتی) و (التآخی) ی پارتی دیموکراتی کوردوستان (پدک) لە بەغدا دەریدەکردن، هەتا داخستنیان لە بەهاری لە ٩٧٤، بەڕاستی بۆ ئێمە ی خوێندکار ئەو دو ڕۆژنامەیە قوتابخانەی بیری نیشتمانپەروەری بون، خوێندنەوەی ڕۆژانەی(التآخی) بۆ ئێمە بوبو بە ئەرک و پێویستیەکی ڕۆژانە. حیزبی بەعس لە جەوهەری ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار پەشیمان بوبۆوە. هەولی بەعس، کە هێشتا لە ڕێکەوتندا بو لەگەل پارتی، بۆ کوشتنی مەلا مستەفا شکستی هێنابو، شیعرە ئاگرینەکەی (شێرکۆ بێکەس - بۆ پێشەوە پێشمان کەوە بارزانی) کە بەو بۆنەیەوە وتبوی، من زو خوێندمەوە و لەبەرمکرد. ئەو هەولە تاوانکارانەی بەعس هەستی زولملێکراوی و چەوساوەیی کوردی لە دل و دەرونمدا ئەوەندەی تر

بەهێزکرد. هەستی نەتەوایەتیی گەنجانەی گەرم و ڕاستگۆیانەی ئەو ڕۆژانەمان وای هەژاندبوین کە زۆربەمان مەترسیەکانی دڕندەیی ڕژێمی سەدام و سزای بەعس مان بە چاوی عەقڵ نەدەبینی. هەر ئەو دۆخە حەماسیە وایلێکردین لە ڕۆژی ١٧ ی ٢ ی ١٩٧٤ نزیکەی مانگێک پێش هەڵگیرسانەوەی شەڕ، (بڵاوکراوەیەکی دیواری) بە زمانی عەرەبی بە بۆنەی ساڵڕۆژی دامەزراندنی یەکێتیی قوتابیانی کوردوستانەوە بنوسین و لە ناوەڕاستی کولیژی پزیشکیدا بە دیوارێکەوە هەڵواسین. لە سەری سەرەوەی بڵاوکراوەکە وێنەیەکی (سەرۆک مستەفا بارزانی) مان دانابو، ئەو وێنەیە خوێندکارە بەعسیەکانی لێ هوروژاندین و بەتوندی ڕەخنەی ئەوەیان لێگرتین ئێمە لە بری وێنەی سەرۆک کۆمار(ئەحمەد حەسەن بەکر) بۆچی وێنەی مەلا مستەفامان داناوە. بەعسیەکان ویستیان بڵاوکراوەکە بدڕێنن و لە دیوارەکەی بکەنەوە، بەڵام ئێمە چەند خوێندکارێکی کورد لە کۆلیجی پزیشکی بە مشتەکۆڵە وکلیلە بچوکەکانی دەستمان پاسەوانی وبەرگریمان لە بڵاوکراوەکە کرد و نەمان هێشت بیدڕێنن. (چیا عەباس ساحیب قران) ی ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەتی) یەکێتیی قوتابیانی کوردوستان) بەتایبەتی بۆ چارەسەری کێشەکە بە پەلە بانگکرابو، ئەو هاتە شوێنەکە و بڵاوکراوەکەی پێ لابردین. چیا لە ئێمە بەئەزمونتر و بەتەمەنتر بو، بە پەرۆش و دڵسۆزیەوە ڕوی تێکردین و وتی: " چواردەوری کۆلیج بە هێزەکانی ئاسایش گیراوە، لە گیانی خۆتان بێزارن؟ شێت بون؟ دەتانەوێ بتانگرن و بزرتان بکەن؟ ". ئای لە خۆشی و جۆش و خرۆش و هەستی بێگەردی نەتەوایەتیی ئەو ڕۆژانە مان: کەمال عبدالرحمن سالح، مەحمود فەقێ ڕەسوڵ،.نەجمەدین حەسەن، جەمال محەمەد زەکی، دلزار عبدالراق قادر، جەمال عبدالحەمید عەباس، شازاد عەلی ڕەشید، سدیق عومەر ڕەسوڵ وبەندە، لە بەشداربوانی ئەو چالاکیە بون. ئا لەو ڕۆژە پڕ جۆش و خرۆشانەدا بو کە ئیدی یەکێتیی قوتابیان بەشی کەف و کوڵی منی نەدەکرد، بۆیە بە پشتگیری ولە ڕێی (ڕەوف فەیلی) و (جەمال عبدالحمید) ە وە داوام کرد بچمە ناو پارتی. شەڕ لەگەڵ ڕژێمی بەعس دەستیپێکردەوە، سکرتێری نوسینگەی (لقی پێنجی بەغدا) ی پارتی خیانەتی کرد و چوە ناو بەعسەوە. بۆ پاراستنیان لە گرتن و لێپرسینەوەی ڕژێم، دڵسۆزان ئەو بەڵگەنامانەیان سوتاند کە پەیوەندیی بە ئەندامان و لایەنگرانی لقی پێنجی پارتیەوە هەبو. خۆشبەختانە! وادیاربو کاغەزی داواکەی منیش کرابو بە سوتو و لە بەر ڕەشەبای ڕق و تورەیی بەعس، لە ئاسمانی بە هەوری ترس و تۆقان داپۆشراوی بەغدای ئەو ڕۆژانە بزر بوبو و شوێنەوارێکی

نەمابو. ڕەوف و جەمال و منیش لە ترسی ژیانی خۆمان بە دوای داواکەمدا نەچوین، نە من لەوانم پرسیەوە، نە ئەوان لە من. بەمجۆرە پەیوەندی کردنم بە پارتیەوە سەرینەگرت.

## دیوار مشکی هەیە، مشکیش گوێی هەیە!

بە تایبەتی لە بەهاری ١٩٧٤ کە شەڕی نێوان کورد و ڕژێمی سەدام دەستی پێکردەوە، کەشی ترس و هەوری ڕەش و سوری ئەو ڕۆژانە وەک چەتر ئاسمانی بەغدایان تەنیبو. دو هاوڕێی مندالی و قوتابخانەم کە زۆر نزیک بون لێمەوە: (عەلی ئیسماعیل) و (بەکرعوسمان) خوێندکاری زانکۆی بەغداد بون، لە مالێکی خوێندکارانی نزیک ئەوەی ئێمە دەژیان. لە بەهاری ١٩٧٤ لە سەر دیواری خانوەکەی تێیدا بون دروشمی پشتگیری لە خەباتی کورد نوسرابو، لە سەر ئەوە (عەلی ئیسماعیل) و (بەکرعوسمان) گیران و نزیکەی هەفتەیەک بزربون. دواتر کە ئازاد کران و دەرکەوتنەوە، یەکترمان بینیەوە. دیاربو لە زیندان ئەشکەنجەدرابون و زۆر ترسێنرابون و هەڕەشەی قورسیان لێکرابو. لە ڕوی دەرونیەوە گۆڕابون، گومان و ترس داگیری کردبون، وەلامی پرسیارەکانمیان نەدایەوە و هیچ شتێکیان لەسەر گرتنەکەیان نەدەدرکان. هەردوکیان وتیان: «کاکە ئەگەر بەتەنیا پالت دابو بە دیوارێکەوە، لەبەرخۆیشتەوە ڕەخنە و نارەزایی بەرامبەر حکومەت دەرمەبڕە چونکە لە ناودیوارەکەی پالت پێوە داوە مشکی گوێ سوک هەیە و گوێت لێدەگرێ!».

## پارکی هاید

Hyde Park پارکێکی گەورەیە لە ناوەڕاستی لەندەن لە نزیک کۆشکەکانی خێزانی مەلیکی ئەو ولاتە. لە سالی ١٨٧٢ وە شوێنێک هەیە لەو پارکەدا بە ناوی (گۆشەی هاید پارک). لە ڕۆژانی یەک شەمان لەگەڵ چێژوەرگرتن لە دیمەنی دلفرێنی درەخت و جریوەی مەل و گۆمی ئاو و بۆنی خۆشی هەزاران گولی دەوروبەر، بە دەنگی بەرز و زولال و بێ ترس لە هیچ سزایەکی حکومەت، هەرکەس و لایەن و دەستەیەک دەتوانن لەو گۆشەیەدا ڕەخنە و بیروڕای خۆیان ئازادانە دەربڕن و وتووێژی لە سەر بکەن. بۆ من دەربڕینی ئازادانەی بیروڕا و هەست وسۆزەکانم یەکێکە لە پێت

و کۆڵەکەکانی کەسێتیم. ئێستا ساڵی ١٩٧٤ و لە بەریتانیا ١٠٢ساڵ تێپەڕیوە بە سەر ئازادیی دەربڕینی بیروڕا، کەچی من و خوێندکارانی من ئاسا لە عێراق، بۆ ئەوەی لە داخ و ڕقی ڕژێمی سەدام نەتەقین، دیوار و دەرگای ئاودەسەکانی ماڵی خوێندکاران و کۆلیجی پزیشکیمان کردوتە پارکی هاید و وەک شوێنی ئەمینی دەربڕینی ڕاوبۆچونەکانمان بەکاریان دێنین و لە دیوی ناوەوەی دەرگا و دیوارەکانیان ڕەخنە و گاڵتە و لاقرتی وجنیو بە ڕژێمی سەدام دەنوسین. بەڵام کە چیرۆکی تۆقێنەری مشکی ناودیواری (عەلی ئیسماعیل) و (بەکرعوسمان) م گوێ لێبو، ئیتر وازمهێنا لە نوسینی سەر دەرگا و دیوارەکان، هەرچەندە هێشتا کامێرای چاودێری نەگەیشتبوە دەست ڕژێمی سەدام، بەڵام هەر ترسم هەبو پێیبزانن.

## دوکتۆری دێم!

ساڵی ١٩٧٢ هونەرمەند (ڕەفیق چالاک) شانۆی (دوکتۆری دێم) ی لە هۆڵی (زانکۆی موستەنسریە) پێشکەشکەرد و من بۆ ئەم شانۆیە چەند وانەیەکی کۆلیجم کردە قوربانی و ئامادەی بوم. ناوەڕۆکی شانۆکە ڕەخنەی گاڵتەجاڕانە بو لە بێتوانایی و نەزانی و ڕەفتاری گەندەلکارانەی زۆرێک لە بەرپرسانی پارتی لە بەغداد کە لە حکومەتی عێراق پۆستی بالایان هەبو یا وەک بەرپرسی پارتی لە پۆستی باڵادا بون لە لقی پێنج. ڕەفیق چالاک خۆی وەک ئەکتەرێکی لێهاتو دەوری دوکتۆرە دێمەکەی دەبینی.

## سەیدا سالح یوسفی

لە ١٧ ی ٢ ی ١٩٧٤ لە هۆڵی (زانکۆی موستەنسریە) بە بۆنەی یادی دامەزرانی یەکێتیی قوتابیانی کوردوستان، لەو کاتە هەستیار و پڕ لە نیگەرانی و ترسەدا، کۆڕێک بۆ (سالح یوسفی) ی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی سازکرا. من کە هەرگیز لە وانەکان دوانەدەکەوتم، ئەم جارە شیان چەند وانەیەکم کرد بە قوربانی و بە حەزێکی زۆرەوە چوم بۆ کۆڕەکە. (سالح یوسفی) بە قژێکی ماشوبرنجەوە، بە باڵایەکی ١٨٠ سم ی کە پالتۆیەکی ڕەشی سادە تیوەی ئالابو، بە زمانێکی عە ڕەبیی پاراو، لە وتارێکی پرواتا و ئارام و دور لە سۆز و هەڵچون، مەترسیەکان

و زیانەکانی هەڵگیرسانەوەی شەڕی بۆ ئامادەبوان باسکرد و داوای چارەسەرێکی ئاشتیانەی کرد. هێشتا ئەو وشانەی لە گوێمدا دەزرنگێنەوە کە بەزمانی جەستەیشی دەریدەبڕی: (لاسامح الله اذا اندلعت القتال من جديد - خوانەکردە ئەگەر شەڕ دەست پێبکاتەوە). بەڵام دیاربو کار لە کار ترازابو! شای ئێران و ئیسرائیل و ئەمەریکا هانی سەرکردایەتیی شۆڕشیان دابو لەگەڵ سەدام ڕێک نەکەوێ، سەدامیش لە ڕێکەوتنی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ پەشیمان بوبۆوە و شەڕی دەویست و بە هیچ جۆرێ ڕازی نەدەبو کەرکوک وەک شارێکی کوردستانی بناسێنێ. (مەلا مستەفا) گوێی نەدا بە ناوبژیوانی و ئامۆژگاریەکانی یەکێتیی سۆڤێت کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ڕێی حیزبی شیوعیی عێراقەوە پێیان دەگەیاند، سۆڤێت و (حشع) هەردوکیان ئاگادری مەترسیەکانی هەڵگیرسانەوەی شەڕ بون و داوایان لێدەکرد هەرچۆنێ بوە لەگەڵ سەدام ڕێکبکەوێ، هەوڵەکان سودیان نەبو، ئەوەبو شەڕ دەستپێکردەوە.

## کە نەتزانی بۆ؟ لە منالیت بپرسە!

کە شۆڕشی ئەیلول دەستپێکرد من تەمەنم حەوت ساڵان بو. بەهۆی ئەوەی هەر لە منداڵیمەوە زۆر هاوین سەردانی خزمەکانم دەکرد لە گوندەکانی سەر بە هەڵەبجە و دەربەندیخان، من هەر لە منداڵیمەوە وردە وردە ئاشنایی و بەرکەوتنم لەگەڵ پێشمەرگە و تفەنگ و جلی پێشمەرگانە بۆ دروستبو. لە دانیشتنی گەورەکاندا چیرۆک و بەسەرهاتی شەڕەکانیانم دەبیست. لە چیرۆکەکاندا ڕۆڵی پاڵەوانانەی چەند پێشمەرگەیەکی ڕەش و ڕوتی بە ژمارە کەمم دەبیست و بە چاوی خەیاڵ دەمبینی، کە چۆن لە شەڕە ناهاوتاکاندا بەرامبەر تۆپ و تانک و فڕۆکەی سوپای پڕسەرباز و پۆشتە و پەرداخی عێراق، سەرکەوتوانە و زۆر جار تا دوا فیشەک شەڕ و بەرگریان کردوە. هەمو ئەمانە خۆراکێکی پڕ ڤیتامینی دەبەخشیە فەنتازیای منداڵیم و پەڕ و باڵی فڕینی لەسەر دەڕوان. تەمەنی منداڵیش تەمەنی خەیاڵ و فەنتازیاکانە، خەیاڵی ڕۆڵبینین وەک پاڵەوانی خۆشەویستی خەڵک، وەک سوپەرمانە ئەفسانەییەکانی فیلمی سینەما کە کۆیلە و قوربانیە بێدەسەڵاتەکان لە دیلی و مردن و ستەمی زۆردارانی خوێنمژ ڕزگار دەکەن. وەک لە خەوندا یا وەک ئەوەی لە ناو تەمو مژدا ببینم، دێتەوە بیرم: جارێک من و عەلیی برام لە ماڵی مامم لە گوندی (ئەحمەدبرندەی وارماوا) ڕێگەی گەڕانەوەمان بۆ ناو سلیمانی لێگیرا. ئێمە و تاهیری ئامۆزام لەگەڵ خەڵکێکی تر کە

ئەوانیش ڕێگەیان لێگیرابو بە شەو، بە ڕێگای دور لە جادەی قیر، بە پێ و بە سواری ئەسپ، لە هەل و مەرجێکی پڕ لە ترسدا، خۆمان گەیاندەوە ناو شار. دیارە ئەو کاتە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ بوە و من تەمەنم نۆ بەهار بوە؛ ئەو ڕۆژە ڕەشانە بوە کە بەعسیەکان هێرشێکی درندانەیان کردە سەر کوردوستان و لە ناوچەی سلێمانی (زەعیم سدیق) کوشتارێکی زۆری لە خەڵکی بێتاوان کرد. کەواتە من بە تەمەنی نۆ ساڵی بینەری یەکەم دیمەنی بە شەوا ڕۆشتن و نیگەرانی و نائارامی و ترس لە کوژاران و گیران بوم و تێیدا ژیاوم ! بیرمە مێردمناڵ بوم، لە یەکێ لە گەشتەکانی لادێم دا، لە گوندی (بەشی پیرک) ی سەر دەریاچەی دەربەندیخان، لە ناو کۆمەڵێک پێشمەرگە دا کوڕێکی هەرزەکاری بەرزانیم بینی. ئەو تەمەنی هەر دوازدە سیازدە ساڵێک دەبو، تفەنگێکی لە شاندا بو بە هێندەی باڵای خۆی دەبو. لە پێینی دێوە (پ.م) کان نیشانەیەکیان نایەوە و کەوتنە تەقەکردن لێی. (پ.م) هەرزەکارە بارزانیەکەش فیشەکی خۆی گرتە نیشانەکە. نازانم پێکای یان نا، بەڵام کە بۆی دانیشت و سێرەی لە نیشانەکە گرتەوە و تفەنگەکەی تەقاند، هەستم بە سەرسامیەکی زۆر کرد بەرامبەر بەو کوڕە منداڵە، لە ناو ئەو پیاوە ڕیش و سمێڵ زبرانەدا ! زۆرینەی دەروونناسەکانی دنیا، بە تایبەتی دوکتۆر Sigmund Freud گرنگیەکی تایبەتی بە قۆناغی منداڵی دەدەن لە پرۆسەی گەشەکردنی دەرونی و کەسێتیی مرۆڤدا. وادیارە ئاوا وردە وردە هەر لە منداڵیمەوە، لە پێچا و پێچە تاریک و ئاڵۆزەکانی دەرونی مندا، ناخۆئاگا تۆوی پێشمەرگە ی کوردوستان وەک بەهایەکی باڵا، بەرز، چاک، باش، جوان.... هێور هێور ڕوابێت و گەشەی کردبێت، هەتا بوە بە خولیایەک. دەنا بۆچی لە ناو ئەو هەموە هاوڕێیەم دا هەر من دەمویست بە هەر نرخێک بوە ببمە پێشمەرگە؟ لە کۆتاییشدا هەر بوم.

### کتێبی گەورە گەورە، کتێبی بچوك!

ئیتر دەرکەوتبو کە شەڕی نێوان کورد و ڕژێمی بەعس دەستپێدەکاتەوە. لە قۆناغی دوی کۆلیجی پزیشکی بوم. لە ناو هاوڕێکانم دا بە تەنیا دەمتوانی قسەی دڵم لەگەڵ (کەمال عەبدولرەحمان) بکەم. نیازی دڵی خۆمم پێ وت کە دەمەوێ واز لە خوێندن بهێنم و ببم بە پێشمەرگە. لەسەر بابەتەکە زۆر دواین، ئەو بێ هیچ دودڵیەک دژی ئەوە بو ببم بە (پ.م). بەهاراتێکی قسە خۆشەکانی تێکەڵ بە

وتوویژەکەمان کرد و بە گاڵتە و پێکەنینەوە وتی: «ئینجا عەول ! تۆ دەبیت بە (پ.م) و ئێمەش خوێندنی خۆمان درێژە پێدەدەین، خوادەزانێ کەی شۆڕش سەردەکەوێت، گرنگ ئەوەیە هەر کاتێ گەڕایتەوە، تۆ هەر دەبێت لە قۆناغی دوی کۆلیجەوە دەست پێبکەیتەوە. ئەوکاتە ئێمە یا لە قۆناغی کۆتایی خوێندندایین و لە کتێبی گەورە گەورەی پزیشکی سەرگەرمی خوێندنەوە و فێربونین، یا هەر خوێندنمان تەواکردوە و بوینەتە دوکتۆر. تۆش بە کتێبێکی بچوکی زانستی توێکاری و فزیۆلۆجییەوە تێهەڵدەچیتەوە «. زۆر سەیر بو! پێشمەرگایەتی ئەگەری کوشتن و کەمئەندام بونیشی تێدایە، کەچی کەمال بۆ ئەوەی قەناعەتم پێ بێنێ کە نەبم بە (پ.م)، منی ڕوبەڕوی ئەم مەترسیانە نەکردەوە کە هەر بەراورد ناکرێت لە گەڵ دواکەوتن لە خوێندن دا! لە ڕاستیدا قسەکەی کاری تێکردم، بەڵام خولیاکەی منداڵیم لە هەمو بەڵگە و لۆجیک و شیکردنەوە هزریەکانی کەمال بەهێزتر بو و لە ئەنجامی سەرەتاییدا خولیا بەهێزەکەی منداڵیم سەرکەوت و بڕیاری ئەوەی پێدام ببمە پێشمەرگە.

## ئاوساوی و (با) ی بایی بون!

لە بەهاری ١٩٧٤ دو سێ هەفتە دوای وردە وردە دەسپێکردنەوەی شەڕی کورد و ڕژێمی بەعس، بۆ چەند ڕۆژێ مۆڵەتی ڕەسمیم لە کۆلیج وەرگرت و خواحافیزیم لە هاوڕێکانم کرد بەتایبەتی لە کەمال. بە نیازی ئەوەی ببمە (پ.م) گەڕامەوە سلێمانی. هەر لە دورەوە دایکم باوەشی گەرم و پڕ لە میهرەبانیی خۆی پیاکردم و هاواری کرد «ئۆخەی ڕۆڵە گیان وا هاتیتەوە، بە خوا سەدام بەغداد لە کورد پاکدەکاتەوە و تۆش تیادەچویت». دایکیشم وەک زۆرینەی خەڵک بڕوای بە پڕۆپەگەندا و درۆ و فیشاڵ ی سەرکردایەتیی پارتی کردبو، کە هەوڵی دەدا بۆ بەهێزپیشاندانی پێگەی خۆی زۆرترین خەڵک بچێتە شاخ وببێتە (پ.م). پارتی بە ترساندن و تۆقاندن لە ڕژێمی بەعس خەڵکیان توشی شڵەژان و نائارامی و هیستریایەکی واکردبو کە قەیسەریی فراوانی عێراقیان لە کورد کردبوە کونەمشک! هەر لەو ڕۆژانەدا بو ئیدریس بارزانی بە پەمپی میدیاکانی ئێران و ئیسرائیل و ئەمەریکا و ئەوروپای ڕۆژاوا (بۆ نمونە ڕادیۆی مۆنتی کارلۆ)، ئەوەندە فوی تێکرابو کە (با) ی ئاوساویە ناتەندروستەکەی خۆی لێبوبو بە ماسولکە و بەستەر و دەماری جیڕ و خۆڕاگر و بەهێز، بۆیە لە گەڵ د.مەحمود عوسمان لە تارانەوە، بە بڕوابەخۆبونێکی زڕ و بێبناغەوە، ڕایگەیاند کە

هێزی (پ.م) خاوەنی هەمو جۆرە چەک و تفاقی جەنگیی تری نوێ و کارایە جگە لە تانک و تەیارە، بۆیە دەتوانی سەرکەوتوانە بەرەنگاری سوپای عێراق ببێتەوە.

## ببینە و ببیسە، فێربە!

براکانم حسەین و ڕەوف وتیان: بڕیاری بون بە پێشمەرگە یان درێژەدان بە خوێندن لە بەغدا تەنیا خۆت دەتوانی بیدەیت و ئێمە ناتوانین پێت بڵێین کامیان هەڵبژێرە. بێگومان ڕاستیان دەکرد، چونکە هەر یەک لەو دو ڕێگایە پڕبون لە مەترسی بو سەر ژیانم.

یاسین ی برام چونکە خوی پێشر پارتی بو و ئەزمونە ناخۆش و نائومێدکەرەکانی ناو شۆڕشی ئەیلولی لە بیر مابو، زۆری پێناخۆش بو واز لە خوێندن بهێنم و ببمە (پ.م) ی ئەو حیزبە. بە دڵتەنگیەکی زۆر و بە قوڵپی گریانەوە پێی وتم: "ئێمە خێزانێکی گەورە و پڕ میوانین، دڵمان بە تۆ خۆشە ببیتە دوکتۆر و کۆمەکی دارایی خێزانەکەمان بکەیت و بو خۆشت وەک دوکتۆر ئایندەیەکی باشت هەبێت، بە پێشمەرگایەتی ئایندەت دەفەوتێ. جگە لەوانە پێشمەرگایەتیش هەروا ئاسان نیە و پڕە لە مەترسی. من حەزناکەم تۆ ببیت بە (پ.م)". دوای وتووێژێکی تێروتەسەل لە گەڵ براکان، ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی خۆم بە تەنیا سەفەرێکی چەندڕۆژی بکەم بۆ ئەو ناوچانەی دەربەندیخان و هەڵەبجە کە لە ژێر دەسەڵاتی شۆڕش دا بون، بۆ ئەوەی خۆم بەچاوی خۆم بارودۆخەکە ببینم و هەلیسەنگێنم و لە سەر بناغەی بینراوەکانم بڕیارێکی دروست بدەم.

## مەلایەکی شیوعیە!

بە ئۆتومبیل چومە گوندی ئەحمەدبرندە، لە ماڵی (حاجی شێخ محەمەدی) ی مامم لامدا. لەگەڵ مامم و ئامۆزاکانم کەوتمە وتووێژ. مامم پیاوێکی زۆر هێمن و میانەڕەو و دانا بو. کە ڕژێمی پاشایەتی ڕوخا، مامم لەو کەسایەتیانە بو بروسکەی پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆڕشەکەی بۆ عەبدولکەریم قاسم نارد، بە هۆی ئەم هەڵوێستەوە هەندێ لە مەلا کانی هەڵەبجە تۆمەتی شیوعیبونیان دایە پاڵی. مامم زۆر نیگەران بو لەوەی کە شەڕ دەستی پێکردۆتەوە، پێێ وتم: هەرچۆنێ بوایە دەبو مەلا مستەفا

شەڕی لە کوردوستان لابدایە و لەگەڵ سەدام ڕێکەوتایە. دوای وتووێژی سیاسیی تێروتەسەل بە پێ خۆم گەیاندە دەریاچەی دەربەندیخان لە ئاستی (پلەسپی)، لێرەوە بە بەلەم پەڕیمەوە و چومە گوندی نێرگسەجاڕ. لێرە سەردانی مام و ئامۆزاکانم کرد و دوای نانخواردن کەوتمە وتوویژ لەگەڵیان لە سەر دۆخەکە. هەستم کرد نیگەران بون لە وەی شەڕ دەستی پێکردۆتەوە. نێرگسەجاڕ دێیەکی ٣٠ ماڵە بو، شوێنێکی پەنا بو، لەسەر ڕێگای دێکانی تر نەبو، بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات و کشتوکاڵێکی کەم دەژیان. زۆرجار (پ.م) بۆ حەسانەوە و خۆلادان لە شەڕ دەهاتنە ئەم دێیە و دەبو دانیشتوانەکەی بیانژێنن.

## سویسرا یەکی بچوك!

لە نێرگسەجاڕەوە بە نزیکەی سەعات و نیوێک پیادەڕەو خۆم گەیاندە دوا قۆناغی گەشتەکەم کە دێی (گوندە) بو. گوندە دەکەوێتە دامێنی شاخی (بالآمبۆ) لە ناوچەی نەورۆڵی کە هەشت کیلۆمەترێک لە هەڵەبجەوە دورە. گوندە کارێز و کانیاوی زۆری تێدابو، ئەوەندە زۆر کە لە دامێنی گوندەکەدا ئاشێکی ئاوی دروستکرابو. باخاتی میوەی جۆراوجۆر و کێڵگەی بەراوی کشتوکاڵ بە تایبەتی توتن، گەنم و جۆ، هەروەها بەخێوکردنی پەز و گا و گۆتاڵ، هەمو ئەمانە بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابوریی خەڵکەکەی پێکدەهێنا. ماڵی خاڵوانم (شێخ محەمەد و شێخ هادی) لەم دێیە بو.

پڕ بە سییەکانم هەوای پاکم هەڵمژی، لە کەناری دێ لە کانیاوێکی نزیک ڕێگاکە لامدا، دەموچاوم فێنک کردەوە و بە پەرداخی هەردو لەپی دەستم تێر تێر ئاوم خواردەوە. گوڵاڵە سورە و فەرشی سەوزی خاک دیمەنێکی دڵفڕێنیان دەبەخشیە سروشت. ژینگەی ئێرە وەک هی زۆربەی گوندەکانی کوردوستان بەهۆی نەبونی کارگە ی پیشەسازیەوە، بە دوکەڵ و پاشەڕۆی کیمیاوی پیس و کرێش نەبوبو. درەختی تازە چرۆکردوی باخەکان و چریکەی باڵندە جۆراوجۆرەکان و بۆنی گوڵە نێرگزی مەست، هاتن بە پیرمەوە و پێشوازییەکی گەرمیان لێکردم.

سروشتە دەست لێنەدراوەکەی ئەم گوندە نازدارە خەم و نیگەرانی و ترسەکانی ئێستایان (بەهاری ١٩٧٤) لەبیربردمەوە و گەڕاندمیانەوە بۆ سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵیی ساڵەکانی ١٩٦٠. بە دەم ڕێ ڕۆشتنێکی هێواشەوە، دۆخێکی وەک مەستی و تاسان و خەون لە ئێرا و ئێستای گەشتەکەمی دابڕیم.

## گەشتیاری بە خۆڕایی!

(پشوی هاوینە، لەگەڵ ئاسۆ و عەلیی برام هاتوین بۆ(گوندە). پێکەوە لەگەڵ عەلی و بەهادینی خاڵم هەر پێنجمان، بزێو و وریا وەک سمۆرە چاوڕەش و کلک جوانەکان، بێ پرس دەکەوینە ناو باخەکانی دێ. بەسەر دارمێو و درختی هەنجیر و هەناری باخەکاندا هەڵدەگەڕێین. کام هێشوی ترێ و کام هەنجیری نەرم و شل و کام هەناری سور کە دەستە بچوکەکانمان پێیان دەگات، لێی دەکەینەوە. هەر بەسەر درەختەکەوە بە پێکەنین و گاڵتە و چێژکردنێکی نەچەشتراوەوە بەرەو خوار ڕەوانەی گەدەمانی دەکەین. لە پڕ فرکەی بەرد بەم لاولاماندا دەدات و باخەوانەکە بە دەنگێکی گڕ هاواردەکات: (ئەوە کێن هان بەسەر ئەو درەختانەوە؟). بە ئاگا دێین و ئینجا لە سمۆرەوە دەبینە کەروێشکی کێوی و بە هەنکە هەنک خۆمان لە چنگی ڕاوکەر ڕزگار دەکەین. سەیر بو! خۆ میوە فرۆشتن لە ناو گوندە دا هەر نەبو، بەڵکو عەیبیش بو، کەچی هەندێ لە خاوەن باخەکان ئاوا ئاهەنگی پڕچێژی سەر درەختی میوەکانیان لێ تێکدەداین).

## شلە شارێ!

(بێ هیچ ڕێنمایی و ڕاهینانێکی پێشتر، عەلیی خاڵم بەرزم دەکاتەوە بۆ سەر پشتی ڕوتی ئەسپە کەی خالە هادی و وەک لە فیلمی کاوبۆی ئەمریکیدا بە قاچە باریکەکانم دەکوتمە کەلەکەی ئەسپەکە، ئەسپ بەرەو ئاسمان دەفڕێ و منیش بەرەو خاک و گڵە نەرمەکەی تەنیشتمان دەدەم بە زەویدا. لە حیلەی ئەسپەکە و قاقای پێکەنینی عەلیی خاڵم بە ئاگا دێمەوە. ئەو بە لاقرتی و تەوسەوە پێی وتم: «ها شلەشاری». ئێش و ئازاری گلانەکەم لە بیردەچێتەوە و بەتوندی دەچم بە گژیا: «ئەگەر تۆش پیاوی پاسکیل لێبخوڕە»).

## توانەوە لە سروشتدا!

(شێخ هادیی خاڵم خولیای ژیانی ڕاوکردن بو، ڕاوی کەو و کەروێشک و کەڵەکێوی. بۆ کەڵەکێوی بە بەلەم لە دەریاچەی دەربەندیخانەوە دەچوە ئەوبەرەوە بۆ چیاکانی (بێژەل) و (زەواڵی)، ئەو هەرگیز بزنی کێویی دوگیانی نەدەکوشت، پێی گوناە بو. دێتەوە پێشچاوم جارێکیان ئەسپەکەی لە تاو برین وهەوکردنی ناو دەمی دەیناڵاند، خاڵە هادی بە گژوگیای تایبەت هەتوانێکی دروستکرد. وەک دوکتۆرێکی ڤێتیرنەریی

ئینگلیز کە چەند چارەوییان خۆشدەوێ، زۆر بە هەستیاری و هێواشی پەنجە بە هەتوان چەورکراوەکانی خستە ناو دەمی ئەسپەکەیەوە و برینەکانی پێ داپۆشی. بە نەترسانی لەوەی لەپڕئەسپەکە پەنجەکانی بگەزێ، زۆرسەرسام بوم و بە ترسەوە هاوارم لێکرد «وریا بە خاڵە هادی بە ددانە گەورەکانی پەنجەت نەگەزێ»).

## ڕۆڵەگیان ! خەریك بوە خۆیشت بکوژیت!

(سەرسام بونم بە خاڵە هادی و سەرچڵیەکانی وایلێکردم زۆر جار بۆ ڕاو و شکار لەگەڵیدا بڕۆم. جارێک بردمیە سەر یەکێک لە کانیەکانی دامێنی چیای باڵامبۆ، سیپە یەکی بۆ سازکردم لە لق و گەڵای سەوزی داربەڕو، بە تاپڕێکەوە داینیشاندم لە کۆڵیتەکەدا.سیناریۆکەی لە بەر بو: «کەوەکان یەک بە دوای یەکدا ڕیزدەبەستن و بۆ ئاوخواردنەوە دێنە سەر کانیەکە، تۆ هەر کڕ و کش دانیشتویت و سەیردەکەیت. کە تێرئاوبون، هەمو بە دەوری یەکدا کۆدەبنەوە و دەبنە یەک کەوی گەورە ! ئێستا کاتێتی! سێرەیان لێدەگریت و ڕاوی خۆت دەکەیت». خۆیشی بە تاپڕەکەیەوە لە من دورکەوتەوە و لە شوێنێکی تری شاخەکە چوە ناو سیپە یەکەوە. وەک دەرهێنەرێکی بەهرەمەند، سیناریۆکەی چۆن دانابو ئاوا هاتەدی! تەقەی خۆمم کرد. گرمەی تاپڕەکە تێکەڵبو لەگەڵ شەقەی باڵفرین و جوکەجوکی کەوەکان. خاڵە هادی بە ڕاکردن و هەناسەبڕکێ گەیشتە لام. بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزەوە پێی وتم: «سەیری چاوت کردوە چیی لێهاتوە ؟ ڕۆڵەگیان خەریک بوە خۆیشت بکوژیت». تومەز قۆناغی تاپڕەکە لە بری ئەوەی توندی بکەم لە شانم، لە هەوادا ڕامگرتبو و لەکاردانەوەی تەقینی گولەکەدا گەڕابۆوە و بە توندی دابوی لە چاوی ڕاستم. لە شڵەژان و ترسدا هەستێکی وام بە ئێشەکەی نەدەکرد. لە ڕاستیدا هیچ خۆشیەکیشم لە کوشتارەکە نەبینی!)

## دەوترێ مرۆڤی فریشتە نیە !

(ڕێگای سەرەکیی ناوچەکە چەند هەنگاوێک لە خوار ماڵی خاڵە محەمەدەوە تێدەپەڕێ. دارتویەکی گەورە لە پێینی ماڵەکە دایە، لە سەر پشتی هەرزاڵەی بن سێبەری دارتوەکە چەند کونەی ئاوی سارد و مەشکەی پڕ لە دۆ دانراوە. لە بەرهەیوانی ماڵەکە، بە دەوری خوانێکی سادەدا، لەسەر نەوگ (لباد) یێک ڕووە و ڕێگاکەی

خوارمان دانیشتوین نانی نیوەرۆ دەخۆین. هەر ڕێبوارێک ناسیاو بێ یا نەناس بە بەردەمماندا تێپەڕێ و سڵاومان لیبکات، خاڵە محەمەد بە ڕویەکی خۆشەوە خوڵکێکی تورکیی دەکات کە بێت لەگەڵمانا نان بخوات یا چایەک بخواتەوە و پشویەک بدات. بەخشندەیی ومیواندۆستیی ئەم جوتیارە بچوکە سەرسامم دەکات. بەیانیە، ئاسمان شینە و ساماڵە، ڕۆژ بە تاڤەکانی خۆی ختوکەمان دەدات و گەرممان دەکاتەوە، دەنگی مەشکەژەنین و گەرمای خۆرەکە هەڵماندەسێنن. کێ دەڵێ مرۆڤی فریشتە نیە؟ (پورە ئامینە) خوشکی دایکمە، کچێکی قەیرەیە، فریشتەی ماڵەکەیە. تازە لە مەشکە ژەندن تەواو بوە. کەرەی تازە، کە وەک دڵ و دەرونی خۆی سپی و بێگەردە، بە لەپی دەستی لە دۆی چەوری مەشکەکە جیادەکاتەوە، پرۆشێک شەکری دەکات بەسەرا و بە نانی هەورامیی تازەوە چەند پارویەکمان بۆ ئامادە دەکات و دەماندانێ: «هانێ کوڕەکەی سۆیبە». محەمەد و ئامینە دوانەیەک بون لێوڕێژ لە بەخشندەیی و هیومانیزمێکی خۆزا و نادەستکرد).

### کولەکە مەلە

(دو کولەکە مەلە کە بە پەتێکی ئەستور لە ملیاندا بەیەکەوە بەستروان لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرین، خاڵە هادیش وەک سەرکاروان لە پێشمانەوە جڵەوی ئەسپەکە ڕادەکێشێ. ئەم کاروانە بچکۆلەیە ڕودەکاتە دەریاچەی دەربەندیخان کە چوار پێنج کیلۆمەترێک لە (گوندە) وە دورە. لە شوێنێکی گونجاوی دەریاچەکە لادەدەین و دەکەوینە شتنی ئەسپەکە. جوانی و درێژیی یاڵی ئەسپەکە زۆر سەرنجم ڕادەکێشێ، بە شانەی پەنجە باریکەکانم کانم دەکەومە داهێنانی. ئینجا کاتی مەلەکردنە، ئادەی منداڵینە، بەڵام زۆر وریا بن. هەر کولەکە یەی دەخەمە بنباخەڵێکم و خۆم دەدەم بەسەر پەتی نێوانیاندا. بە بۆقەمەلە و باسکەمەلە و پشتەمەلە ڕو لە کەناری ئەوبەری دەریاچەکە دەکەم. کە زۆر دوردەکەومەوە، خاڵە هادی بە هاور هاوار دەیەوێ من بگەڕێنێتەوە، بەلام من تازە ناوەراستی دەریاچەکەم تێپەڕاندوە، دەکەوێتە جنێودان پێم. لەسەر لاساری وسەرکێشیەکەی خۆم بەردەوام دەبم تا دەگەمە ئەوبەری دەریاچەکە. ئای چەند هەست و شعورێکی خۆش بو، چەند شانازیەکی گەورە بو بۆ منی مێرمنداڵی شلەشاری! لە دەریاچەی دەربەندیخان بە کۆمەکی دو کولەکە مەلە بپەڕمەوە).

## گونجاو و تەبا لە گەڵ سروشت

(چەند خۆش بو ئەو ڕۆژانەی خەڵکی ناوچەکە بە گونجان و سازانی تەواو لەگەڵ سروشتدا دەژیان. بیرمە ئێواران کە ماندو و شەکەت لە گەشت و گەڕان دەگەڕاینەوە، لەگەڵ عەلیی برام لە سەربانی ماڵی خاڵم لە سەر پشت پاڵدەکەوتین، تەماشای ئاسمانی بێکۆتاییمان دەکرد و کێبەرکێمان لە سەر ئەوە دەکرد، کام مان پیش ئەوی تر یەکەم ئەستێرەی گەشی ئاسمان دەبینێ، ئەو ئەستێرەیەمان ناونابو (ئەستێرە گەشە). هەر لە (گوندە) خاڵە هادی گروپە ئەستێرەی (حەوتەوانە) ی پیشاندایین و پێی ناساندین:

«ئەو حەوتەوانە هەر حەوت زەریفە هەر حەوت پاسەوان قودسی شەریفە).

## میوانێك لە ناکاتدا!

هەروا بەدەم لێدانەوەی ئەو فیلمی ڤیدیۆیەی لە ساڵەکانی ١٩٦٠ وە لە خانە چرو پڕ و پڕلقوپۆپەکانی مێشکمدا تۆمارکرابو، وردە وردە گەیشتبومە ناو دێی (گوندە) ولاقەکانم بەرەو لای ماڵی خاڵە هادیان دەبردم. نزیکی ماڵەکەیان بومەوە، بینیم بە بێڵ خەریکی کێڵانی زەویی پێش ماڵەکەیان بو. هاتنەکەم چاوەڕوان نەکراو بو چونکە ئێمە ساڵانی پێشو لە پشوی هاویندا دەهاتین. پاش سڵاو وماچ وموچ،هەستم کرد لە چاو جاراندا سارد و وشک بو، پێشم کەوت بۆ ژورەوە. دوای حەسانەوەیەکی کورت و نانخواردن، بە بڕێک ساردی و گومان و گرژیەوە لێی پرسیم، بەم بەهارە بۆچی هاتوی؟ منیش نیازی خۆمم پێوت کە دەمەوێ ببمە (پ.م). شێخ هادی جوتیارێکی خوێندەواری نیوە مەلای پڕئەزمونی ناوچەکەبو. ئەو کەموکورتی و ستەم وناشیرینی و ناڕەوایەتیەکانی هەندێ لە لێپرسراو و فەرماندە سەربازیەکانی ساڵانیی دوایی شۆڕشی ئەیلولی بینیبو و چەشتبو. بە تەوێڵێکی گرژی مرومۆچەوە، بە دەنگێکی ئارام و پڕحەسرەتەوە، بە تۆنێکی قوڵ کە ساروخئاسا خۆی گەیاندە ناخی هەستی و نەستیم، بە تەوسەوە پرسی: "هەر بە ڕاستی نیازت وایە ببیتە پێشمەرگە؟ دەتەوێت بۆ پێشمەرگایەتی لەم شۆڕشە جوانە! واز لە خوێندنەکەت بهێنی؟ ".

شێخ هادی کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکی زوڵم و زۆر و دەسدرێژیەکانی هەندێک لە بەرپرسانی پارتی و شۆڕشی ئەیلول لە ناوچەکە.

## ئەحمەدی حەمەئەمینی (پریس)ی

وەک دوێنێ ڕویدابێت، بە داخ و حەسرەتێکی زۆرەوە باسی کوشتنی نارەوای پیاوی نیشتمانپەروە و جوامێر(ئەحمەدی حەمەئەمین) ی خەڵکی گوندی (پریس ی سەرو) ی کرد. بە فەرمانی فەرماندەی هێزی خەبات (عەبدولوەهاب ئوتروشی) ژمارەیەکی زۆر (پ.م) چونە سەری لە ماڵەکەی خۆیدا، ئەویش جوامێرانە تا دوا فیشەک بەرگریی لە خۆی کرد.

تەنیا تاوانی ئەحمەد ئەوە بو بێدەنگ نەدەبو لە دەسدرێژی و زوڵمی بەرپرسە سەربازی و حیزبیەکانی پارتی و شۆڕشەکەی لە ناوچەکەدا.

## زیاتر بە ناخی زەویدا....

باسی ناوەڕاستی ساڵەکانی ١٩٦٠ تا ١٩٧٠ ی سەردەمی زوڵم و زۆری عەبدولوەهاب ئوتروشی بۆ کردم. عەبدولوەهاب بنکە گەڕۆکەکانی لە زەردەهاڵی لای بیارە و دواتر لە گوندی تەوێڵە بو. باسی داد و بێدادی خەڵکی هەورامانی کرد لە سوخرە و دەست دەسدرێژی، لە زیندانیکردن و لە ئەشکەنجەدانی جوتیاران لە ژێر ناوی شۆڕش دا. باسی بۆرەپیاوە دەسکەلاکانی بەردەست عەبدولوەهاب ئوتروشی ی کرد، وەک (ف. ک) و (ع.م). بۆی گێڕامەوە: (جوتیارێکی هەورامی قوربانیی زۆرداری ودەستدرێژیە کانی (ع.م) بوە، جارێک بە لای گۆڕستانی دێی بیارە دا تێدەپەڕێ. لە نائومێدی و تورەیی و غەمباریدا دەچێتە ناو گۆڕستانەکە، بە دەنگی بەرز ئاوا بە مردوانی ناو گۆڕەکان دەڵێ: «باش گویم لێبگرن: ئەگەر زیندوببنەوە، دە سەلات و حوکمی (ع.م) بەچاوی خۆتان ببینن و بچێژن، ئینجا دەمودەست دەگەڕێنەوە ناو گۆڕەکانتان و دەتانەوەێ زۆر لە جاران زیاتر بچنەوە بە ناخی زەیدا، بۆ تاریکستانی قوڵایی قوڵاییەکان، بۆ ئەوەی ئاگاتان لە ڕوداوەکانی سەر زەویی ئەم ناوچەیە نەبێت»).

## وەرە پاشکۆم سواربە!

وەک مشتێک لە خەروارێک ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە: «کادیرێکی چاوحیزی داوێن پیسی پارتی دەیەوێ بە مێردی ئەو ژنە ی چاوی لە سەریەتی نامەیەکی بەناو گرنگی پیا بنێرێ بۆ دێیەکی زۆر دور، ئەوەندە دور کە نەتوانی شەو بگەڕێتەوە بۆ

ماڵەکەی خۆی. کابرای جوتیار و ژنەکەی دەکەونە تکا و پاڕانەوە لێی کە وازی لێبێنێ چونکە تازە زۆر درەنگە، شەو دێت بەسەریا و ناتوانێ بڕوات. بەڵام تکاکەیان سودی نابێت. جوتیارەکە کاتێک نیازی گڵاوی کادیرەکەی بۆ دەردەکەوێ، بانگ لە ژنەکەی دەکات با خۆی بگۆڕی و بێت لە پاشکۆی ئیسترەکە لە پشتی خۆیەوە سواربێ و پێکەوە بچن نامە نانامەکە ببەن بۆ دێ دورەکە».

## وەك گەڵای دار!

فیلمی درێژی تراجیدیای ڕوداوە ڕاستەقینەکانی ناوچەکە تەواو نەدەبو. بیرم چوبۆوە ئێستا بەهاری ١٩٧٤ و من خوێندکاری کۆلیجی پزیشکیم و بۆ ڕونکردنەوەی پرسیارێک هاتوم کە پەیوەندیی بە ژیان و مردنەوە هەیە. شێخ هادیش لە بیرهاتنەوە و گێڕانەوەی چیرۆکەکان ماندو و شەکەت بوبو. بە هەنسک دەستی پێکرد و بە قوڵپی گریان کۆتایی پێهێنا!

«هاوینی ساڵی ١٩٦٨ بو، گەرمەی شەڕی براکوژی بو.عەبدولوەهاب ئوتروشی هێزێکی گەورەی کۆکردبۆوە لە زنجیرە چیاکانی باڵامبۆ و شنروێ کە بەسەر شاری هەڵەبجەدا دەڕوانن. بە پشتیوانیی نزیکەی ٣٠٠ چەکداری کوردی ئێران (چریک) کە ڕژێمی شای ئێران ناردبونی، کەوتە تۆپبارانی هەڵەبجە و لە ئەنجامدا دەیان کەسی بێتاوان لە ناو شار کوژران و بریندداربون. لە کاردانەوەی ئەوەدا، جەلالیەکان هێزێکی شەڕکەری گەورەیان کۆکردەوە. بە تەنیا لەم گوندەی ئێمەدا نزیکە ٤٠ چریکی کوردی ئێران کوژران و دەیانی تر بریندداربون و بەدیل گیران. ڕژێمی کوردکوژی شای ئێران ئەوانی برسی و بێکار کردبو، ئینجا بەرامبەر پارویەک نان و قوتویەک شیر بۆ منداڵەکانیان، چەکداری کردبون بۆ شەڕێک کە نەیان دەزانی بۆچی دەیکەن». تەواو ! باتریی وزەی شێخ هادی خاڵی بوبو، بە کزی و کەساسیەکەوە کە جەرگیان دەتاوان وتی: «بەخوا لە ناو باخ و پەنا و پاسارەکانی ئەم دێیەدا، وەک گەڵای وەریوی پایزان، جەستەی خڵتانی خوێنی چل چریکمان دۆزیەوە. هەمویانمان کۆکردەوە، بێکەس و دور لە خزم و کەسیان، بە جلەکانی خۆیانەوە لە گۆڕستانی (شێخ ئەحمەد) ی گوندەکەمان، لە چاڵی بچوک بچوکدا ناشتمانن».

## فەرشی ئۆرتە و زمناکۆ!

شێخ هادی ئینجا بەمە کۆتایی بە گێڕانەوەکانی هێنا: «بڕوانە: چی بەلەمی ماسیگرانی ئەم دەریاچەی دەربەندیخانە هەیە، هەموی بە سوخرە گیراون. دەزانی بۆ؟ بۆ گوێزانەوەی ژن و منداڵ وفەرشی ئۆرتە وکەلوپەلی نەختینە وگرانبەهای مەسئولە گەورەکانی پارتی وهێزی (پ.م)ی خەبات بۆ ناو ئێران. ئەمە لە کاتێکدایە کە پێشمەرگەی سادە و ڕەش و ڕوتی هێزی خەبات بە سکی برسیەوە پەلاماری بەرزاییەکانی دوژمن دەدەن لە شاخی زمناکۆ، ئەمەیە شۆڕشە جوانەکەت، تێگەیشتی؟».

## خاتون هەیبەت

(خاتون هەیبەت) هاوژینی شێخ هادی بو، ئەویش جار جار دەهاتە لامان و گوێی لە قسەکانمان دەگرت، ئینجا وەک هەر ژنێکی ماڵ دەگەڕایەوە سەر ئیشەکانی خۆی. ئەو ژنێکی دانا و سەلار و هێمن بو. هەمو جومگە گرنگەکانی ژیانی خاڵم و خێزانە گەورەکەی لە دەست دا بو. ئەم ژنە بەهەیبەتە، بە باشترین شێوە ماڵ و مێرد و منداڵ و میوانی زۆری خێزانەکەی دەبرد بەڕێوە. (خاتون هەیبەت) پورە خەمەی ژنانی گوندە بو، ئەوان کێشەکانیان و دەردی دڵیان هەڵدەڕشت، ئەمیش بە پێی توانا و ئەزمونەکانی یارمەتیی دەدان. لە بیرمە کە مێردمنداڵ بوم، زۆر جار دەمبینی تەنانەت هەندێ لە پیاوانی دێش بۆ ڕاوێژ و پرس دەهاتن بۆ لای (خاتون هەیبەت).

## وانەیەکی کاریگەر لە مێژو!

بەرامبەر قسەکانی شێخ هادی، بەڕاستی وەک دەڵێن دەمم بوبە تەڵەی تەقیو. هەر تیوریەکی وشک و خۆلەمێشی و بێگیانی ڕۆشنبیرانەم بهێنایەتەوە، لەبەردەم نمونە زیندوە کانی ئەودا هەرەسی دەهێنا. ئیتر کاتی نانخواردن هاتبو. خاتون هەیبەت خواردنێکی خۆشی بۆ سازکردبوین، هەمو خێزانەکە پێکەوە بە دەوری خوانێکدا نانمان خوارد. بە دەوری سەماوەردا دانیشتبوین، بەدەم خواردنەوە ی چای بە خەڵوز دەمکراو، خاتون هەیبەتیش لە شێخ هادی زیاتر هانیدام بڕۆمەوە بۆ بەغداد بۆ سەر خوێندنەکەم. ئیتر پێویستم بە وتوێژی تر نەبو، کاتی ماڵاوایی هاتبو. سەری قەناعەتم کزکرد و هەر ئەو ڕۆژە لە هەڵەبجەوە کە هێشتا بەدەست (پ.م) وە بو،گەڕامەوە بۆ

سلێمانی بۆ ماڵی خۆمان. باوک و دایکم وبراکانمم لە بڕیاری گەڕانەوەم بۆ بەغدا و درێژەپێدانی خوێندنەکەم ئاگادارکردنەوە، ئەوانیش هیچ ڕێگریەکیان لێنەکردم. خۆم گەیاندەوە بەغدا، باشبو هێشتا کاتی مۆڵەتەکەم تەواو نەبوبو، بۆیە توشی هیچ لێپرسینەوەیەک نەبوم. لەگەڵ هەمو ڕەخنەکان لە شۆڕشی ئەیلول، دواتر کە شەڕی نێوان (پ.م) و ڕژێم گەورەتر و گەرمتر دەبو، ئێمەی خوێندکاری کورد بە جەستە لە بەغدا و بە دڵ و بە گیان لە کوردوستان بوین. بۆیە ڕۆژانە بە نهێنی لە ڕێی ڕادیۆ وە ئیستگەی دەنگی شۆڕشمان وەردەگرت، گوێمان لە دەنگ وباس و چالاکیەکانی (پ.م) و هەواڵەکانی شۆڕش و ناوچە کانی ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە دەگرت، بە سەرکەوتنەکانیان دڵشاد و بە شکست و زیانەکانیان غەمبار دەبوین.

## ئاشبەتاڵی مانگی ٣ ی ١٩٧٥

لە بەغدا دور لە ڕوداوەکانی کوردوستان دەژیاین ، سەرگەرمی خوێندنی قورسی پزیشکی بوین. چەند ڕوژێک بو هەواڵی شوم و تەمومژاویی (ئاشبەتاڵ) ی شۆڕش گەیشتبوە گوێی ئێمەی خوێندکار. بەڵام هەر بە دەنگۆ و پرۆپەگەندای ڕژێم مان دەزانی. نیوەڕۆیەکی مانگی ئازاری ١٩٧٥ بو، لە پێش چێشتخانە گەورەکەی ماڵی خوێندکارن لە (باب المعظم) لەگەڵ کەمال ی هاوڕێم لە ڕیزی درێژی خواردن ڕاوەستابوین و چاوەڕێمان دەکرد. من خوێندنەوە وەک خویەکی بەسودی هەمیشەییم، یارمەتیم دەدات کاتی چاوەڕێکردن لە هەر شوێنێک بێ زو تێیپەڕێنم، بۆیە ڕۆژنامە و کتێب بەردەوام لە جانتاکەمدایە و لە باشترین هاوڕێکانی ژیانمن. خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامەی (هاوکاری) بوم، کە ڕۆژنامەیەکی ڕە سمیی سەر بە ڕژێمی بەعس بو. بابەتی سەرەکیی ئەو ژمارەیە (جەوهەری مەسەلەکە) بو کە سەرنجی ڕاکێشام، بابەتەکە لە نوسینی (عبدالله عباس) ی سەرنوسەری ڕۆژنامەکە بو. کەوتمە خوێندنەوەی، نوسەر هەواڵی ئاشبەتاڵ پشتڕاست دەکاتەوە و دەیەوێ ئاشبەتاڵ وەک دەرفەتێک و شانسێک بۆ کورد بە خوێنەر بناسێنێ. لە نوسینەکەدا دەڵێت: کورد لە عێراقدا ئیتر ڕزگاری بوە لە شەڕ و ئاژاوەی سەرکردایەتیی خێڵەکی و خۆفرۆشی سەر بە ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل. ئەو لە نوسینەکەیدا ئاشبەتاڵ بە شکستی گەورەی سەرکردایەتیی خێڵەکی بارزانی دەزانێ نەوەک شکستی گەلی کورد.

## چۆن باوەڕبکەم؟

کە لە خوێندنەوەی (جەوهەری مەسەلەکە) بومەوە، موچڕکە و تەزویەکی کارەبا هەمو جەستەمی تەنی و سرکرد، پێستم دەتوت شارە مێروڵە تێی ئاڵاوە، ئەژنۆکانم شلبون، تنۆکی مرواریی چەند فرمێسکێکی گەرم وەک ملوانکەیەکی بچڕاو ڕیزیان بەست و وەرینە سەر ڕۆژنامەکەی دەستم. ترسام سەرنجی خوێندکارە عەرەبەکانی ئەمـلاولام ڕاکێشابێ، بۆیە خێرا چاوەکانم هەڵگلۆفی و بە دەست فرمێسکی سەرڕۆژنامەکەم سڕی و دامە دەستی کەمالی هاوڕێم. ئەویش نوسینەکەی خوێندەوە و زۆر ناڕەحەتی کرد. هێزێکی ناوەکی پاڵی پێوەدەنام و دەیوت هەتا بەچاوی خۆت نەیبینی باوڕ مەکە. بۆیە بۆ چەند ڕۆژێک پشوی پزیشکیم وەرگرت وگەڕامەوە سلێمانی. بە چاوی خۆم سەدان (پ.م) ی سەرکز و غەمباری خۆبەدەستەوەداوم لە سەرای سلێمانی بینی لە کاتی ڕادەستکردنی چەکەکانی شانیان. ئیتر بۆم دەرکەوت هەواڵی ئاشبەتاڵ ڕاستە و هەمو شتێک تەواو بوە، تەواو !

## بەڵگەت چیە؟

لە پێش ئاشبەتاڵ و لە قۆناغی دوای ئاشبەتاڵیشدا جگە لە سێ چوار خوێندکاری ڕیوەڵە و بێهەڵوێست کە بوبون بە بەعسی، هەمو خوێندکارانی کوردی کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی بەغداد کە نزیکەی ٧٥ خوێندکار دەبوین، بەرامبەر گوشین و پەستانی ڕژێم بە ئارامی خۆمان ڕاگرت. ئێمە نە بوین بە بەعسی و پیاوی ڕژێم، بەسەرکەوتویی خوێندنمان تەواوکرد. بەعسیبون پەڵەی شەرم وشورەیی و خەوش بو. ئێمە خوێندکارە کوردەکان لە کافیتیریای کۆلیج مێزی تایبەتیی خۆمان هەبو. (ع.دزەیی) یەکێک بو لەو خوێندکارە بەعسیانە، ئەو کاتێک دەهاتە سەر مێزەکەمان، زۆربەمان وەڵامی سڵاویمان نەدەدایەوە، قسەمان لەگەڵ نەدەکرد، لە ئامادەبونی ئەودا قسەمان نەدەکرد و هەندێکیشمان لەگەڵ دانیشتنی ئەو مێزەکەمان جێدەهێشت. ڕۆژێک لەسەر داوای خۆی دوبەدو بە پیاسەوە کەوتینە قسەکردن. ئەو پرسی «ئێوە بۆچی ڕێزم ناگرن و بە چاوی سوک سەیرم دەکەن، من تاوانم چیە؟». منیش ڕەپ و ڕەوان پێم وت تۆ بەعسیت، وتی «بەڵگەتان چیە؟ «وتم: ئەو خوێندکارە عەرەبانەی ئێمە هاوڕێیەتیان دەکەین یا شیعەن یا شیوعی یا بێلایەن یا مەسیحی. بەڵام هاوڕێ عەرەبەکانی تۆ هەمویان بەعسیەکانن. پرسی: «بەڵگەت چیە؟»، پێموت: مەگەر خۆیشم ئەندامی ئەو

شانە حیزبیە بم کە تۆی تیا ڕێکخراوە. جگە لەوە کەس دایک و باوکمانی لە ناو جێگای خەودا دیوە؟ کەس داوایان لێدەکات بەڵگە بخەنە ڕو کە فرزەندی ئەوانین؟

## وەك ئۆکسجین !

لە دوای ئاشبەتال من لە بارێکی دەرونیی گرژ و نیگەران و نائارام دا دەژیام چونکە نە ئازادیم هەبو نە دڵنیایی. لای من هاوشان لە گەڵ ئۆکسجین و ئاو و خواردەمەنی، ئازادیی دەبڕینی بیروڕا و ئازادبون لە پیادەکردنی حەز و ئاواتەکان گرنگترین بنەماکان و پێویستیەکانی ژیانی ئینسانە. بەغداد بۆ کوردێکی ئازادیخوازی وەک من وەک قەفەزێکی پۆلایینی بێ دەلاقەی لێهاتبو. بیرم کردەوە پەساپۆرتێک دەربێنم و لە ڕێی سەردانی وڵاتێکی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتەوە بچمە وڵاتێکی ئەوروپای ڕۆژاوا و داوای پەنابەریی سیاسیی لێ بکەم. بە هۆی بەهێزیی دراوی دینار بەرامبەر بە دۆلار و بەهێزیی دولاریش بەرامبەر دراوی ئەو وڵاتانە، گەشت بۆ وڵاتانی بلۆکی وارشۆ بۆ عێراقی زۆر هەرزان بو. بۆ دەرهێنانی پەساپۆرت یا دەبوایە پشتگیریی یەکێتیی خوێندکارانی بەعسم پەیداکردایە یان کەفالەتی ١٤٠٠٠ دیناری عێراقیم پەیدا بکردایە وەک بارمتە بۆ ئەوەی دوای سەفەرکردنم بگەڕێمەوە بۆ عێراق. بەو برە پارەیە لەو کاتەدا دەتتوانی پێنج شەش خانوی ٢٠٠ مەتریی لە بەغداد بکڕی! کورد دەڵێ (کردەی پەشیمان باشترە لە نەکردەی پەشیمان)، بۆ وەرگرتنی پشتگیری چومە لای بەرپرسی لقی کۆلیجی پزیشکیی یەکێتیی نیشتمانیی خوێندکارانی عێراق کە سەر بە بەعسیەکان بو، کابرای بەرپرس کە بەعسیەکی ڕقاوی و شۆڤێنی بو، بە لاقرتی و زەردەخەنەیەکی ژەهراویەوە وتی: «پشتگیری بۆ تۆ بکەین؟». (شێخ تاهیر) ی ئامۆزامماڵیان لە بەغدا بو، ئەفسەر بو بە پلەی (ڕائید). کە کێشەکەم بۆ باسکرد یەکسەر ئامادەیی خۆی نیشاندا کەفالەتەکە بگرێتە ئەستۆی خۆی، پێم وت ئاخر ئەی ئەگەر من نەمویست بگەڕێمەوە عیراق تۆ توشی سزا و لێپرسینەوە نابیت؟ بێ دودڵی و زۆر ڕاستگۆیانە وتی تۆ حەقت بەسەر منەوە نەبێت و هەر لە ئێستاوە گەردنت ئازابێت. بەڕاستی کە ئەم هەڵویستە جوامێرانەیەی دەربڕی، لە دڵی خۆمدا وتم حەیف نیە پیاوی ئاوا لە دوای خۆت بخەیتە کێشە و مەترسیەوە؟ شێخ تاهیر یش هەر لە تافی لاویدا چوبوە ناو حیزبی شیوعی و پێشمەرگەی لقی ١٠ ی ئەو حیزبە بو لە ناوچەی قەرەداغ، ئەو بە دڵ و بەگیان دژی ڕژێمی سەدام بو و نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزبو.

## خوایە گیان! چی دەبینم ؟

هاوڕێ (بەکر هەولێری) خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیاری بو، سەر بە (حشع) بو. یەکترمان دەناسی و جار جار دەردەدڵی سیاسیمان لای یەکتر دەکرد. ڕۆژێک لە هاوینی ساڵی ١٩٧٥ لە ماڵی خوێندکاران لە باب المعظم خەریکی خوێندن بوم، ئەویش هەر لەوێ دەژیا. هاتە لام و وتی با پیاسەیەک بە ناو چیمەنەکەدا بکەین. بە دەم پیاسەوە و دور لە چاوی هیچ کەسی، لە ناو کتێبەکەی دەستی نوسراوێکی چاپکراوی دەرهێنا و دایەدەستم. پێی وتم زور نهێنی و مەترسیدارە، بیخوێنەرەوە و هەر با بۆ خۆیشت بێت، چیی لێدەکەیت بیکە. ئێمە هاورێی نزیک نەبوین، هیچ زانیاریەکی ترم لەسەر خۆی و خێزانەکەیان نەبو، دەشیا لێی وەرنەگرم و داوای لێبوردنی لێ بکەم، کەچی ئەوەم نەکرد، بۆچی ؟ نازانم. نوسراوەکەم لێ وەرگرت و بە پەلە و بە نهێنی خوێندمەوە، بڵاوکراوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردوستان (ینک) بو. یەکەم جارم بو ئەم ناوە دەبیستم. نوسراوەکە شنەی شەماڵێکی فێنک بو لەو گەرما پڕوکێنەرەی بەغداد. هەواڵی هەستانەوە و ژیانەوە وهەلگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێی تێدا بو. نوسراوەکە وەک مژەدەیەکی خۆش، ئەو هەواڵەی دەدا بە گوێی خوێنەردا، کە سەرلەنوێ چیا و دۆڵە چۆلکراوەکانی کوردوستان وردە وردە بە (پ.م)ی نوێ ئاوەدان دەکرێنەوە. بە خۆشی و شادی و ئومێدێکی زۆرەوە بڵاوکراوەکەم بە مکو می و دڵنیایی لای خۆم شاردەوە. چەند هەفتەیەک دواتر نوسراوەکەم لەگەڵ خۆمدا بە شاراوەیی بردەوە بۆ سلێمانی، ویستم بیدەم بە کەمالی هاوڕێی زۆرنزیکم. ئەو دیاربو هەڵچونی هەست و سۆزی بە هۆی خۆشیی هەواڵەکەوە کەمتربو، لە خەمی ئەو ئەگەرە کوشندەیە بو لە لایەن ڕژێمەوە بڵاوکراوەکە بە دەستیەوە بگیرێ، بۆیە پێی وتم پێویست ناکا بیدەمە دەستی، با خۆم جارێکی تر جوان و ورد لە ماڵەوە بیخوێنمەوە، ئینجا بە باشی و دروستی ناوەڕۆک و زانیاریە گرنگەکانی ناو بەیانەکە لە پیاسەیەکی ئێواران بۆی با سبکەم. پێشنیازەکەی ژیرانە و خۆپارێزانە بو، منیش هەر ئەوەم بۆکرد.

ماوەیەک دواتر لە هاوینی ١٩٧٧ دا لە ڕۆژنامەی (طریق الشعب) ی زمانحاڵی حیزبی شیوعی هەواڵێک بڵاوکرابۆوە گوایە (جەلال تاڵەبانی) لە گوندێکی باکوری کوردوستانی (تورکیا) کوژراوە، ئەم هەواڵە خورپەیەکی قورسی لە دڵم دا. لەو ڕۆژاگارەدا کەس نەیدەتوانی راستبون یا درۆبونی هەواڵەکە بسەلمێنێ.

## سەگەکەی لەیلان و تەپەلو!

هەر لەو سەردەمەدا بو نوسەرێک بە ناوی (دنیادیدە) لە نوسینێکدا لە گۆڤاری (ڕۆژی کوردوستان) کە لە بەغدا دەردەچو، کۆرپەی تازە لەدایکبو و فرەنازداری یەکێتیی نیشتمانیی چواندبو بە سەگێک کە ژیانی لە گوندەکانی (لەیلان) و (تەپەلو) بەسەر بردوە. ئەو سەگە بە ئەزمون بۆی دەرکەوتبو لە کوێ دەنگی دەهۆڵ بێت، لەو شوێنە خۆراک هەیە. دەهۆڵ لێدەرێ لە (لەیلان) و یەکێکی ترلە (تەپەلو) سەگە کە بەوە دەسخەڕۆ دەکەن، کاتێ ئەوەی لەیلان دەهۆڵەکەی لێدەدات، ئەوەی تەپەلو لێی نادات، سەگەکە بەرەو لەیلان دەڕوات، کە دەگاتە ناوەڕاستی ڕێگا، دەهۆڵ لێدەری لەیلان لە دەهۆل لێدان دەکەوێت و ئەوی تەپەلو دەست بە دەهۆڵ لێدان دەکات، سەگی داماو دەگەڕێتەوە و ئینجا بەرەو تەپەلو دەڕوات، هەمان کاری بێبەزەییانە دوبارەدەبێتەوە! لە کۆتاییدا سەگەکە ناگاتە هیچ یەک لە دو دێکە و لە نێوانیاندا لە برسا کۆتایی بە ژیانی دێت. ئەو کاتە دەوترا (دونیا دیدە) (مکرم تاڵەبانی) یە، ئەم پیاوە سەرنوسەری گۆڤارەکە بو، وەزیر بو لە حکومەتی سەدام دا و هەروەها ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی شیوعی بو. مەبەستی (دونیا دیدە) ئەوەبو بێهودەیی و نائومێدی بخاتە دڵی هەمو ئەوانەی دڵیان بە هەستانەوەی کوردو شۆڕشە نوێکەی خۆش کردبو. (دونیا دیدە) بە خوێنەری دەوت: پشتگیریکەرانی دەرەکیی یەکێتی (سوریا ولیبیا و...) ڕاستگۆ نین لەگەڵی و لە دوائەنجامدا دەستی یەکێتی دەبڕن و وەک سەگەکە برسیی دەکەن و کۆتایی پێ دێنن. ئەوەی شایەنی فەرامۆش نەکردنە مامۆستا (مەسعود محەمەد) لە کتێبی (حاجی قادری کۆیی) دا بە توندی وەڵامی (دنیادیدەی) دایەوە. کە ئەم چیرۆکەم خوێندەوە زۆر تورە و غەمباری کردم، چونکە لەو ڕۆژگارە تاریکەی کوردوستانا دروستبونی یەکێتی و هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ خۆشترین مژدەبون بۆ من. ئا لەو دورەوە ڕوناکیی کزی مۆمەکەی جەلال تاڵەبانی، دڵی منی شەیدا و پڕلە تاسە بۆ ئازادی، ڕۆشن و گەرم دەکردەوە و تین و تاوی پێ دەدا، من ئەو پیاوە بوم کە پیرەمێرد ی دانا و شاعیر لەم شیعرەدا باسی دەکات:

**شەوێ پیاوێ لە بەفرا ما نەمرد دیی ئاگرێکی دێ**
**لەلای من نائومێدی کفرە ئەم ئاگری دڵەم بۆ کوێ؟**

نوسراوی (جەوهەری مەسەلەکە) و هەواڵی کوشتنی جەلال تاڵەبانی و نوسینەکەی (دونیا دیدە)، ئێشێکی بە سوێیان بە منی زامداری ئاشبەتاڵ گەیاند.

دواتر ورده ورده باسک و بازوی (ینک) ئەستورتر دەبو و هەواڵی چالاکییەکانی لە کوردوستان دەگەیشتە بەغداد. لە ناوەڕاستی بەغداد، بە هاوکاریی ڕێکخراوی (هەڵۆی سور) و ڕێکخراوی (خوێنی شەهیدان) ی سەربە (کۆمەڵەی مارکسی-لینینیی کوردوستان – بیری ماوتسیتۆنگ) (عوسمان محەمەد فایق) ی بەڕێوەبەری گشتیی ڕۆشنبیریی کوردی کوژرا. ڕۆژێک لە کۆلیج خوێندکارێکی عەرەبی بەعسی، باوەڕنەکردە و سەرسام و ترساو، بە چاوی داچەقاوەوە لێی پرسیم: ئایا هەواڵی تەقەلێکردنی پاریزگاری سلێمانی لە لایەن کوردە یاخییە کانە وە ڕاستە یا درۆ و پڕۆپەگەندایە؟

## «ئەوی خۆشم ویستبو جێم هێشتبو»!

کۆلیجی پزیشکیم تەواو کرد، بە پێی نمرەکانم دەمتوانی لە بەغدا وەک پزیشکی نیشتەجێ (موقیم) دامەزرێم، بەڵام دڵم دەیویست پاداشتی هەمو ئەوانە بدەمەوە کە هاوکاریی منیان کرد تا ئەوەی بومە دوکتور، ئەوانە هەمویان لە سلیمانی بون و لەوێ جێمهێشتبون، منیش وەک هێمنی شاعیر دەڵێت (ئەوی خۆشم ویستوە جێمهێشتوە). لە ڕۆژی ١٧ ی حوزەیرانی ١٩٧٨ لە سلێمانی بە دوکتۆری نیشتەجێ (مقیم) بە موچەی مانگانەی ٤١ دینار(بە دەرماڵەوە دەیکردە ٨٧ دینار) دامەزرام، ئەم موچەیە بۆ ئەو کاتە زۆر زۆر بو.

## بەس مزگەوتەکە!

لە پایزی ١٩٧٨ دا چەند مانگێک بو وەک پزیشکی نیشتەجێ لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی دامەزرابوم، ئاکۆی خوشکەزام تەمەنی ١٠ ساڵ دە بو، ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە: «لە هاوینی ساڵی ١٩٧٨، ڕەمەزان بو، لەگەڵ دایکم هاتینە گوندی نێرگسەجاڕ بۆ ئەوەی ئێمەش بەشی خۆمان لە قەرەبوکردنەوەی چۆڵکردنی دێکە وەربگرین. هەمو خەڵکی دێ لە مزگەوت و دەوروبەری گردبوبونەوە، ئەوانەشی نێرگسەجاڕی بون و بەڵام پێشتر باریان بۆ شار کردبو، وەک ئێمە، ئەوانەش هاتبون بۆ وەرگرتنی پشکی خۆیان. لیژنەیەکی حکومەتی لە ناحیەی (سیروان) وە هاتبون بۆ مەزەنەکردنی بژاردنەوەی (تەعویز) زیانەکان، کە بە هۆی چۆڵکردنی گوندەکە بەر

خەڵکەکەی دەکەوت. دەوروپشتی دێ بە سەرباز تەنرابو، بەتایبەتی لوتکەی شاخی (سەید شوجاع)، کە نێرگسەجاڕ لە دامێنیدا دروستکراوە، سەربازی زۆر لە نێوان تاشەبەردە کانیا دامەزرابون. سەربازەکان سەرگەرمی ڕاکێشانی وایەری بۆمبەکانیان بون بۆ ناوماڵەکان. چەند کارمەندێک لە مزگەوتەکە فۆرمیان دەربارەی خێزانەکان پڕدەکردەوە. ئەفسەرێکی عەرەب چەند سەربازێکی پڕچەکی لەگەڵدا بو و ئەمانیش لە مزگەوتەکەدا بون. بابە حاجی (شێخ عوسمان – باوکی نوسەر) بە عەرەبی کەوتە قسەکردن لەگەڵ ئەفسەرەکە، تکا و داوای لێکرد بەس مزگەوتەکە نەڕوخێنن چونکە ماڵی خودایە و یادگاریی بنەماڵەکەیانە. زۆر هەوڵی لەگەڵ دا سودی نەبو، ئەفسەرەکە پێی وت فەرمانی سەرۆک سەدامە و ئەم ناتوانێ سەرپێچیی لێباکت، دەبێت مزگەوت و خانوەکان هەموی بروخێنرێن. کە بابەحاجی زانیی هەر دەیڕوخێنن، ئەو فۆرمەی بۆیان پڕکردبۆوە و تێیدا بڕێک پارەی زۆریان بۆ نوسیبو، دڕاندی و پێی وتن ماڵی خودا و خاک نافرۆشرێن، ئینجا کەوتە کۆکردنەوەی قورئان و کتێبە ئاینیەکانی تری ناو مزگەوتەکە ولەگەڵ خۆی هێنانیە دەرەوە. هەرگیز فرمێسکەکانی بابە حاجیم پیرناچێتەوە کە لە کاتی کۆکردنەوەی کتێبەکاندا بە ڕیشە سپیە درێژەکەیدا تک تک دەهاتنە خوارێ. کە ناونوسکردن تەواو بون، هەمو خەڵکەکە لە ناودێ چونە دەرەوە و دورکەوتنەوە. گرمە و ناڵە لە ناودێوە بەرزبۆوە، نێرگسەجاڕ لە دوکەڵێکی چڕی ڕەش و شیندا لە چاومان بزربو».

قاقای پێکەنینی (سەید شوجاع) بەو بەرزاییەوە تێکەڵ بە گرمەوناڵەی بۆمباکان بو و خواحافیزیەکی گەرمی لە نەوەکانی خۆی کرد، ئەوانەی لە پشتی گابەردەکانی سەریەوە پاسەوانیی پرۆسەی وێرانکردنی (نێرگسەجاڕ) یان دەکردا!

## کۆمەڵەی مارکسی - لینینیی کوردوستان - بیری ماوتسیتۆنگ (کملك)

لە دوای ڕێکەوتنی ۱۱ ی ئازاری ۱۹۷۰ کە لە نێوان سەرکردایەتیی بارزانی و سەدام حسەین واژۆکرا، باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی (جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد) شکستی هێنا. هەندێ لە پاشماوەکانی ئەو باڵە و کەسە چەپ و مارکسی و ماویەکان و ڕەخنەگرانی سیاسەتی مەلا مستەفا، لە ناوەڕاستی ساڵی ۱۹۷۰ دا ڕێکخراوێکیان دروستکرد بە ناوی (کملك)، یەکێ لەو دامەزرێنەرانە شەهابی شێخ نوری بو. دواتر لە سەرتای مانگی ۱۱ ی ۱۹۷۸ لە کۆبونەوە فراوانەکانی (کملك)

لە گوندی شێنێ لە ناوچەی سەرکردایەتیی (ینک) بە زۆرینەی دەنگ ناوی (کملک) گۆڕدرا بۆ (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردوستان – کۆمەڵە. دوای شکستی شۆڕشی ئەیلول، لە لایەن سەرکردە سیاسی و سەربازیەکانی (پدک):عەلی عەسکەری و ساڵح یوسفی و مولازم تایەری عەلی والی و ڕەسوڵ مامەند و... (بزوتنەوەی سۆشیالیستیی کوردوستان - بزوتنەوە) دامەزرێنرا. لە ڕۆژی ١ ی ٦ ی ١٩٧٥ دوای سێ مانگ لە ئاشبەتاڵی شۆڕشی ئەیلول، لە دیمشق بەیانی دامەزرانی یەکێتیی نیشتمانی کوردوستان لە لایەن جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانیان دەرچو. هەر لە سەرەتای دروستبونی (ینک)، کۆمەڵە و بزوتنەوە بونە دو کۆڵەکەی ڕاگری(ینک).

ئەو کاتەی من وەک پزیشک لە سلێمانی دامەزرام، ڕۆژگاری خەباتی مان و نەمانی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانی بو، گەرمەی خەباتی نهێنیی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە بو لە ناو شارەکان. لەو ڕۆژانەی سەرەتای کارکردنم بو وەک پزیشک کە یەکەم جار لە نزیکەوە ناو و خەباتی کۆمەڵە م بیست و زانیاریم لەسەر کۆکردەوە. خەباتی چینایەتی و کوردایەتی لە سەر ڕێبازی سێ ڕابەرە لە سیدارەدراوەکەی کۆمەڵە: (شەهابی شێخ نوری و ئەنوەر زۆراب و جەعفەر عبدالواحد(، لە ژێر دروشمی (کەم بژی و کەڵ بژی) ی ئەو سێ ڕابەرە ویردی سەرزمانی گەنجانی شۆڕشگێڕی سەر بە کۆمەڵە بو.

## پەپولەیەك

ئەو ڕۆژانـە لە دورەوە کەسێکم ناسی کە ناوەکەی وەک ئەفسانە لە ناوەندە سیاسی و ڕۆشنبیریەکانی ناو سلێمانیدا هاتوچۆی دەکرد، ئەو کەسە (شاسوارجەلال) ی ناسراو بە (ئارام) بو. ئارام لە ڕۆژی ٣١ ی ١ ی ١٩٧٨ لە دێی (تەنگیسەر) ی قەرە داخ شەهید کرابو. ئارام برینە کاریگەرەکانی هێشتا خوێنیان لێدە چۆڕا و سارێژ نەبوبون.

سەیر بو! شاسوار پیاوێکی باریکەلەی باڵا ناوەندی چاویلکە لەچاوی بێوەی و لێبوردە و ئارام بو، ئەو پەپولەیەک بو بۆخۆی. کەچی ڕۆحەکەی و ئیرادەکەی و بوێری و بیروبڕواکەی، تەنانەت دوای شەهیدبونیشی، نائارامی و ترسی خستبوە ناودڵی ڕژێمێکەوە کە خاوەنی هەمو ئامێر و دەسگاکانی کوشتن و برین بو. لەو

ڕۆژانەدا کۆمەڵە و (ینک) شۆڕە سواری بێ ڕکابەری مەیدانەکە بون، ئەوان بوبون بە ڕوگە (قبیلە) ی ئاواتی هەمو ئەوانەی هێشتا برینی (ئاشبەتاڵ) لە ڕۆحیاندا خوێنی لێدەتکا. دەتوانم بڵێم لە ساڵانی ١٩٧٦ بەدواوە سلێمانی لە لوتکەی خۆڕاگریی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و پێشمەرگانەدا بو دژی ڕژێم. سەدام خۆی ئەم ڕاستییەی بۆ دەرکەوتبو، بۆیە لە یەکێ لە وتارەکانیدا وتی: سلێمانی شارێکی سەخت و قورسە (السليمانية مدينة صعبة).

## کە بڕیارت لە دەست خۆتا نەبو !

(حشع) بە ئامۆژگاریی یا دورنیە بە فەرمانی ڕاستەوخۆی یەکێتیی سۆڤێت لە ١٧ ی ٧ ی ساڵی ١٩٧٣ چوە بەرەیەکی سیاسی لەگەڵ حیزبی بەعس، لە سەر کاغەزهێشتا بەرەکە مابو و دو وەزیریشی لە ناو حکومەتدا هەبو: موکەڕەم تاڵەبانی و عامر عەبدوڵا، بەڵام لە سەر زەوی ئەندام و کادیرەکانی خوارەوەی کەوتبونە بەر شاڵاوی گرتن و کوشتنی ڕژێمەوە. لە سوپای عێراقدا دەیان ئەفسەری سەر بە (حشع) گولەباران کران. ئەندامانی پاک و دڵسۆزی(حشع) بە پەشیمانی و ناکامیەوە وردە وردە خەریکبون لە ڕژێم دوردەکەوتنەوە، هەندێکیشیان دەچونە شاخ و دەبون بە (پ. م). دوای ئاشبەتاڵ ئیتر ڕژێمی بەعس ئیشی بە حیزبی شیوعی نەمابو. دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ مەلا مستەفای بارزانی لە ئەمریکا مافی پەنابەریی وەرگرت و لەوێ جێگیر بو. سەرکردەکانی (پدک) ی سەر بە بنەماڵەی بارزانی (قيادە موءقەتە - سەرکردایەتیی کاتیی پدک) یان دروست کرد. (ئیدریس و مەسعود بەرزانی) لە شاری (کەرەج) ی ئێرانەوە، لە ژێر سایەی قورس و دزێوی ساواک و حەمە ڕەزا شاوە (سەرکردایەتیی کاتیی پدک) یان دەبردبەڕێوە. لەوانەوە هیچ نوزە و هەواڵی چالاکیی گرنگی دژ بە ڕژێمی سەدام لە ناوەوەی کوردوستان نەبو.

## هەوڵێکی سەرنەکەوتو

چوبوینە ساڵی ١٩٧٩ وە، بیستبوم (مستەفا چاوڕەش) فەرماندەی هەرێمی پێنجی قەرەداخە و کادیرێکی پێشکەوتوی کۆمەڵە یشە، ئەو هاوڕێ و باوڕپێکراوی مەلا ڕەئوف و حسەینی برام بو. (مەلا ڕەوف) (پ.م) و تێکۆشەری دێرینی (حشع) بو،

وازی له (حشع) هێنابو، کۆنه هاورێی مستەفا چاوڕەش بو له (حشع – باڵی قیاده مەرکەزی)، وامدەزانی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی به مستەفاوه هەیه. ویستم ڕاستەوخۆ له ڕێی (مەلا ڕەوف) ی بەئەزمون و دۆستی باوەڕپێکراوی خێزانەکەمانەوه پەیوەندی به (مستەفا چاوڕەش)ه وه بکەم، بۆ ئەوەی له ڕێی ئەوەوه پەیوەندی به ڕێکخراوی نهێنیی کۆمەڵه بکەم. بۆم دەرکەوت مەلا ڕەوف نه بڕوای به کۆمەڵه و نه بڕوای به هەڵگیرسانەوەی شۆڕش هەبوله ژێر سەرکردایەتیی جەلال تاڵەبانی دا. ئەو ڕاستگۆیانه وتی: "بمبوره ناتوانم ئاسانکاریت بۆ بکەم بۆ شتێک که خۆم بڕوام پێی نەبێت"، پەیوەندیەکەم بۆدروستنەبو وهەوڵەکەم سەرینەگرت.

## خولیاکەی منداڵی!

دوای ئەم هەوڵه سەرنەکەوتوەم، ئیتر کەسێکم نەدەناسی بزانم لەسەدا سەد ئەندامی کۆمەڵه و ئەوەنده بڕواپێکراوه که دڵارام و ئەرخەیان پەیوەندیی پێوەبکەم و له ڕێی ئەوەوه به ڕەسمی بچمه ناو کۆمەڵه وه. ترس له ئاشکرابون و خەبەرلێدان لای ڕژێم، ترس لەوەی ئەندامێکی گیراوی کۆمەڵه له ژێر ئەشکەنجەدا ناوی هاوخەباتەکانی بۆ ڕژێم ئاشکرا بکات، ترس له وەی خۆم وەک ئەندامێکی کۆمەڵه ئەگەر گیرام و بەرگەی ئەشکەنجەم نەگرت و ناوی هەڤاڵه هاوخەباتەکانم بۆ جەللادەکانی ڕژێم ئاشکرا بکەم، هەمو ئەم ترسانه و زۆر ترسی تریش گەیاندمی بەو بڕیارەی هەوڵی تر نەدەم بۆ پەیوەندی کردن به کۆمەڵەوه. بەڵام له ناخی دەرون و ویژدانمدا، بۆ خۆم و بێ ئەوەی لای هیچ کەس باسی بکەم، بڕیارم دا دوای کۆکردنەوەی زانین و ئەزمونی پراکتیکیی پزیشکی بەگشتی و هی نەشتەرگەری بەتایبەتی، ئینجا بچمه شاخ و ببمه پێشمەرگه، بۆ ئەوەی بتوانم وەک پزیشکێکی به ئەزمون خزمەت بکەم له شۆڕشدا. سەیر بو! که ئەم بڕیاره ناوەکیەم دا، ئارامی و هاوسەنگیەکی باشم بۆ دروستبو بەرامبەر هەمو پەستان وگوشینەکانی ڕژێم.

## نەخۆش وەك شایەت!

که من پیشەی پزیشکیم هەڵبژارد پاڵنەری سەرەکیم خزمەتکردنی ئینسان بو، به تایبەتی ئینسانه نەدار و دەسکورت و داماوەکانی کۆمەڵ، که دەمزانی چەند زۆرن!

بۆیە لە نەخۆشخانە کان زۆر بە دڵسۆزی و لێبڕاوی کاری پزیشکیی خۆمم دەکرد. دەمتوانی لە ماڵی پزیشکان بخەوم کە پەنجا مەترێک لە شوێنی ئیشەکەمەوە دور بو، بەڵام ئەو شەوانەی ئێشکگربوم لە نەخۆشخانەی فریاکەوتن، بۆ ئەوەی دەمودەست بێ دواکەوتن بچمە سەر نەخۆش و فریای بکەوم، بە جلە سپیەکانم و سەماعە و لایتە کەمەوە لە سەر جێی تێڕوانینی نەخۆش (کاوچ) ڕادەکشام و دەخەوتم. نەخۆشخانەی فریاکەوتن بە هۆی زیرەکی و دڵسۆزی و ماندونەناسیم لە کارکردندا وەک دوکتۆر (سوپاس و پێزانین) ی پێدام.

جارێک کرێکارێکیان هێنا کانە بەرد بە سەریا ڕمابو، ئێسکی ڕانی و چەند ئێسکێکی تری شکابون و ژیانی لە مەترسیدا بو، بۆیە تا خوێنیان بۆ ئامادەکرد شلەخۆراک م بە لولەی خوێنهێن بۆ دانا و خۆم لەگەڵی چوم بۆ گرتنی وێنەی تیشکیی چەند شوێنێکی. بەڵام کەسی لێپرسراو بێ هیچ هۆیەکی زانستی کارەکەی نەکرد. منیش خۆم پاڵمنا بە دەستەبەرە تایەدارەکە و نەخۆشەکەم هێنایەوە قاوش، چەند بوتڵێ خوێنم تێکرد و دواتر بە باشی چارەسەرمان کرد. دواتر سکاڵام لای بەڕێوەبەری نەخۆشخانە دژی کەسە کە تۆمارکرد. ڕۆژی بەرەوڕوبونەوە لە بەردەم لیژنەی لێکۆڵینەوە، برینداره‌کە و چەند نەخۆشێکی تر بە شەلە شەل و بە گۆچانەوە لە بەردەم لیژنەکە شایەتیی دڵسۆزیی منیان دا وپشتگیریی منیان کرد، کەسەکە سزای خەمساردی و کەمکاریی خۆی وەرگرت.

## بێلایەنی درۆیە!

من وەک دوکتۆرێکی گەنجی پڕوزەی بە کەف و کوڵ بۆ مرۆڤدۆستی و کوردایەتی و خەباتی سۆشیالیستی، نەک هەر نەبوم بە بەعسی، بەڵکو بێلایەنیش نەبوم! ئەگەر کەسێک لەو هەل و مەرجەی من کارم تێدا دەکرد، سەری کزبکردایە و بێلایەن بوایە، ئەو هێشتا هەر بێلایەن نەبوە، بەڵکو لە پێش هەمو لایەنداریەکی تر لایەنداربوە بۆ ژیان و سەلامەتیی خۆی و کەسە نزیکەکانی، ئەمە مافی ڕەوای خۆیەتی و زۆرینەی خەڵکیش هەر ئاوان. بەڵام ئەو کەسە هەر لە ناخی ویژدانی خۆیدا لایەنداریەکی سیاسیی گشتیی هەبوە، بەس لە ترسی سزای قورسی ڕژێم دەرینەبڕیوە. هەڵوێستی ڕۆژانەم لە کاتی کارکردندا وەک دوکتۆر، هەروەها قسەکانم لە ناو نەخۆشخانەکاندا کە کارم تێدا دەکردن، هەموی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە دژی ڕژێم و لایەنگرەکانی بو. تەنیا وەک نمونە چەند ڕوداوێکتان بۆ باس دەکەم:

## ماستاوچییەکان بە دەوری دەسەلاتدا!

گەورەکارمەندێکی بەعسیی کورد لە بەڕیوەبەرایەتیی تەندروستیی سلێمانی (ج.م) بە ئۆتۆمبیلەکەی پیاوێکی داماوی کرد بەژێرەوە. بەرێکەوت من ئێشکگر بوم، دەمودەست خەواندم و بۆ دڵنیایی ئەوەی نەوەک شکان یا لەجێچون یکی هەبێ، وێنەی تیشکیی دەست و لاقیم گرت. لە چاوەڕوانیدابوم دوکتور (ئەدواردۆ) ی کۆبایی، کە پسپۆڕی ئێسک و جومگە بو، بیت و بە ڕاوێژ لەگەڵ ئەو چارەسەرێکی بۆ دابنێین. ئەوەندەم زانی یەک لە دوای یەک هەندێ لە کارمەندانی بەڕیوەبەرایەتیی تەندروستی دەهاتن و داوایان لێدەکردم نەخۆشەکە بنێرمەوە ماڵەوە. من نەمدەزانی یاسایەکی عێراقی هەیە کە ئەگەر کەسی بریندار لە نەخۆشخانە مایەوە ئەوا دەبێت ئەو کەسەی هۆی بریندارکردنەکەیە بگیرێ و بخرێتە زیندان بۆ لێکۆڵینەوە لە گەڵی. منیش وەک ئەرکی ویژانیی پزیشکی نەمدەویست بەبێ ڕاوێژ بە دوکتوری پسپۆڕ نەخۆشەکە دەربکەم. کە ماستاوچی و بەعسیەکان بۆیان دەرکەوت من داواکەیان قوبوڵ ناکەم، ئینجا چونە لای خودی نەخۆشە داماوەکە و هانیان دا لە سەر بەرپرسیارێتیی خۆی بچێتەوە ماڵەوە، جا تەماشاکە! (شەفیقە قادر) یاریدەدەری دوکتور بو، زۆر دڵسۆز و زیرەک و لێهاتو بو، دواتر بۆم دەرکەوت ئەم خوشکە زۆر بەڕیزە پەیوەندیی هەبو بە کۆمەڵە وە، شەفیقە بە ئەسپایی لە پەناوە پێی وتم:»مەسەلەکە ئەوەیە (ج.م) نەچێتە زیندان، بۆیە ئەم کەسانە تۆیان ئاوا خستۆتە ژێر پەستان و گوشین«. کە ڕاستیەکەم بۆ دەرکەوت ئەوەندەی تر سورتربوم لەسەر هەڵوێستی پزیشکیی خۆم، ئەو هەڵوێستەم ئێستا پاڵنەری سیاسی - نیشتمانیشی چوەسەر. من داوای نەخۆشەکەم قوبوڵ نەکرد لە دژی ئامۆژگاریی پزیشک بڕواتەوە ماڵەوە. ئینجا بە خۆم و وێنە تیشکیەکانی نەخۆشەکەوە چوم بۆ لای دوکتۆر (ئەدواردۆ) لە ماڵی پزیشکان، تازە لە خۆشتن دەهاتە دەرێ و سەری وشکدەکردەوە. بە وردی باسی نەخۆشەکەم بۆکرد و وێنە تیشکیەکانیم پیشاندا، پێم وت ئەگەر کەمترین هۆ هەیە بۆ مانەوەی لە نەخۆشخانە ئەوا با بیهێڵینەوە ! (دوکتۆر ئەدواردۆ) نەیدەزانی من بۆچی ئاوا سورم لەسەر مانەوەی نەخۆشەکە لە نەخۆشخانە هەتا ڕونکردنەوە و چارەسەرکردنی تەواوی،ئەو خۆی گۆڕی و بەیەکەوە چوینە لای نەخۆشەکە. دوکتۆر (ئەدواردۆ) تێڕوانینی بۆ نەخۆشەکە کرد و پێی وتم پێویست بە مانەوە ناکات و دەتوانێ بێ هیچ کێشەیەک لە نەخۆشخانە دەربچێت. منیش بە ویژدانێکی ئاسودەوە ئینجا نەخۆشەکەم نارەدەوە ماڵەوە.

## ئەجەل و قەدەر و ڕۆژتەواوبون ؟

جارێک کوڕێکی ٢٠ ساڵەی شارەزوری بە ناوی (کاوە) (دوکتور غازی پاسەوان - غ.پ) عەمەلیاتی ڕیخۆڵەکوێرەی بۆ دەکات، (کاوە) بەیانی زوی ئەو شەوەی عەمەلیاتەکەی بۆ کرابو بەهۆی خوێنبەربونی ناوەوە مرد. بەڕێکەوت من دوکتۆری ئێشکگربوم، زۆرم پێناخۆش بو و خەفەتم بۆ خوارد. ئەم (غ.پ) ە پێشتریش هەڵەی زۆری کردبو، بەلام تورکمانێکی نزیک لە ڕژێم بو، بۆیە کەس پێی نەدەوێرا. گومانم کرد کە هەڵەیەکی پزیشکیی گەورەی کردبێ بۆیە (کاوە) مردوە. چومە لای (دوکتۆر عەبدولڕەحمان ڕیس) ی میسری کە بەڕیوەبەری نەخۆشخانەی فریاکەوتن بو، داوام لێکرد جەستەی (کاوە) توێکاری بکرێ تا ڕاستیمان بۆ دەربکەوێ و بزانین بۆچی مردوە. من خۆم لە نەخۆشخانەی فێرکاری کارم دەکرد، بەلام دەمزانی ئەگەر بڕۆم ئەوا ناهێڵن توێکاریە کە بکرێ، بۆیە لە فریاکەوتن مامەوە. خزم وکەسی (کاوە) بە هاندانی (غ.پ) و ماستاوچیەکان دەپاڕانەوە لێم جەستەی کاوە توێکاری نەکرێ و لێگەڕێم بێ توێکردن بە دەستلێنەدراوی بیاندەمەوە. کار بەوە گەیشت مەلای گوندەکەیان بۆ هێنام، ئەویش بە بەڵگەی ئاینیی (ئەجەل و قەدەر و ڕۆژتەواوبون) زۆر هەوڵی لەگەڵ دام، بێهودە بو. مەسەلەکە بۆ من هەم ویژدانی بو هەم زانستی، ئاخر مرۆڤێک لە تافی لاویدا بە عەمەلیاتێکی سادە و بچوکی وەک ڕیخۆڵە کوێرە بۆ بمرێ؟ (دوکتور عەبدولڕەحمان ڕیس) کە زانیی وازناهێنم، خۆی توێکاریەکەی کرد و دەرکەوت خوێنبەری ڕیخۆڵەکوێرەکە نەبەستراوە یا زۆر شل بەستراوە و بووەتە هۆی خوێنبەربونی بەردەوام بۆ ناو ناوسکی تا مردنی نەخۆشەکە. لیژنەی لێکۆڵینەوە دانرا بۆ (غ.پ) و (دوکتۆر م.ع) کە پزیشکی نیشتەجێی دێرین بو و یاریدەدەری (غ.پ) بو لە عەمەلیاتەکەدا. سەیر بو! لە بری ئەوەی (غ.پ) سزای توند بدرێ، (دوکتۆر م.ع) کە کورد بو سزادرا و لە سلێمانی دورخرایەوە. دوای چەند ساڵێک (غ.پ) بە هۆی ئەوەی بە مەی خواردنەوە ڕاهاتبو مرد.

هەندێ جار من و پزیشکی نەشتەرگەر(دوکتۆر نەوزاد ساڵح ڕەفعەت کاکەیی)، کە دواتر بوبە ئەندامی پەرلەمانی عێراق، بەدەم کارکردنەوە دەردی سیاسیی ناودڵمان بۆ یەکتر دەردەبڕی. من زۆربەی شیعرە نەتەوەییە ئاگرینەکانی (عەبدوڵا پەشێو) م لەبەر بو، جار جار کە بە تەنیا دەبوین، هەندێ لەو شیعرانەم بۆ دەوتەوە، زۆری

پێخۆشبو. من دەمزانی کە د.نەوزاد پیاوێکی نیشتمانپەروەری دڵسۆزە، هەروەها دەیشمزانی کە پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بوە و خزمەتی زۆری کردوە. ئەو منی بە تەواوی دەناسی، بۆیە زۆرتر گوێی دەگرت و زۆر باسی سیاسیی لەگەڵ من نەدکرد، مافی خۆی بو و لێی تێدەگەیشتم.

## دوکتۆر عومەر محەمەد شەریف ژاژڵەیی

لەو ڕۆژانەدا یەکێک لە و دوکتورانەی زۆر بەخۆشحالیەوە کاری پزیشکیم لەگەڵ دەکرد دوکتۆر عومەر محەمەد شەریف ژاژڵەیی بو. د.عومەر هەم لە ڕوی زانستیەوە هەم لە ڕوی نیشتمانپەریەوە شایەنی یادکردنەوە و باسکردنە. ئەو پزیشکی نیشتەجێی دێرین بو لە بەشی هەناوی، دڵسۆز و دۆستی خەڵک بو، ئارام و هاوسەنگ و بنجداکوتراو بو. بەشی یەکەمی دوکتورای بەریتانیا (MRCP) کە هەر لە عێراق دەکرا بەسەرکەوتویی تەواوکرد، بۆ تەواوکردنی بەشی دوهەم دەبوایە بچێت بۆ بەریتانیا. بۆ ئەوەی حکومەت ڕێگەی بدات بچێت بۆ بەریتانیا دەبوایە واژوی بکات کە بەعسیە. کابرای عەرەبی بەرپرسی بەعس تەنیا داوای واژوەکەی لێدەکات وهیچ پابەندیەکی تری لێی ناوێ، بەڵام دوکتۆر عومەری جوامێر و بەهەڵوێست داواکەی قوبوڵناکات و بەهۆی ئەو هەڵوێستە ئازایانەیەوە خوێندن و بڕوانامەی زۆر بەبەهای (MRCP) کە هەمو دوکتورێک خەونی پێوە دەبینێ دەکاتە قوربانی هەڵوێستی ویژدانی و نیشتمانیی خۆی. دوکتۆر عومەر دواتر لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا خۆی گەیاندە بەریتانیا و لەوێ بڕوانامەی (MRCP) ی وەرگرت و بە ئاواتی خۆی گەیشت و وەک دوکتورێکی سەرکەوتو لە لەندەن جێگیر بو.

## حەمە ئاوات سدیق عەبابەیلێی

لە سەردەمی ڕژێمی سەدامدا دەسگا جاسوسیەکانی رژێم فایلی بۆ زۆرکەسی وەک من کردبۆوە. وەک خوێندکارلە کۆلیجی پزیشکی کارنامەکەم دژی بەعس بو، لە هەمو بنەماڵە پڕ لق و پۆپەکەماندا بەعسیەکی یا هەر کەسێکی سەربە ڕژێمی تێدا

نەبو. لەبەر ئەو هۆیانە و هەڵویستەکانم هەر زو کەوتمە ژێر چاودێریی جاسوسە چاوبزەکانی ڕژێم و کەوتمە ژێر گوشین و پەستانی دەسگا ئەمنیەکانی. ئا لەم کاتەدابو کەسێکی سەر بە دەسگای ئاسایشی ناو بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی سلێمانی (ئە.خ) لێپرسینەوەی لەگەڵ کردم لەسەر ئەوەی من وەک دوکتۆرێک زۆر بەدەور و خولی (حەمە ئاوات سدیق عەبابەیلێی) دا هاتوم و یارمەتیم داوە لە سارێژکردنی برینە کاریگەرەکانی و هێوردکردنەوەی ئێش و ئازارە قوڵەکانی.

حەمە ئاوات (پ.م) و کادیری کۆمەڵە بو، لە شەڕی (پدک) لە گەڵ (ینک) لە شوێنێک بە ناوی (کانی ژەنان) لە بناری چیای (بێزەل) لە ناوچەی (تاوگۆزی) ی سەر بە هەڵەبجە، بە سەختی بریندار کرابو. دوای چەند ڕۆژێک لە تیمارکردنی بە نهێنی، کە ئیتر برینەکەی هەودەکات و هەڕەشە لە ژیانی دەکات، خزمەکانی لە بری مردن بەهۆی برینە کاریگەریەکانیەوە لە ناچاریدا ڕادەستی ڕژێمیان کردبۆوە لە هەڵەبجە. (ئە.خ) هەڕەشەی لێکردم کە ئیتر نابێت ئەوەندە نزیکی حەمە ئاوات ببمەوە. بێگومان من بەردەوام بوم لە خزمەتکردنی، بەڵام وتووێژە سیاسیەکانم لەگەڵی تۆزێ کەمکردەوە.

## لە خۆی بپرسین بۆ!

دوکتۆر ئومێد مەدحەت موبارەک یەکێ بو لە دوکتۆرە زیرەک و سەرکەوتوەکان. پیاوێکی قۆز بو، هاوژینەکەی دوکتۆرە ناسکەی پسپۆڕی نەخۆشیەکانی ژنان و منداڵبون بو، ئەمیش دوکتۆرێکی سەرکەوتو و خزمەتگوزار و خۆشەویستی خەڵک بو.کە لە مانگی ئازاری ١٩٧٤ شەڕ دەستییێکردەوە ئەویش وەک دەیان پزیشکی کورد چوە شاخ و بوبە (پ.م.). نازانم د.ئومێد چی و کێ کردی بە پیاوی ڕژێم؟ مەخابن! هەر لە سەرەتای کارکردنمەوە پەیوەندیم لە گەڵ دوکتۆر ئومێد گرژ و سارد بو، ئەو بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی فێرکاریی سلێمانی بو و یەکێک بو لە پیاوە دڵسۆزەکانی ڕژێم لە بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی سلێمانی. وام هەست دەکرد دوکتۆر ئومێد خاوەنی کەسێتیەکی زۆرزان، نهێنکار و کینە لە دڵ، پیلانگێڕو خۆپەرست بێت. مەزەنەکەم ڕاست دەرچو، ئەوە بو دواتر کرا بە وەزیری تەندروستی لە ڕژێمەکەی سەدام دا و هەر بە وەزیری مایەوە تا ڕوخانی ڕژێم.

له سەر بەعسی بونەکەی من ڕیزم لێ نەدەگرت و بۆ کاری زۆر پێویست نەبوایە نەدەچوم بۆلای. بە گشتی خۆمم لێدەپاراست و خۆمم بەدور دەگرت لێی. بەڵام خواهەڵناگرێ ئەویش خۆی لە من لادەدا و بەهیچ جۆرێ بە ئاشکرا و ڕوبەڕو پەستان و گوشینی نەدەخستە سەر من، بە مەزەنەم ئەویش دەترسا لەوەی من پەیوەندیم بە (پ.م) وە هەبێت.

لەو نزیک ساڵەم دا وەک دوکتۆری نیشتەجێ کارکردنم زۆر پێخۆشبو. لە بەشەکانی فریاکەوتن و هەناوی و منالان و ژنان و منداڵبون بە دڵ کار و خزمەتی خەڵکم دەکرد، ئەزمونی پراکتیکی و زانینی پزیشکیی باشم بەدەستهێنا.

## «منداڵەکان ئەی برسیە ژین تاڵەکان»!

لە کاتی کارکردنم لە نەخۆشخانەی مندالان لە چوارباخ، ماوەیەک منداڵی زۆرمان لە (ئۆردوگای شانەدەری) وە بۆ دەهات، لەو ئۆردوگایە خەڵکی گوندەکانی بناری سورێن و ناوچەی شلێر و پێنجوێنی تیادا کۆکرابۆوە. زۆرێک لە منداڵەکان بە هۆی سکچون و ڕشانەوە و کەمخۆراکی و بەدخۆراکیەوە هەتا دەگەیشتنە لای ئێمە دەمردن، ئەمە زۆر نارەحەتی دەکردم . بێ بیرکردنەوەی زۆر، داوایەکم نوسی بۆ بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی تەندروستیی سلێمانی کە تێیدا داوام کردبو بمنێرن بۆ (ئۆردوگای شانەدەری) بۆ ئەوەی لەوێ منداڵەکان ببینم و زو چارەسەریان بکەم و بەمە نەهێڵم ئەو هەموە منداڵە بمرن. داواکەم بردە لای (دوکتۆر جەمال حەماوی) ی بەڕیوەبەری نەخۆشخانە بۆ ئەوەی بۆم بەرزبکاتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی تەندروستی. پەیوەندیەکی زور خۆشم لەگەڵ د.جەمال هەبو، پیاوێکی زۆر دڵسۆز بو، کە شتێکی نەخۆشخانەکە خراپ دەبو، چاوەڕیی بەشی هونەریی نەدەکرد بێت چاکی بکاتەوە، بانگی دەکردم و پێکەوە دەکەوتینە چەکوش و گاز و پلایس کاری . دوکتۆر جەمال کە داواکەمی خوێندەوە، سەرێکی بادا و وەک برایەکی گەورەی دڵسۆز پێی وتم : « ئەمەی تۆ دەیکەیت مەترسیدارە چونکە بە ناڕاستەوخۆ تۆ جۆرێک لە ڕەخنە لە حکومەت دەگری، منیش حەزناکەم تۆ توشی کێشە بیت» . ئینجا د.جەمال بە بەرچاومەوە داواکەمی دڕاند و خستیە تەنەکەی زبڵی ژێر مێزەکەی . نیگەرانیەکەی ئەو لە جێی خۆیدا بو، بەڵام لە ڕستیدا من هیچ ئامانجێکی

سیاسیم نەبو، تەنها ئامانجە پزیشکیە ئینسانیەکە پاڵی پێوەنام ئەو داوایە بنوسم .
لە ڕاستیدا پێشنیازەکەم دەشیا و دەکرا و هیچی تێنەدەچو و ژیانی چەندین منداڵی لە مردن ڕزگار دەکرد، چونکە خزم و کەسی هەندێ لە منداڵەکان بە هۆی کەمیی ئۆتومبیل و دوریی ڕێگا و کەمیی ڕۆشنبیریی تەندروستی، کاتێک منداڵەکانیان دەهێنا بۆ لای ئێمە کە زۆر درەنگ بو و تازە نەمان دەتوانی ژیانی هەندێکیان ڕزگاربکەین. لەو سێ مانگەی کارکردنم دا بە هۆی ئەوەی ڕێژەیەکی باش لە منداڵە نەخۆشەکان زو چاکدەبونەوە و بەری ڕەنجەکەمان زو دەبینی، هەروەها بە هۆی ئەوەی من هەر لە بنەڕەتدا منداڵم زۆر خۆش دەوێ، حەزی ئەوەم لا دروستبو ببمە پسپۆڕی منداڵان، بەڵام ڕوداوەکانی دواتری ژیانم و جێگیربونم لە ئەڵمانیا نەیانهێشت ئەو حەزەم بەدیبێت.

## ئازادی ئازادی ئازادی

ئەوە ڕاستە منی پزیشکی بێ ژن و منداڵ ئەو موچە و دەرماڵەیەی وەرمدەگرت لە پێویستیە مادییەکانی ژیانی ڕۆژانەم ئەوەندە زۆرتر بو کە مانگانە بڕێکیم لێ لادەدا وەک پاشەکەوت. بەڵام منی مرۆڤ بەهەمان ئەندازەی پێویستیە مادییەکان پێویستیشم بە ئەرخەیانی و دڵنیایی لە سەر ژیانم هەبو کە دەبێت پارێزراوبێت لە هەر مەترسییەکی گرتن و کوشتن. هەروەها پێویستیشم بە ئازادیی جموجوڵ و بزوتن هەبو کە بتوانم بە حەزی خۆم و بێترس لە مۆرە و لە چاوی بزی جاسوسە زۆروزەوەندەکان بۆ کوێ بمەوێ بڕۆم. بەهۆی دژایەتیکردنی ڕژێمی سەدامەوە پەساپۆرتی عێراقی یان نەدامێ کە ئەوە سادەترین مافی هاوڵاتیە. جگە لەوانە ئازادیی بیروڕادەربڕین بێترسی سزا و لێپرسینەوە بۆ من وەک ئۆکسجین پێویست بو. هەندێ مرۆڤ خۆیان بە پێی کەسێتیەکەیان کەمدو و گۆشەگیر و بەڕوی دەرەوەدا داخراون. ئەم جۆرە کەسانە گرنگی نادەن بە ژیانی گشتی کە سیاسەت بەشێکی گرنگە لێی، بۆیە دەتوانن بێ ئەوەی ببنە پیاوی ڕژێم زیرەکانە بە ڕێگا و شێوازی جۆراوجۆر خۆیان لەگەڵ دەسگاکانی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان بسازێنن و دەست بە کڵاوی بێلایەنیی ڕواڵەتیانەی خۆیانەوە بگرن با ی سیاسەت و حیزبایەتی

کردن نەیبا. بێگومان ئەمانەش لە ناخی دەرونیاندا بێلایەن نین و زۆرینەیان لە پەنهانی دڵیاندا دژی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانن، بەڵام شەڕی پڕ لە مەترسیی ئەو ڕژێمانەیان پی ناکرێت، ئەم جۆرە کەسانە زۆرایەتیی خەڵک پێکدەهێنن و لە ئەڵمانیا وەک پەسن و پیاهەڵدان پێیان دەڵێن (هونەرمەندانی مانەوە). مەبەستی ئەم چەمکە ئەوەیە کە ئەو جۆرکەسانە بە ئازادی ناژین بە واتا فراوان و قوڵ و ڕەنگاوڕەنگەکەی ژیان، بەڵکو هەر ئەوەندەیە کە دەژین و لە ڕوی جەستەییەوە بە زیندویی دەمێننەوە، چونکە ژیانی ڕاستەقینە ئەوەیە مرۆڤ ئازادبێت و وەک ئەسپی عەرەبانە لەغاونەکرێ و ناچاریش نەبێ خۆی خۆی لەغاوبکات، ئەم بابەتە ئەم بەسەرهاتەم دێنێتەوە یاد:

پیاوێکی قسەخۆش لە مەجلیسی مامۆستایەکی ئاینیی بەڕێز و شکۆدار دانیشتوە، کابرایەکی بەعسیش خۆی دەکات بە ژورا و لە جێیەکی ژورەکەدا دادەنیشێ. پیاوە قسەخۆشەکە بە چپە بە هاورێکەی تەنیشتی دەڵێ: «بە هاتنی ئەمناموبارەکە ئێستا ئیتر نەک هەر کۆم مان بەڵکو دەبێ دەمیشمان بگرین».

کەسێتیی پڕوزە و کراوە و خۆدەربڕی وەک من، بەهیچ جۆرێ نەدەسازا و نەدەگونجا لەگەڵ ئەو ژیانە لە سایەی ڕژێمێکی جاسوسی و دیکتاتۆریی وەک ڕژێمی سەدام. هەستم دەکرد لە نەخۆشخانە لە ژێر چاودێریی ورد و بەردەوامی پیاوەکانی ڕژێم دام ، هەستم دەکرد وردە وردە بازنەی پەتی ڕژێم بە دەوری گەردنمدا تەنگ و تەنگتر دەبۆوە و نیگەرانی و ترسەکانم زۆرتر دەبون. بەڵام وادیاربو من هەر لە ژێر چاو و چاودێریی بەد و گوماناویی دەسگا ئەمنیەکانی ڕژێمدا نەبوم، بەڵکو لە ژێر چاودێریی دڵ و هۆش و چاوی وریا و میهرەبانی (سۆیبەخان) ی دایکیشم بوم. دایکم ژنێکی زۆر زیرەک و وریا و ئازا و خاوەن کەسێتیەکی بەهێز بو.

## دەتەوێ لە بەرچاوت بزربم؟

لەگەڵ هاورێکانمدا هەر یەکدوهەفتە جارێک لە کاتی پشودا یەک دو شوشە بیرە م دەخواردەوە و بە ئازادییەکی تێکەڵ بە ترسەوە دەردی دڵمان بۆ یەکتر دەردەبڕی. شەوێک بە برێک سەرگەرمیی دوای مەی نۆشینەوە، غەمبار و بێزار و وەڕس لە دۆخەکە، گەڕامەوە ماڵەوە. دایکم بە نیگەرانیەوە پێی وتم: 'ڕۆڵە چەند ڕۆژێکە

دەتبینم زۆر نائارام و بێزار وبێتاقەتی، چیتە پێم بڵێ؟". بێ بیرکرنەوە یەکسەر پێم وت "دایە گیان لە دەست ستەم و زوڵمی ئەم ڕژێمە ژیانم نەماوە، دەتەوێ لەمەودوا هەمو ئێوارەیەک بە سەرخۆشی بێمەوە لات؟ یا دەتەوێ لەپڕ لە بەرچاوت بزربم و لە یەکێ لە زیندانەکانی ڕژێمدا بمکوژن و لاشەکەشم نەبینیتەوە؟ ". سۆییبەخانی شێرەژن کە شایستەی هەمو ڕازدرکاندن و باس و خواسێک بو، بێدودڵی و بێترس وتی نەخێر کوڕم هیچیانم ناوێت. منیش ڕەپ و ڕەوان پێموت: "دە دەچمە شاخ و دەبمە پێشمەرگە". خورپەی قسەکەم ئەو ژنە زۆر بەهێزەی تاساند و نەیتوانی بڕوا بە گوێکانی بکات، بۆیە هیچ کاردانەوەیەکی تری پیشان نەدا.

## ڕێکخستن و نەخشە نیوەی ژیانە !

دوای چەندڕۆژێ لەم وتووێژە کورت و چارەنوسسازە، دەستم کرد بە پیادەکردنی ئەو نەخشەیەی پیش چەند هەفتەیەک لە مێشکم دا کێشابوم. لە ڕۆژی ١ ی ٨ ی ١٩٧٩ وە بۆ دوڕوژ مۆڵەتی ڕەسمیم وەگرت نەوەک لە ڕێگە بمگرن و بڵێن بۆچی لە سەر کارەکەت نیت. لەو ڕۆژە بە ئوتومبیل خۆم گەیاندە دێی (ئەحمەدبرندە)ی نزیک جادەی دەربەندیخان، لەوێوە بە ئاسانی، بە یاوەری و کۆمەکی (عبدالکریم سعید عبدالله) کە باوکی ئامۆزام بو خۆمان گەیاندە دەریاچەی دەربەندیخان لە ئاستی دێی (گولان) لە شوێنێک بەناوی (پلەسپی)، ئەم شوێنە برێک لە دەست و چاوی پیاوەکانی ڕژێمەوە دوربو. عەبدولکەریم لە مێردمنداڵیدا بە لوغمی ڕژێم دەستێکی پەڕیبو، لە شۆڕشی ئەیلولدا پێشمەرگایەتیی کردبو، جەربەزە و نەترس بو، بۆیە بڕوای تەواوم پێی هەبو.

## ئومێد نابێت بمرێت !

هێشتا هەتاوی پاشنیوەڕوان بە ئاسمانەوە بو کاتێک لە گەڵ عبدالکریم سواری بەلەمە شڕی قاچاخچیەک بوین. بە دەریاچەی دەربەندیخانا بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردوستان (ئێران) کەوتینە ڕێ. ماتۆڕی بەلەمەکەمان لە ژێر قورسایی ئێمە و بەلەمەوان و کەلوپەلی قاچاخدا هەر تەکان تەکان و هەناسەبڕکێی بو، جارناجارێکیش ماتۆڕ دەخنکا و بە دەست دەمانخستەوە گەڕ. ترسی هێلیکۆپتەر مان هەبو بێتە سەرمان

و ئاگربارانمان بکات، بەڵام من لەم سەرچڵی و سەرکێشیەم دا لە ناخی دەرونم دا ئەم دروشمەم هەڵگرتبو: یا ئازادی یا نەمان، بۆیە کوژرانیشم بە بۆمباکانی ڕژێمی بەعس بەدور نەدەزانی و گوێم پێ نەدەدا. بەڵام من کەسێکی گەشبین و ژیاندۆستیشم و مەلە باش دەزانم، بۆیە جلەکانم داکەند و مایەوە سەر دەرپێ کورتەکەم. بۆ ڕەوشێکی ئاوا ئەگەر هێلیکۆپتەر بێتە سەرمان خۆمم ئامادەکرد بازبدەمە ناو ئاوەکە و هەوڵێکی خۆڕزگارکردنم بدەم! بە پێی یاسای عێراقی ئاوی بەنداوی دەربەندیخان لەو شوێنەی ئێمە پێیدا دەڕۆشتین هاتوچۆ پێیدا قەدەغەبو، کوشتنی کەسی یاساشکێن ڕێگەپێدراو بو. لە بەری ناوچەی (شەمێران) و(تاوگۆزی) ی ئاوەکەوە سوپای عێراق بەسەر شوێنەبەرزەکاندا خۆی دامەزراندبو، لە دژی تۆپە دورهاوێژەکانیان ئەگەر بیانبینینایە یا بیانویستایە؟ـ هیچ دەرفەتی ڕزگاربونمان نەبو! دوای نزیکەی سێ سەعات بە ئاودا ڕۆشتن گەیشتینە وشکانی.

ئەو شوێنە ی لێی دابەزین ناو کوردوستانی ئێران بو، کەوتبوە دامێنی گوندی (دڕۆڵـە) ی سەر بە شارۆچکەی پاوە. (دڕۆڵـە) دەکەوێتە نێوان چۆماوی (لێڵە) و (سیروان)، ئەم دو چۆماوە لەگەڵ چۆماوی (زمکان) کە لە ناوچەی جوانڕۆی ئێرانەوە دێت و (تانجەرۆ) کە بە پێینی سلێمانیدا تێدەپەڕێ، دەریاچەی دەربەندیخان پێکدێنن.

## بێ ڤیزا و بێ ناسنامە!

لە دڕۆلە چەند قاچاخچیەکی کوردی ئێران و عێراقمان بینی خەریکی کڕین و فرۆشتنی کاڵاکانیان بون. سواری دوای پیکابە شڕێک بوین و لە نێوان کەلوپەلی قاچاخدا جێمان سازکرد و پاڵمان لێدایەوە تا شەو گەیشتینە شاری (پاوە). لێرە لە ماڵە ناسیاوێکی عەبدولکەریم نانی ئێوارەمان خوارد و شەومان کردەوە. بەیانی عبدالکریم ماڵاوایی لێکردم و بەهەمان ڕێگەدا گەڕایەوە عێراق. ئەمە یەکەم جارم بو بێمە ئێران، بەتەنیا دو سەعاتیک بە ناو بازاڕی پاوەدا گەڕام و لە چایخانەکانی چاییم خواردەوە و لەگەڵ خەڵک کەوتمە دوان و پرسیارکردن لە سەر دۆخەکە. پاوە لە سەرەتای مانگی ٨ی ١٩٧٩ لە ڕوی سیاسیەوە بە سەر سێ بەرەی چەکداری ناکۆک دابەش بوبو: یەکەم: لاگیرانی دەوڵەتی ئێران کە تێکەڵەیەک بون لە کەسانی کۆنەپەرست و هەلپەرست و پیاوانی پێشوی ڕژێمی شا و کەسانێکی موسوڵمانی بێئاگا کە بە دروشمە ئیسلامیە درۆزن و بریسکەدارەکانی دەسەڵاتدارانی تازەی

ئێران خەپێنرابون. دوهەم: لاگیرانی حیزبی دیموکراتی کوردوستانی ئێران (حدکا). سێهەم: لاگیرانی کومەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردوستانی ئێران(کۆمەڵەی ئێران) کە تازە خۆی ئاشکراکردبو وهاتبوە مەیدانی خەباتەوە. یەکەم جار بو لە ژیانمدا شارێکی کوردوستانی ئێران ببینم. چەند خۆش بو ئەو ئازادییە ی هەستم پێکرد، ئازادانە هاتومەتە ناو پاوە، بە جادە و کۆلانەکانیدا دەگەڕێم بێئەوەی کەسێکی سەر بە دەوڵەتی داگیرکەر بە چاوێکی پشکنەری گومانەوە داوای ناسنامە و ڤیزام لێبکات! بەڵام داخەکەم ئەم دیمەنە سیاسیە ناکۆک و گرژ و ئاییندە نادیارە بڕێک لەو خۆشیەمی کەمکردەوە!

## هەر بۆ بینین

ئینجا پاوەم جێهێشت، هەر بۆ دیدەنی و گەشت، وەک ڕاکردویەکی زیندان، بە حەز و ئارەزویەکی گەرمەوە، بۆ بینینی خانەیەکی تر لە دڵی نیشتمانەکەم، خۆم گەیاندە شاری (کرماشان) و چەند سەعاتێ بە ناویدا گەڕام. ئینجا چوم بۆ) شوێنەواری تاقەوسان - بێستون) کە مەڵبەندی چیرۆکی شەیدابونی شیرین و فەرهاد ە. دوای بینینی شوێنەوارەکە، بەرە و باکور درێژەم بە گەشتە چەند ڕۆژیەکەم دا. بە شارەکانی (سنە) و(سەقز) و (بۆکان) تێپەڕیم و لە هەر یەکێکیان شەوێک لە ئوتێل دەمامەوە. هەر لە قەراغ شاری بۆکان پێش چونم بۆ ناوشار، بە تاکسیەک خۆم گەیاندە سەر گۆڕی گۆرانیبێژی مەزن (حەسەن زیرەک) لە سەر بەرزایی (ناڵەشکێن). زۆر خەمم خوارد بەوەی سەر گۆرەکەی و دەوروپشتەکەی بێنازبو، پڕبو لە توێکڵی گوڵەبەڕۆژە، من چاوەڕێ بوم ڕازابێتەوە بە گوڵ و سەوزایی و دیکۆرێکی جوانی شایستە بەو هونەرمەندە مەزنە!

## چەند سەیرە !چەند سەیر نیە !

کە گەیشتمە شاری (مهاباد)، کەش و هەوای سیاسی و ڕۆشنبیری وکۆمەڵایەتی لێرە زۆر ئازاد و کراوە و گەشبین و پڕلە چالاکی و هەژان بو. بیر و خەباتی نەتەوەیی کوردایەتی کەف و کوڵی دەکرد، هەستم کرد لێرە کوردی عێراق، بەتایبەتی لایەنگرانی (ینک) ڕێزێکی تایبەتیان لێدەگیرێ. چەند ئەزمونێکی خۆش و بەتام بو، لە

زیندانە گەورەکەی کوردوستانی عێراقەوە ئێستا هاتبیتە بەشێکی تازە ئازادکراوی نیشتمانەکەت، ژورێکی تری مالی دلە شەیداکەت! ئینجا بڕوانە چەند خۆشە، چەند سەیرە !چەند سەیر نیە ! کە دەبینی لە ئاستی تۆدا خاوە ن مال خاوەنی مالی خۆی نیە، بێ ئەوەی بتناسێ دەستت دەگرێ و دەتباتەوە مالەکەی خۆی و هەرچی خۆشە لە خواردن وخواردنەوە لە سەر خوانەکەی بۆت دادەنێ، لە وەلامی سوپاسی تۆدا خاوەن مال دەلێت (خوایشت ئەکەم، قابیلی تۆیە). کە بیر لەو گەشتە چەندرۆژیەم دەکەمەوە بە کوردوستانی ئێرانی تازە ئازادکراودا، واهەست دەکەم لە دۆخێکی مەستی و خوماری و ژێرئاگایی و نائاگایی دا بوم. هێشتا دەسەلات لە تاران جێی خۆی بە تەواوی نەگرتبو، کوردوستان پڕ بە سیەکانی هەوای پاک و سازگاری ئازادیی چیا سەرکەشەکانی زاگرۆسی هەلدەمژی. لەو ڕۆژانەدا کوردوستان دلی پڕوزە و ترپەی دلی هەمو ئازادیخوازانی ئێران بو. کوردوستان لە زولم و پۆخلیی سیخوڕەکانی ساواک و چەتە و ژاندارم و سەربازی داگیرکەران پاک کرابۆوە. هەزاران کوڕ و کچی چەپ و دیموکراتخوازی فارس و ئازەری و تورکمان و بلوجستانی پەنایان بۆ کوردوستان هێنابو. ئەمانە لە چوارچێوەی دەیان ڕێکخراوی سیاسی و ڕۆشنبیریدا چالاکیی سیاسیان دژی ڕژێمی خومەینی ئەنجام دەدا. ئەم ڕژێمە تازە دەسەلاتی دژە دیموکراتیی خۆی بە تەواوی بە سەر تاران و شارە گەورەکانی تری ئێراندا چەسپاندبو، بەلام هێشتا لە کوردوستان زۆر لاواز بو. چەند کورت بو ئەو ڕۆژانە، چەند تێپەڕ و کاتی بو ئەو خەونە خۆشە!

## دەسپێك: درۆ و فێل !

لە مهاباد ڕێکەوتی هیچ کەسێکی ناسیاو یا هاوڕیی کوردی عێراقم نەکرد. هەر بە پرسیار زانیاری ئەوەم وەرگرت سەرکردایەتیی (ینک) لە کوێیە و چۆن و بە چی بۆی دەچیت. بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ خۆم بگەیەنم بە بنکەکانی سەرکردایەتیی (ینک) لە نزیک سەردەشت، لە مهاباد سواری پاسێکی بچوک بوم کە بەرەو سەردەشت دەچو. ئەو کەسەی لە تەنیشتم دانیشتبو بە شێوە و جل و بەرگ و قسەکردنم هەستی کرد کوردی عێراقم، لێی پرسیم بۆ کوێ دەچیت و چ کارەیت. منی سەرخۆشی ئەو ئازادیەی کە بە بەجێهێشتنی عێراق بە دەستم هێنابو، بە سادەیی و بێ بەدگومانی وتم دوکتۆرم و دەمەوێ ببم بە (پ.م) لای (ینک). من کە لە سلێمانی بوم ئەوانەی لە

مەیدانی خەباتدا بون دژی سەدام و ڕۆژانە چالاکی شۆڕشگێڕانەیان دەکرد هەر (پ.م) کانی (ینک) و ڕێکخراوە نهێنیەکانی کۆمەڵە بون نەک هیچ حیزبێکی تر. لە ڕاستیدا بۆ خەڵکی ناوشار ئەگەر کەسێکی ئاسایی بێلایەن خۆی حیزبی نەبوایە یا زۆر نزیک نەبوایە لە کەسێکی حیزبی هەر نەیدەزانی کە جگە لە (ینک)، (پ.م) ی حیزبی کوردیی تریش هەن. منی پرلە تاسە و حەزی هەستانەوەی شۆڕش، ئاگاداری وردەکاریە ئەهریمەنیەکانی دۆخی ناوەوەی خەباتی چەکدار نەبوم، پەندێک هەیە دەڵێ (شەیتان لە وردەکاریەکاندایە). کەسەکە بێئەوەی ڕاستیی خۆیم پێ بڵێ وتی منیش (پ.م) ی کوردی عیراقم وئامادەم کۆمەکت بکەم و بتگەیەنمە لای (پ.م). بە سوپاسەوە قوبوڵم کرد، وردە وردە دەمەتەقێمان گەرمتر بو و بوینە جۆرێک لە هاوڕێ، ئەم کەسە ناوی (ش. ز.) بو، خەڵکی لای قەڵادزێ بو، نەخوێندەوارێکی شۆڕشدیدە بو! من ئەو زانیاریەم وەرگرتبو کە بۆ گەیشتن بە ناوچەی سەرکردایەتیی (ینک) دەبێت لە سەردەشت دابەزین و بە پێ بڕۆین. بەڵام (ش.ز) وتی لە خانێ (پیرانشەهر) ە وە زوتر خۆمان دەگەیەنینە ناو (پ.م)، منیش کە هیچ شارەزای جوگرافیای دابەشبونی (پ.م) لە ناوچەکەدا نەبوم، پێشنیازەکەیم پەسەندکرد. گوندەکانی ڕێگای نێوان سەردەشت و خانێ بەتایبەتی (میراوێ) کە بەسەر بەرزاییەکەوەیە گەلێک جوان و دڵڕفێن هاتنە پێش چاوم. گەیشتینە خانێ، لە ماڵێکی ناسیاوی (ش. ز.) نانمان خوارد و برێک حەساینەوە، ئینجا سواری جێبێک بوین و دوای نیوسەعاتێک ڕۆشتن بەسەر ڕێیەکی خاکیی ناخۆشدا ڕێگاکە کۆتایی هات و لە جێبەکە دابەزین. بە پێ درێژەمان بە ڕۆشتن دا هەتا دوای ماوەیەک گەیشتینە دەوارگەیەکی چەندماڵی بەناوی (مردواوێ)، لێرە چەند(پ.م) یەکمان بینی. لێرە (ش.ز.) پێی وتم با بچین بۆلای کاک (تایەری عەلی والی بەگ) و کاک (ڕەسوڵ مامەند)، منی برد بۆ ناو چادرێک کە دەستەیەک (پ.م) لە ژێریدا دانیشتبون لە ناویاندا دوانیان برێک بەتەمەنتربون، بە ڕەفتاریاندا مەزەنەم کرد دو کەسەکە ڕەسول مامەند و مولازم تایەربن. (ش.ز.) منی بەوان ناساند کە دوکتۆرم و هاتوم ببم بە (پ.م) ی (ینک). ئینجا ئەوانیشی بە من ناساند، پێشترناوی ڕەسوڵ مامەندم نەبیستبو، برێک نائارام و گرژ و بەدگومان هاتە پێش چاوم، بە ساردیەکەوە بەخێرهاتنی کردم. مولازم تایەر سادەتر هاتەپێشچاوم، برێک گەرمتر و دۆستانەتر چاکوچۆنیی لەگەڵ کردم، لە دورەوە ناوم بیستبو، کە بنەماڵەی خۆمانم پێناساند ڕێزێکی تایبەتیی لێگرتم چونکە بنەماڵەی ئێمە و مولازم تایەر خەڵکی یەک ناوچەن و پەیوەندیەکی خزمایەتیی دێرینی نزیک وباشمان هەیە لەگەڵ یەکتر. لە ڕوی

حیزبایەتیەوە نە مولازم تایەر نە ڕەسوڵ مامەند خۆیان بە من نە ناساند کە لە کام حیزبن و بەرپرسیاریتیان چیە،هەروەها لە منیشیان نەپرسی بۆچی دەبیتە (پ.م) و چۆن وازت لە دوکتوری هێناوە و سەربە کام حیزبیت یا بۆ لای کام حیزب هاتوی، هەروەها لەو زانیاریە گرنگەی (ش.ز.) پێیدان کە من هاتوم ببمە (پ.م)ی (ینک) هیچ نەکۆڵینەوە و هیچ پرسیاریان لەسەری لێ نەکردم. دوای پشودان و پێکەوە نانخواردن، مولازم تایەر نامەیەکی نوسی و پیشانی ڕەسوڵ مامەندی دا و ئینجا دایە دەستی (ش.ز.) و پێی وت بمبات بۆ بنکەکەیان بۆ لای (دوکتۆر مەحمود عوسمان) و نامەکەشی بداتێ. نەمزانی مولازم تایەر لە نامەکەدا چیی بۆ دوکتۆر مەحمود نوسیبو، بە دەمیش هیچی پێنەوتم. هەستاین ومالآواییمان لیکردن.

## کەوێك لە قەفەزێکەوە بۆ ناو داوێك!

لەگەڵ (ش.ز.) بەڕێ کەوتینەوە و بە لای دێیەکی سی ماڵی تێپەڕبوین بە ناوی (دۆڵەتو)، ئەمە دوا گوندی گەورەی کوردوستانی ئێران بو لە نزیک سنوری قەڵادزێ، دۆڵەتومان جێهێشت و دوای نزیکەی کاتژمێرێک ڕۆشتن گەیشتینە شوێنێک بە ناوی (دراوی دۆڵەتو). ئەم شوێنە بە درەختی داربەڕو داپۆشرابو، لە دامێنی گردێکی ئەم شوێنەدا کە چەمێک بەلای خوارەوەیدا دەڕوات بنکەی سەرکردایەتیی حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردوستان (حسیک) ی لێبو. ئەم شوێنە دەکەوێتە نێوان گوندی دۆڵەتو و گوندی گۆرەشێر کە کەوتۆتە پشتی ئەم شوێنەوە و لە سەر سنورە بەرامبەر گوندی شێنێی کوردوستانی عێراق. لە ژێر چەند چادر و کەپرێکدا نزیکەی ٤٠ (پ.م) ی لێبو کە زۆربەیان عەشایری خەڵکی ناوچەی قەڵادزێ و ڕانیە بون. (ش.ز.) منی برد بۆ چادرێکی بچوک کە چادرەکەی (دوکتۆر مەحمود عوسمان) بو، نامەکەی مولازم تایەری دایە دەستی و بە کورتی منی پێناساند و خواحافیزیی لێکردین و ڕۆشت. بەم جۆرە (ش. ز.) سادەیی و بێئەزمونی و بێزانیاریبونی منی بە مەبەستی حیزبایەتی بەکارهێنا و ڕاستیی خۆی و نیازی حیزبیانەی خۆی لە من شاردەوە. ڕەسول مامەند و مولازم تایەریش بەهەمان شێوە کارەکەی (ش.ز.) یان تەواکرد و ڕادەستی دوکتور مەحمودیان کردم. د.مەحمودیش بە دەوری خۆی هەستا و وەک هاوپیشەیەکی من کارەکەی ئەوانی تەواوکرد و گەیاندیە ئەنجامی کۆتایی. من لەبری ئەوەی ببمە پێشمەرگەی (ینک) و ئەندامی کۆمەڵە، ئێستا کردمیان

به (پ.م) ی (حسیک). سەیر بو! ئەکتەرەکانی ئەم شانۆگەریە سیناریۆکەیان لەبەر بو، دەرهێنەری نەدەویست، لە زمانی یەکتری شارەزابون: زمانی سیاسەت و فرۆفێڵەکانی. ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە خۆمم وەک تۆپێکی فتبۆڵ یا باسکە دێتە پێشچاو کە یاریزانەکانی تیپێک، بە پاسی گونجاو بە یەکتری تۆپەکە سەرکەوتوانە دەخەنە ناو گۆڵی تیپی بەرامبەرەوە، بەڵام گۆڵەکە لەمەی مندا هی تیپی ڕکابەر نەبو بەڵکو هی خۆیان بو، (حسیک) بو! ئاوا من بێ ویست و نیاز و حەزی خۆم توشی حیزبێک بوم، توشی حیزبێک کرام کە پێشتر هەر ناویشیم لە کولەکەی تەڕدا نەبیستبو، حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردوستان. من کەوێکی ناو قەفەزی ڕژێمی سەددام بوم، ئێستا بوم بە داوی گەمەی کرێش و چەپەڵی حیزبایەتیی کوردیەوە!

نزیکەی چل مەترێک لە سەرو چادرەکەی د.مەحمود عوسمانەوە دە (پ.م) یەکی شاری کە زۆربەیان خەڵکی سلێمانی بون لە ژێر چادرێکدا دەژیان، لێپرسراوەکەیان (جەلالی حاجی حسەین) بو، ئەمانە (پ.م) ی پارتی سۆشیالیستی کورد (پاسۆک) بون.

## دوکتۆرێکی خۆش مەحشەر

دوکتۆر مەحمود عوسمان کە پێشتر وەک دوکتۆری مەلا مستەفا ناویم بیستبو، پێشتر نەمبینیبو و نەمدەناسی، بەخێرهاتنێکی گەرم و دۆستانەی لێکردم و (فەقێ حەسەن) قەلادزەیی یاریدەدەری پێناساندم کە لە چادرەکە لەگەڵی دەژیا، جێگایەکی خەویان لە چادرەکەدا بۆ دیاریکردم. دوکتۆر مەحمود هیچ پرسیاری ئەوەی لێنەکردم چۆن هاتومەتە دەرێ و سەر بە کام حیزبم، لە سەرەتادا هەر بە گشتی پرسیار و باسی بارودۆخی سلێمانی و شارەکانی تری کوردوستانی لەگەڵما دەکرد. دوکتۆر مەحمود هەر لە ڕۆژی دوهەمەوە کاری پزیشکیی چارەسەرکردنی نەخۆش و برینداری (پ.م) و خەڵکی ناوچەکەی خستە ئەستۆی من، منیش وەک دوکتۆرێکی لاوی تازە لە شارەوە هاتو ئەم ئەرکەم بە پەرۆشەوە بە جێ دەگەیاند. د. مەحمود کەسێتیەکی سادەی بێفیزی، کراوە و ڕوخۆش وقسەخۆش و زۆردو بو. هیچ نیگەرانی وگرژی و نائارامی و تورەییەکم لێنەدەبینی، ڕێزی بەرامبەری دەگرت و هاوڕێیەتی لەگەڵیدا خۆشبو.

## مولازم ئەنوەری مەجید سوڵتان

لای د. مەحمود بۆ یەکەم جار (مولازم ئەنوەری مەجید سوڵتان) م ناسی. هەرگیز روی نیگەران و بێزاری شەهید ئەنوەرم بیرناچێتەوە کاتێک چاوە ڕەشە تیژەکانی تیبڕیم و زۆر دۆستانە و دڵسۆزانە بە ئارامی و زەردەخەنەیەکەوە لێی پرسیم: "دوکتۆر گیان تۆیش بۆ کوردایەتی هاتویتە دەرەوە؟". مولازم ئەنوەرپێشتر (پ.م) ی شۆڕشی ئەیلول بو. دوای چەند ڕۆژێک لەم دیدارە کورتە لە ڕۆژی ٢ ی ٩ ی ١٩٧٩ مولازم ئەنوەر لە شەڕی هێرشی یەکەمی ئێراندا بۆ سەر کوردوستان لە نزیک شاری بانە لە شەڕی بەرگریدا شەهید بو. چەند هەفتەیەک دواتر کە تەواو لە بارودۆخە زۆر ناخۆشەکەی شۆڕش تێگەیشتم، ئاوا پرسیارەکەی مولازم ئەنوەرم لێکدایەوە "ها دوکتۆری بێئاگا و نەگبەت، چەند بەزەییم پێتا دێتەوە کە لەم شۆڕشە پڕلە ڕق و کینە و ناکۆکیەدا دەبیت بە پ.م ".

## گێژاوی حیزبەکان!

لەو چەند هەفتەیەی ژیانی ژێر چادرەکە، کە لەگەڵ د. مەحمود و (فەقێ حەسەن) ی یاریدەدەریدا بەسەرم برد، لە وتوویژەکانمدا لە گەڵیان، هەروەها لەو باس و خواسانەی کە دەمبیست و دەمکرد لە گەڵ کەسانی وەک (ڕەسول مامەند)، (قادر عەزیز)، (مولازم تایەر)، (قادر جەباری)، (عەدنان موفتی)، (حاجی حاجی برایم) و(سەید کاکە)، هەروەها لەو بڵاوکراوانەی دەمخویندنەوە، ئاوا لە دۆخەکە تێگەیشتم: (ینک) نیمچەبەرەیەک بو پێکهاتبو لە (کملک) و بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردوستان (بزوتنەوە) و هێڵی گشتی. د.مەحمود عوسمان دوای ئاشبەتاڵ دەچێت بۆ سوریا و لەوێ لەگەڵ (قادر جەباری) و (عەدنان موفتی) (لیژنەی ئامادەکاریی پدک) یان دروستکردبو. دواتر د. مەحمود لە هاوینی ١٩٧٧ لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لە سوریاوە بە ناو تورکیا و ئێراندا گەڕابۆوە کوردوستان و بنکەکەی لە نزیک بنکەکانی سەرکردایەتیی (ینک) دانابو. لە نەورۆزی ١٩٧٩، پێنج مانگ پێش ئەوەی من ببمە (پ.م) (ڕەسول مامەند) و زۆربەی سەرکردەکانی تری بزوتنەوە لە (ینک) جیادەبنەوە و لە (خڕی نێوزەنگ) ی شوێنی سەرکردایەتیی (ینک) وە دەگوێزنەوە بۆ ئەوبەری چەمەکە بۆ گوندەکانی (گۆڕەشێر) و (دۆڵەتو) و دەوروبەریان کە دەکەونە نێوان شاری (سەردەشت) و (خانێ) ی ئێران. کەسانی کەمتر ناسراوی باڵە کەی تری بزوتنەوە لەناو (ینک) دەمێننەوە. چەند

ڕۆژێ دواتر د. مەحمود و قادر جەباریش (خڕی نێوزەنگ) جێدەهێڵن و دەپەڕنەوە بەری گۆڕەشێر بۆلای ڕەسوڵ مامەند و هاوڕێکانی. خوێنەری هێژا! ئینجا بزانە ئەم جیابونەوەیە دواتر چ کارەساتێکی لێدەکەویتەوە! لە باڵی جیابۆوەی بزوتنەوە و (لیژنەی ئامادەکاریی پدک) لە ژێر سەرکردایەتیی ڕەسول مامەند و د. مەحمود پێکەوە حیزبێکی تازەیان دروستکرد بو بە ناوی (حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردوستان - حسیک). دواتر لە کۆنگرەی یەکەمی (حسیک) کە لە ناوەڕاستی مانگی ٥ ی ١٩٨١ لە (دۆڵەتو) بەسترا وشەی (یەکگرتو) ی لێ لادەبەن ودەبێتە حیزبی سۆشیالیستی کوردوستان – عێراق (حسک).

## (ئەو) یان لە بیرکردبو خەریکی خۆیان بون!

دوکتۆر مەحمود پێشتر نامیلکەیەکی ڕەخنەگرانەی بچوکی بە عەرەبی دەرکردبو لەسەر شکستی شۆرشی ئەیلول و ئەو پەندانەی کە دەبێت لە شکستی شۆڕشەکە وەربگیرێ، بە ناوی (تقییم مسیرة الثورة الكوردية و انهيارها و الدروس و العبر المستخلصة منها)، د.مەحمود ئەو نامیلکەیەی پیشاندام و منیش خوێندمەوە. لە دوای ئاشبەتاڵ ئیدریس و مەسعود بەرزانی لە ناو ئێرانە وە (سەرکردایەتیی کاتیی - پدک) یان دروستکرد کە بە (قیادە موەقەتە) ناسرابو. دامەزرێنەرانی (حسیک) دەیانوت گوایە دەیانەوێ خۆیان لە شەڕ و ناکۆکیە کۆن و تازەکانی نێوان باڵی تاڵەبانی و باڵی بارزانی دوربخەنەوە و حیزبەکەیان بکەن بە تەوژمی سێهەمی ناو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردوستان. ئامانجی کۆتاییان ئەوە بو جێگە بە باڵی تاڵەبانی و باڵی بارزانی لێژبکەن و خۆیان ببنە سوارچاکی سەرەکیی مەیدانەکە و یاریزانی سەرەکیی کایەکانی کوردایەتی لە عێراقدا. پاسۆک لە ڕوی بیروڕاکانیەوە خۆی لە (حسیک) بە نزیکتر دەزانی هەتا لە (ینک)، پاسۆک جارجارێکش چاوێکی دۆستانەی لە قیادە موەقەتە دادەگرت. وادیاربو هەم (حسیک) و هەم (پاسۆک) لە ژێرەوە پەیوەندیی باشیان لەگەڵ (پدک) هەبێت، چونکە لە ماوەی ئەو سێ مانگەی میوان بوم لای (حسیک)، نە سەرکردەکانی ئەمان و نە ئەوانەی پاسۆک ڕەخنەیەکی ڕاستەقینە و بوێرانەیان لە (پدک) نەگرت. پێم وایە لە بەر من کە بۆیان دەرکەوتبو ڕۆح وتەنێکی غەریبم لە جەستەیاندا! هەندێ جار شەرمنانەو لە ژێر لێوەوە ڕەخنەیەکی نابەدڵیان لە (سەرکردایەتیی کاتی - پدک) دەگرت. تیری بێبەزەیی ڕەخنەی یەکلایەنەی

سەرکردەکانی (حسیک) هەر لەسەر دڵی یەکێتی و بەتایبەتی کۆمەڵە بو. لەو ڕۆژە ناخۆش و بێواتایانەدا، زۆر لەلام سەیر و سەرنجڕاکێش بو کە د. مەحمود و هاوحیزبیەکانی زۆر بەکەمی باسی خەباتی دژی ڕژێمی سەدامیان دەکرد. هەستم ئەکرد ئومێدیان بەوە نەمابو بتوانن درێژە بەخەبات بدەن دژی ئەو ڕژێمە، گومانێکی قوڵیان هەبو لەوەی خەباتەکەیان هیچ ئەنجام وسودێکی هەبێت. ڕەخنەکانیان لە (ینک)هیچ زانستی نەبو، لە لایەنی فکر و فەلەسەفەوە کوڵەوار و بێناوەڕۆک بو، ڕوکەش و شەخسی و هەندێ جاریش بازاڕی بو. بۆ نمونە بە (ینک) یان دەوت هەر جاشی ١٩٦٦ ن و ناوێکی تریان لە خۆیان ناوە، بە کۆمەڵە یان دەوت توندڕەو و سەرلێشێواو و هەرزەکاری سیاسین. بەڕاستی نە (پاسۆک) ونە (حسک) هیچ بیر و نەخشە و پرۆژەیەکی نوێیان پێنەبو کە جێگرەوەی پرۆژەکانی (ینک) بێت. لەو ڕۆژانەدا حیزبی دیموکراتی کوردوستانی ئێران (حدکا) پشتگیریی (حسک) ی دەکرد، وەک ئەوەی تۆڵە لە یەکێتی بکاتەوە کە پشتگیریی کۆمەڵەی ئێرانی دەکرد. لەو ڕۆژانەدا و دواتریش (حدکا) هەوڵی زۆری دەدا خۆی لە شەڕی (سەرکردایەتیی کاتیی پدک) بە دوربگرێ، بەتایبەتی کە ڕابەرانی (سەرکردایەتیی کاتیی پدک) بۆ بەهێزکردنی خۆیان توانیبویان خۆیان لە ڕژێمی هێشتا ناجێگیری خومەینی زۆر نزیک بکەنەوە، ئەم ڕژێمەش پێویستیی بەوان هەبو بۆ هاوکریکردنی لە شکست پێهێنانی شۆڕشی کوردوستانی ئێران. کۆمەڵەی ئێران هەر لە سەرەتاوە پشتگیریی (ینک) و بە تایبەتیی کۆمەڵە ی دەکرد و دژایەتیی تەواوی (سەرکردایەتیی کاتیی پدک) یان دەکرد.

### هەوڵێکی ناکام !

جارێکیان لە چادرەکەدا دوبەدو لەگەڵ د. مەحمود دانیشتبوم، پرسیاری کارەساتی ئاشبەتاڵ و خۆبەدەستەوەدانی بارزانی و سەرکردەکانی لایەنگریم لێکرد. د.مەحمود لە سەر مەلا مستەفا لە کاتی ئاشبەتاڵ دا ئاوای وت: (دوای بڵاوکردنەوەی بەیانی ڕێکەوتنی سەدام و شا لە جەزائیر لە سەرەتای مانگی ئازاری ١٩٧٥، بەشێک لە سەرکردە سیاسی و سەربازیەکانی شۆڕش وەک عەلی عەسکەری و...لە ئەنجامی چەند کۆبونەوەیەکدا کە بێ مەلا مستەفا کردبویان، بڕیاری درێژەپێدانی خەباتی چەکداریان دابو، بەڵام بە شێوازێکی نوێی پارتیزانی نەک جەبهەیی. نیازیان وابو

ژمارەی (پ.م) کەمبکەنەوە، تەنها ئەوانەی لاو و ڕەبەن و تەندروست و بەڕاستی شەڕکەربون لە شاخ بمێننەوە. بەڵام مەلا مستەفا دوای دیداری لە گەڵ شای ئێران، کە گەڕابۆوە لە شاری (نەغەدە) کۆبونەوەیەکی کردبو، تێیدا بە توندی دژی درێژەپێدانی شەڕی بەرگری لە دژی سەدام قسە ی کردبو، بۆچی لەو ڕۆژانەدا پیاو هەبو سەرپێچی لە ئیرادە و دەسەڵاتی مەلا مستەفا بکات؟

## دیداری خۆبەدەستەوەدان

لە سەر چونی مەلا مستەفا بۆ لای شا ی ئێران، دوکتۆر مەحمود ئاوای گێڕایەوە:

(مەلا مستەفا و د. مەحمود خۆی و نوێنەری شۆڕش لە ئێران شەفیق قەزاز و نوێنەری مەلا مستەفا لە ئێران موحسین دزەیی، دوای چەند ڕۆژێک چاوەڕێکردن ئینجا توانیان لە (کۆشکی نیاوەران) لە تاران دیداری شای ئێران بکەن. گوایە ئەو (د. مەحمود) زۆر سەری سوڕماوە و ناڕەحەت بوە کاتێک بینیویەتی چۆن مەلا مستەفا لە سەرەتای دیدارەکەدا دەستی شای ئێرانی ماچکردوە و بچوکی و گوێڕایەڵی و دڵسۆزیی تەواوی خۆی بۆ شا دەربڕیوە). بەڵام دوکتۆرمەحمود کە ئەمەی بۆ من گێڕایەوە، هیچ زانیاریی لە سەر ئەوە نەدا ئایا خۆی و شەفیق قەزاز و موحسین دزەییش دەستی شای ئێرانیان ماچکردبو یان نا. شای ئێران بە مەلا مستەفا دەڵێ:(لەگەڵ عیراق ڕێکەوتوین و هیچ کێشەیەکمان لەگەڵی نەماوە، ئێوە ش لە ماوەی دوهەفتەدا دەتوانن ئێران جێبهێڵن و چیتان هەیە لەگەڵ خۆتان بیبەنەوە بۆ عێراق، یان دەیشتوانن هەر لە ئێران بمێننەوە و چیتان دەوێت و پێویستە لە عێراقەوە بیهێننەوە بۆ خۆتان لە ئێران). لە وەڵامدا مەلا مستەفا بە شای ئێران دەڵێت: (قوربان ئێوە بۆ خۆتان چی بەباش دەزانن بۆ ئێمەش باشە، داوام ئەوەیە ئەو پەیوەندییەی نێوان من و تۆ وەک خۆی بمێنێ). موحسین دزەیی کە لە دوای ڕێکەوتنی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ بۆ ماوەیەک بالیوزی عێراق دەبێت لە وڵاتی چیکۆسلافیا، دەیەوێ خزمەتێکی خۆی کە لە کاتی سەفیریەکەیدا بە ڕژێمی شای ئێرانی کردوە، بە بیری بێنێتەوە بەڵکو تۆزێ دڵی شا نەرم بکات. لە شای ئێران دەپرسێ: ئایا ئەو زانیاریانەی ئەو وەک سەفیرلە سەر دۆخی عێراق بۆی ناردوە بە دەستی گەیشتوە یان نا، شا ی ئێرانیش بە ساردی و ناگرنگیەکەوە دەڵێت بەڵێ بەدەستی گەیشتون).

## کەلاوەکانی گوندی سونێ

ڕۆژێک کوڕێکی ڕۆژنامەنوسی گەنجی نەمساوی هاتە لای د.مەحمود و دوای دیدار لەگەڵیدا، د.مەحمود پێی وتم پێی باشە ئەگەر لە گەڵ ڕۆژنامەنوسەکە بچم بۆ بینینی دێی (سونێ) ی سەر سنور کە ڕژێمی سەدام بە زۆرچۆڵیکردوە و سوتاندویەتی. کوڕێکی ڕیشنی کەرکوکی کە (پ.م) ی پاسۆک بو بە ناوی (عەبدوڵا) بە کلاشینکۆفێکەوە ناردی لەگەڵمان بۆ پاراستنمان. لە سەر گردەکانی بە سەر سونێ دا دەیڕوانی سەربازگەی سوپای عێراقی پێوەبو. ناوچەکە بەگشتی بێ مەترسی نەبو و ڕێی هاتوچۆی جاش و سیخوڕانی ڕژێم بو. من (عەبدوڵا) م نەدەناسی و لە ڕێگادا ئەوم وەک کەسێکی داخراو، کەمدو، نائارام و ناڕۆشنبیرهاتە پێشچاو. هەمو ئەمانە بڕێک نادڵنیای کردم، بەتایبەتی کە ئێمە بەرەو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم دەچوین و منیش هیچ چەکێکم پێنەبو لە کاتی تەنگانەدا بەرگریی لەخۆمی پێبکەم. پێموت ئێمە ناتوانین بە پێی ئەو بڕۆین با ئەو پێشمان بکەوێت، ئێمەش وردە وردە بەدوایدا دێین، ئەمە بەهانەی من بو دەمویست ئەو لە پێشمانەوە بڕوات. لە ڕاستیدا ترس و گومانی ئەوە چوبوە دڵمەوە نەوەک لە دواوە میلمان لێ بێنێتەوە و وەبەرخۆیماندا و تەسلیمی یەکێ لەبنکەکانی ڕژێم مان بکات کە زۆر نزیک بون لێمانەوە، چەند پارویەکی چەوردەبوین بۆ ڕژێم: ڕۆژنامەنوسێکی بێیانی و دوکتۆرێکی (پ.م) ی کورد! دوای سێ کاژێر پێڕەو گەیشتینە دێی سونێ کە یەکەم گوندی وێران و چۆڵکراوی کوردوستان بو بینیم. سونێ تەنیا چەند کەلاوەیەکی مابو، ئەوانیش دوکەڵیان لێ بەرزدەبۆوە، چەند سەگێکی لەڕ و برسی و بێزاریش لەوناوەبون کە وزەی وەڕینیشیان تیانەمابو. چەند دیمەنێکی غەمبار و مەرگ پڕژێن بو! بە پێی توانا و بە درێژی بە ئینگلیزیە بەهێزەکەم سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی دژەکوردی ڕژێمی سەدامم (چۆڵکردنی لادێکان و بەبەعسی کردنی خەڵک) بۆ ڕۆژنامەنوسەکە باسکرد و وەڵامی پرسیارەکانیم دایەوە. ئەویش کەوتە وێنەگرتنی شوێنەکە، بە بێزیان گەڕاینەوە شوێنی خۆمان بۆ لای د.مەحمود.

## داواکەی ئەو و سەرسوڕمانی من!

جەژنی ڕەمەزانی ١٩٧٩ لە ڕۆژی ٢٥ یا ٢٦ ی مانگی ئاب دا بو. د.مەحمود دەیزانی من وەک دوکتۆرێکی تازە لە شارەوە هاتو بڕێک پارەم پێیە. دوسێ ڕۆژ

پێش جەژن بانگی کردم و کەوتە پیاسەکردن لەگەڵمدا، بە جۆرێک لە شەرم و پرینگانەوە پێی وتم چەند ڕۆژێکی تر جەژنە و هیچ پارەمان نیە گۆشتی پێبکڕین بۆ (پ.م) کان، بەڵکو بڕێک قەرزیان بدەمێ. بەڕاستی ئەم داوایە کۆمەڵێک بیر و هەستی تێکەڵ و پێکەڵی لە هەناومدا وروژاند. هەوری غەم و نیگەرانی و بەزەیی هاتن بە کورد دا ئاسمانی ساماڵی گەشبینیمی تەڵخ و تاریک کرد، سەرسوڕمان و ڕامانێکی گوماناوی و ڕەشبینانە لە ئایندەی کورد ئەژنۆکانمی شلکرد و زەویی ژێرپێمی کردە زیخ و چەوێکی لوس و خلیسک و ناجێگیر. لە خۆمم پرسی: ئەمە چۆن شۆڕش و چۆن حیزبێکە، چۆن سەرۆک حیزبێکە ناتوانێ سکی جەنگاوەرەکانی تێربکات و داوای قەرز لە من دەکات؟ شۆڕشی چەکدار بە گیرفانی بەتاڵ و بە بێ دۆستێکی بەخشندە و ستراتیجی و گیانی بە گیانی، دەکرێ؟ من بڕی ١٢٠ دینارێکم پێدا و ئیتر بۆ خۆم تەنیا پەنجا دینارێکم پێمایەوە. ئەو جەژنمان بە گۆشتەوە کرد! دواتر و تائێستاش دوکتۆر مەحمود نەیتوانی قەرزەکەم بداتەوە، بەڵام من هەر زو گەردنم ئازاد کرد، چونکە ئەویش پارەکەی بۆ خۆی نەبو، جگە لەوە ئەویش قەرزی میواندارییە پڕ لەڕێز و قسەخۆشەکانی بەسەر منەوە هەبو! بەڕاستی دوکتۆرمەحمود لە هاوڕێیەتی ڕۆژانەمدا لەگەڵی، پیاوێکی کراوە و قسەخۆش و بێفیز و خاکی و سادە بو. قسەی خۆشی زۆر لابو، لە سەر (سەید کاکە) ئەمەی بۆ گێڕامەوە: لە ساڵی ١٩٧٦ یا ١٩٧٧ دەبێت کە تازە شۆڕش هەڵگیرساوەتەوە، سەید کاکە بە گوندەکاندا دەگەڕێ و لەسەر شۆڕشی نوێ قسەیان بۆ دەکات، لە چەندین دێ لە کۆبونەوەکاندا ئەم پرسیارە دەکات (کوڕە ئاخر ئەمە کەی حکومەتە، ئەوەتا تەنانەت ناتوانێ پیاڵە و ژێرپیاڵەیەک دروست بکات؟). دواتر بۆ نەگبەتیی سەید کاکە کارگەی دروستکردنی بەرهەمە شوشەییەکان لە شاری (ڕومادی) دروستدەکرێ. ئەفسەرێکی دەسگای جاسوسیی ڕژێم بە نیوە گاڵتە و نیوە ڕاست دەستەیەک پیاڵە و ژێرپیاڵە کە لەو کارگەیەدا دروستکرابون وەک دیاری دەنێرێ بۆ سەید کاکە و بە گەیەنەری دیاریەکەش دەڵێ بە سەید کاکە بڵێ: دە با ئیتر خۆیبدات بەدەستەوە و بگەڕێتەوە ناو حکومەت، ئەوەتا ئێستا عێراق پیاڵە و ژێرپیاڵەش دروستدەکات و ئیتر ئەو بیانوەی نەماوە.

## یەکەم بۆردومان

خولی یەکەمی شەڕی کورد و کۆماری ئیسلامی لە ٨ ی ٩ی ١٩٧٩ وە دەستی پێکرد و بۆ سێ مانگ درێژەی کێشا. لە ڕۆژێکی ئەو خولەی شەڕەکەدا لە بنکەکەی خۆمانەوە بینیم چەند هێلیکۆپتەرێکی جەنگیی ئێرانی دێی دۆڵەتوی ئەوبەری بنکەکەمانی بە بێبەزییانە بۆردومان کرد. ئەمە یەکەم جار بو لە ژیانمدا بە بەرچاوی خۆمەوە، وەک لە فیلمی شەڕدا بۆردومانکردن ببینم، زۆر تورە و غەمباری کردم چونکە گوندەکە خێزانی زۆری تیا دەژیا. دیاربو زانیاریان پێدرابو کە لە ناو گوندەکەدا کادیر و (پ.م)ی (حدکا) هەیە. دوای بۆردومانەکە و لەچاوونبونی هێلیکۆپتەرەکان، ڕێچکەی خەڵکم بینی بەسەر ئەو ڕێگایەی لە دۆڵەتو وەوە بەرە و خوار بۆ سنوری عێراق دەچو. ئەوانە ڕاکردوان و زامدارەکانی بۆردومانەکە بون کە بۆ چارەسەر و پەنابردن بەرەو عێراق هەڵدەهاتن. من بە کۆڵەپشتەکەمەوە بە یاوەریی چەند (پ.م) یەکی گەنجی پاسۆک خۆم گەیاندە سەر ڕێگاکە و کەوتمە تیمارکردن و داپۆشین و بەستنی برینەکانیان و پێدانی دەرمانی دژە ئێش و هەوکردن پێیان. یەکێ لە زامدارەکان کادیرێکی باڵای(حدکا) بو کە پێشتر لە ساڵی ١٩٧٧ لە کاتی خوێندنم دا لە بەغدا بە ڕێکەوت ناسیبوم و جارێکیش لە سلێمانی لە ماڵی خۆمان بانگێشتنم بۆ کردبو. دوای بەجێگەیاندنی ئەرکە پزیشکیەکانم، بە و کادیرەدا هەواڵی ساغی و تەندروستیی خۆمم ناردەوە بۆ خێزانەکەمان و ئەویش بە ئەمانەتەوە گەیاندبوی. بەڕاستی ڕێکەوتێکی ناوازە بو چونکە پتر لە مانگێک تێپەڕیبو کە کەس و کارم جگە لەوەی دەیانزانی بومەتە (پ.م) هیچ شتێکی تریان دەربارەی من نەدەزانی، ماوم؟ لە کوێم؟ چیدەکەم؟. هێرشە سەرتاسەریەکەی ڕژێمی ئێران دوای سێ مانگ، بە گرتنەوەی شارەکانی کوردوستانی ئێران و بە ڕاونانی سەرکردایەتیی (حدکا) و کۆمەڵەی ئێران تا سەر سنورەکان دوایی هات. لە شارەکانی کوردوستان نوێنەری (خومەینی) (اية الله صادق خلخالي) حوکمی کوشتنی بەسەر چەندین خەڵکی بێتاواندا دەرکرد. چەند کەسێکی کوردی سەر بە ڕژێمی ئێران پێیان وتبو: قوربان بە هەڵە حوکمی کوشتنت دەرکردوە بەسەر کەسانێکدا کە دۆستی کۆماری ئیسلامی بون، خلخال یش لە وەڵامدا پێیانی وتبو: هیچ کێشە نیە، ئەگەر موسوڵمانی بێتاوانم کوشتبێ دەچێتە بەهەشت ولێرەی خۆشترە! ئەگەر کافریشم کوشتبێ ئەوە دەچێتە دۆزەخ!

## هەڤاڵ جوجەڵە

شەڕی تاران دژی کوردی ئێران گەرمتر دەبو، دوای بۆردومانەکەی گوندی دۆڵەتو بنکەکانی (حسک) و پاسۆک گوازرانەوە بۆ چەند کیلۆمەترێک خوارتر کە دەربەند و شیویکی پڕ پێچ و پەنا و سەخت بو لە پێینی شاخی جاسوسان. ڕۆژێک لەم هەوارە تازەیەدا لە ژێر کەپرێکدا دانیشتبوین چامان دەخواردەوە. پیاوێکی گردەی باڵا ناوەندی ڕیشن، کە تازە لە مهابادە وە دەهات، خۆی کرد بە دانیشتنەکەماندا و لە تەنیشت منەوە دانیشت.

بە (خاڵە حاجی) بە منیان ناساند، پیشتریش لە دانیشتنەکاندا وەک نوێنەری (حسیک) لای ڕژیمی ئێران ناویم بیستبو. ئەم کەسە (هەڤاڵ جوجەڵە حەمەڕەحیم) بو. پیاوێکی چوست و چالاک و زمانپاراو و قسەزان بو. بە درێژی باسی بارودۆخی تازەی شەڕی کورد و هێزەکانی ئێرانی کرد. کە لە گێرانەوەی هەواڵەکان تەواوبو، منیش یەکسەر دەفتەرە بچوکەکەم دەرهێنا و تیایدا نوسیم ئیمڕۆ (هەڤاڵ جوجەڵە) م بۆ یەکەمجار بینی و ناسی. تومەز لە سەر شانمەوە لاچاوی بڕیوەتە دەستم و ئەوەی نوسیبوم خوێندبویەوە. یەکسەر بە زەردەخەنەیەکی ڕەخناویەوە پێی وتم (ها کاک دوکتور ناوی منیشت نوسی!). هەڤاڵ جوجەڵە لە هەرزەکاریدا لەگەڵ (حشع) دەستی بە خەباتی سیاسی کردبو، دواتر بوبە پارتی و پاراستن، ئینجا (حسیک). ئەو بە کەسێکی وریای خاوەن تۆڕێکی پەیوەندیی جۆراوجۆر و ئاڵۆز و چەند سەرە دەناسرا، دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی١٩٩١ لە سلیمانی کوژرا.

## (ئایشێ سوار) ی (بێدەلان)

دوای یەک دو هەفتە منیان لەگەڵ (حیلمی مەلامەحمود) گواستەوە بۆ دێی بێدەلان. حیلمی پورزای سەلاحی موهەندیسە، خوێندنی ئامادەیی تەواوکردبو و پێش من بوبو بە (پ.م)، لە سلیمانی دراوسێمان بو، دواتر دو برای شەهید بون (د.کامل و شێخ محەمەد)، حیلمی لە بێدەلان بوبە یاریدەدەری من لە بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکەمان. بێدەلان تەنیا دوسی ماڵی تێدا بو، چەند کیلۆمەترێک خوار کەپرەکان بو، ئەمە دوا دێی چۆڵپێکراوی کوردستانی عێراق بو. (بێدەلان) دەڕوانێت بەسەر ئەو چەمە گەورەیەی لە ئەوبەریدا دێی (سونێ) و (شێنێ) بو. لە ئاستی بێدەلان بۆ خوارەوە لە سەر چەمەکە (ئاشی پشتکاوێ) بو کە دواتر کرایە بنکەی کاتیی ڕاگەیاندنی (حدکا). لە

کەلاوەکانی بێدەلان ژورێکی پەڕپوتی بچوک و نزم و تاریکیان بۆ پەیداکردم و ناومان لێنا نەخۆشخانە. لێرە چارەسەری پزیشکیمان پێشکەش دەکرد بە (پ.م) و جوتیار و ڕاکردوانی دێهاتەکانی کوردوستانی ئێران لە هێرشی ڕژێمی ئێران و ئەو چەند دانیشتوە کەمەی خەڵکی بێدەلان. لەم دێیەدا (نەنە ئایش) ی نزیک حەفتا ساڵەم ناسی کە بە (ئایشی سوار) ناسرابو، گوایە لە تافی لاویدا کە شویکردوە، بە سواری و بەڕێزەوە بردویانە بە بوکی بۆ ماڵە زاوا، بۆیە ناسناوی (سوار) یان پێوەنابو. نەنە ئایش زوزو بۆ ئارامکردنەوەی ئێشی جومگەکانی دەهاتە لام بۆ ژورەکەم کە وەک پشتی ئەو کۆماوەبو. منیش حەبی ئێشم دەدایە و دەرزی ڤیتامیناتم لێدەدا، بەتایبەتی دەرزیەکان زۆر دڵی خۆشدەکرد و سوپاسی گەرمی دەکردم. ئایشێ سوار ناوبەناو ماستی شیری مەڕو بزنەکانی بۆ دەهێنام، دەکەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتە تاڵ و تفتەکانی چۆڵپێکردنی گوندەکانی سەر بە قەڵادزێ و کۆکردنەوەیان لە ئۆردوگا زۆرەملەیکانی دەوروبەری. دیاربو ئەمانیش خەڵکی یەکێ لەو گوندانە بون. ئەم و کوڕەکەی کە ناوی (ئیبراهیم) بو لە بێدەلان بنەیەکیان دروستکردبو بۆ بەدەستهێنانی بژیو بە پەز و وڵاخ بەخێوکردن و قاچاخچێتی. ئیبراهم زو زو بۆ قاچاخچێتی دەڕۆشتەوە بۆ ناو ئۆردوگاکانی پشدەر، هەندێ جار کە ئیبراهیم بۆ چەند ڕۆژێک دیار نەدەما و لە نەنە ئایشم دەپرسی لە کوێیە، زۆر بە سروشتی و سادەیی و بەڵگەنەویستانە دەیوت لە (گەرمێنە). بۆ من سەیر بو کە نەنە ئایش بە دەگمەن وشەی عێراق و ئێران بە زاریدا دەهات. نەنە ئایش ژنێکی نەخوێندەواری بێئاگا بو لە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستی. خزمەکانی بە ئەمبەر و ئەوبەری سنورە زۆرەملێ دەسکردەکەدا دابەش بوبون، بۆ ئەوعێراق و ئێران هیچ واتایەکیان نەبو، بۆ ئەو گەرمێن و کوێستان یەک وڵاتە کە ناوی کوردوستانە، دیارە کوێستان ڕۆژهەڵاتی کوردوستانە و گەرمێنیش باشوری کوردوستانە.

وێرانە و کەلاوەکانی سیاسەتی کوردی چڕە دوکەڵ و زمانی درێژی ئاگری بێبەزەیی شەڕی براکوژیان لێ بەرزدەبۆوە و تەواو بێزار و نائومێدیان کردبوم. ئەو چەند هەفتەیەی لە بێدەلان بوم، دراوسێیەتی و هاوڕێیەتیی ئەم ژنە میهرەبان و بەسۆز و پاک و بێگەردە بوبو بە پەناگەی ڕۆحی من. نەنە ئایش منی لە هەواڵە ناخۆش و خورپەهێنەکانی مەیدانی شەڕە جۆراوجۆرەکان دەپاراست و دوردەخستەوە و لە بیری دەبردمەوە. لەم کاتەدا بو براکانم (ڕەوف و یاسین و عەلی) هەر جارە یەکێکیان لە قەڵادزێ وە بە شەو لەگەڵ قاچاخچی هاتن بۆلام و یەکی یەک دو شەو لەلام

مانەوە. بەڕاستی هەستم بە گوناه دەکرد بەرامبەریان چونکە ڕێگای هاتن بۆ لای من و گەڕانەوە بۆ سلێمانی کارێکی بوێرانەی پڕ لە مەترسی بو، مەترسی لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە وهەروەها مەترسیی ڕوداوی کوتوپڕی نەخوازراو. ئیتر وردە وردە لە پەیوەند بە سیاسەتی کوردیەوە هەستی نامۆیی و گومان لە دڵ و دەرونمدا چەکەرەی دەکرد و گەشەی دەسەند. لەم سەروبەندەدا هەواڵ و دەنگۆی وتووێژی (حسیک) بە تەنیا لەگەڵ ڕژێمی سەدام بڵاوبۆوە. لە مانگی ١٠ ی ١٩٧٩ دوکتۆر مەحمود بە یاوەریی عەدنان موفتی بۆ وتووێژ چوە بەغدا و لەگەڵ نوێنەری سەدام قسەیان کردبو. بەڵام بەدەستی بەتاڵ گەڕانەوە و لەسەر وتووێژەکە و وردەکاریەکانی هیچ شتێکی وا گرنگ یا باشیان پێنەبو تا بۆمان باسبکەن!

## یەکەم دیدارم لەگەڵ هێمنی شاعیر

تاسەی دیدەنیی (هێمنی موکریانی)ی شاعیرم دەکرد کە زۆربەی شیعرە بەناوبانگەکانیم بەتایبەتی (ناڵەی جودایی) لە بەربو. لە گەڵ دوکتۆرمەحمود دا چوم بۆ دێی (گۆڕەشێر)، لەم دێیە بۆ یەکەم جار (هێمن) ی هەستناسک و نیشتمانپەروەر، هەروەها (کەریمی حیسامی) ی ئەندامی کۆمیتە ی ناوەندیی (حدکا) م بینی، ئەوان وەک هەزارانی تر، لە دەست بۆمباران و شاڵاوی دڕندانەی ڕژێمی ئێران لە مهابادە وە پەنایان بۆ ئەم گوندە سنوریە هێنابو. بەداخەوە! بەهۆی بارودۆخی شەڕ و ترسی بۆمبارنی فڕۆکەی ئێرانی و باس و خواسی سیاسی، نەمانتوانی باسی ئەدەبی بکەین و چێژ لە دانیشتنەکە وەربگرین. بەهەرحاڵ بۆمن زۆر خۆشبو لە نزیکەوە (هێمن) ببینم و لەگەڵی بدویم، مەخابن کامێرایەکمان دەست نەکەوت وێنەیەکی لەگەڵدا بگرم.

## دامەزرانێکی حیزبایەتیی سەیر

وردە وردە هەستم دەکرد پەستان و گوشین بۆ بەحیزبی کردنم فرەتر دەبو، بۆخۆیشم هەستم دەکرد ئیتر کاتی ئەوەهاتوە نیازەکەی بۆی هاتبومە دەرێ پیادەی بکەم. دەمویست خۆم ڕزگاربکەم لەو بارودۆخە نەخوازراوەی بەهۆی سادەیی و دڵپاکی خۆم تێی کەوتبوم. ئیتر دەبوهەرچی زوترە خۆم بگەیەنمە (خڕی نێوزەنگ) بۆ بنکەکانی سەرکردایەتیی (ینک) و کۆنکرێت بۆ لای هاوڕێیانی کۆمەڵە. دروست

لەم کاتەدابو قادر جەباری هاتە لام بۆ کولانە پشتکۆماوە و تاریکەکەی ناوم نابو نەخۆشخانە، نامەیەکی ڕەسمیی دایەدەستم کە مۆری (حسک) ی لێدرابو. لە نامەکەدا مەکتەبی ڕێکخستنی حیزب منی کردبو بە لێپرسراوی لقی ڕێکخستنەکانی (حسک) لە پارێزگای سلێمانی. سەیر ئەوەبو پێشتر نە دوکتۆر مەحمود و نە قادر جەباری و نە هیچ کەسێکی تری (حسک) لە سەر مەسەلەی بون بەئەندامبونم قسەی لەگەڵ نەکردبوم و داوای لێنەکردبوم ببمە ئەندام، هەروەها خۆیشم بە دەمی یا بە نوسراو داوای ئەندامێتیم لێ نەکردبون! باشە کە من لە بنەڕەتدا ئەندامی (حسک) نەبوم، ئیتر بێ پرسکردن بە خۆم لە کوێوە و چۆن منتان کرد بە لێپرسراوی (حسک) لە ناوچەی سلێمانی؟ کە من لە بنەڕەتدا لەم یاریی ماروپەیژەیەی (حسک) یاریکەر نەبوم، ئیتر چۆن کەوتمە بەر دەم پەیژەکە و بە یەک جوڵە فڕێمە ناو یەکێ لە خانەکانی سەرەوەی یاریەکە؟ لەو سێ مانگەی ناو (حسک) یەک جار یەک لێپرسیاری (حسک) ڕاستگۆیانە و ڕاشکاوانە باسی ئەو فێڵەیان لەگەڵ نەکردم کە لێیان کردم، نێچیرێکی چەور بوم و کەوتبومە بەردەستیان، ئیتر چۆن و بۆ لە کیسی خۆیان بدەن؟ هەر وا کات تێدەپەڕی و خۆیان لێ کەڕ دەکرد.

لە پێشدا ویستیان هەر وەک پزیشک سودم لێ وەربگرن، دوایی ویستیان وەک سیاسیەکیش بەکارم بێنن و سودم لێوەربگرن. دیارە ئەم فەرمانی دامەزراندنی حیزبیەم لە ڕوی دەرونیەوە باشتر و لەبارتر گوڕ و گوژم و دەرفەتی بە من دا نەخشەی خۆدەربازکردنم لە (حسک) و چونەناو (ینک) پیادەبکەم. بێگومان من دواتر نامەکەم دڕاند و هەرگیز هیچ کارێکی حیزبایەتیم بۆ (حسک) نەکرد.

## ئامادەسازی بۆ دیدارێکی گرنگ

پەیوەندیەکی دۆستانەی خۆشم لەگەڵ دوکتۆرمەحمود بەستبو، ئەو وەک لێپرسراوی ڕاستەوخۆی منی لێهاتبو، لە سەر داوای خۆم ڕێگەی پێدام بچم بۆ لای (مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی) کە خاڵی براژنمە و ئەندامی کۆمیتە ی ناوەندیی (حشع) بو. ڕاستە حەزم بە بینینی ئەو دەکرد، بەڵام ئامانجی نهێنیی دڵم ئەوەبو بە پاساوی دیداری مەلا ئەحمەدی خزمم، بێ کێشە و بە سەلامەتی خۆم بگەیەنمە سەرکردایەتیی (ینک) و ئیتر بە فەرمی بچمە ناو (ینک) و نەگەڕێمەوە ناو (حسک). بنکەی سەرکردایەتیی (حشع) لە سەرەتای ڕاکردنیان لە شارەوە بۆ شاخ لە مانگی

کانونی دوهەمی ١٩٧٩ لە نزیک شوێنەکانی سەرکردایەتیی (ینک) بو لە گوندی (شێنێ) و لە شوێنەکانی (نێوزەنگ) و (زەڵێ) و (نۆکان). ئەم شوێنانە سەخت و پڕ پێچ و پەنا و درەخت بون، لە دیوی ئێرانی سنوری نێوان (سەردەشت) و (قەڵادزێ) بون، بە (پ.م) ی زۆر و شارەزای (ینک) دە پاریزرا. من کە میوانی لای (حسک) بوم، هەرگیز هیچ جۆرە چەکێکیان پێنەدام و بۆ جارێکیش لێیان نەپرسیم داخۆ چەکم پێویستە یان نا. دیاربو لە من بەگومان بون، خۆیشم هەرگیز داوای چەکم لێنەکردن. بە تەنیا و بێچەک لە چەم و ئاوەکەی بەردەم بێدەلان پەڕیمەوە و دوای چەند سەعات ڕێکردن بە پرسیارخۆم گەیاندە بنکەی مەلا ئەحمەد لە شوێنێک بەناوی (توژەڵە) کە گردێک لە (نێوزەنگ) ی جیادەکاتەوە. پاش نانخواردن و حەسانە وە و بڕێک گفتوگۆی دۆستانە، داوام لە مەلا ئەحمەد کرد، لەبەر ئەوەی جەلال تاڵەبانی من ناناسێ، بەڵکو ئەو منی پێبناسێنێ و دیدارێکم بۆ سازبکات لەگەڵی ؛ بە مەلا ئەحمەد یشم نەوت دەمەوێ بچمە ناو (ینک)، بەڵکو پێم وت تەنیا بۆ وتووێژ لە سەر دۆخی شۆڕش دەچمە لای. مەلا ئەحمەد بە ئاسانی دیدارەکەی بۆ سازکردم، کوڕەکەی خۆی (سامان (ی نارد لەگەڵمدا.

کە لە گەڵ سامان بەڕێوەبوین بۆ بنکەی جەلال تاڵەبانی، هەڵۆی تیژفڕی خەیاڵم دای لە شەقەی باڵ و بەسەر بەغدا ی هاوینی ساڵی ١٩٧٧ وە لەنگەری گرت. (هاتەوە یادم هیشتا لەوێ دەمخوێند، ڕۆژێک ڕۆژنامەی (طريق الشعب) ی زمانحاڵی حیزبی شیوعی هەواڵێکی وەک مانشێت بڵاوکردەوە کە گوایە جەلال تاڵەبانی لە دێیەکی کوردوستانی تورکیا کوژراوە. لەو کاتەدا ئەم هەواڵە بۆ ئێمەمانانی تینوی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی کورد کسپە وخورپەیەکی پڕئازار و کوشندەبو. جەلال تاڵەبانی دوای ئاشبەتاڵ پاڵەوان و ڕابەری ناسراوی هەستانەوەی شۆڕش بو، جەلال تاڵەبانی بۆ ئێمە تروسکەی مۆمی ئەو هیوایە بو لە تاریکایی وێرانەکانی ڕوخان و نائومێدیی دوای ئاشبەتاڵ لە کوردوستانەوە دەگەیشتە دڵ و دەرونی ئێمەی خوێندکار لە ناوجەرگەی ڕژێمی بەعس لە بەغدا. من ڕۆژی بیستنی ئەو هەواڵە شومە وازم لە چەند وانەیەک هێنا و بۆ بەدواچونی هەواڵەکە چوم بۆ لای چەند هاوڕێیەکی نزیکم لە کۆلیجی ئاداب - بەشی کوردی، ئەوانیش لە سەر هەواڵەکە زانیاریی دڵنیاکەریان لانەبو).

لەناکاو پڕمەی چەند ئێسترێک و (ماندو نەبن) ی خاوەنەکانیان کە بەرەو ڕومان دەهاتن فیلمەکەی خەیاڵمیان بچڕاند و گێڕایانمەوە توژەڵە و ڕێگا بەردەڵانەکەی لە

گەڵ ساماندا بەسەریدا دەڕۆیشتین. چەند خۆشە خوایە گیان! ئێستا چەند خولەکێکی تر، من بە ئازادی وتوویژ لەگەڵ ئەم کەسایەتیە دا دەکەم. دیدارەکە لە سەرەتای مانگی تشرینی دوهەمی ساڵی ١٩٧٩ لە (توژەڵە) بو لە میوانخانەکەیدا کە بریتیبو لە دەوارێکی گەورەی ئەستون بەرز لە ژێر دارگوێزێکی گەورە دا. سەردەستەی پارێزگاریی جەلال تاڵەبانی بە ریزەوە داوای لە (سامان) کرد دەمانچەکەی لاقەدی لەخۆی بکاتەوە و بیداتە دەستی ئینجا دەتوانێ لەگەڵ مندا بچێتە ژورەوە، سامان بە بیزارییەکەوە بەناچاری دەمانچەکەی دایە دەستی.

## چاوەڕێی زۆر نائومێدیی زۆرتر!

چوینە ژورەوە، جەلال تاڵەبانی بەڕێزەوە بەخێرهاتنێکی گەرم وگوڕی لێکردین ولە بەرامبەری خۆی لەسەر کومباری ڕاخراوی ژێر چادرە ڕوت و قوتەکە داینیشاندین.

من دوکتۆرێکی گەنجی ئایدیالیستی خەون و خەیاڵخۆش بوم، بە یەک دنیا هیوا و ئاوات و چاوەڕوانیی زۆرەوە بوبوم بە (پ.م). ئێستا دوای سێ مانگ لە پیشمەرگایەتی، شەڕە جنێو و شەڕی سارد و گەرم و ناکۆکیە بێکۆتاییەکانی نێوان (ینک) لە لایەک و (حسک) و (پدک) لە لاکەی تر تەواو نائومێد و بێزار و تورەیان کرد بوم. من لە تەمەنی هەرزەکاریمەوە لە سەرچاوەکانی شیعر و ڕۆمان و کتێبە فکریەکانەوە، بیر و هەستی مرۆڤدۆستی ودیموکراتی و سۆشیالیستیی مارکسی - لینینی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازم خواردبۆوە. من لە سەر شۆڕشە شکستخواردوەکانی کورد لە ئێران و عێراق و تورکیا خوێندبومەوە. لە سەر شۆڕشە مەزنەکانی مێژوی مرۆڤایەتی هەر لە (سپارتاکۆس) وە هەتا (شۆڕشی گەورەی فەرەنسیی ١٤ی تەموزی ١٧٨٩) و (کۆمۆنەی پاریسی ١٨٧١) و (شۆڕشی ئۆکتۆبەری١٩١٧ ی ڕوسیا) کتێبم خوێندبۆوە و لە سەریان فیلمم بینیبو. من لە قولایی ئێش و ئازارەکانی ئینسانی کوردەوە هاتبوم و لە سلێمانیی ژێر پۆستاڵی بەعسی داگیرکەرەوە ڕامکردبو. من لە لانکی شۆڕش و قوربانیدان و ڕۆشنبیریەوە هاتبوم و بە دڵێکی پاک و بە نیازێکی بێگەرد و دروستکەرانەوە بوبوم بە پیشمەرگە. من لە دوای شەهید (دوکتۆر بەختیار خالید) دوهەم پزیشک بوم کە لە شارەوە ڕایکردبو و بوبو بە (پ.م). کە من جەلال تاڵەبانیم بینی ئەو خاوەنی نزیک لە سی ساڵ ئەزمونی خەباتی سیاسی و حیزبایەتی و ڕۆژنامەنوسی و دبلۆماسی و پێشمەرگایەتی بو. ئەو یەکێ لە ڕەمزە درەوشاوەکانی

کوردایەتی بو لە هەر چوار پارچەی کوردوستان. بۆیە چاوەڕوانیەکانم لەو زۆر بەرزتر بو لە دۆخە تاریک و تاڵەکە ی شۆڕشی نوێ. هیوا و ئومێدم بەو زۆرتر بو هەتا بە ئیدریس و مەسعود بەرزانی و دوکتۆرمەحمود و ڕەسوڵ مامەند و هاوڕێکانیان. من وامدەزانی ئەو ڕەفتاری نەرم و ئارام و هێور و لەسەرخۆ بێت، چاوەڕێی ئەوەم لێدەکرد ئاسۆی بیرکردنەوە و هەستی بەرپرسیاری و پەرۆشیی ئەو بۆ کورد لە ئاستێکی فرە بەرزتر بێت لە هی سەرکردەکانی تر. من تامەزرۆی ڕابەرێک بوم هاوسەنگ و کەمدو، خاوەن دورنما و نەخشە و پلانی ورد بۆ ئێستا و ئایندەی دورونزیک. جەلال تاڵەبانی بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت و هەست بەخۆی و بە من بکات، بێ مەبەست و بێ ئەوەی بیەوێ، بێبەزەییانە منی لەم هەموە چاوەڕوانی و خەونە شیرینانە ڕاچڵەکاند و بەئاگای هێنامەوە!

## دوسەد هەزار کەڵەشێر و مریشك

لە سەرەتای قسەکانماندا هەر زو لەسەر ئەوە ڕێکەوتین و هاوڕابوین کە دامەزراندنی (ینک) دوای سێ مانگ لە ئاشبەتاڵ و لە دەرەوەی وڵات کارێکی مێژویی پێویست و بوێرانە بوە. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەبو کۆمەڵە وەک هێزی سەرەکی و بزوێنەر، هەروەها بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردوستان وەک هێزی دوهەم بەپیر یەکێتیەوە چون، هەم لە شێوەی خەباتی نهێنیی شار و هەم لە شێوەی خەباتی پێشمەرگانەی ئەو ڕۆژگارە سەختەی کوردوستان. لەسەر ئەوەش هاوڕابوین کە دەتوانرا ودەبوایە لە لایەن مەلا مستەفای ڕابەری شۆڕشی ئەیلولەوە ئاشبەتاڵ بە نزیکەی دوسەدهەزار (پ.م)ی شۆڕشی ئەیلول نەکرێ و کورد ئاوا زەلیل و نائومێد و ڕوخاو نەخرێتە بەر کێردی ڕق و کینە و تورەیی ڕژێمی شۆڤێنیی سەدام. دەکرا و دەتوانرا هەزاران خێزانی کورد نەکرێنە ئاوارەی ئێران و سوکایەتیان پێنەکرێ و وەک هێزی کاری هەرزان لەوێ نەچەوسێنرێنەوە. لە قسەکانماندا جەلال تاڵەبانی وێنەی خەیاڵیی ئەوەی هێنایە پێشچاو کە ئەگەر نەک دوسەد هەزار (پ.م) بەڵکو دوسەدهەزار کەڵەشێر و مریشک بەربدرانایە شاخ و چەم و دۆڵە پڕ پێچ وپەناکانی کوردوستان، ڕژێمی سەدام بە چەند مانگێک ئەو کەڵەشێر ومریشکانەی بۆ کۆنەدەکرایەوە و بۆ نەدەگیرایەوە ! بە یەک فەرمانی مەلا مستەفا دوسەد هەزار (پ.م) لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا توانەوە و شوێنەوارێکیان نەما. من لە پێنج ساڵ و چوار مانگ پێشمەرگایەتیم

دا، شارەزاییەکی زۆرم لە سروشتی تۆپۆگارفیی کوردوستان بەدەست هێنا و سەدان کەورگ و چیای زۆر سەخت و پێچ و پەنا و شیو و دۆڵ و دارستان و لێرەواری چڕ و تاریکی کوردوستانم بینی و تێیدا گەڕام و ژیام، هەمو جارێک کە بە شوێنێکی هەڵەموت وسەختدا ڕێگەم دەکرد یەکسەر لە بەرخۆمەوە دەموت: ئاخر ئاشبەتاڵ بۆ؟ بۆیە بۆم دەرکەوت وێنە خەیاڵیەکەی دوسەد هەزار کەڵەشێر و مریشک کە جەلال تاڵەبانی زۆر بە ڕونی و ڕەوانبێژانە هێنایە پێش چاوم ڕاست و دروست بو و لە واقیع زۆر نزیک بو. تەنیا تەفسیرێکم بۆ ئەو وازهێنان و مەیدان چۆڵکردنەی مەلا مستەفا و لایەنگرە زۆر گوێڕایەڵەکانی هەر ڕوخانی مەعنەوی و ڕۆحی بو. بێگومان پیری و شەکەتی و ماندوبونی جەستەیی بە هۆی ئەو خەباتە درێژخایەنەی کردبوی ڕۆڵی خۆی هەبو لەو ورەبەردانە، دواتریش دەرکەوت شێرپەنجەی سییەکانی هەبو کە ئەمیش بێگومان لاوازی کردبو. بۆیە من وەک پزیشکێک لەوە تێدەگەم کە دوای ڕێکەوتنی شا و سەدام مەلا مستەفا خۆی ئیتر بەهۆی نەخۆشی وپیریەوە نەیدەتوانی درێژە بە خەباتی چەکداری بدات، بەڵام ئەی بۆچی ڕێگەی بەو چەند سەرکردە سەربازی و سیاسیەی شۆڕشی ئەیلول نەدا کە ویستیان درێژە بە شۆڕش بدەن بەڵام بە شێوازی پارتیزانی نەک بە شێوازی بەرەیی (جەبهەیی) ؟

## من دەڵێم، ئەو دەڵێ !

دواتر کە لە وتووێژەکەدا زۆرتر چوینە پێشەوە، جیاوازیی ڕاوبۆچونی من لە هی جەلال تاڵەبانی دەرکەوت. من دەموت بە سیاسەتێکی هاوسەنگ و واقیعبینانە دەشێت و دەکرێت و دەبێت لایەنە سیاسیە چەکدارەکانی کورد یەکبخرێن. دەبێت گورزی کاریگەری خەبات ڕاستەوخۆ و تەنیا ئاراستەی ڕژێمی سەدام بکرێت، نەک وەک ئێستا لە شەڕی لابەلادا ئاراستەی کورد خۆی بکرێت. من دەموت تەنیا بەڕێزت نەک هیچ سەرکردەیەکی تر دەتوانێ ڕەشماڵێک، چەترێک هەڵبکات کە هەمو هێزە کوردیەکان کۆبکاتەوە و ئاراستەیان بکات بەرەو سەرکەوتنمان. جەلال تاڵەبانی لەگەڵ هەمو ئەوانەدابو کە من دەموت، بەڵام چەندین بەڵگەی بۆمن دەهێنایەوە کە لە ڕیزەکانی (حسک) و (پدک) دەیان سەرکردە و کادیر و چەکدار هەن لە ژێرەوە لەگەڵ دەسگا نهێنیەکانی ڕژێمی سەدام و کۆماری ئیسلامیی ئێران دژی (ینک) کاری تێکدەرانە دەکەن. ئەو دەیسەلماند هەر ئەو دەسگایانە خۆشیان هەندێ لە پیاوەکانی خۆیان ناردۆتە ناو شۆڕش بە ناوی (حسک)

و (پدک) بۆ نانەوەی پشێوی و ئاژاوە و شەڕ. جەلال تاڵەبانی ناوی دەیان کوێخا و ئاغا و سیخوری بۆ دەهێنامەوە کە چەکی ئەو دو حیزبەیان هەڵگرتوە و لە ژێرەوە بە ڕەسمی لەگەڵ ڕژێمی سەدام یا پێشتر لە گەڵ دەسگای سیخوڕی شای ئێران (ساواک) کاریان کردوە یا ئێستا بۆ ڕژێمی ئیسلامی ئێران کاردەکەن. جەلال تاڵەبانی ئەوەندە بە ڕونی و وردی و بەڵگەوە ئەو زانیاریانەی باسدەکرد کە باوەڕی پێبێنی ڕاستدەکات. بەڵام من دەمویست ئەو وەک سکرتێری گشتیی گەورەترین و کاریگەرترین ڕێکخراوی ئەو کاتەی کوردوستانی عێراق ئاستە نزم وتاریک و بچوکەکانی حیزبایەتیی کوردی تێپەڕێنێ. من دەمویست ئەو بەرزتربێتەوە و لە سەرەوەڕا پانۆراما ی هەمو دیمەن و وێنەکانی کوردوستان لە تابلۆیەکی سەرتاسەریی گەورەدا ببینێ و ببێتە کۆتری ئاشتیی ناو ماڵی کورد. ئەو دەی وت هەمو ڕێگایەکی وتووێژیان تاقیکردۆتەوە بەڵام سەرکردایەتیی (حسک) و (پدک) نایانەوێ لەگەڵ ئێمە ڕێکەون.

## باتریەکی پڕ لە وزە

پێداگری و سوربونی گەنجانەم لەسەر ڕا و بۆچونەکانم وردەوردە جەلال تاڵەبانیی هەڵدەچواند و تورەی دەکرد، بەڵام هیچ هەڵەیەکی شەخسی و قسەیەکی بریندارکەری بەرامبەرم نەکرد. وەک زمانی جەستە و شێوازێکی ناخۆئاگایی (لاشعوری) لە دەربڕینی تورەیی وهەڵچون، لەو نزیک سەعات و نیوەی کە وتووێژی ڕاشکاوانەمان خایاندی، چەند جارێک بە نائارامی و بێئۆقرەیی و هەڵچونەوە دەهاتە سەر چۆک، جامانەکەی لەسەری دادەگرت و بە یەقین و بڕوابەخۆبونێکی تەواو درێژەی بە قسەکانی دەدا و ئینجا جارێکیتر جامانەکەی لەسەری دەبەستەوە. سامان ی یاوەرم جگە لە سەرسوڕمان و بێدەنگی هیچی بۆ نەمابۆوە. بە داخەوە لە جەلال تاڵەبانیەوە شەپۆلێکی دەرونی و ڕۆحیی ئارامبەخش و دڵخۆشکەر، وەک ئەوەی لە کەسایەتیەکی خاوەن کاریزماوە چاوەڕێ دەکرێت، پرشنگی نەدایەوە هەتا ناخ و هەناوم گەرمبکاتەوە و پڕی بکات لە هیوا و ئومێد بە دوارۆژی ئەم شۆڕشە نوێیە!

جەلال تاڵەبانیم وا هاتە پێشچاو لە ژێر پەستان و گوشارێکی گەورەی ڕژێمی سەدام و(حسک) و (پدک) دا بێت، سوپەر مان هەر لە فیلمەکاندا هەیە، ڕاستە جەلال تاڵەبانی وزە و توانای جەستەیی و دەرونیی زۆری هەبو، بەڵام هەستم کرد ماندو و بێزار و وەڕسە لە دۆخەکە.

## دەرفەتێك بۆ هەردوكمان لەبارمان برد!

زۆر سەیربو، ئێستاش تێناگەم بۆ چی هەر لەسەرەتای دیدارەکەمان و پێش ئەوەی بکەوینە وتووێژی سیاسی، جەلال تاڵەبانی بە وردی لە منی نەپرسی، من کێم و بۆ چ مەبەستێک هاتومەتە لای ئەو و چۆن کەوتومەتە ناو (حسک)، بێگومان بیپرسیایە هەمویم بە ڕاستی پێدەوت. ئەی باشە من خۆم بۆ هەر لە سەرەتاوە خۆمم بەو نەناساند و بەسەرهاتی بەهەڵە کەوتنمە ناو (حسک) م بۆ باس نەکرد و ئامانجی هاتنەکەمم پێ نەوت؟ بەڕاستی کەف و کوڵ و پروزەیی و زاڵبونی لایەنی عاتیفی و هەڵچونی هەردوکمان، هەروەها دڵسۆزیی هەردوکمان بۆ شۆڕش، وتووێژەکەمانی بە ئاقارێکی نەباشی وادا برد کە من لە کۆتاییدا نەمتوانی نیازەکەی خۆمی پێ بڵێم کە من هاتوم بێمە ناو (ینک).

پروزە یی و بزێوی و نائارامی و قسە زۆرەکانی جەلال تاڵەبانی کە لە ڕەوانی و ڕونیدا دەتوت ئاوی تاڤگە بەخوڕەکەی ئەحمەداوا ی نزیک هەڵەبجەیە، نەیانهێشت کەمێک باسی خۆم بکەم، کێم و چۆن بوم بە (پ.م).

تەوژمی بەخوڕ و پڕ تین و تاوی تاڤگەکەی جەلال تاڵەبانی منیشی لەگەڵ خۆی لولدا و برد! جەلال تاڵەبانی لەم دیدارەدا هەڵەی ئەوەی کرد نەیتوانی دوای سەعات و نیوێک وتووێژ، من بناسێ وەک پزیشک و کەسێکی دڵسۆز و ڕۆشنبیرێکی گیرخواردو لە ناو (حسک) دا. بە نائومێدیەوە ڕاستەوخۆ گەڕامەوە بۆ بێدەلان بۆ لای دوکتۆرمەحمود.

## منیش وەك (دەیڤید هیرست) ی گاردیان

لە هەمان ئەو بارودۆخەی من باسیدەکەم لە مانگی ١١ ی ١٩٧٩، پەیامنێری ڕۆژنامەی گاردیان (دەیڤید هیرست) لە سەردانێکی کوردوستاندا، دیداری ڕۆژنامەوانی لەگەڵ ئەم سەرکردانە دەکات: سامی عبدالرحمن ی پارتی، دوکتۆرمەحمودی حیزبی سۆشیالیست، دوکتۆرعەبدولڕەحمان قاسملوی حیزبی دیموکرات، نەوشیروان مستەفای یەکێتیی نیشتمانی و هەروەها سەرکردەیکی حیزبی شیوعیی عیراقیش. نەوشیروان مستەفا لەسەر دیدارەکەی خۆی لەگەڵ (دەیڤید هیرست) دەنوسێت: «ئەوی سەرنجی دەیڤیدی ڕاکێشابو، ئەوەبو هەمو ئەم حیزبانە دژی یەکتری دوابون. سامی دژی یەکێتی و سۆشیالیست، دوکتۆرمەحمود دژی یەکێتی و پارتی، منیش دژی پارتی و سۆشیالیست. پرسیاری

سەرکیی دەیڤید دەربارەی هۆکانی ناکۆکیی نێوان حیزبە کوردیەکان بو، چەندی هەوڵم دا بۆی ڕون بکەمەوە عەقلی نەیبڕی». ئینجا سەیری نەگبەتیی من بکە! من لە سەردەمێکی ئاوادا بوم بە (پ.م)، منیش وەک (دەیڤید هیرست)، ئەو لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و سەرکردەکانی تر قسەیکردبو، منیش کە لەگەڵ دوکتۆرمەحمود و جەلال تاڵەبانی قسەم کردبو، عەقڵم نەیدەبڕی ئەم حیزبە کوردیانە بۆچی شەڕی یەکتر دەکەن!

## دەربازبون لەداوەکە

دیارە نائومێدکەرەکەی جەلال تاڵەبانی لەوە پەشیمانی نەکردمەوە کە هەر لە ڕۆژی یەکەمی ڕاکردنمەوە بڕیارم دابو کە دەبم بە کۆمەڵە و دەچمە ڕیزی (پ.م) کانی (ینک). بۆ گەیشتن بەم مەبەستە کە ئیتر نەدەکرا لەوە زیاتر لەبەر شەرم و لەڕوداوان دوایبخەم، دڵنیا نەبوم لەوەی (حسک) هەروا بێ هیچ کێشەیەک ڕێگە بە من بدات لە چەمەکەی کە بنکەکانی ئەوانی جیادەکردەوە لە بنکەکانی (ینک) بپەڕمەوە و ڕاستەوخۆ خۆم بگەیەنمە بنکەکانی (ینک).

ڕۆژی ٢٩ ی ١٠ی ١٩٧٩ خولی یەکەمی شەڕی ڕژێمی ئێران و کوردی ئێران وەستا. بە بیانوی ئەوەی دەرمانمان نەماوە و دەبێت دەرمان پەیدابکەم، لە کۆتایی مانگی ١١ی ١٩٧٩ لە گەڵ دوکتۆر مەحمود ڕۆشتم بۆ مهاباد بە نیازی ئەوەی لەوێوە پەیوەندی بە کۆمەڵە بکەم و خۆم بگەیەنمە بنکەکانی (ینک). لە مهاباد کە ئیتر ترسی ئەوەم نەبو نیازی خۆم بڵێم، دوکتۆر مەحمودم ئاگادارکردەوە کەئیتر ناگەڕێمەوە لایان و تا ئەوکاتەش هەر خۆم بە میوان زانیوە، میوان لای مولازم تایەر و دوکتۆر مەحمود خۆی. دوکتۆرمەحمود هەوڵی لەگەڵم نەدا پەشیمانم بکاتەوە لە بڕیارەکەم، دیاربو دەیزانی هەوڵێکی وا سودی نیە. لە وەڵاما پێی وتم: بڕیاری خۆتە و ئازادی چی دەکەیت. بێگومان بڕیارەکەمی پێ خۆش نەبو، بەڵام کە زانیی بڕیاری کۆتاییمە، ئینجا باسی ئەوەی کرد کە دۆستایەتیەکی نزیکی لەگەڵ (د.کەندال نەزان) هەیە کە سیاسەتوانێکی کوردی باکورە و لە پاریس دەژی، ئەگەر بمەوێ ئەو(د.مەحمود) دەتوانێ لە ڕێگای (د.کەندال نەزان) وە بمنێرێ بۆ فەرەنسا بۆ ئەوەی لەوێ درێژە بە خوێندنی پسپۆڕیی پزیشکی بدەم. دیارە د.مەحمود لە بەزەیی و دڵسۆزیە وە بو بۆ من، چونکە دەیزانی دوکتۆرێکی دڵسۆز و ڕابوردوپاک و بێ کێشەی وەک من بچێتە ناو (ینک)، ئایندەیەکی نادیارچاوەڕیی دەکات.

## خەیاڵەکان بەرەنگاری یەکتر دەبنەوە !

لەو کاتەدا د. مەحمود ئەو پێشنیازە دڵڕفێنەی دەخستە بەردەمم، هەڵۆی تیژفڕی خەیاڵە بزێو و زوئامادەکەم دابوی لە شەقەی باڵ، بنمیچ و دیوارە ئەستورەکانی ئەو زیندانانەی ڕژێمی سەدامی بڕیبو کە سەرکاروانی شەهیدانی کۆمەڵە (شەهاب و جەحفەر و ئەنوەر) و کادیرانی تر وەک شەهید ئاشتی (ئەبوبەکر شێخ نوری) و(شەهید وەستا ئەنوەری هەڵەبجەیی) و... تێیاندا چاوەڕێی حوکمی مەرگیان کردبو. نرکە و نەڕە و وێنەی دەموچاوی ئەو سەرکردە و کادیرانەی کۆمەڵە م دەهاتەوە بەر گوێ و بەر چاو کە لە ئەشکەنجەگاکانی ڕژێمی سەدام پێش لە سێدارە دانیان ئەم دروشمانەیان بەڕوی جەلادەکانا وتبۆوە:

**کەم ژیام و کەڵ ژیام.**

**بێباک لەبەردەم سێدارەی دوژمن   پەتی خنکاندن دەنێمە گەردن**

**کرێکارێکی هەژاری کوردم     هچ پەشیمان نیم لەوەی کە کردم**

بەڕاستی جۆش و خرۆشی خەباتی ڕەوا و ئومێدبەخشی (پ.م) کانی (ینک) و ڕێکخراوە نهێنیەکانی کۆمەڵە لە شارەکاندا، لە دڵ و دەرون و ویژدانی مندا هێشتا لە کەف و کوڵ نەکەوتبون. ئەم جەمسەرەی موگناتیزەکەی چارەنوس زۆر بەهێزتربو لە جەمسەرەکەی تری، کە ژیان بەسەربردن و خوێندن و گەشت و گوزار بو لە پاریس. پیاسەی سەر جادەی (شانزلیزە) و سەرکەوتن بە بورجی (ئایفل) دا و گەڕان بە ناو هۆڵ و دالانەکانی مۆزەخانەی (لوڤەر) و) ڤەرسای)، هەمو ئەوانە لە چاوی خەیاڵمدا بێهێز و لاواز وکاڵ و تەمومژاوی دەرکەوتن. من کە لەو ڕۆژانەدا لە تافی لاویم دا بوم، تەنانەت خەیاڵی کات بەسەربردنی گەنجانەش لە دیسکۆ وسەماگە کانی پاریس، کە جمەیان دەهات لە کچانی زراڤ وجوان و دڵڕفێن و مینیجۆپ لەبەر،هەر کاری تێنەکردم، ئەو خەیاڵە خۆشانەش هەر زو تێپەڕین و ئاوابون.

## جیابونەوەیەکی دۆستانە

تازە منی تنۆکە ئاو کەوتبومە ناوەڕستی لەهی و لافاوی ڕامالەری ڕوباری کوردایەتیی مرۆڤدۆستانە و پێشکەوتنخواز. ئەو ڕوبارەی هەرگیز لە ڕۆشتن

ناوەستێ هەتا نەگاتە دەریای دنیایەکی ئارام و ئازاد و دادپەروەر و پڕلە جوانی. تازە ئیتر زۆر ئەستەم بو لە تەوژمی ئەو ڕوبارە خۆم جیابکەمەوە و بێمەدەرەوە.

سوپاسی د. مەحمودم کرد بۆهەڵوێستەکەی و پێشنیازەکەی، خواحافیزیەکی دۆستانە و گەرمان لەیەکتر کرد و لەیەک جیابوینەوە. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئیتر بە شەخسی د.مەحمودم نەبینیەوە.

## ئەوەی ویستم، کردم !

بۆ ڕۆژی دوایی لە مهاباد، دوای گەڕان بەدوای برادەرانی یەکێتی (فەرەیدون عبدالقادر) و (بابەتایەر بەرزنجی) م دۆزیەوە. خۆمم وەک دوکتۆرهەژار پێناساندن. پێشتر من لە ناو (حسک) دا هەر بە (دوکتۆرعەبدولڕەحمان) ناسرابوم کە ناوی ڕاستەقینەی خۆم بو. ناسناوی (هەژار) م هەڵبژارد وەک هێما بۆئەوەی من دەمویست بە تایبەتی ببمە دوکتۆری هەژارانی کوردوستان. لە سەر داوای خۆم، لەگەڵ دو (پ.م) دا و نامەیەکی کاک فەریدون ناردیانم بۆ خڕی نێوزەنگ کە بنکەکانی سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵەی لێبو. دو (پ.م) کە بردیانم بۆ بنکەی (دوکتۆرخدر مەعسوم) لە شوێنێک بە ناوی(زەڵێ) کە نزیک نێوزەنگ بو، نامەکەی کاک فەرەیدونیان دایە دەست د.خدر و خواحافیزیان لێکردین. دیاربو لە بەر ئەوەی پزیشک بوم بۆیە کاک فەرەیدون ناردمی بۆ لای د.خدر.

## دوکتۆر خدر مەعسوم

دوکتۆرخدر برای د. فوئاد مەعسومە، د.خدر پاش تەواوکردنی خوێندن لە کۆلیجی پزیشکی لە قاهیرە، وەک یەکەم دوکتۆری ناو (ینک) لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دا گەڕابۆوە بۆ کوردوستان. دوکتۆر خدر جگە لەوەی دوکتۆریی دەکرد، لێپرسراوی لقی سێی (ینک) ی دەڤەری پشدەر بو. ئیتر منیش لە بنکەکەی ئەو بە فەرمی دامەزرام و جێگەی خەویان بۆ دابینکردم. ڕۆژانە کەوتمە کاری دوکتۆریی خۆم. جگە لەوە ناوبەناویش پێکەوە لەگەڵ د.خدر خولی فریاکەوتن و تیمارکەریمان بۆ کادیر و (پ.م) کان دەکردەوە کە تێیدا دەرزلێدان و تیمارکردنی برین و فریاکەوتنی سەرەتایی بریندار و نەخۆش مان فێردەکردن. بە هۆی زۆریی کاتەوە و حەزم لە خوێندنەوە، هەرچیەکیشم لە

کتێب و بڵاوکراوەی سیاسی بەردەست بکەوتایە دەم خوێندەوە. دوکتۆر خدر سەر بە خەتی گشتی بو، بە هاوکاریی (ڕەهبەری سەید ئیبرهیم) و لالۆ (عبدالرحمانی عەبەلالە) ی پێنجوێنی و (مام ڕەسوڵ) ی قەڵادزەیی بنکەکەیان بە ڕێکوپێکی و بێ کێشەوناکۆکی دەبردبەڕێوە. بە ڕاستی ئەو چەند مانگەی بەسەربردنی ژیانم لەگەڵ ئەو سێ بەڕێزە و (پ.م) کانی تردا کاتێکی خۆشبو. دوکتۆر خدر پیاوێکی زۆر بەڕێز وسادە و خاکی و قسەخۆش و دەمبەخەندە بو. ڕەهبەر کوڕێکی بەڕێزو ڕۆشنبیر و هەستناسک و ڕو لە شیعر و ڕۆشنبیری بو. دواتر کە بوبە سەرتیپ بەلامەوە سەیر بو ئەم شیعردۆستە چۆن بوە بە فەرماندەیەکی سەربازی، ڕەهبەر زۆر لە جەلال تاڵەبانیەوە نزیک بو و سەرسام بو پێی. کوڕێکی تەمەن ١٨ساڵی سادەی کەم خوێندەواری قەڵادزەیی بە ناوی (مەلا وریا) کە لە بنکەکەمان بو دەنگی زۆر خۆشبو، زو زو گۆرانیی بە سۆزی بۆدەوتین، بەداخەوە دواتر شەهید بو. (دڵشادی مام عەلیی کۆیی) کە ناسناوی (کوێخا) ی وەرگرتبو قسەی خۆشی بۆ دەکردین. لە هەمو ئەو ماوەیەدا کە لە بنکەکەی دوکتۆر خدر بوم، لە سەر خواستی خۆم نەبوایە پاسەوانیان پێنەدەگرتم و چێشتیان پێ لێنەدەنام،ماڵیان ئاوابێت! پاش چەند هەفتەیەک (دوکتۆر شادمان فوئاد مەستی) ش هاتە بنکەکەمان، د.شادمان لە گەڵ میرانی برایدا لە یۆگۆسلاڤیاوە گەڕابۆوە و بوبون بە (پ.م). بنکەکەمان بوبە (ماڵی پزیشکان) کە لە نەخۆشخانە گەورەکاندا دوکتۆرە نیشتەجێکان تێیدا دەژین. هەر سێ پزیشکەکە بوین بە تیمێکی گونجاو و کارا، کە کارە پزیشکیە جۆراوجۆرەکانمان بە باشی ڕادەپەڕاند. د.خدریش ئیتر کاتی زۆرتری هەبو بۆ ئەنجامدانی ئەرکە سیاسیەکانی.

### نەجمەدین بیوک کایا

ئێوارەیەک کوڕێکی تەمەن ٣٥ ساڵی کوردی تورکیا بوبە میوانمان و پێکەوە نانی ئێوارەمان خوارد، شەو لامان خەوت و دوای نانی بەیانی ماڵاوایی لێکردین. دوکتۆرخدر ئەو کوڕەی بە پارێزەر(سەلاح) بە ئێمە ناساند، بەڕاستی هەرگیز کەسێتیی ئارام و مەند و قورسی (سەلاح) م بیرناچێتەوە. دواتر زانیم ئەو سەلاحە (نەجمەدین بیوک کایا) یە کە لە کوڕی خەباتدا بە (نەجۆ) دەناسرا. لە کتێبی (لە دانوبەوە بۆ خڕی نێوزەنگ) نەوشیروان مستەفا باسی کوردپەروەری و دڵسۆزی و ئازایەتیی (نەجۆ) دەکات لە بەدەستخستنی چەک وفیشەک لە تورکیا بۆ یەکێتیی نیشتمانی.

دواتر (نەجۆ) لە ناوجەرگەی خەباتی کوردوستانی باکوردا دەگیرێ و لە زیندانی (دیاربەکر) لەناودەبرێ. کە ٢٠٠٩ بەیەکجاری گەڕامەوە کوردوستان زۆر دڵشادبوم کە بینیم پارکێک لە سەر جادە شەستیەکە لە سەر ڕێی عەربەت لە سلێمانی بە ناوی ئەوەوە(نەجمەدین بیوک کایا) ناونراوە.

## چی تۆی هێنا بۆ نێوزەنگ ؟

دواتر کە لە ئەڵمانیا گیرسامەوە و بە حەز و ویستی خۆم دەروونناسیم خوێند و وەک دوکتۆری دەرونی دەیان ساڵ کارم کرد، زۆر جار لە دیدگایەکی دەرونیەوە بیرم لە ساڵانی پێشمەرگایەتی دەکردەوە و، بۆم دەرکەوت هەندێ کەس کە دەهاتنە ناو شۆڕش، هۆ دەرونی و کۆمەڵایەتیەکان هۆی سەرەکی بون کە پاڵی پێوە نابون بۆ ئەوەی ببن بە پێشمەرگە.

بنکەی ڕاگەیاندنی (ینک) لە زەڵێ بو، چەند هەنگاوێک لە بنکەکەی ئێمەوە دوربو. مامۆستا جەعفەر(فازیل کەریم) وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی لێپرسراوی بو، (حسەین سنجارِی) لە بنکەی ڕاگەیاندن لای مامۆستا جەعفەر دامەزرابو، حسەین لە چاو ئێمەدا زۆر گرنگیی بە ڕوخسار و جل و بەرگی دەدا. حسەین سمێڵێکی قیتی هەبو کە ئەمسەروئەوسەری بۆ سەرەوە لول دەکرد، ئەو خزمی نزیکی (سامی عبدالرحمن) ی پارتی بو. حسەین لە نەمساوە گەڕابۆوە و لە ناو (ینک) دا سەر بە خەتی گشتی بو و خۆی زۆر لە جەلال تاڵەبانی نزیک دەکردەوە. حسەین نەیدەویست لە ئەرک و ئیش وکاری ڕۆژانەی بنکە کەیاندا وەک پاسەوانی و چێشت لێنان و زۆپا گەرمکردن و بانماڵین و بانگێڕان...هاوتا و هاوشان لەگەڵ هاوخەباتەکانی تریدا، بەشداری بکات. ئەو کە وەک گوێزی کوێر ساغ و تۆکمە بو، تکای لە دوکتۆرخدر کرد پشتگیرینامەی بۆ بکات کە نەخۆشە و ناتوانێ کاربکات، د.خدری خستە هەڵوێستێکی ناخۆشەوە! دواتر لە ساڵی ١٩٨٤ لە کاتی وتووێژی (ینک) و ڕژێمی سەدام، بە هۆی ڕەفتاری نادروست و خەوشئامێزەوە بوبە هۆی ئاژاوەیەکی گەورە لە ناو دوکتۆر و کارمەندەکانی شۆڕشدا. کێشەکە جەلال تاڵەبانیی زۆر تورەکرد، مام لایەنگریی حسەین سنجارِیی کرد و سزای دوکتۆرەکانی شۆڕشی دا بەتایبەتی د.فایق گوڵپی و دڵیانی ئێشاند. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام زۆر لە پارتی نزیک بۆوە، بەڵام لە هەمان کاتدا توانی پەیوەندیە بەهێزەکەی لە گەڵ جەلال تاڵەبانی درێژە پێبدا و بەمە

توانی له پشکی یەکێتیی نیشتمانی پۆستی سەفیری عێراق له پورتوگال بەدەست بینی، جا تەماشا بکە! ئێستاش له خۆم دەپرسم چی (حسەین سنجاری) ی هێنا بۆ نیوزەنگ ؟

هەر لەو بنکەی ڕاگەیاندنەی زەڵی، شاعیر (جەمیل ڕەنجبەر (م ناسی که پیاوێکی روخۆش وسەنگین وئارام وکەمدوبو، بەداخەوە دواتر که دابەزی بۆ دەڤەری هەولێر شەهید بو.

## نەوشیروان مستەفا و تیوریی سێ جیهانی

ڕۆژێک له دانیشتنێک دا له بنکەی ڕاگەیاندنی (ینک)، (دوکتۆر جەعفەری شەفیعی) ی ئەندامی دامەزرێنەر وئەندای کۆمیتە ناوەندیی کۆمەڵەی ئێرانم ناسی. بەڕاستی مرۆڤێکی تێکۆشەر و پاک و خۆشەویست و ڕوخۆش بو. وتووێژی سیاسی و فکریمان دەکرد. ئەو بەرگریی له ئێرانیبونی کۆمەڵەی ئێران دەکرد، ئێمەش بەرگریمان له کوردستانیبونی کۆمەڵە دەکرد و پێمان دەوت: زۆر حەیفە ئەم ئەندام و کادیر و ڕۆشنبیر و دڵسۆزانەی ئێوە بکرێن بە قوربانی چینی کرێکاری ئێرانی له ئەسفەهان و شیراز و تاران؛ لەسەری دەڕۆیشتین و پێمان دەوت:کوردوستانی ئێران که له ژێر باری چەوساندنە وە و دواکەوتندا دەناڵێنێ زۆر زۆر پێویستیی زیاتری بە ئێوە هەیە هەتا ناوچە فارس و ئازەر و تورکنشینەکان. لەو سەرو بەندەدا زۆر جار ئەم باسانە له نێوان پێشمەرگە و کادیرەکانی کۆمەڵە وکۆمەڵەی ئێران دەکرا. جارێک چەند مارکسی و چەپێکی کوردی ئێران لای نەوشیروان مستەفا دەبن، باسی تیوریی سێ جیهانی دەکەن. نەوشیروان وەک سەرکردەیەکی واقیعبین و پراگماتیکی پێیان دەڵێ: ئێمە ئێستا زۆرتر سەرگەرمی ئەوەین چەند ئێستر و بارگین بۆ گوێزانەوەی خۆراک و چەک و فیشەک بۆ (پ.م) کانمان پەیدابکەین، وە ئەمەمان لا گرنگترە هەتا باسە تیوری و وشک و خۆڵەمێشیەکانی وەک دابەشکردنی دونیا بۆ سێ جۆر سیستم و وڵات! دامەزرێنەری کۆماری گەلیی چین (ماوتسی تۆنگ) باوکی داهێنەری تیوریی سێ جیهان بو، ئەم تیوریە که له ساڵەکانی ۱۹۷۰ دا دەرکەوت، دنیای کردبو بە سێ جۆر له وڵاتان، جیهانی یەکەم ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤێت بو، جیهانی دوهەم کەنەدا و ئەوروپا و یابان بو، جیهانی سێهەم جگە له یابان هەمو وڵاتانی ئاسیا بو بە چین خۆیشیەوە و هەروەها هەمو وڵاتانی ئەفریقا و

ئەمریکای باشور (لاتینی). سەردەمێکی سەیر بو! بە پشت و کوڵی ئێستر و بە شان و باهوی (پ.م) ڕۆژانە بە سەختی نان و ئاو و سادەترین پێویستیەکانی ژیانمان بۆ دابین دەکرا، بەردەوام لە ژێر مەترسیی بۆمبابارانی فڕۆکە جەنگیەکانی عێراق بوین، کەچی لە بنکەکانی کۆمەڵە و (ینک) لە نێوزەنگ، لە ناو ئەو داروبەرد و لێرەوارەی دوربو لە هەمو ڕوخسارەکانی مەدەنیەت، باس وخواسی ئایدیۆلۆجی و سیاسەتی نێونەتەوەیی وا دەکرا، وەک ئەوەی لە ساڵۆنە ڕازاوەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان بین لە شاری نیۆرک!

## چێشتی مجەور لە قازانێك دا!

ناوچەی بناری زنجیرە چیای مامەندە بە دیوی ئێراندا کە بنکەکانی سەرکردایەتیی (ینک)ی لێدانرابو، پێکهاتبو لە گوندەکانی شێنێ و هەوارەکانی زەڵێ و نێوزەنگ و توژەڵە و نۆکان. کە رژێمی شا ڕوخا و هێشتا ڕژێمی خومێنی خۆی نەگرتبو، ئەو ناوچەیە کرانەوە یەکی سەیری بەخۆوە بینی.

لە سەرەتای ١٩٧٩ وە حیزبی شیوعی وردە وردە لەو ناوچەیە بنکە کانی دانا. حیزبی (تودە ی ئێران) یش بنکەیەکی بچوکی دانا. چەند (پ.م) یەکی کوردی تورکیاش کە پێموایە سەر بە (ڕێکخراوی ئاڵای ڕزگاری) بون بنکەیان دانابو. دواتر لە ١٢ی ١١ ی ١٩٨٠بەرەی نیشتمانی نەتەوەیی دیموکراتی (جوقد) ڕاگەیەندرا کە لەم حیزبانە پێکهاتبو: (ینک)، (حشع)، (حسک)، حیزبی بەعسی سەر بە سوریا (ئەبو سەلاح)، بزوتنەوەی ئیشتراکیی عەرەبی (ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر) کە بیروڕاکنی جمال عبدالنصر یان هەبو،سوپای ڕزگاریی گەلی عێراق (حسەین سەکسول) کە مارکسی بون، کۆمەڵی (بیت النهرین) کە مەسیحیەکانی لەخۆگرتبو و هەروەها کەسایەتیە سەربەخۆکان. حکومەتی سوریا ی حافیز ئەسەد و لیبیای قەزافی پشتگیریکەری ئەم بەرەیە بون. پێکهاتە جۆراوجۆر و جیاواز و دژبەیەکەکانی (جوقد)، وەک تەسبیحێکی سەیر و سەرنجڕاکێش وابو، جەلال تالەبانی کە کەسایەتیی سەرەکیی بەرەکە بو، وەک پەتی بەیەکەوە گرێدەری دەنکە ڕەنگاوڕەنگەکانی تەسبیحەکەبو. هەمو ئەم حیزبانە لەو چەند کیلومەتر چوارگۆشە ئازادکراوەی سەر سنوردا بنکەی خۆیان هەبو. هەندێ جار وەک ڕەخنە و گاڵتەپێکردن بە حیزبە بچوکەکانیان دەوت (دوکانی سیاسی). (جوقد) دەیویست لە نێوزەنگەوە شۆڕشی کوردوستان بکات بە شۆڕشێکی سەرتاسەریی عێراقی و ڕژێمی سەدامی پێ بروخێنێ. لە زستانی ١٩٧٩ / ١٩٨٠ لە بنکەکانی سەرکردایەتی

ئەم کەسایەتیانەم بینی وناسی و لە کۆڕ ودانیشتنەکانیان دا بەشدار دەبوم: سالار عەزیز، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، (محەمەدی موهتەدی) ی کوردی ئێران کە بە پەیرەوکەری (ترۆتسکی) ناسرابو، (هەڤاڵ خەجێ) ژنێک بو سەرۆکی حیزبی (ئاڵای رزگاری) کوردوستانی تورکیا بو، (عومەر شێخ موس) ی کوردی سوریا کە یەکێ لە دامەزرێنەران و ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بو لەسەر خەتی گشتی، کە من بینیم هاوژینە سویدیەکەی (ئەگنیتا) شی لەگەڵ بو، یوسف زوزانیی کوردی سوریا، ئەبو شەهاب (ئیحسان کەرکوک)ی کە لێپرسراوی لقی سلێمانیی یەکێتی بو.

## حیلفی وارشۆلە نێوزەنگ!

زستانی ۱۹۸۰ کە لە (نیوزەنگ) بوم، لە سەر داوی من دانیشتنێکی تایبەتیم بە تەنیا لە گەڵ ئەبو شەهاب کرد کە بەرپرسی لقی سلێمانیی (ینک) بو، پێشنیازم کرد: من وەک چاوساغ لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بە شەو بنێرێتە ناو شاری سلێمانیەوە بۆ فڕاندنی ئەو چەند دوکتۆر و کارمەندە پزیشکیانەی خەڵکی وڵاتی (کوبا) بون و لە نەخۆشخانەی سلێمانی کاریان دەکرد. لێپرسراوەکەیان (دوکتورئەدواردۆ) ی نەشتەرگەری جومگە و ئێسقان بوکە پێشتر وەک دوکتۆر کارم لەگەڵ کردبون. من هەموی چوار مانگێک بو هاتبومە شاخ، باش شارەزای کات و خشتەی بەرنامەی کاری ڕۆژانەیان بوم و دەمزانی لە کوێ دەژین. ئەبو شەهاب پێشنیازەکەمی پەسەند نەکرد و وتی بە چالاکیەکی ئاوا ئێمە دڵی (بلۆکی وارشۆی سۆشیالیست) ی دۆستمان دەڕەنجێنین چونکە کوبا سەر بە بلۆکی وارشۆ یە. ئەمە لە کاتێکدا بو نە وڵاتانی بلۆکی (وارشۆ) ی سۆشیالیستی و نە وڵاتانی بلۆکی (ناتۆ) ی سەرمایەداری و کۆلۆنیالیست هیچ حیسابێکیان بۆ ئێمە نەدەکرد و لە هەواڵنامەی میدیا جیهانێکاندا باسی کوردی عێراق بە گشتی بەدەگمەن دەکرا. میدیاکانی وڵاتانی بلۆکی وارشۆ و یەکێتیی سۆڤێت کە ڕابەری ئەو بلۆکە بو ئەو دەگمەنەشیان نەبو، لە کولەکەی تەریشدا باسی کوردیان نەدەکرد! من دەمویست بە چالاکیەکی ئاوا ئەو دیواری بێدەنگیە سەنگینەی بەدوەرماندا کێشرابو بشکێنین، بۆ ئەوەی بۆ جارێکیش بوە دەنگمان بگاتە میدیا جیهانیەکان. ڕەنگە هۆیەکی تری پەسەندنەکردنی ئەو چالاکیە ی من پێشنیازم کرد، نیگەرانیی ئەبو شەهاب بوبێت لەوەی نەوەک دوکتورێکی شۆڕش و چەند (پ.م) یەک لەو چالاکیە پێشنیازکراوەدا بگیرێن یا بریندار بن یا بکوژرێن.

## وەهمێکی گەورەی درێژخایەن!

چ وەهمێکی گەورە بو، چ درۆیەکی شاخداربو، چ هەڵەیەکی گەورەبو، کە نەک هەر حیزبی شیوعی بەڵکو (ینک) و (پدک) و (حسک) یشی تێکەوتبون، کاتێک بڕوایان وابو یەکێتیی سۆڤیێت و شوێنکەوتوەکانی لە بلۆکی وارشۆ دۆست و ڕزگارکەری گەلانی چەوساوە و ژێردەستی وەک کوردن! ئەم بۆچونە هەڵەیە لەساڵەکانی ١٩٥٠ بەدواوە درێژەی هەبو تا ڕوخانی سۆڤیێت و هەڵوەشانەوەی بلۆکی وارشۆ لە ساڵی ١٩٩١. وڵاتانی بلۆکی وارشۆ ساڵانە ژمارەیەکی کەم لە خوێندکارانی سەر بە (حشع) ی وەردەگرت لە زانکۆکانیاندا. زۆربەی ئەو خوێندکارانە کوڕ و کچی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی (حشع) بون یان دەبوایە لە لایەن ئەوانەوە پەسەند بکرانایە، بەمەیان دەوت (زەماڵە). ئەڵبەتە بلۆکی وارشۆ هەمان زەماڵەی دەدا بە هەمو حیزبە شیوعیەکانی سەر بە خۆی لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای باشور، کەواتە ئەم چاکەیە شتێک نەبو تایبەت بێت بە کورد و دڵنیاشم بێ بەرامبەر نەبو! ئایا ئەمە بەسە و بەڵگەی ئەوەیە کە یەکێتیی سۆڤیێت و هاوپەیمانەکانی دۆستی ستراتیجیی کورد بن؟ دوای هەشت ساڵ کە هەڵەبجە کیمیاباران کرا و هەمو دنیا بە چاوی خۆی قوربانییەکانی لە تەلەفیزۆنا بینی، کەچی ڕۆژنامەی (براڤدا) ی زمانحاڵی حیزبی شیوعیی سۆڤیێتی، وەک میدیاکانی ڕژێمی سەدام هەر نکولیی لە کیمیابارانی هەڵەبجە کرد و دەیوت شتی وا ڕوینەداوە!

## کە دوژمن ئیشی پێتان نەما!

شای ئێران لە بەرامبەر وەرگرتنی نیوەی (شط العرب) لە سەدام، پشتی کردە کورد و شکستێکی گەورەی بەسەر کوردی عێراق هێنا. ڕژێمی سەدام بە ڕێکەوتنی لەگەڵ شا ی ئێران لە ٦ ی ٣ ی ١٩٧٥ لە جەزائیر ئیتر ئیشی نەما بەو هاوپەیمانیە کاتیەی کە لە گەڵ (حشع) لە ١٧ ی تەموزی ساڵی ١٩٧٣ وە بەستبوی. (حشع) بە ئامۆژگاریی یا فەرمانی ڕاستەوخۆی یەکێتیی سۆڤیێت چوبوە بەرەیەکەوە کە بەعس سەرکردایەتیی دەکرد. کە شۆڕشی ئەیلول ئاشبەتاڵی کرد، ڕژێمی سەدام ئینجا وردە وردە کەوتە گیانی کادیر و ئەندامەکانی (حشع) لە سەرتاسەری عێراقدا. ئەندامە کوردەکانی (حشع) لە

سالی ١٩٧٨ / ١٩٧٩ بەدواوە ناچاربون بۆ ڕزگارکردنی ژیانیان و درێژەدان بە خەباتەکەیان ڕوبکەنە چیاکانی کوردوستان و ببنە (پ.م). شیوعیە عەرەبە داماوەکان ئەم دەرفەتەیان بە سەختی دەست دەکەوت چونکە دور بون لە کوردوستانەوە. لەو کاتەدا بۆ (حشع) نزیکترین و ئاسایشترین بنکەکان کە دەستیان پێ ڕادەگەیشت بنکەکانی (ینک) بو. ئەوەبو (ئەحمەد بانیخێلانی) کە ئەندامی کۆمیتە مەرکەزیی (حشع) بو لە ڕۆژی ١٦ ی ١ ی ١٩٧٩ گەیشتە نێوزەنگ و جەلال تاڵەبانیی بینی. (ئەحمەد بانیخێلانی) لە چاپی دوهەمی لاپەڕە ٣١٧ ی (یادەوەریەکانم) دا دەنوسێ: "بە گەیشتنی هاوڕێیانی حیزبی شیوعی بۆ شاخ برادەرانی یەکێتی زۆر گەشانەوە و پێیان وابو حیزبی شیوعی کە دەبێتە حیزبێکی بەرهەڵستکار هەمو ولاتانی سۆشیالیستی پشتیوانیی دەکەن و ئەمەش کۆمەکێکی نوێ دەبێ بۆ ئەوان". دیارە ئەحمەد بانیخێلانی لە جەلال تاڵەبانی باشتر یەکێتیی سۆڤێتی دەناسی کە دۆستی گەلان نییە، بۆیە گاڵتە و لاقرتی بەوانە دەکات کە وادەزانن یەکێتیی سۆڤێت و هاوپەیمانەکانی دۆستی گەلانی چاوساوە و ژێردەستەی وەک کوردن.

## سەرەتایەکی خۆش و دروستکەر

حیزبی شیوعی وردە وردە لە (زەڵێ) و (نۆکان) لە نزیک بنکەکانی سەرکردایەتیی (ینک) چەند بنکەیەکیان دانا. سەرکردایەتیی یەکێتی زۆر دڵشادبو بە وازهێنانی (حشع) لە ڕژێم و بون بە پێشمەرگەی سەرکردە و کادیر و ئەندامەکانی، (ینک) لەم هەنگاوەدا پشتگیریی گەرمی لە (حشع) کرد. (پ.م) و کادیرەکانی هەردولا ڕێزی تایبەتیی یەکتریان دەگرت. من کە لە نێوزەنگ بوم پەیوەندیەکی زۆرباشم لەگەڵ دوکتۆرەکەیان (د.صادق) و کادیرەکانیان هەبو. هەمو جارێ کادیری دێرینیان (سەید باقی هانەسورەیی) کە خزمم بو ژمارەی نوێی ڕۆژنامەی(طریق الشعب) ی بۆ دەهێنام و بە زەردەخەنەیەکی پاک و بێگەرد و دۆستانەوە دەیوت فەرمو خزم (هەڵمی لێ هەڵدەسێ)، مەبەستی لەوەبو تازە دەرچوە. (د.صادق) عەرەب بو، لە نێوزەنگ بنکەی تەندروستیی (حشع) ی دەبرد بەڕێوە، هاوڕێیەتی و هاوپیشەییەکی خۆش و دروستکەرمان هەبو و هاوکاریی یەکترمان دەکرد.

## وێنەکان لە دورەوە جوانتر دیارن!

لە و سێ مانگەی مانەوەم دا لە نێوزەنگ، وردە وردە لە بەشداریکردنم لە دانیشتنەکان و کۆر و کۆبونەوەکاندا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ناکۆکی و کێبەرکێی یەکی ناتەندروست هەیە لە نێوان کۆمەڵە لە لایەک و بزوتنەوەی سۆشیالیستی و هێڵی گشتی لە لاکەی تر . کەسە سەربەخۆکانی ناو یەکێتی کە نە کۆمەڵە بون و نە بزوتنەوە بون ، وەک دوکتۆر فوئاد مەعسوم و دوکتۆر خدری برای و دوکتۆر عومەر شێخ موسی خەڵکی عامودای سوریا ، پێیان دەوتن (هێڵی گشتی یا هێڵی پان) . لە ١٥ ی ئابی ١٩٨٣ بزوتنەوە و هێڵی گشتی یەکیان گرت و(یەکێتیی شۆڕشگێرانی کوردوستان) یان دروستکرد. کاتێک بە ڕەسمی چومە ناو کۆمەڵەوە ، وردەوردە بۆم دەرکەوت کە لە ناو خودی کۆمەڵە یشدا ناکۆکی و کێبەرکێی فیکری و شەخسیی ناتەندروست و روخێنەری جۆراوجۆر هەیە . لە زستانی ١٩٧٩ / ١٩٨٠ لە ناو کۆمەڵە دا سێ دەستە هەبون، دەستەی یەکەم : (سالار عەزیز) و(مەلا بەختیار) کە پێشتر لە گەڵ (شاسوار جەلال – ئارام) و ئازاد هەورامی و چەند کادیرێکی تر، لە دوای گیرانی شەهاب و ئەنوەر و جەعفەر (کۆمیتەی هەرێمەکان) ی کۆمەڵە یان دروستکردبو. ئەمانە لە هەل و مەرجێکی گەلێک سەخت و پڕمەترسیدا لە ناوەوەی وڵات رۆڵێکی گرنگیان گێڕابو لە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە و پەیوەندیکردن بە (ینک) لە دەرەوەی وڵات و دەسپێکردنەوەی خەباتی چەکدار، فازیل کەریم ئەحمەد (مامۆستا جەعفەر) یش کە ماوەیەک ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی و بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیەندنی یەکێتی بو، سەر بەم دەستەیە بو. دەستەی دوهەم: نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتیی دەکردن و بەشێکی زۆری ڕێکخستنەکانی شار و شاخی کۆمەڵە و بەرپرسە سەربازیەکانی پێشمەرگە لایەنگریی ئەمیان دەکرد. دەستەی سێهەم بە (دەستەی زیندان) ناسرابون، ئەمانە سەرکردەکانی تری کۆمەڵە بون کە دوای ئاشبەتاڵ و لە سێدارەدانی شەهاب و ئەنوەر و جەعفەر گیرابون ولە مانگی ٨ ی ١٩٧٩بە لێبوردنی گشتیی سەدام ، لە زیندان ئازادکرابون. ئەمانە بەرودوا دوای چەند هەفتەیەک خۆیان گەیاندبوە نێوزەنگ ، ئەمانە بریتیبون لە: عومەری سەید عەلی،دارۆی شێخ نوری، جەبار فرمان، فەرەیدون عبدالقادر، ئاسۆی شێخ نوری، ئاوات عبدالغفور ، ئەنوەر حەسەن، عەلی بچکۆل، کاکە عەبە و ئەرسەلان بایز. ململانێ نیوە ئاشکرا – نیوە نهێنیەکانی ناو کۆمەڵە بەتایبەتی لە نێوان دەستەی نەوشیروان و کۆمیتەی هەرێمەکان دا دەبینرا. دەستەی زیندان وادیاربو لە ناوخۆیاندا زۆر لەیەک

نزیک بن و بەڕوی کەسانی تردا برێک داخراو بن . (دەستەی زیندان) خوێنێکی گەش و نوێیان کردە ناو جەستەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بە گشتی و ڕێکخستنەکانی ناو (پ.م ) بەتایبەتی، ئەوان سەرگەرمی گەشەپێدانی کۆمەڵە بون بە پێی نەخشە و پلان و بیروڕاکانی خۆیان ، بەڵام دواتر کە بۆیان دەرکەوت ناتوانن ببنە زۆرایەتی لە ناو کۆمەڵە دا ، وردە وردە دایەنە پاڵ دەستەی نەوشیروان مستەفا.

## جیاوازبون ، ناکۆك بون

جیاوازبون ئاساییترین شتی ناو سروشت و کۆمەڵە، من و تۆ و ئەو لە یەکتر جیاوازین، بەڵام دەتوانین بۆ گەیشتن بە هەندێ ئامانجی هاوبەش پێکەوە کاربکەین، جیاوازبون واتای ناکۆک بون و شەڕ نیە! کۆمەڵە لەناوخۆیدا و لەگەڵ بزوتنەوە و خەتی گشتی دنیایەک ئامانجی هاوبەشمان هەبو. هەمومان (سەرکردەکانیش لە مام و نەوشیروانەوە بیگرە) چ لە ناوچەکان و چ لە نیوزەنگ ، کە تەنیا زنجیرە شاخی مامەندە لە کەمپە سەربازیەکانی ڕژێم جیای دەکردەوە ، هەمو چرکەیەک لە ژێر مەترسیی مردندا بوین بە بۆمبابارانی فرۆکە، بە مین ، بەهێرشی زەمینی، بە ڕوداوی نەخوازراو، بە نەخۆشیی کوتوپڕ، بە مار و دوپشک... ، لەم لایەنەوە بەلامەوە سەیر بو کاتێک ئەو ململانێ ناتەندروستانەم دەبینی بە تایبەتی لە ناو کۆمەڵەدا . نەوشیروان مستەفا مارکسی نەبو بەڵام سکرتێری کۆمەڵە بو کە ئەمە خۆی لە خۆیدا دژبەیەکبونە چونکە کۆمەڵە ڕێکخراوێکی مارکسی بو، برادەرانی کۆمیتەی هەرێمەکان و دەستەی زیندان خۆیان بە مارکسی دەزانی بەڵام سکرتێرێکیان قوبوڵ بو کە مارکسی نەبو. دەستەی زیندان پشتی کردە هاوبیرە مارکسیەکانی کۆمیتەی هەرێمەکان و بوبە پیادەکەری هەمو بیرورا و سیاسەتەکانی نەوشیروان مستەفای نامارکسی .هەمو ئەمانە جیاوازی و ناکۆکیەکانی گەرمتر دەکرد.

## نێرگسی بون

هۆ کانی تری ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵە و ناو یەکێتی شەڕ بو لە سەر دەسەڵات و ناوبانگ و تێرکردنی هەست و شعورە نێرگسیەکان ، نەک لە سەر چارەنوسی خەڵکی چەوساوە و شۆڕشە ڕەواکەی . کەسێتیی سەرکردەکان و ڕەفتاریان جیاوازبون لە یەکتری و لە خەباتی ڕۆژانەدا بەریەک دەکەوتن و ئەمەش هۆیەکی گرنگی ناکۆکیەکان

بو. نێرگسی بون بریتیە لە (خۆشەیدایی) و (هەرمن) ییەکی ناتەندروست و لەڕادەبەدەری تاک و شانازیی ناسروشتی و لەڕادەبەدەر و فوتێکراوبە خۆ و بە بەرهەمەکانی خۆ؛ بێگومان ئەمانە هەموی لە سەر حساب و بە زیانی کەسانی دەوروپشتی کەسی نێرگسی تەواو دەبێت ، چونکە کەسی نێرگسی هەست و سۆزی کەسانی دەوروپشتی نابینێ و هەستیان پێناکات و نایانخوێنێتەوە ، ئەو بە تەنیا لە سەر سەکۆی شانۆی ڕوداوەکانە و هەمو تیشکەکان دەبیت لەسەر ئەو بێت. ئەم ڕەفتار و هەڵوێستە لە ژیانی ڕۆژانەی کەسی نێرگسی دا دەبێتە هۆی کێشەی کۆمەڵایەتیی زۆر لەگەڵ دەوروبەردا، کەسی نێرگسی هەر خۆی دەبینێ و چاوەڕێش دەکات دەوروبەرەکەی (ئەندامانی خێزانەکەی، هاوژینەکەی، هاوڕێکانی، ئەندامانی حیزبەکەی ....) هەمویان بەردەوام ، شایەنی بێت یا نەیبێت ، بە شان و باهویدا بڵێن و پەسنی بکەن و پێی بڵێن بە ڕاستی تۆ جوانی، قارەمانی، زیرەکی، تێکۆشەری ......ئەم نێرگسیبونە بە زەقی لە دەستەی (کۆمیتەی هەرێمەکان) بەدیدەکرا، کە چۆن ئەمان دوای گرتن و لەسێدارەدانی شەهاب و ئەنوەر و جەعفەر ئازایانە و گەشبینانە توانیویانە کۆمەڵە لە توانەوە و نەمان ڕزگار بکەن و یەکەمین دەستە چەکدارەکانی دوای ئاشبەتاڵیان دروستکردوە ؛ نێرگسی بون هەروەها بە ڕونی لە دەستەی زینداندا بەدیدەکرا کە چۆن ئەمان وەک دامەزرێنەر و نەوەی یەکەمی کۆمەڵە هاتونەتە مەیدانی خەبات. لە نوسینێکی بەناوبانگی دا (Erich Fromm) ی دەرونناس و دەرونشیکاری ئەڵمانی بەناوی ( Krieg entsteht aus Eigenliebe واتە: شەڕ لە خۆشەیداییەوە دروستدەبێت) باسی دو جۆر نێرگسیبونی تاک دەکات، جۆرێکی خراپ و ناتەندروست کە بێبەرهەمە و دەبێتە هۆی ئاژاوە و ناکۆکی و شەڕ؛ جۆرێکی تەندروست و باش کە دەبێتە هۆی هاوسەنگی و ئارامی و داهێنان و بەرهەمی ناوازە لە بواری زانست و ئەدەب و هونەر و سیاسەت و مەعریفەدا، بەداخەوە زۆربەی سەرکردە کوردەکان لە جۆرە خراپەکەی نێرگسین . جیاوزی و دابەشبون و ململانێ ناتەندروستەکانی ناو کۆمەڵە زۆرجار شەخسی بون هەتا فکری و سیاسی ، فرەتر پەیوەندیی بە ڕابوردوی کۆمەڵەوە هەبو هەتا بە ئێستای کۆمەڵە، فرەتر پەیوەندیی بە چەند سەرکردەیەکی کۆمەڵەوە هەبو هەتا بە هەزاران دۆست و لایەنگر و ئەندامان و کادیرانی خوارەوەی کۆمەڵە ، هیچ کام لە باڵەکانی ناو کۆمەڵە نەخشەڕێگایەکی ڕون و کۆنکرێتی و پراکتیکیی نەبو کە جیای بکاتەوە لە وانی تر.

ململانێی ناو یەکێتی نیشتمانی، هی کۆمەڵە لەلایەک و بزوتنەوە و هێڵی گشتی لە لاکەی تر، فرەتر لە سەر پلە و پایە و دابەشکردنی چەک و شتە مادییەکانی تر

بو هەتا لە سەر نەخشەڕێگای ڕزگاریی کوردوستان و وردەکاریە بەرجەستەکانی پیادەکردنی ئەو نەخشە ڕێگایە لە سەر زەویی بینراو و هەستپێکراو. هێڵی گشتی و بزوتنەوە بەردەوام داوای پۆستی زۆرتریان دەکرد لە ئۆرگانەکانی (ینک) دا لەوەی کە شایستەی بون. من هەمو ئەمانەم هەست پێدەکرد ، دواتر کە د.کەمالی هاوڕێی دێرینم بوبە (پ.م) و هاتە نێوزەنگ ، بە تایبەتی لەگەڵ ئەودا کە بە تەنیا دەبوین باسی دۆخی ناوەوەی شۆڕشمان دەکرد و وتووێژی ڕاشکاوانەمان لەسەر دەکرد . بیرکردنەوەی بەردەوام لە بازنەیەکی داخراودا و ڕاڕایی و بڕیارنەدان دەرونی من و د.کەمال ی دەکرۆژت ، یەک دوجار هەردوکمان لە نائومێدیمان لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە دەگەیشتینە لێواری ئەوەی واز لە کۆمەڵە بهێنین. بەڵام کە وردتر تەماشای هەمو دیمەنەکەی شۆرشی چەکداریی کوردوستان مان دەکرد پەشیمان دەبوینەوە و بە خۆمان و بە یەکتریمان دەوت: نەخێر، لەگەڵ هەمو کەموکوڕیەکاندا هێشتا لە مەیدانەکەدا لە کۆمەڵە باشتری تێدا نیە، کۆمەڵە بێ ڕکابەر و بێ جێگرەوە بو.

## لە شەیدابونەوە بۆ بۆ خۆشەویستی

ئەم دۆخە ڕاڕا و پڕلە نیگەرانییەی خۆم ئەزمونەکەی (غاندی) ی بیردەهێنامەوە .غاندی لە بیرەوەیەکانیدا باسیدەکات چۆن لە دورەوە زۆر سەرسام بوە بە (حیزبی کۆنگرێسی هیندی) کە گەورەترین حیزبی هیندیستان بو. بەڵام کاتێک دەچێتە سەرکردایەتیی ئەو حیزبەوە و لە نزیکەوە سەرکردەکانی دەناسێ و ڕەفتاری ڕۆژانەیان و پەیوەندیە نەباش و ناڕستگۆکانی نێوانیان دەبینێ، زۆر غەمبارو نائومێد دەبێت لێیان و لە حیزبەکەش بە گشتی. بەڵام غاندی کۆڵنادات و دەبێتە ڕابەری بێڕکابەری حیزبەکە و لە ژێر ڕابەرایەتیی خۆی و حیزبەکەیدا بە شێوازی ئاشتیانە هیندستان لە دەست ئیمپریالیزمی بەریتانی ڕزگاردەکەن و دەیکەنە وڵاتێکی سەربەخۆ. زۆرجار مرۆڤ لە پەیوەندیی خۆشەویستیدا هەست و سۆزە گەرم و گوڕو شیرینەکانی بەرامبەر ئەو کەسەی خۆشیدەوێ ئەوەندە بەهێزن کە بەچاوی ئاوەزو عەقل و ڕەخنە کەسەکە نابینێ، ئەم دۆخە پێیدەڵێن عاشقبون یا شەیدابون، بیستومانە چۆن کەسەکە دەڵێ شێتی وانێک (فلانە) کەس بوم. جیاوزیی شەیدابون لەگەڵ خۆشەویستی ئەوەیە کە لەخۆشەویستیدا ئاوەز و بیکردنەوەی مەنتیقی تێکەڵ بە هەست و سۆزەکە دەبێت و ئیتر کەسی زۆر خۆشویستراو لە ئاسمانی ئایدیالە

بێخەوشەکانەوە دێتەخوارەوە بۆ سەر زەویی پڕ لە کۆسپ و بەرزی و نزمی و ئیتر کەموکورتیەکانی رونتر دەبینرێ. شەیدابون کاری کەسی کۆرپە و کەمئەزمونە، بەلام خۆشویستن کاری کەسێکی گەورە و پێگەیشتوو هەراشە! وادیار بوو منی تینوی شۆڕش و بەرخۆدان کاتێک لە ناوشار بوم و لە دەرەوەی پەیکەری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە بوم، کاتێک ئەو هەموە خەبات و قوربانیدانەی ئەندام و لایەنگرانیم دەبیست، ئیتر لە دورەوە شەیدای کۆمەڵە بوم. دواتر کاتێک بوم بە کۆمەڵەو هاتمە ناو پەیکەری ڕێکخراوەکەیەوە و ئاشنابوم بە سەرکردەکانی و ململانێکانیان؛ کاتێک ئومێد و چاوەڕوانیە زۆر بەرزو بالاکانی ناو مێشکم بە کۆمەڵە، لە سەر زەویی بینراوەکان و هەستپێکراوەکانی خەباتی ڕۆژانە، نەم بینین و نەهاتنەدی، ئیتر توشی نائومێدیەکی گەورەبوم بەتایبەتی لە سەرکردەکانی کۆمەڵە، بەلام خۆشەویستیەکی ڕەخنەگرانە نەک کوێرانە بۆ کادیران و ئەندامان و لایەنگرانی کۆمەڵە لە مەیدانە جۆراوجۆرەکانی خەباتدا وەک خۆی مایەوە و نەیدەهێشت تەواو لە دۆخەکە نائومێدبم چونکە کۆمەڵە لەگەڵ هەمو کەموکوڕیەکانی هێشتا هەر باشترینی هەمو حیزبە کوردیەکانی باشور بوو.

## پراگماتیکی و عەقلانی

وام هەست دەکرد نەوشیروان مستەفا لە لایەن جەلال تالەبانیەوە پشتگیریی تەواو دەکرێت ، بۆیە خۆی بە دور دەگرت لە ململانێی ڕاستەوخۆ لەگەڵ دەستەی (کۆمیتەی هەرێمەکان) و لیدەگەڕا دەستەی زیندان شەڕەکەی بۆ بکەن . نەوشیروان زۆر تر سەرگەرمی ڕێکخستن و پەرەپێدانی شەڕی پێشمەرگانە و نوسین و خوێندنەوە بو. بنکەکەشی توژێ دور و جیا لە هەمو بنکەکانی تر بەسەر گردۆلکەیەکەوەبو لە نێوزەنگ کەدەیڕوانی بەسەر بنکەکانی تردا. لە مانگی ١٢ ی١٩٧٩ بۆ یەکەم جار لە بنکەکەیدا ، لە ژورە بچوک و پاک و ڕێکوپێکەکەی خۆیدا نەوشیروان مستەفا م بینی، پێشوازیەکی هاوڕییانەی لێکردم و قسەم لەگەڵ کرد . ئەم بە بەراورد لەگەڵ جەلال تالەبانی دورەپەرێزتر و ئارامتر و کەمدوترهاتە پێشچاوم، بیروڕا سیاسیەکانی کورت و پوخت و ڕون و ڕەوان، کۆنکرێت و یەکلاکەرەوە دەردەبڕین ، ڕاوبۆچونەکانی لەسەر ناکۆکیە کان لەگەڵ پارتی و (حسک) وەک هی جەلال تالەبانی بون، بەلام ئەم وەک تالەبانی حەماسی نەبو، هەڵنەدەچو و ئارام دەمایەوە، هەست و سۆزەکانی دەرنەدەبڕی و تێکەڵ و پێکەڵی نەدەکرد لەگەڵ بیروڕا سیاسیەکانیدا.

## تۆزێك بوێری و ڕاشکاوی!

ورده ورده له ناو کۆمه‌ڵه دا ، له‌و ناکۆکی و ده‌سته ده‌سته‌بییه‌ی سه‌رنجیان ڕاکێشا بوم، هه‌ستم به بێزاری و وه‌ڕسی ده‌کرد. خه‌بات درێژه‌ی هه‌بو، (پ.م ) ساده‌کان ، ئه‌ندامان و لایه‌نگرانی کۆمه‌ڵه له خواره‌وه له دێهاته‌کان و شاره‌کانی کوردوستان له شه‌ڕی سه‌ربازی و سیاسیی به‌ره‌نگابونه‌وه‌ی ڕژێمدا بون ، چالاکیی پاڵه‌وانانه‌یان ده‌کرد و قوربانی گه‌وره‌یان ده‌دا. که‌چی له‌ژێر چادره‌کانی هه‌ندێ له سه‌رکرده‌کانی یه‌کێتی و کۆمه‌ڵه دا، له بری داڕشتنی نه‌خشه و پلانی گه‌شه‌پێدانی چالاکیه شۆڕشگێڕیه‌کان له ئێرا و ئێستای خه‌باتی مه‌یدانیدا، زۆرجـار ئـه‌وان سه‌رگه‌رمی ناکۆکیه شه‌خسیه‌کانیان بون ، له شه‌ڕه ده‌نوکی ئه‌وه‌دابون کامیان شۆڕشی نوێیان هه‌ڵگیرساندوته‌وه وخه‌باتی زۆرتری کردوه و کامیان هه‌ڵه وکه‌م و کورتیی زۆرتره. لێره و له‌وێ له دانیشتنه شه‌خسیه‌کاندا که به‌شدار ده‌بوم ، تێیاندا پرسیاری ئه‌وه ده‌کرا، بۆچی دوای ئاشبه‌تاڵ شێخ شه‌هاب و هاوڕێکانی مه‌یدانی خه‌باتیان چۆڵ کرد و چونه ئێران؛ ئایا له (ده‌سته‌ی زیندان) کامیان له زیندانا لاوازیی نواندوه و په‌شیمانیی ده‌ربڕیوه. ئه‌مانه پرسیارگه‌لێکی بڤه بون و که‌س ئه‌و بوێری و ڕاستگۆییه‌ی نه‌بو به ڕاشکاوی بیخاته سه‌ر مێزی خڕی گفتوگۆیه‌کی هاوڕێیانه و دیموکراتیانه، ئاوا ده‌توانرا وه‌لامی پرسیاره‌کان به جۆرێک بدرێته‌وه که هه‌مو ده‌سته جیاوازه‌کانی ناو کۆمه‌ڵه په‌سه‌ندی بکه‌ن و ببێته هه‌وێنی به‌هێزکردنی نه‌ک لاوازکردن و دابه‌شکردنی کۆمه‌ڵه .

## ئه‌وه ئێشمان بۆ تۆش دۆزیه‌وه

چه‌وساوه‌یی وسته‌ملێکراویی ئینسانی کورد و پێویستیی حه‌یاتیم به ئازادی و دادپه‌روه‌ی و یه‌کسانی، فڕێیاندامه ناو ده‌ریای پڕ له زینده‌وه‌ری ڕه‌نگا وڕه‌نگ و سه‌یر و سه‌رسوڕهێنی سیاسه‌ت و حیزبایه‌تی . له‌و ده‌ریاچه کوردوستانیه پرمه‌ترسیه‌ی سیاسه‌تدا شانسم هه‌بو، هه‌ر ئه‌وه‌نده فێری مه‌له بوم که له چه‌ند هه‌نگاوێک زیاتر له که‌ناره‌که‌ی دور نه‌که‌وتمه‌وه ، بۆیه زۆر دورمامه‌وه له قوڵاییه تاریک و کرێش و پۆخڵه‌کانی ، ده‌ست وپێ سپیه‌کانی من چاری شه‌پۆله به‌رز و بێبه‌زه‌یی وهار و شێته‌کانی ئه‌وی نه‌ده‌کرد! ئه‌لبه‌ته من ئه‌وساش و ئێستاش سیاسه‌ت و حیزبایه‌تی به

گرنگترین چالاکیی کومەلایەتیان دەزانم و بێ سیاسەتێکی پاک و زیرەکانە ئینسانی کورد و کوردوستان ڕزگاریان نابێت. بۆیە حەیفە ئەم بوارە هەرە گرنگەی ژیانی کومەڵ و گەل چۆلبکرێت بۆ کەسانی خۆپەرست و دەسەلاتخواز و نەزان و دەرون نەخۆش.

١٩٨١ بو نەوشیروان مستەفا پێی وتم «دوکتۆر هەژار ئەوە ئیشمان بۆ تۆش دۆزیـەوە»، نەمهێشت بلێ ئیشەکە چییە، یەکسەر وتم (کاک نەوشیروان کەس لە شۆڕشدا بە هێندەی من وەک پزیشک ئیش و کاری نیە)،ئەو ئیتر هیچی تری نەوت، ئێستاش نەمزانی ئیشە پێشنیازکراوەکەی چی بو . من جارێک قادر جەباریی (حسک) و جارێک نەوشیروان مستەفا و دو جار بەکری حاجی سەفەر داوایان لێکردم پۆستی سیاسی و ئیداری لە شۆڕش دا وەربگرم، هەمویانم ڕەفزکرد چونکە دەمزانی لەو کەش و هەوا زۆر نالەبارەی شۆڕش دا سەرکەوتو نابم . بۆیە لەو پێنج ساڵ و پێنج مانگەی پێشمەرگایەتیم دا هەر وەک پێشمەرگەیەکی پزیشک مامەوە و پیشەی سەرەکیم هەر کاری دوکتۆری بو.

## دو وشەی نامۆ: بەزەیی و هاوسۆزی!

بە ڕای فەیلەسوفی ئەلمانی (نیتشە) کەسی سیاسەتپیشە مرۆڤەکان دەکات بە دوبەشەوە: یا دوژمن یا دەسکەلا و ئامراز بۆ بەکارهێنانی بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسیەکانی ؛ بەم قسەیەی (نیتشە) بێت، سیاسەتپیشەی دەسەلاتخواز کەس بە هاوڕێی خۆی نازانی. وادیارە سیاسەتپیشەکان ، ئەوانەی زورتر شەیدای دەسەلات و پۆست و ناوبانگن هەتا شەیدای ئامانجە سیاسیەکانی گەلەکەیان بن، کاتێک لە ناوجەرگەی خەباتی تاوسەندوی سیاسی دان ، ئیتر وردە وردە هەست و سۆز و بەزەیی و هاوغەمی و هاوئازاری لە دڵ و دەرونیان کەم و کەمتر دەبنەوە و جێ چۆڵ دەکەن بۆ کەمهەستی و بێهەستی و دڵڕەقی و بێڕەحمی و هەرمنی (خۆپەرستی) یەکی ڕوخێنەر، لە کۆتاییدا ئەم گۆڕانە دەرونیە خراپە خۆیشیان و کەسوکاریشیان دەگرێتەوە . لە دنیا بچوکەکەی نێوزەنگیش سیاسەت و حیزبایەتی هەر ئاوا بو، بۆ من زۆر سەیر بو کە هەندێ لە سیاسەتپیشە دەسەلاتخوازەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی، هەمو ئەو سوکایەتی پێکردن و ئەشکەنجە و ئێش و ئازارە جەستەیی و دەرونیانەی کە هاوخەباتەکانیان، ئەوانەی(دەستەی زیندان) ، لە زیندانەکانی ڕژێمی

بەعس چەشتبویان، نەیان دەبینی و هەستیان پێنەدەکرد و بەزەییان پێیان نەدەهاتەوە، باوڕناکەم یەک جار داوایان لی کردبن ئەزمونەکانی ناو زیندانیان بۆ بگێڕنەوە ؛ بۆیە لە کۆبونەوە بچوکەکانیان لەگەڵ سیاسەتپیشەکانی هاوڕێیاندا، هەندێ جاریش تەنانەت لە کۆنفرانسی کۆمەڵەدا بە لاقرتی و گاڵتەوە دەیانوت فلان هاوڕێی (دەستەی زیندان) لاوازبوە و ئیعتیرافی کردوە.

## تەنیاکەوتن و نامۆبون

دوای نزیکەی سێ مانگ لە هاتنم بۆ نێوزەنگ و بون بە (پ.م) ی یەکێتی، لەم کەش و هەوا سیاسیەدا کە بە ڕۆحی من گەلێک نامۆ بو، ژیان و مانەوەم لە خڕی نیوزەنگ وەک ڕۆتینێکی بێتام و وەڕسکەری لێهاتبو، ئالەم بارە دەرونی و فیکریە ناخۆشەمدا بۆ تۆزێ گۆڕینی کەشەکە و دورکەوتنەوە لێی، لە گەڵ چەند هاوڕێییەکدا چوم بۆ سەردانی (شێخ عیزەدینی حسەینی) کە ڕابەرێکی ئاینی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی زۆر بەرێزی کوردی ئێران بو. بنکەکەی لە چەمودۆڵێکدا بوبە ناوی (چۆمی مەجیدخان) لە نزیک بۆکان. بەڕاستی هەرگیز شنەبای ئەو ڕۆژەی بەهاری ١٩٨٠ م بیرناچێتەوە کە لە سەرەتای چەمەکەدا بە یەک دونیا بۆنی تێکەڵی سەدان جۆر گوڵی کێویی بەهاریی چەمەکەوە، مەستانە و بە کش و بێدەنگی پێشوازیی لێکردین. ئەمە و دیمەنی دڵفرێنی بەهاری شوێنەکە بڕێک دونیای سیاسەتی کوردیی لەبیربردمەوە و گەڕاندمیەوە بۆ ناو قوڵاییەکانی سروشت و ئەندێشە وجودیەکان! لە بنکەکەی شێخ عیزەدین (هێرش - ئەحمەدی ئەسکەندەری) کە پێشتر لە فەرەنسا خوێندبوی و مارکسی بو،وەک سکرتێری مامۆستا کاریدەکرد، پێشوازیەکی گەرمی لێکردین، نانی نیوەڕۆمان نان و شۆربایەکی دەرویشی بو. نزیکەی سەعاتێک لەگەڵ مامۆستادا لە سەر بارودۆخی سیاسی دواین، ڕابەرێکی ئاینیی میانەڕەو و کوردپەروەر و پێشکەوتنخواز و عەدالەتخوازبو، بڕوای بە ئازادیی ژن هەبو، کچەکانی پێشمەرگەی کۆمەڵە بون. هەر لەم کاتەدا بو سەردانی بنکەیەکی کۆمەڵەی ئێرانم کرد کە هاتبونە ناوچەی گوندەکانی (داوداوە) و (مامکاوە)ی سەر بە سەردەشت. بە ڕاستی ڕێکخستن وبەڕیوەبردنی بنکەکە زۆر دروست و جوان ڕێکخرابو. بونی (پ.م) ی ژن بە ژمارەیەکی زۆر لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا جیای دەکردەوە لە هەمو حیزبە کوردیەکانی تر لەو سەردەمدا.

## ڕێکەوتێك و توشبونێکی تر!

دوای سەردانی شێخ عیزەدین و کۆمەڵە ی ئێران گەڕامەوە بۆ نێوزەنگ. دوای چەند ڕۆژێ (محەمەدی حاجی مەحمود) م ناسی، کە لە یەکێ لە شەڕەکانی ڕژێمدا لە شارەزور باڵێکی زامداربوبو. هاتە نەخۆشخانەکەمان، تیماری برینەکەیم کرد و دەرمانی پێویستم پێدا. وردە وردە کە چەند جارێک دەهاتە لامان، ناسیاویمان پەیداکرد، ئەو زۆر باش بنەماڵەی ئێمەی دەناسی، پرسیاری زۆرم لێکرد لە سەر بارودۆخی (پ.م) و چالاکیەکانیان لە ناوچەی شارەزور. ئەو فەرماندەی هەرێمی یەکی شارەزور و هەورامانی یەکێتی بو، دیاربو زۆر بە گەشبینیەوە دەیڕوانیە بارودۆخی شۆڕش و (پ.م) لە ناوچەکەیدا. کە هەستیکرد من بە وردی و بە گرنگیەوە لە دۆخی ناوچەکە دەپرسم، کەوتە هاندانم بۆ ئەوەی لەگەڵی بچمە خوارەوە. دواتر زانیم کە کاک محەمەد خۆی لە ناوچەی هەورامان و شارەزور لەگەڵ کادیرە کانی کۆمەڵە کێشەی زۆر و توندی هەیە، بەڵام ئەو تەنانەت بە یەک ڕستەش باسی هیچ ناکۆکی و کێشەیەکی خۆی نەکرد لەگەڵ هیچ کەسدا! بێزاریم لە ناکۆکیە بێسود و شەخسی وناڕاستەکانی ناو سەرکردایەتیی کۆمەڵە وەک پاڵنەر لە لایەک، هاندانی کاک محەمەد وەک ڕاکێشەر لە لاکەی ترەوە،هەروەها ژیانی ڕۆتینی چەندبارەبۆوەی نێوزەنگ، بڕیاری کۆتاییان پێدام کە لەگەڵ محەمەد بچمەخوارەوە بۆ ناوچەی شارەزور و هەورامان. جگە لەو هۆکارانە من هەمیشە خولیای ئەوەم هە بو وەک (پ.م) یەکی سادە بم و لەناو (پ.م) سادەکان و کۆمەڵانی خەڵکدا خاکیانە بژیم و خەبات بکەم. کە برادەرانم ئاگادارکردەوە لە بڕیارەکەم، نە دوکتۆر خدر نە هیچ یەک لە سەرکردەکان هیچ کۆسپێکیان نەخستە بەردەمم و ئازادیی تەواویان پێدام لە بڕیاردان. لە هەمان کاتدا دەربارەی بڕیارەکەم کەدورنەبو بە شەهیدبونم کۆتایی بێت، هیچ ئاگاداری و ڕێنمایی ووریاکردنەوەیەکیان پێنەدام، تەنانەت هیچ زانیاریەکیشیان نەدامێ لە سەر کێشەکانی محەمەدی حاجی مەحمود لەگەڵ کادیرەکانی کۆمەڵە لە ناوچەی هەرێمی یەکدا.ئەمە گوێ پێنەدان و بەتەنیا جێهێشتنی دوکتۆرێکی (پ.م) ی کەمئەزمونی وەک من بو، وە چاونوقاندنێک بو لەو مەترسیانەی لە سەر ڕێگاکەم دا خۆیان مەڵاس دابون. دەبوایە بەلای کەمەوە بەرپرسێکی کۆمەڵەی شارەزا لە ناوچەی هەرێمی یەک و تایبەتمەندیەکانی، دانیشتنی لەگەڵ من بکردایە و دۆخی ناوەوەی هەرێمەکەی بۆ باس بکردمایە. کەس لێی نەپرسیم بۆچی دەچمە خوارەوە، بۆچی لەگەڵ حەمەی حاجی مەحمودا دەچمە

خوارەوە کە ئەوان ئاگاداری کێشەکانی ئەو بون لەگەڵ کادیرەکانی کۆمەڵە! وەک ئەندامێکی کۆمەڵەش هچ شتێکم پێنەوترا بیکەم یا نەیکەم وخۆمی لێ بەدوربگرم، کەسیش لێی نەپرسیم پارەم پێویستە یان نا.

## بۆ ئەگەری شەهیدبون!

خواحافیزیم لە هاورێیان کرد و لەگەڵ محەمەد و دەستە (پ.م) کەیدا بە پێ ملی ڕێگامان گرت. کۆڵەپشتی دەرمان و تفاقی پزیشکیی پێویست بۆ بریندارم پێبو لەگەڵ یەک دو کتێب، جگە لەمانە هیچی ترم نەبو لەگەڵ خۆم بیبەم، چ ژیانێکی سادە ودەروێشی بو! نێوزەنگمان جێهێشت و چوینە سەردەشت، لە سەردەشت بە سەروڕیش و کاسکێتەکەمەوە وێنەیەکم گرت بۆ ئەگەری شەهیدبونم و بڵاوکردنەوەی وەک پۆستەر. بە پیادە و ناوبەناویش بە جیبی لاندرۆڤەر بە سەر ناوچە سنوریەکانی سەردەشت و بانەدا دور لە هێزەکانی دەوڵەتی ئێران کە لە دۆخی شەڕدابون لەگەڵ کورد، بە دوسێ ڕۆژ لە دوای نەورۆزی ساڵی ١٩٨٠ گەیشتینە شاری مەریوان کە ماڵی محەمەد ی لێبو. محەمەد وەک فەرماندەیەکی سەربازیی یەکێتی بە هۆی چالاکیە سەربازیەکانیەوە کە شان بەشانی (پ.م) کانی کۆمەڵەی ئێران و (حدکا) لە دژی هێزە سەربازیەکانی ئێران کردبونی، لە ناو خەڵکی مەریواندا ناسراو و خاوەن ڕێز بو. ماڵی محەمەد لە مەریوان نزیک ماڵی (شێخ عوسمانی خالیدی) بو کە سەرۆکی ئەنجومەنی شاری مەریوان بو. نزیکەی هەفتەیەک لە ماڵی محەمەد مامەوە. کاتێ (پ.م) و میوانەکانی ماڵی محەمەد زۆردەبون و جێیان نەدەما، دەچونە ماڵی شێخ عوسمان کە وەک ئوتێلی لیهاتبو. (دایە ئایشێ) ی هاوژینی و کچەکانی نان و چێشتیان بۆ ئامادەدەکردن و هەر لەوێش دەخەوتن. بەهار بو مەریوان لە ژێر دەسەڵاتی (پ.م) کانی کۆمەڵە و (حدکا) دا بو. لە مەریوان کۆمەڵە زۆر لە حیزبی دیموکرات بەهێزتر و ڕێکخراوتر بو، بە پێچەوانەی (حدکا) کە زۆربەی (پ.م) کانی نەخوێندەوار یا کەمخوێندەوار بون، (پ.م) و کادیرەکانی کۆمەڵە خوێندەوار بون و ڕۆشنبیریی باوی مارکسی لینینی ئەو سەردەمەیان دەزانی و پەروەردەی ئایدیۆلۆژی دەکران، بێگومان ئێمە لەمانەوە نزیکتربوین هەتا لە دیموکراتەکانەوە.

## وەك تیمێكی پزیشكی!

یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان پاشكۆی (عێراق) ی پێوە نیە و ڕێكخراوێكی كوردوستانیە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە پشتگیریی سەربازی وسیاسی و هەمەلایەنەی شۆڕشی كوردوستانی ئێرانی كرد، شەڕەكانی ناوچەی مەریوان و هەورامانی ئێران، بانە و سەقز شاهیدی ئەم ڕاستیەن. (پ.م) ی یەكێتی لەم ناوچەیە ڕێزێكی زۆری لێدەگیرا چونكە پێكەوە لەگەڵ (پ.م) كانی كۆمەڵە ی ئێران و (حدكا) بەرگریان لە مەریوان دەكرد. سەربازگە (پادگان) ی ڕژێمی ئێران كە لە دەرەوەی مەریوان بو، زوزو تۆپبارانی ناوشاری دەكرد وەک خۆئامادەكرن بۆ پەلاماردانی و گرتنەوەی. جگە لە ماڵە هەژار و كەسە پیر و پەككەوتەكان كە توانایان نەبو مەریوان جێبهێڵن، بەشێكی زۆری خەڵكی شار وردە وردە ناچاربون شار چۆڵ بكەن و پەنا بۆ دێهاتەكانی دەوروبەر ببەن. ئەو كاتە مەریوان یەک دوكتۆری كوردی ئێرانی تێدا نەبو! هەمو دوكتۆرە هیندی و پاكستانیەكان بە هۆی شەڕەوە تاقە نەخۆشخانەكەی شاریان چۆڵكردبو. لە مەریوان (قادری حاجی حەمە شەریف گێلەرەیی) م ناسی كە بە دوكتۆر قادر ناسرابو، ئەو پەیمانگای دەرمانسازیی لە بەغداد تەواوكردبو و لە ١٩٧٨ وە پ.م بو. بە پاسەوانیی (پ.م) كانی كۆمەڵە، لەگەڵ (هۆشەنگ سەقزی) و (عوسمانی حەقیقەت –بۆكانی بو) كە پێشمەرگە و كادیری كۆمەڵە و یاریدەدەری پزیشكی بون- بە داخەوە دواتر شەهید بون - هەروەها بە هاوكاریی د.قادر و (د.سیمای ئازەری) كە سەر بە سازمانی ماركسیی چریكە فیدائیەكانی خەڵک بو، ژێرزەمینی خانوی (شێر و خورشیدی) ناوشارمان كردە بنكەی تەندروستی. لە ژێر گرمە و ناڵەی تۆپبارنی شار كەوتینە چارەسەری بریندار و نەخۆش لە پێشمەرگە و خەڵک.

بەیانیەک دوای نانخواردن دوكتۆرە سیما بەدەم پیاسەوە بە جۆرێک لە پرینگانەوە وشەرمەوە ئاگاداری كردم كە سازمانی چریكە فیدائیەكان وازی لە خەباتی چەكداری هێناوە بۆیە ئەمیش دەگەڕێتەوە لای ڕژێم، دوكتۆرە سیما هەر ئەو ڕۆژە ماڵاویی لێكردین و بەجێیهێشتین.

## مەست و خومار بە بێ مەی!

لەو ڕۆژانەی بەهاردا كە بەهاری تەمەنم پێی نابوە ٢٦ ساڵە وە، ئیتر من ڕیشێكی درێژم هێشتبۆوە و لە مەڕ دڵ و حەز و چێژەكانی ژیان بوبومە جۆرێک لە دەروێش

یا سۆفی. تەنانەت دوکتۆرە سیما و پەرستار (خ) کە بێئەندازە جوان و دڵڕفێن بون، لە کاری پێکەوەیی ڕۆژانەماندا، وەک ژن هیچ کاریگەریەکی ژن و پیاویی (ئیرۆتیک) یان لەسەرم نەبو. من تازە شەیدای شتێکی تربوبوم! پێموایە ئێستا (پ.م) کانی پارتی کرێکارانی کوردوستان (پەکەکە) و پارتی یەکێتیی دیموکراتی کوردوستانی ڕۆژاوا (پەیەدە) لە هەلومەرجێکی دەرونی و سیاسیی وەک ئەو سەردەمەی مندان. ئەوانیش سۆفی و دەروێشی بێ نەفس و حەزخامۆشکراوی ڕێبازی کوردایەتین. خەباتی ڕەوای گەلەکەمان و بێکەسیەکەی، دڵڕەقی و وەحشیگەریەکانی ڕژێمی ئێران، تۆپبارانی بەردەوام، وردە وردە هەستی ترس لە مردنی لام کەمکردبۆوە. کە ئێستا بیر لەو ڕۆژانەی مەریوان دەکەمەوە وادیارە لەو کاتانەدا شەرابی خەباتی ڕەوا ی ئینسانی کورد لە پێناوی ئازادیی خۆی و ڕزگاریی نیشتمانەکەی، تەواو مەست و خوماری کردبوم. ڕوباری هەردەم ڕەوان و بەگوڕ و تینی ئەوخەباتە، منی تازە مەلەوانی بۆ هەرکوێ بویستایە لەگەڵ تەوژمی خۆی دەیبردم.

ئا لەم بارە دەرونیەدا بوم کاتێک دوکەڵ و تۆزی تۆپێک لەماڵێکی مەریوان بەرزدەبۆوە، لەگەڵ یەکێ لە هاوکارانم بە کۆڵەپشتی دەرمان و پێویستیەکانی ترەوە، بۆ چارەسەری بریندارەکان بەراکردن بەرەو ماڵەکە دەچوین.

## «پڵنگەکان لە ڕۆژی دەیەم دا !»

لە چیرۆکێکی کورت دا نوسەری عەرەب (زکریا ثامر) باسی پڵنگێک دەکات تازە بە ساغی گیراوە و ئێستا لە قەفەزێکی پۆڵایینی مکوم دایە. هەوڵەکانی بۆ دەربازبون شکست دەهێنێ و تینوێتی و برسێتیشی دەچێتە سەر. لە ڕۆژەکانی یەکەمی ناو قەفەزەکەدا نەڕەی وادەکات هەمو شوێنەکە دەلەرێنێتەوە و لە ترساندا کەس ناوێرێ لە قەفەزەکەش نزیکی بێتەوە، لە ڕۆژی دەیەم دا کە ئیتر برسێتی و تینوێتی و دیلی زۆری بۆ دەهێنن، نەڕە ترسێنەرەکەی نامێنێ و بۆ تۆزێ گۆشت و ئاو وەک پشیلەیەکی ماڵی بە میاوە میاو دەپاڕێتەوە و لە دواجاردا بە ناچاری فێری کا و جۆ خواردن دەبێت. کۆمەڵەی ئێران لە سەرەتاکانیدا وەک ڕێکخراوێکی مارکسیی تازە دروستبو زۆر پابەندی بیر و ڕاکانی بو، دژی ڕژێمی سەدام بو، وەک (حدکا) پەیوەندیی کۆن وتازەی بە ڕژێمی بەعسەوە نەبو، سەرکردە و کادیرەکانی عێراقیان نەبینیبو و نەیاندەویست پەیوەندی بکەن بە ڕژێمی سەدامەوە. بیرمە پێشمەرگەی کۆمەڵە (نیعمەتی حاجی

ڕەشیدی مەریوانی) یان هێنا بۆ لام لە گوندی باشماخ ی سەر سنوری پێنجوێن، لە شەڕدا بریندابوبو و ئیسقانی لاقی شکا بو، پێویستی بە عەمەلیات بو، پێم وت چار نیە برۆ بۆ پێنجوێن، لە وەلامدا وتی: پێم شەرمە بچمە بەردەم ڕژێمی فاشیستی بەعس، وتم کاکە تۆ لەمن زیاتر ڕقت لە ڕژێمی سەدام نیە، بەلام چارنیە تۆ بۆ چارەسەر دەچیت و دەگەڕێیتەوە، سودی نەبو. ئەوە بو بینیمان چۆن دواتر لە ساڵەکانی ١٩٨٢ و ١٩٨٣ بەدواوە لە ژێر شالاوی ڕامالەری ئێراندا هەمو سەرکردایەتی و دەسگاکانی کۆمەلە و دیموکرات و سازمانی خەبات ناچاربون بچنە عێراق و جۆرێک لە پەیوەندیی ناچاریان لەگەڵ ڕژێمی سەدام بەست. ئەوەش بەسەرهاتی پلنگەکانی کۆمەلەی ئێران!

## مامۆستا سەیفەدین کاکەیی

ڕۆژێک کادیری کۆمەلە و (پ.م) ی خۆشەویستی خەلک (مامۆستا سەیفەدین هاواری) م ناسی، کاسکێتێک لەسەر و چاویلکە لەچاو لە دوای پیکابێکەوە بو کە لە سەر یەکێ لە چوارڕێ گەورەکانی مەریوان لەنگەری گرتبو. سەیفەدین بەسەر ڕەشاشی دابەستراوی سەر پیکابەکەوە ڕاوەستابو، ئەگەری ئەوە هەبو هێزەکانی ڕژێم لە پادگان بێنەدەرەوە و ناوشار بگرنەوە، ئەمیش ئامادەی بەرگریکردن بو لە مەریوان، چومە سەر پیکابەکە و پێموت فێرم بکە ئەم ڕەشاشە چۆن بەکاردێ؟ بە پێکەنەوە پێی وتم: بۆ ئەوەی ئەگەر شەهید بوم جێم بگریتەوە؟ ڕۆژێک تۆپێک لە نزیک پیکابەکەوە دابوی بە جادەکەدا، بەلام زیانی نەگەیاندبو، تۆ بلێی لە ناوشارەوە بە دەسگای بێتەل ڕێنمایی کابرای تۆپهاوێژیان لە پادگان کردبێت؟ مەخابن سەیفەدین دواتر لە گوندی (موان) لە شارەزور بە پیلانی چەند خۆفرۆشێک شەهیدکرا.

## لە شاری سنە دا

هەر لەو ڕۆژانەی مەریوان دابو بولەگەڵ دەستەیەک (پ.م)ی کۆمەلە ی ئێران بە جێبێک چوم بۆ شاری سنە بۆ هێنانی دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی. لە سنە بردیانمە هۆلێکەوە کە پڕبو لە دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی، سەرپشکیان کردم لەوەی چی و چەندم دەمەوێ بیبەم، منیش ئەوەی پێویستم بو بۆ کارەکەم وەک دوکتۆری (پ.م) و خەلک هەلمگرت. ئاوابو خەباتی هاوبەشی هەردو کۆمەلە لەو سەردەمە دا!

## مەلەك و عەبدولآی سولتانی

خوێنەری هێژا فەرمو لەسەر دۆخی ئەو کاتەی مەریوان و ڕۆڵی من تێیدا، تەنیا بۆ مێژو ئەم نامە هاوبەشەی خوشک و برای شەهید فوئاد سولتانی (مەلەک و عەبدولا) بخوێنەرەوە کە ڕۆژی ۱۹ ی ۷ ی ۲۰۱۵ بە ئیمەیل بۆیان ناردم، مەلەک هاوژینی شەهید دوکتۆر جەعفەری شەفیعی بو:

"بە درێژایی تەمەنیان کۆمەڵە ی زەحمەتکێشان و یەکێتیی نیشتمانی کوردوستان هاوکار و پاڵ پشتی ڕۆژە سەخت و دژوارەکانی یەکتری بوون. ساڵی ۱۹۷۹ دکتور جەعفەری شەفیعی لە قەندیل کاری پزشکی و تەبابەتی (پ.م) کانی یەکیەتی نیشتمانی کوردستانی ئەکرد و ساڵی ۱۹۸۰ دکتوور هەژار لە مەریوان، هەر بۆیە لە خۆ پیشاندانەکانی شارەکانی کوردستان دا ئەم درۆشمە (یەکێتیی نیشتمانی، پشتیوانی گەلانی) یەکێک لە درۆشمە سەرەکیەکان بو. لە شارە خنجیلانەکەی گوێ زرێباریش، مەریوان، بە هەمان شێوە وەک هەموو کوردستان شەڕ بوو. دیاریی کۆماری سێدارە سەدان تۆپ و خومپارە بو کە ڕۆژانە بە سەر خەلکیدا دەیباراند. لەو کاتە وەختە دا ئینسانێکی شۆڕشگێر، فیداکار، مرۆڤدۆست و لێزان دکتر هەژار بو کە بە بێ فەرق و جیاوازی شەوی ئەدا بە دەم ڕۆژەوە، ساتێک لە بهداری(دەرمانگا) شیر و خورشید و ساتێک لە بیمارستان (نەخۆشخانە) و ساتێک لە کوچەو کۆلان بریندارەکانی ئەو شەڕە داسەپاو و ماڵ وێرانکەرەی تیمار ئەکرد. لە نێوان ئەو هەڵسوڕان و کار و مسئولیتە دا بیر و هۆشی لای خەڵکی فقیر و زوڵم لێچووی شار و دیهات بو، کە لە کاتێکدا هەموو ولات ئاگر بارانە تیماری دەرد و ئازارەکانی ئەوانیش بکات. جگە لەو ئەرکە قورسانە لە بیرمە دکتر هەژار بوبو بە مامۆستای پۆلێک لە کچان و کوڕانی لاو و تازە پێگەیشتوی مەریوانی و فێری برینپێچان و دەرزی وەشان و ئەو جۆرە کارانەی ئەکردن. من بۆ خۆم (مەلەکە) لە دکتر هەژار زۆر شتی لەوبابەتە و دڵسۆزی بۆ خەڵک فێر بوم کە دوایی لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، زۆر بە کەلکم هات. ئەو هەڵسوڕان و هەڵسو کەوتانەت بو کە قەت لە بیرمان ناچیتەوە. لە بیرمە لە گەرمەی ئەو شەڕ و گولە بارنە دا دکتر هەژار لە چکۆلەترین کات کەڵکی وەر ئەگرت بۆ خوێندەنەوە و فێر بونی زبانی فارسی تاکو بتوانیت لە بۆچون و هەلویستی سازمان و ڕێکخراوە شۆڕشگێر و سیاسیەکانی ئێران تێ بگات «.

## ڕوداوێکی لەبیرنەچو

منیش کە لە مەریوان بوم لە بازنەی ڕێباز و بیروباوەڕە کوردوستانیە کەی (ینک) چالاکیم دەنواند. لەو دۆخە دەرونی و سیاسیەدا بو عەسرێکی درەنگ نازانم من بە تفەنگ وکۆڵەپشتەکەمەوە چۆن خۆم بینیەوە وەک یەکێک لە ناو کاروانی دەستەیەک لە (پ.م) پرچەکەکانی کۆمەڵەی ئێران بە فەرماندە یی (عەبدوڵای نەودنیان). ئەم کاروانە بچوکە وردە وردە و کش و مات وەک مێروله بەدوای یەکدا بەسەر یەکێ لە گردەکانی دەوری شاردا سەردەکەوت. ئەم دەستە (پ.م) یە دەیانویست دەستێک بوەشێنن لە هێزە ئێرانیەکانی سەر بەرزایی (گردە ڕەش) کە لەوێوە شاری مەریوان تۆپباران دەکرا. (پ.م) کان منیان لە سەر کانی و ئەستێڵێکی ئاو جێهێشت و پێیان وتم لەو شوێنەدا بمێنمەوە تا ئەوان دەگەڕێنەوە. وردە وردە (پ.م) کان یەک یەک لە دەریای تاریکیی ئەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا نوقمبون و لەبەر چاوم بزربون. پاش نزیکەی کاتژمێرێک لە ڕۆشتنیان بوبە دەسرێژی تەقە و گرمە و ناڵەی توپ و هاوەن کە نزیکەی سەعاتێکی خایاند. کش و ماتیەکی ترسناک باڵی کێشا بەسەر شوێنەکەدا. بەرایی (پ.م) کان وردە وردە دەرکەوتن، بە غەمباری و بێدەنگیەوە جەستەی بێگیانی سەردەستەکەیان (عەبدوڵای نەودنیان) یان بەسەر شانەوە بو.

ئەوە یەکەم جارم بو ئاوا لە نزیکەوە لە مەیدانی شەڕێکی ناهاوتادا بە هەمو هەستەکانم لەگەڵ شەهیدبونی (پ.م) یەک دا بژیم. لە برینە هێشتا ساردنەبۆوەکانی عەبدوڵا وە تێکەڵەیەک لە بۆنی خوێن و خاک وئارەق بەرزدەبۆوە. جەستەی خڵتانی خوێنی عەبدوڵا هێشتا هالاوی لێبەرزدەبۆوە، هالاوی ژیان و هالاوی پاشماوەی ئاگری ڕۆحێکی یاخی و توڕە، توڕە لە هەموناحەقی و ناعەدالەتیەکانی ئەم جیهانە. تاریکایی ئەنگوستەچاو، بێدەنگیە کی ترسناک، مەرگی چاوەڕواننەکراوی عەبدوڵا و هەروەها غەم و پەژارەی هاوڕێ جەرگبڕاوەکانی، ئەمانە هەموی دونیای هۆش و دەرونمی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵتەکاند و داگیرساند. ئێستاش دوای ٤٠ ساڵ لەو ڕوداوە، لە کاتی هێنانەوەیادی ئەو دیمەنەدا، شەپۆلی موچڕکێک وەک تەزوی کارەبا هەمو جەستەم دەتەنی، ئینجا چڕدەبێتەوە و کۆدەبێتەوە لە چاوەکانم دا، بینایم لێلدەکات و وەک چەند دەنکە مرواریەکی پڕبەها و پرواتا، بە ماتی بە هەردو ڕومەتم دا دێنەخوار. بە ئاوی ئەستێڵەکە جەستەی عەبدوڵا مان پاک شت و دامانپۆشی. بێ ئەوەی بەخۆم بزانم و بیری لێبکەمەوە، لەگەڵ چەند (پ.م) یەکی تردا چوبومە ژێر

تەرمەکەی عەبدوڵا و شانم لە ژێریدابو، بەرەو خوار بۆ ناو شار هەنگاومان دەنا ، بە دەنگی بەرز و حەماسی ئەم سرودەمان دەوتەوە:

**من پێشمەرگەی کوردوستانم**
**ئامادەی جەرگەی مەیدانم**
**بەسەر و ماڵ و گیانم**
**ئەیپارێزم کوردوستانم**
**دەست لە چەکەم دەست لە چەکەم**
**هەڵناگرم یا سەرئەکەوم یا ئەمرم**
**بەم کوردوستانە رەنگەینە**
**کە بەهەشتی سەر زەمینە**
**بەم کوردەی بەشی لەم ژینە**
**دیلی و کوشتن وبڕینە**
**دەست لە چەکەم دەست لە چەکەم**
**هەڵناگرم یا سەرئەکەوم یا ئەمرم**

ئەمە یەکەم جار بو من ئاوا لە نزیکەوە (پ.م) ی شەهید ببینم و نزیک ببمەوە لە شەڕ، شەهیدەکەشم لە نزیکەوە دەناسی. گەنجێکی ڕوخۆش و ڕۆشنبیر و چوست و چالاک بو، هێشتا بیست ودو بەهاری ژیانی تێنەپەڕاندبو، خۆشیەکانی ژیانێکی ئاسایی نەچەشتبو. وشە بەوشەی سرودەکە، لە دڵ و دەرونی هەژاو و هەڵقرچاومەوە هەڵدەقوڵا. وشەکانی سرودەکە کە دەبونە دەنگ و لە گەرومەوە دەهاتنە دەرێ، ئاواز و میلۆدیەکی ڕۆمانسیی شۆڕشگێڕانەی ئەوسەردەمەی بەرهەم دەهێنا.

## دەبێ جێی بێڵم !

ئێستا ئێمە لە کۆتایی بەهاری ١٩٨٠ داین، جەلال تاڵەبانی لە تارانە، خەریکی بینینی کاربەدەستانی ئێرانیە بۆ باشکردنی پەیوەندیەکانی یەکێتیی نیشتمانی لەگەڵ ئێران کە لەو کاتەدا زۆر گرژ و نادۆستانەبو. بەکری حاجی سەفەر لە گوندەکانی دەوروپشتی مەریوان بو، هەواڵی بۆ ناردم هەرچی زوترە مەریوان جێبێڵم چونکە بەهۆی بونی

جەلال تاڵەبانی لە تاران بروسکە لە سەرکردایەتیەوە کراوە کە دەبێت هەمو (پ.م) کانی (ینک) لە بەرەکانی شەڕی دژی ڕژێمی ئێران بکشێنەوە دواوە. وەڵامم دایەوە کە من لە شەڕدا بەشدارنیم و لەبەر ئەوەی لە مەریوان دا من تەنیا دوکتۆرێکم ماومەتەوە، ڕەوشتی پزیشکیم ڕێگام نادات ئەو نەخۆش و بریندارانەی لە ناوشاردان بێ کۆمەکی پزیشکی بەجێیان بێڵم، بەکری حاجی سەفەر بە نابەدڵی هەڵوێستەکەمی قوبوڵ کرد. پاش چەند ڕۆژێک (پ.م) کانی کۆمەڵەی ئێران و (حدکا) لە ژێر پەستان و گوشینی هێرشی توند و فراوانی ئێران ناچارکران مەریوان بەجێبێڵن. بەم جۆرە منیش ناوشارم جێهێشت و خۆم گەیاندە (پ.م) کانی یەکێتی کە بە سەر گوندەکانی دەوروپشتی مەریوان دابەشبوبون و دەگەڕان.

## دەروێشەکان و پێشمەرگە!

بە دێهاتەکانی نزیک سنوری پێنجوێن: (بەردەڕەشە) و (باشماخ) و (بایاوا) و (ئاسناوا) و.. دەگەڕاین، لە دێی بایاوا لە ماڵێک نانمان دەخوارد، ئەوەندەمان زانی دەنگەدەنگ و هەرا لە ناو دێوە بەرزبۆوە. (پ.م) پێنجوێنیەکان پیاوێکیان گرتبو بە تۆمەتی ئەوەی جاسوسی ڕژێمی سەدامە. (پ.م) کان بێئاگا بون لەوەی ئەو پیاوە باوەڕپێکراوی (حەمەی شێخ عبدالکریمی کەسنەزانی) بو. کە خەڵکی دێ بینیبویان کەسەکە بەدەستی (پ.م) کانەوە گیراوە، لە (پ.م) کان ڕاپەڕیبون و داوای دەسبەجێ ئازادکردنی کەسەکەیان لێکردبون یان ئەوەی نان نادەن بە (پ.م) و دەبێت دەسبەجێ گوندەکە چۆڵبکەن. حامیدی حاجی غالی و بەکری حاجی سەفەر قسەیان لەگەڵ پیاوەکە کرد و بینیان هیچ تۆمەتێکی بەرجەستەی لە سەر نیە، بۆیە بێکێشە ئازادیان کرد. (حەمەی شێخ عبدالکریم) ئەو سەردەمە دەروێشێکی زۆری لە ناوچەی مەریوان هەتا سنە هەبو، دیار بو خەڵکی ئەم دێیەش دەروێشی دڵسوتاوی ئەوبون. مەزەنە دەکەم دەروێشەکانی ئەم شێخە لە ئێران زۆرترن هەتا لە عێراق، ئەوان مامە شێخ لە دورەوە دەناسن و دەنگی دەهۆڵیش لە دورەوە خۆشترە هەتا لە نزیکەوە!

## خودا، ڕۆح، ئاین

بیروباوەڕی ئاینی لە منداڵیەوە کە هێشتا مرۆڤ ئێسقانەکانی ڕەق و خورت نەبوە، وەک خۆراک بەردەوام دەکرێت بەدەمی منداڵەوە هەتا هەرزەکاری و دوای

هەرزەکاریش. بناغەکانی کەسێتیی مرۆڤ لە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاریدا دادەنرێ، پەروەردەی ئاینیی خەست و چڕ لەو ساڵانەدا ئاین دەکات بە بەشێکی بنەڕەتی لە پێکهاتەی کەسەکە. هۆیەکی تری تێکەڵبونی ئاین لەگەڵ ڕەگوڕیشەی کەسێتیی مرۆڤدا هەمو جۆرەکانی ترسی مرۆڤە: ترس لە مردن، ترس لە نەخۆشیی قورس و پەککەوتن و بێدەسەڵاتی لە ناوجێدا، ترس لە بەڵا و شەڕی مرۆڤی بەدڕەفتار و تاوانبار، ترس لە ڕوداو و کارەسات، ترس لە سیحر و جادو و چاوی پیس، ترس لە جنۆکە و خێو.... لای باوەڕداران چارەسەری هەمو ترسەکان ئەمانەن: نزا و پاڕانەوە لە خودا و پێڕەوکردنی ڕێنماییەکانی ئاین و هانابردن بۆ پیاوچاکانی زیندو و مردو. بە تایبەتی لە کۆمەڵی پیاوسالاری و خێڵەکیدا ژن زۆرتر لە پیاو هەست بە ترس و نیگەرانی دەکات و دەریدەبڕێ. لەم کۆمەڵانە پێگەی ژن لاوازترە لە هی پیاو، بۆیە بیروباوەڕی خەرافیات و نازانستی و بێبنەما و بێبەڵگە لە ژندا بە تایبەتی لە ژنی نەخوێندەوار و دیلی ناوماڵدا زۆرترە هەتا لە پیاو. بۆیە لە کۆمەڵی کوردەواریدا هەتا ئێستا کچان و ژنان بۆ چارەسەری کێشە دەرونکۆمەڵایەتیەکانی ژیانیان زۆرتر دەچن بۆ لای مامۆستایانی ئاینی و شێخ و سەیدەکان. ئەمانە کە نەیانتوانی بۆیان چارەسەر بکەن ئینجا دەچن بۆ لای پزیشکی دەرونی.

لەو وڵاتانەی ئاشتیی بەردەوام هەیە، زانین و زانست بەردەوام هەر لە منداڵیەوە دەخرێتە مێشک و دەرونی مرۆڤەکان، دڵنیایی تەندروستی هەیە، سیستمی دڵنیایی کۆمەڵایەتیی حکومەت ناهێڵی کەس برسیی بێ، کەس بێدەرمان بێ، کەس لە کاتی نەخۆشیی قورسدا ببێتە بار بەسەر خێزانەوە. لەو وڵاتانە کە کێشەی نێوان مرۆڤەکان لە دادگای سەربەخۆ، دادوەری دادپەروەر و بەتوانا بە پێی یاسا چارەسەری دەکات. لە وڵاتانی ئاوادا بۆ نمونە لە سوید و دانیمارک وئەڵمانیا و هاوشێوەکانیان، ئیتر مرۆڤ پێویستیی بە ئاین و پیاوە ئاینیەکان زۆر کەمتربۆتەوە و بەردەوامیش هەر لە کەمبونەوەدایە و دەوری ئاین لە ژیانی کۆمەڵ و تاکدا بەگشتی لە کزبوندایە. لایەنی ڕۆحیی مرۆڤ و پێویستیە ڕۆحیەکانی زۆر گرنگن و مرۆڤ جیادەکاتەوە لە زیندەوەرەکانی تر. بەڵام لایەنی ڕۆحیی ئینسان نابێت بە تەنیا لە ئاینەکاندا وەک جولەکە و مەسیحی و ئیسلام و هیندۆس و... دا قەتیسی بکەین، بچوک و بەرتەسک و کورتی بکەینەوە. بەڵێ ئەم پێویستیە ڕۆحیە بە پلەی جیاواز لە هەمو تاکێکی مرۆڤی ئەم دونیایەدا هەیە و بەردەوامە و بۆ بەختیاری و هاوسەنگیی دەرونیی مرۆڤیش زۆر پێویستە. بە بێ ڕابەر و پێشەوای ئاینی، بە بێ هیچ کتێبێکی ئاینی، مرۆڤی تاک

چ خوێندەوار چ نەخوێندەوار، ڕۆژانە یا هەر کاتێ، بەو جۆرەی کە دڵ و ڕۆحی دەیەوێ، دەتوانێ خۆی بخاتە پەیوەندیەکی قوڵ و ڕاستەقینە لەگەڵ خودای خۆی، هەمو بیروهۆشی چڕبکاتەوە لە سەر خودا، بپاڕێتەوە لێی و نیازی دڵی خۆی بۆ باسباکات و داوای ڕەحم و کۆمەکی لێبکات.

## میلە ئاسنەکەی سنور

لە نزیک دێی (ئاسناوا) ی سەر بە مەریوان، سنوری نێوان ئێران و عێراق بە میلێکی ئاسن کە لە سەر بناغەیەکی چیمەنتۆ چەقێنرابو، نیشانەکرابو. ئێمە، بەتایبەتی (پ.م) کانی یەکێتی پێشتر لە مەیدانەکانی شەڕی ئێراندا بە خوێن هەڵوێستی نەتەوەیی و مرۆڤدۆستیی خۆمانمان سەلماندبو، سنور و تخوبە دەستکردەکانی داگیرکەرانی کوردوستانمان شکاندبو و تێپەڕاندبو. لەو چۆڵەوانیەدا کە ئەم میلە ئاسنینەم بینی، ڕقێکی ڕەوای ئەستور لە دەرونم تاویسەند و دوای چەند چرکەیەک بوبە حەزێکی تاوسەندو بۆ لێدان وسرینەوەی ئەم میلە دزێوە لەو خاکە پیرۆزە. دورکەوتمەوە لێی و بە خۆشحاڵیە وە چەند فیشەکێکم پێوەنا، سەیربو! برێک دڵ و دەرونم ئاسودە بو.

## خۆدەربازکردن لە داوی دوهەم !

لە ناوچەی مەریوان بۆیەکەم جار ئەم پێشمەرگە بەرپرس و کادیرانەی (ینک) م ناسی کە هەمویان لە ناوچەی شارەزور و هەورامان و شارباژێڕ ئەندام و کادیری کۆمەڵە بون: بەکری حاجی سەفەر(فەرماندەی هەرێمی سێ بو کە هەمو شارباژێڕی دەگرتەوە) ، ئەبو شەهاب - ئیحسان کەرکوکی (لێپرسراوی لقی سێی یەکێتی بو کە هەمو سلێمانیی دەگرتەوە)، ئاسۆی شێخ نوری (ڕابەری سیاسی و لێپرسراوی کۆمەڵە بو لە هەرێمی یەک کە شارەزور و هەورامانی دەگرتەوە)، حامیدی حاجی غالی، شێخ عەلی کەشکۆل، مامۆستا سەرکەوت عوسمان، دوکتۆر قادر، جەمالی حەمەی خواکەرەم،پشکۆ نەجمەدین، د.کەمال شاکیر،حەمەی حاجی سابیر، مەلا یاسین...

کە من لەگەڵ محەمەدی حاجی مەحمود هاتمە مەریوان و دوسێ هەفتە میوانی بوم و زۆر ڕێزی لێگرتم، هەمو ئەم کەسانەی سەرەوە لە سەرەتادا برێک بە سەرسوڕمان وبە چاوی گومان ودرد‌ۆنگی لەمنیان دەڕوانی، چونکە لە ناکۆکیدابون لەگەڵ محەمەد. ئەی خودایە ! ئەمە بۆ من زۆر ناخۆش بو چونکە من لە دەست ناکۆکیە ناڕاست و بێبەرهەمەکانی ناو سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵە نێوزەنگ م جێهێشتبو، کەچی

له خوارەوەش لە ناو (پ.م) و کادیرەکاندا توشی هەمان ناکۆکی و دژایەتی کردنی یەکتر بومەوە. دواتر کە مەریوانم جێهێشت و وردە وردە تێکەڵی ئەو کادیرانەی کۆمەڵە بوم و ئەوانیش لە نزیکەوە منیان ناسی، هەروەها کە من و ئەوان پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵەی ئێران کەوتینە چالاکی و ئاڵ وگۆڕی بیروڕا سیاسیەکانمان، ئیتر وردە وردە گومانەکەیان ڕەویەوە و باشتر منیان ناسی و پەیوەندیم لە گەڵیان بەهێزتر بو. ئەم نزیکبونەوەیە لەوان خۆبەخۆ ئەوەی لێدەکەوتەوە کە وردە وردە لە محەمەدی حاجی مەحمود دوربکەومەوە، چونکە ئەو ناکۆکی زۆری لەگەڵ کادیرەکانی کۆمەڵە لە شارەزور و هەورامان هەبو. ئەوان ڕەخنەی ئەوەیان لەو دەگرت کە بنەما فیکری و ڕێکخراوەییەکانی (ینک) پێشێل دەکات و وەک کەسێکی خێڵەکی نەک شۆڕشگێڕ ڕەفتار لەگەڵ خەڵکدا دەکات، هەروەها دەوترا کە کاک محەمەد پارە لە خەڵک دەسەنێ و تەنیا بەگوێی جەلال تاڵەبانی دەکات و کەسی تر. لەو کاتەدا زۆربەی ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ کاک محەمەد دا بون نەخوێنەوار یا کەمخوێنەوار بون و خەڵکی لادێ بون، بە پێچەوانەوە ئەوانەی لە گەڵ لاکەی تر دا بون زۆربەیان شاری و خوێندەوار و زۆرترجێی بڕوابون. ئیتر ڕێگا ی هاوڕێیەتیی پێشمەرگانەی من و کاک محەمەد دوای یەک مانگ وردەوردە لەیەکتر دورکەوتەوە. بیری چونەخوارەوەم بۆ شارەزور و جەولەکردن لەگەڵ ئەو هیچ بنەمایەکی فیکریی نەما، ئەویش هەستی بەمە کرد و کاتێک ئەو لە ١ ی ٥ ی ١٩٨٠ ناوچەی مەریوانی جێهێشت وبە شاخی سورێنا بەرەو شارەزور ڕۆشت، داوای لێم نەکرد لەگەڵی دابەزم. ئەوە بە تەنیا بەس نیە تۆ لە ژیانت دا بە چەند تاقیکردنەوە دا تێدەپەڕیت و چەند ڕوداو بەسەرت دا دێت، لەوە گرنگتر ئەوەیە چەند پەند و وانەیان لێ وەردەگری! من پەندم لە داوی یەکەم وەرگرتبو کە لە سەرەتای هاتنە دەرەوەم دا پێوەی بوم و کەوتمە ناو (حسک). دواتر لە دوا هەفتەکانی پایزی ١٩٨٠ ئەم جیاوازی و ناکۆکیە بە جیابونەوەی کاک محەمەد لە یەکێتیی نیشتمانی و چونی بۆ ناو (حسک) کوتایی هات، ئەم جیابونەوەیە زیانێکی گەورەی بە یەکێتیی نیشتمانی و شۆڕش گەیاند و بوبە هۆی شەهیدبونی چەندین (پ.م).

## شایەتێکی زیندو کتێب و دەرمان و نامەیەك!

لە لاپەڕە ٣١٤ ی (ڕۆژژمێری (پ.م) یەک، بەرگی یەکەم - ١٩٧٦ تا ١٩٨١)، محەمەدی حاجی مەحمود دەنوسێت:

«کاک دوکتۆر هەژار ناوی عبدالرحمن شێخ عوسمانی شێخ مارفی نێرگسەجاڕە و تەبیبە و هاتۆتە دەرەوە ئەویش کۆمەڵە بو، کۆڵێک کتێبی بە کۆڵەوە بو لە باتی دەرمان، کوڕێکی باش ودڵسۆز و خۆماندوکەر و بەتوانابو، من زۆر دڵخۆشبوم بە هاتنی، بەتایبەتی لەو کاتەدا ئەویش دەچونە ژێر کڵێشەی بۆ ئەوەی بێتە کۆمەڵەکەی ئەوان کۆمەڵەکەی کاک ئەبو شەهاب وکاک ئاسۆ و کاک شاهۆ و کاک سالار و کاک مەلا بەختیار...چونکە پیشتریش ناسراوی لە نێوان بنەماڵەی هەردولاماندا هەبو».

من سوپاسی کاک محەمەد دەکەم بۆ ئەو پەسنەی کە هی منی داوە. کاک محەمەد یەکێ بوە لەو (٧) پێشمەرگە یەی لە ناوچەی شارەزور دوای ئاشبەتاڵ و لەمانگی حوزەیرانی ١٩٧٦ بە چەند چەکێکی سادە و کۆنەوە بون بە پێشمەرگە و کەوتنە چالاکیی چەکداری وسیاسی لە دژی رژێمی سەدام کە لەوپەڕی هێز و توانایدا بو، ئەم هەڵوێستەی کاک محەمەد و هاوڕێکانی شایەنی ڕێز و پێزانینە.

من بەردەوام لە (پ.م) یەتیدا سێ چوار کتێبم پێبو و نەمدەهێشت بێ کتێب بم، چونکە لە بنەماڵەیەکی کتێبدۆست وئەدەبدۆست پەروەردە بوبوم و هەر لە منداڵیمەوە تا ئێستا کتێب بوە بە یەکێ لە باشترین هاوڕێکانم. لە پێشمەرگایەتیدا بەردەوام دەرمان وکەرەسەی پزیشکیم پێبو چونکە کاری سەرەکیی من لە شۆڕشدا پزیشکی بو نەوەک سیاسی، کەواتە کتێبم (لە باتی دەرمان) هەڵنەگرتوە وەک کاک محەمەد دەڵێت، بەڵکو لەگەڵ دەرمان. محەمەدی حاجی مەحمود لە لاپەڕە ٧٠٥ و ٧٠٦ ی (ڕۆژژمێری (پ.م) یەک بەرگی دوهەم - ١٩٨٢ تا ١٩٨٦) نامەیەکی منی بڵاوکردۆتەوە کە لە ٥ ی ٦ ی ١٩٨٥ لە ئێرانەوە بۆم ناردبو. لەو نامەیەدا من ڕەخنەم لە (ینک) گرتوە کە وتوویژی لە گەڵ ڕژێمی سەدام کردوە، هەروەها ڕەخنەم لە سەرکردایەتیی تاکڕەوانەی جەلال تاڵەبانی گرتوە. دەربارەی شەڕی براکوژیش نوسیومە:

"هیوادارم ئێوەی بەڕێز دەورێکی پیرۆز ببینن لە چالاکی دژی ڕژێمی فاشیی عێراق و نەهێشتنی شەڕی براکوژی لە ناوچەی شارەزور و هەوراماندا، بەڕاستی شەڕی براکوژی پەڵەیەکی ڕەشە لە مێژوی شۆڕشی گەلەکەماندا و هەمو حیزب وڕێکخراوەکانی کوردوستان بیانەوێ و نەیانەوێ بەشدارن لەو پەڵە ڕەشەدا و لەو (تراجیدیا) یەدا.... جارێکی تر تکای برایانەتان لێئەکەم کە دەوری شەریفانەی خۆتان بگێڕن لە نەهێشتن و ڕونەدانی شەڕی براکوژیدا".

هەمو ئەوانەی لە نامەکەم دا بۆ کاک محەمەد وتومن ڕاستن و شایەتیی ئەوە بۆ من دەدەن، کە من هەر لە یەکەم ڕۆژی پێشمەرگایەتیمەوە ئاوا دژی شەڕی براکوژی

بوم، ئەم هەڵویستە نەگۆرەم سەرچاوەی ئاسودەیی ویژدانی زیندوی منە. من بەرامبەر بەوانەی پاساوی شەڕی براکوژیان دەهێنایەوە و وەک چارەنوسێکی نەگۆڕ و ناچاری سەیریان دەکرد، دەموت لە کۆتاییدا ئەوە تۆی کوردی نەک سەربازی عەرەب و تورک و فارس کە پەنجە دەنێی بە پەلەپیتکەی ئەو تفەنگەی لولەکەیت کردۆتە پێشمەرگە کوردەکەی بەرامبەرت، کەواتە دەتوانی دەستی پێدا نەنێیت.

## بەلام لەوەدا هەڵەبوم !

بەڵام لەوە پەشیمانم و هەڵەبوم کە دواتر لە نامەکەدا نوسیومە گوایە جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا پاڵەوانی ئەو تراجیدیا یەن (تراجیدیای شەڕی براکوژی). ئەو حوکمەی من لە نامەکەدا دەرمبڕیوە ناڕەوا بوە و ناڕاست بوە، چونکە لە شەڕی براکوژیدا سەرۆک و ئەندامانی کۆمیتە ناوەندی و مەکتەب سیاسی و سەرکردە سیاسی و سەربازیەکانی (پدک) و (حسک) و (ینک) و (حشع) و (پاسۆک) هەمویان، هەریەکە بە پلە و نمرەی خۆی بەشدار و بکەری شەڕی براکوژی بون. کەواتە جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا پاڵەوانی تراجیدیای شەڕی براکوژی نەبون، بەڵکو ئەوان وەک مەسعود و ئیدریس بارزانی و ڕەسوڵ مامەند و د. مەحمود عوسمان و قادر جەباری و هەندێ لە سەرکردەکانی (حشع) و (پاسۆک) هەمویان بەرپرسیارن لە شەڕی براکوژی. من لە کاتی نوسینی ئەو نامەیەدا لە کەشێکی سیاسی و فکریدا بوم کە پڕ بو لە ڕق و کینە لە نەوشیروان وجەلال تاڵەبانی، هەر لەو ڕۆژانە دا بو سالار عەزیز و فازل کەریم نامیلکەی (لم یعد الصمت ممکنا – ئیتر بێدەنگی شیاو نیە) یان لەگەڵ خۆیان هێنابو بۆ ئێران، دەوترا خۆیان نوسیویانە و بلاویانکردۆتەوە، بێگومان منیش خوێندمەوە. ئەو نامیلکەیە پڕ بو لە ڕەخنەی توند لە نەوشیروان مستەفا و جەلال تاڵەبانی، بەلام هیچ ڕەخنە لە خۆگرتنێکی تێدا نەبو لە خۆیان لە سالار و فازل. ئەوان (سالار و فازل) دو پێشمەرگەی سادە ی بێدەسەلات و بێئاگا نەبون لە شەڕی براکوژیدا، ئەوان دو سەرکردەی یەکێتی وکۆمەڵە بون. من لە کاتێکدا ئەو نامەیەم نوسیبو لە چادرێکی کەمپی پەنابەران لە (جەهروم) لە ژێر گەرمایەکی پڕوکێنەردا لەو پەڕی نائومێدی و بێزاریدا دەژیام. دیارە هەمو ئەم هۆکارە نالەبارانە پێکەوە منیان خستە ناو چرکەیەکی هەڵچون و تورەیی دەرونیی وا توند کە ئەو حوکمە ناڕاست و ناڕەوا و ناهاوسەنگەی لی دەرپەڕێ.

## یەکەم دابەزەینم بۆ شارباژێڕ

هێشتا شەڕی ئێران - عێراق دەستی پێنەکردبو، سەدام تازە هاتبوە سەر حوکم و لەوپەڕی بەهێزی دا بو. هێزی (پ.م) هەم لە ڕوی چەک و کەرەسەی جەنگیەوە هەم لە ڕوی ژمارەوە زۆر لاوازبو. بۆیە پێشمەرگە دەبو زۆر بە وریایەوە بە ناوچەکاندا بگەڕێن. دوای جێهێشتنی ناوچەی مەریوان لە بەهارێکی درەنگی ١٩٨٠ دا، هێزێکی نزیک پەنجا (پ.م) کۆکرایەوە کە بەکری حاجی سەفەر و ئەبو شەهاب و ئاسۆی شێخ نوری سەرپەرشتیان دەکرد، منیش وەک تەنیا دوکتۆرێک لەگەڵ ئەم هێزە بوم. کۆڵەپشتی دەرمان و کتێب و چەکێکی سوکم پێبو پێیان دەوت (ویزیی ئیسرائیلی) لەگەڵ چەند فیشەکێکی کەم. ویزی لە کلاشینکۆف بچوکترە بەڵام وەک ئەو بە ڕیز فیشەک دەتەقێنێ، کاتی خۆی (محەمەدی حاجی مەحمود) پێی دابوم. بەکری حاجی سەفەر و (پ.م) پێنجوێنیەکان شارەزای ناوچەکە بون، بە ڕێنمایی ئەوان بێ کێشە بە ناوچەی (شلێر) ی چۆڵکراودا خۆمان گەیاندە گوندی (بلەکێ) ی سەر سنوری نێوان شاری (بانە) و (چوارتا). شەوێک لە (بلەکێ) ماینەوە و بۆ ڕۆژی دوایی لە ئاستی (هەورازی سورەبان) شاخی (سورکێو) ی نێوان باشور و ڕۆژهەلاتی کوردوستانمان بڕی. بە هەورازەکەدا هاتینە خوارەوە، بە لای گوندی کاولکراوی (سورەبان) دا تێپەڕین، لە چەمە کەی دامێنی پەڕینەوە و خۆمان گەیاندە گوندی ئاوەدانی (چاڵەخەزێنە). ئیتر لێرە هێزەکە بوبە سێ بەشەوە و هەر بەشە سەربەخۆ کەوتە گەڕان بە شارباژێڕ دا. من لە گەڵ بەشەکەی بەکری حاجی سەفەر بۆ یەکەم جار کەوتمە گەڕان بە گوندەکانی ناوچەی شارباژێڕ دا.

## ئەحمەدی کاکی و ژوانێك خلتانی خوێن

لە نیوەڕۆی ڕۆژی ٣ ی ٧ ی ١٩٨٠ لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر و (پ.م) کان لە شوێنێکی زۆر چڕ و سەخت بە ناوی (گەڵی) دانیشتبوین، (گەڵی) دەکەوێتە نێوان پشتەوەی گوندەکانی حاجی مامەند و باراو و دۆڵپەمو. شوێنەکە زۆر چۆڵ و پەنا و دوردەستە، تەنیا ڕەشماڵی خێزانێکی پەز بەخێوکەری لێبو. پیاوێکی بەتەمەن وردە وردە لێمان نزیک بۆوە و لە سەر خواستی خۆی هێنایان بۆ لای بەکری حاجی سەفەر، لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر دانیشتبوم، خۆی پێ ناساندین کە ناوی ئەحمەدی کاکی یە. زۆر کز و غەمبار بو، زۆر لاواز و بێهێز هاتە بەرچاوم، بە ئاستەم و بە دەنگێکی

زۆر نزم قسەی بۆدەکرا. کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی کە دوێنێ واتە ڕۆژی ٢ ی ٧ ی ١٩٨٠ ڕویدابو. هیوای کوڕی و بەختیاری هاوڕێی کە پێشمەرگەی (یnک) بون، بە نهێنی دێنەوە ناوشار بۆ ماڵی مام ئەحمەد لە گەڕەکی حاجی ئاوا، مام ئەحمەد لە ماڵەوە نیە. بۆنەی ژن گواستنوە ی ساڵحی کوڕی دەبێت، ساڵح لێپرسراوێکی کۆمەڵە ی ناوشاری سلێمانی دەبێت. سێ هاوڕێی تری ڕێکخستنی کۆمەڵە ی ناوشار دێن بۆ بۆنەکە: وشیاری برای بەختیار، ڕەوف و فەرهاد. ئەم ژوانە بۆ ڕژێم ئاشکرا دەبێت و لە سەعات ٤ ی پاشنیوەڕۆ چەند مەفرەزەیەکی هێزە تایبەتیەکان بەسەرۆکایەتی (ملازم محسن) هێرش دەکەنە سەرماڵی مام ئەحمەد. دوای شەڕێکی دەستەویەخەی قورس، هیوا ی کوڕی بە ساغی دەرباز دەبێت، بەڵام ساڵحی کوڕی و دوبرا (وشیار و بەختیار)، هەروەها ڕەوف و فەرهاد شەهید دەبن. چواردە کەس لە هێزە تایبەتیەکان دەکوژرێن و بریندار دەبن، ملازم محسین لە ناو برینداره‌کاندایە. ئامینە ی ژنی مام ئەحمەد بەسەختی بریندار دەبێت. دەستگیرانی ساڵح و ئامینە ی هاوژینی و ڕەوفی کوڕی و سێ کچەکەی دەست گیردە کرێن. هیوا هەر هەمان ڕۆژ خۆی دەگەیەنێتە شارباژێڕ، لە سەر داوای خۆی بەرپرسێکی (یnک) کلاشینکۆفێک و چەند شانەیە فیشەکی دەداتێ. شەو هیوا بەتەنیا دێتەوە ناو شار بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو پیاوەی ڕیژێم کە سوکایەتیی بە لاشەی ساڵح کردبو، بەڵام پێش ئەوەی دەستی بگات بە کابرا هەر ئەو شەوە دەکەوێتە کەمینەوە و شەهید دەبێ. کوڕێکی تری مام ئەحمەد (مستەفا، ناسراو بە سیروان) لە ساڵی ١٩٧٩ لە گەڵ (جەماڵی عەلی باپیر) لە گوندی (یاخسەمەر) شەهید بو بو. یەکەم جارم بو ئاوا لە نزیکەوە بەسەرهاتی تراجیدیای خێزانێکی شۆڕشگێڕ ببیسم. دەیان پرسیاری عەقلانی لە مێشکم دا هوروژان، بەڵام بێگومان کاتی پرسیار نە بو بەڵکو کاتی هاوغەمی و دڵنەواییکردن بو. مام ئەحمەد زۆر لەوە زویر بو کە ئەو بەرپرسەی (یnک) چەک و فیشەکی بۆ هیوای کوڕی دابینکرد بو، ئەوە نەبوایە هیوا تازە لە تەنورەکە ڕزگاری بوبو و نەدە کوژرا. زۆر دڵنەوایی مام ئەحمەد مان کرد، بەکری حاجی سەفەر کلاشێنکۆف و شانە فیشەکەکانی خۆی پێشکەش بە مام ئەحمەد کرد. لە سەر داوای خۆی دو (پ.م) ی لەگەڵ نارد بیبەن بۆ سەرکردایەتی.

زیادەڕەوی لە بڕوابەخۆبون و بەکەم زانینی دوژمن و گوێ پێنەدانی مەترسیەکان کارەساتی ئاوای لێدەکەوێتەوە. بێگومان دەبێت حساب بۆ دوژمن بکەیت و بڕێک لێی بترسی، بەڵام ترسەکەت نابێت ئەوەندە زۆربێت کە هێزت لە بەر ببڕێ و ئیتر نەتوانی بۆ خۆپاراستن چالاکیی پێویست بکەیت.

## سیروان: بە گڕکانێکەوە لە ناخت دا !

لەم گەڕانەمان بە شارباژێردا سێ چوار ڕۆژ لەگەڵ ئەبو شەهاب و دەستەکەی بوم. کوڕێکی کەرکوکی بە ناوی (سیروان) تازە لای ئەبو شەهاب بوبو بە (پ.م). سیروان تازە پەیمانگای تەندروستیی تەواوکردبو، کوڕێکی زۆر کەمدو و مەنگ و داخراو بو،وتراوە (لە گۆمی مەنگ بترسە). ئەبو شەهاب لە وتووێژێکی دوبەدودا داوای لێکردم (ویزی) یەکەم بدەم بە سیروان بۆ چالاکیەکی گرنگ لە ناوشاردا، من بێ دودڵی داواکەیم پەسەند کرد، ئێ خۆ چەک موڵکی کەسیی من نیە، هی شۆڕشە. سیروان بە ئەبو شەهابی وتبو (قادر فەرەج) ی سەرۆک جاش دراوسێیانە و دەتوانێت زۆر بە ئاسانی بیکوژێت و لە ماوەی ئەو پەڕی دو هەفتەدا بگەڕێتەوە شاخ، چونکە ئەو هەموی دو هەفتەیە لە ماڵ دەرچوە و کەس نازانی بوە بە (پ.م) و کەس گومانی هیچی لێناکات. ئەبو شەهاب نارنجۆکێکی دەستی و (ویزی) یەکەی من دەداتە سیروان و ئەمیش بە نهێنی دەگەڕێتەوە بۆ کەرکوک. سیروان کات هات و کات ڕۆشت، هەرگیز نەگەڕایەوە. دوای دوسێ مانگ هەواڵی گیران و مردنی سیروان لە ژێر ئەشکەنجە دا دەگاتەوە ئەبو شەهاب. قادر فەرەج هەر زو گومان لە سیروان دەکات و دەیخاتە ژێر چاودێریی وردی ئاسایشی کەرکوکەوە. ڕۆژێک سیروان بە نارنجۆکەکەوە دەگرن لە گەڵ نامەیەکی خوشکەزای ئەبو شەهاب کە بۆ خاڵی ناردوە. سیروان پاڵەوانانە بەرگەی ئەشکەنجەی دڕندانەی جەلادەکان دەگرێت و ناوی هیچ کەسێک نادرکێنێ. سیروانیش وەک کوڕەکانی مام ئەحمەد هێز و توانا جۆراوجۆرەکانی ڕژێم بە هەند وەرناگرێ و کاری کوشتنی جاشێکی بەئەزمون و ڕێویەکی پڕفێڵی وەک قادر فەرەج زۆر بە ئاسان دەبینێ.

## جەولەی هەورامان و ڕوداوێکی خۆش

زۆر حەزم بە بینینی دایکم دەکرد، بەڵام لە بەر نزیکیی شارباژێر لە سلێمانیەوە نەم وێرا بنێرم بەدوایدا. بە نیازی بینینی دایکم لە ناوچەی هەورامان، لە دوا هەفتەی مانگی ٧ دا لە گەڵ دو (پ.م) شارباژێرم جێهێشت و بە هەمان ڕێگەی لێوەی هاتبوین خۆمان گەیاندە شەوکەتی حاجی موشیر و د.کەمال شاکیر لە ناوچەی مەریوان. بە جێب بەو ڕێگا سنوری یەی مەریوان ی بە پاوە دەبەستەوە و بە ناو دێی دزلی و بەلای دێی (هەورامانی تەخت) دا تێدەپەڕی، خۆمان گەیاندە گوندی (نۆدشە). لێرە بۆ پشو و

حەسانەوە ڕاوەستاین. بە هۆی شەڕ و نائارامیەوە خەڵکێکی کەمی تێدامابو، زۆربەی دانیشتوانەکەی بەرەو پاوە کۆچیان کردبو. چەند دوکانێک سەرنجیان ڕاکێشام کە تیایاندا چەند پیاوێک خەریکی ئیشی دەست بون بە تەختە و دار، چەند پیاوێکی تر (جۆلایی) یان دەکرد و کلاشیان دروست دەکرد. دوای نانخواردن سواری ئۆتۆمبیل بوینەوە وگەیشتینە شارۆچکەی (نەوسو). لە پاڵ نەوسودا دێی (شۆشمێ) هەیە کە گردێک بە یەک دو کیلۆمەتر لە دێی (تەوێڵە)ی باشوری کوردوستانی جیادەکاتەوە. لە دێی شۆشمێ (پ.م) کانی یەکێتی بنکەیەکی کاتیان لە ژێر سابات و کەپرا دروستکردبو، چەند ڕۆژێک لە شۆشمێ مامەوە و هات و چۆی نەوسو مان دەکرد. کاک شەوکەت توانی هەواڵی من بۆ خزمەکانم لە هەڵەبجە بنێرێ. ڕۆژێک لە نەوسو لە چایخانەیەک دانیشتبوم، لە ناکاو (پ.م) یەکی خۆمان دایکمی هێنایە لام. بەڕاستی دوای تێپەڕبونی ساڵێک لە دابڕانمان، دیدارێکی خۆش و پڕلە فرمێسکی شادی بو. لە ماڵە دۆستەکانی یەکێتی لە شۆشمێ و نەوسو چەند شەوێکم لەگەڵ دایکم بەسەربرد. دایکم کەم وکورتی وسەختی و مەترسیەکانی ژیانی پێشمەرگایەتیی دەزانی، بۆیە هیچ شادی و خۆشحاڵیەکی دەرنەبڕی لەوەی کە کوڕەکەی پێشمەرگەیە، بە چەندبارە کردنەوەی "دایکت بمرێ ڕۆڵە "دەریخست غەمبار و نیگەرانە لە بارودۆخی من. بەڵام لە هەمان کاتدا دەیزانی کوڕەکەی بەهەشتێکی لە عێراق دا لە دوای خۆی جێ نەهێشتوە، بۆیە بە هیچ جۆرێ تەنانەت بە ناڕاستەوخۆش پێی نەوتم با خۆم بدەم بەدەستەوە و بگەڕێمەوە ژێر سایەی ڕژێمی سەدام. کاتی خواحافیزی هات و جارێکیتر لە یەکتر جودابوینەوە. فرمێسکی تاڵ و بەخوڕی ئەم جارەی دایکم دەربڕی غەم و ترس و دڵەڕاوکەی ئەوە بو داخۆ لە پێشمەرگایەتیدا چیم بەسەردێ؟ جارێکیتر یەکتر دەبینینەوە؟ کەی ؟ لە کوێ؟ ماڵاواییەکی غەمبار و پڕلە پرسیارمان لەیەک کرد، دایکمم بەڕێکرد بەرەو هەڵەبجە و سلێمانی.

## سەرجادە وەك پۆلی قوتابخانە!

ڕۆژێک بە ڕێکەوت لە ناوەڕاستی نەوسو بوم کە کادیرێکی کۆمەڵەی ئێران بەناوی (عارفی بابایی) خەڵکەکەی لە ناوەڕاستی شاردا کۆکردبۆوە، باسی وشک و برینگی ئایدیۆلۆجی و سیاسەتی بۆدەکردن. دەتوت لە پۆلی مەکتەبدایە و وانە بە خوێندکار دەڵێت. ئەو چۆن لە کتێبە مارکسیەکاندا هاتبو و خوێندبونیەوە ئاوا باسی پرۆلیتاریا

و بۆرجوازیی بچوک و گەورە و چینی کرێکار و خەباتی چینایەتیی بۆدەکردن. خەڵکە کەش زۆربەیان بێ ئەوەی حەزێکی ڕاستەقینەیان لە بابەتەکە هەبێت گوێیان لە کاک عارف دەگرت، هەندێکیان باوێشکی بێزاراین دەدا و پەلەیان بو زو تەواوبێت و بڕۆن، هەندێکی تریشیان بیر و هۆشیان لای باخەکانیان بو، بەڵام زۆربەیان لە ترس و نیگەرانیی ئەوەدابون داخۆ ئایندەی تەمومژاویی ناوچەکە، کە کەوتبوە بەر شاڵاوێکی قورسی سەربازیی ئێران چیی لێدێ و خەڵکەکە چی چاوەڕیی دەکات.

## حەوزە لارە و مقەست

حەوزێک هەبو لە نەوسو پێیان دەوت (حەوزە لارە)، جۆگەلەیەکی ئاو لە بەرزاییکەوە دەڕژایە ناوی، چومە سەر ئەو حەوزە کە چایخانەیەک لە سەری لە ژێر سێبەری درەختەکانی دەوروبەی دروستکرابو. لە چایخانەکە دانیشتم و کەوتمە پرسیار دەربارەی ژیانی خەڵک، بە دەم چایی خواردنەوە یەک دو پیاوی نەوسویی ئەم بەسەرهاتەیان بۆ گێڕامەوە: لە ڕۆژانی بەسەرچودا کابرایەک لە کەنار ڕێگا ی سەرەکیی ناو نەوسو چەقۆ دەفرۆشێ کە هەورامیەکان خۆیان دروستی دەکەن و پێی دەڵێن (قەڵەمبڕ). کابرایەک کە دەسەڵاتدار و بەگی نەوسو دەبێت لەگەڵ پیاوەکانیدا بەلایدا تێدەپەڕێ و لە ئاستیدا ڕادەوەستێت، بە برێک فیزلی و لەخۆبایی بونەوە بە نوکی پێڵاوەکەی ئاماژە بۆ چەقۆیەک دەکات و لێی دەپرسێ ئەم چەقۆیە بەچەندە. کابرا دەڵێ ئەوە چەقۆ نیە مقەستە. بەڵگە و ڕونکردنەوەی بەگ و پیاوەکانی کە ئەوە چەقۆیە نەک مقەست، لەگەڵ کابرای فرۆشیار سودی نابێت کە هەر سورە لەسەر ئەوەی شتی ئاماژەبۆکراو چەقۆ نیە و مقەستە. بەگە کە زۆر تورە دەبێ و بە پیاوەکانی کابرای فرۆشیار ڕاکێش دەکات بۆ سەر حەوزە لارە و دەیخەنە ناویەوە. بە شوڵک دەکەوێتە لێدانی کابرا لە ناو ئاوەکەدا، بەڵام کابرا سورە لەسەر قسەی خۆی ودەڵێ هەر مقەستە هەتا خەریکە نوقمی ئاوەکە بێت و بخنکێ. ئیتر وای لێدێ ناتوانێ بە قسە بڵێ مقەستە، دەستی لە ناو ئاوەکەوە بەرزدەکاتەوە و بە دو پەنجە ئیشارەتی بڕین بە مقەست دەکات! بێگومان کابرای چەقۆفرۆش دەیەوێت حەقی خۆی بکاتەوە لە کابرای دەسەڵاتدار بەرامبەر بەو بێڕێزیەی کە بە نوکی پێڵاوەکەی پێیکردوە! لەو ناوچەیە لەو کاتەوە بە کەسی زۆر کەلەڕەق و عیناد دەڵێن (مقەستە).

## هەنجیر چەند خۆشە !

لە گەڵ دو (پ.م) ی خۆماندا چوم بۆ شوێنێک، هەوارێک کە لەو بەری بە شۆشمێ یە بە ناوی (پەروێنێ). لێرە (پ.م) کانی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە کە هەمویان کۆمەڵە بون (فەرهاد، ئەمیر، سالح مەجیلان، نیازی هەورامی...) لە ژێر کەپرێکدا بنکەیان دانابو، دەوروپشتیان هەموی دارهەنجیر بو. من زۆر حەزم لە هەنجیرە، هەنجیرەکان باش گەیی بون، لە (پ.م) کانم پرسی باخەکە هی کێیە، تێگەیشتن مەبەستم ئەوەیە بڕێک هەنجیر بخۆم. زۆر بە ئەدەب و بە بڕێک شەرمەوە وتیان خاوەنەکەی لێرە نیە و ئەوان خۆیان هەتا ئەوی لێنەبێت دەست بۆهیچ میوەیەک نابەن. ئاوابون (پ.م) و کادیرەکانی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە و یەکێتی! موچڕکەیەکی شادی و شانازی سەرتاپای لەشی داگرتم، زۆر دڵم خۆشبو بەوەی (پ.م) کان ئەوەندە خۆگر و دەستپاک و نزیک لەخەڵکن. بێگومان منیش بەسەر حەزی خۆمدا زاڵبوم، خۆمگرت و دەستم بۆ یەک هەنجیر نەبرد، کابرای باخەوانیش لە شانسی مندا هەر نەهات.

## ئەحمەد گریانەیی

دواتر لەگەل (پ.م) کاندا چوین بۆ دێی (هاوار)ی کاکەییەکان کە چۆڵ و وێرانکرابو، لە بەرزاییەکانی دەوروبەرەوە چەند تۆپێکیان تێگرتین بەڵام دور لە ئێمە تەقینەوە. لە چەمەکەی نێوان هاوار و تەوێڵەدا بە بۆمبای دەستی (پ.م) کان هەندێ ماسیان ڕاوکرد و نانی نیوەڕۆمان پێ دابینکرد.

ئەوە یەکەم جارم بو ڕاوەماسی بە بۆمبا تەقاندنەوە ببینم، زۆرم پێناخۆش بو، شێوازێکی هەڵە و توندوتیژە کە دەبێتە هۆی کوشتنی چەندین ماسیی زۆر ورد کە ناخورێن، جگە لەوە لە بۆمبا تەقاندنەوەکەدا ئەگەری بریندار بونی کەسەکان هەیە.

لەم گەڕانەمدا بە هەوراماں، گوێ و دڵم بە گۆرانی و لاوانەوە غەمبار و بەسۆز و کاریگەرەکانی (ئەحمەد گریانەیی) ئاشنابو. چیرۆکی ئازایەتی و پاکی و دڵسۆزیی ئەوم زۆرجار لە (پ.م) کان دە بیست. ئەو خەڵکی دێی (گریانە) ی نزیک هاوار بو، لە (پ.م) سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و (ینک) بو لە ناوچەی هەڵەبجە. بە بنێشتکردن لە دارقەزوانەکانی ناوچەکە خۆی دەژیان و یارمەتیی (پ.م) یشی دەدا، باوەڕپێکراو و خۆشەویستی خەڵکی ناوچەکە بو،لە یەکێک لە شەڕەکانی (سەرکردایەتیی کاتیی پارتی) دا بە دەستی (پ.م) کانیان کوژرابو.

## تەوێڵە و ئاوێسەر

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگی مانگی ٨ لە گەڵ کاک شەوکەتی حاجی موشیر و د.کەمال شاکیر و دەستەیەک لە (پ.م) کان لە دێی (دزاوەر) ی پشتی تەوێڵەوە کە دوا دێی ئێرانە هاتینە سەیرانگەی (ئاوێسەر) ی تەوێڵە کە لە سەر سنوری نێوان ئێران وعێراقە. لە بەر ئەوەی من خەڵکی ناوچەکە نەبوم و یەکەم جاربو دەرکەوتبوم کەس نەیدەناسیم، بۆیە وا بەباش زانرا من سەیرانکەرەکانی ئاوێسەر کۆبکەمەوە و قسەیان بۆ بکەم. بە خۆم و چاویلکەی پزیشکی و کلاشینکۆفی سەر شانمەوە، بە کەف و کوڵێکی شۆڕشگێرانەی جیڤارائاساوە لەسەر شۆڕشی نوێی یەکێتیی نیشتمانی قسەم بۆکردن. (پ.م) هەورامیەکان لە پەناوە بەگێکی هەورامیان لە ناو سەیرانکەرەکان پیشاندام کە گوایە بەعسیە، دیارە لە ترسی کەس وکاری خۆیان نەیان وێرا هیچی پیبڵێن و ئیشەکەیان بۆ من بەجێهێشت! منیش بانگم کردە لاوە و برێک سەرزەنشتمکرد کە بۆچی بوە بە بەعسی. وردە وردە کە تاریکی داهات یەک لە دوای یەک و بە وریایی و بێدەنگیەوە بە ناو باخەکاندا بەرەو ناو دێی تەوێڵە کاروانمان بەست. من لە گەڵ (حەمە سەلیم) کە (پ.م) یەکی تەوێڵەیی وریا و شارەزا بو لە ماڵێک دامەزرام. دوای نانخواردن و پشودانێکی باش و کۆبونەوەی نهێنی لەگەڵ لایەنگران و ئەندامانی یەکێتی لە تەوێڵە، ناودێمان جێهێشت. بە پیادەڕە و بە شاخەکان دا بە چەند سەعاتێ خۆمان گەیاندە گوندی (هانەگەرمەڵە) کە دوا دێی کوردوستانی ئێرانە و دەکەوێتە پشتی دێی(بیارە) ی کوردوستانی عێراق. لە (هانەگەرمەڵە) نانی بەیانی مان خوارد، پاشان منیش لە سەربانی یەکێ لە ماڵەکان نۆڕینگەیەکی کاتیم دانا، دەرمان و کەل وپەلی پزیشکیم دەرهێنا و کەوتمە بینینی نەخۆش و پێدانی دەرمانی پێویست. لەم گەشتەمدا بە هەوراماں چەند وشەیەکی هەورامیش فێر بوم!

## یەکەم ساڵڕۆژی شەهیدبونی فوئاد سوڵتانی

دوای ئەم گەشتەی هەورامان گەڕاینەوە ناوچەی مەریوان، ئیتر کاتی یەکەم ساڵڕۆژی شەهیدبونی یەکێ لە خۆشەویسترین ڕابەر و یەکێ لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ئێران (فوئاد سوڵتانی) بو. کاک فوئاد لە ٣١ ی ٨ ی ١٩٧٩ لەسەرەتای خولی یەکەمی شەڕی ڕژێمی ئێران دژی کورد، لە نێوان بانە و مەریوان شەهید بوبو. لە کوردوستانی ئێران فوئاد سوڵتانی وەک (شە هید ئارام) ی خۆمان سەیردەکرا. ئەو ئەندازیارێکی زۆر

زیرەکی کارەبا بو، بەهۆی چالاکیە سیاسیەکانیەوە ڕژێمی شا چەندین ساڵ زیندانیی کردبو. دواتر لە سەروبەندی ڕوخانی ڕژێمی شا و گەڕانەوەی خومەینی بۆ ئێران ئازادکرا و وەک سەرکردەیەکی کۆمەڵەی ئێران کەوتبوە خەباتیکی گەرموگوڕ. کاک فوئاد خۆی کوڕە دەرەبەگی خاوەن زەوی و زار بو، کەچی دڵی لای جوتیاران بو، گوندەکەی خۆیان ناوی (ئەڵمانە) بو لە نزیک مەریوان. کاک فوئاد ڕابەرایەتیی (یەکێتیی جوتیاران) ی کرد بۆ بەرگریی لە مافەکانیان، کاک فوئاد سەرکەوتوانە ڕابەرایەتیی بەرگریی مەدەنیانەی خەڵکی مەریوانی کرد بەرامبەر بە هاتنی هێزی پاسداران بۆ ناو شار. ئەو بەرگریە ناتوندوتیژانەی خەڵکی مەریوان دەسەڵاتدارانی تازەی کۆماری ئیسلامیی لە تاران لەرزاند و لە هەمو ئێراندا دەنگیدایەوە. لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر و شێخ عەلی کەشکۆڵ وئاسۆی شێخ نوری و چەند (پ.م) یەکدا بەشداریی یادەکەمان کرد، کە لە سەر گۆڕەکەی لە گۆڕستانی (تاڵەسوار) ی گوندی (ئەڵمانە) ی شوێنی لەدایکبونی بەسترا، کاک ئاسۆ وتارەکەی یەکێتیی خوێندەوە.

## بەرەو سەرکردایەتی

لە ناوەڕاستی مانگی ٩ی ١٩٨٠ لە کاتێکدا دەگەڕاین بە گوندەکانی ناوچەی مەریوان دا، بروسکەیەک لە سەرکردایەتیەوە هات کە هێزێکی پێشمەرگە بگەڕێتەوە بۆ نێوزەنگ بەهۆی جم و جوڵی سەربازیی گومان لێکراوی (پدک) و (حسک) لە ناوچەکە. لەگەڵ شێخ عەلی کەشکۆڵ و دەستە (پ.م) کەی بەرەو سەرکردایەتی کەوتینە ڕێ و بە ناوچەی مەریواندا تێپەڕین، شاری مەریوان حوکومەتی ئێران گرتبویەوە. دوای پیادەڕێیەکی درێژ و پروکێنەر، لە سەر ڕێگە ی نزیک گوندێکی مەریوان لاماندا، من کۆڵەپشتەکەم و نایلۆنێکی دەستم کە کتێب و دەفتەری یاداشت و ناسنامەی پزیشکیمی تێدابو لە تەنیشت خۆمەوە دامنا. لە شەکەتی و ماندوێتیدا هەر زو خەوم لێکەوت، نازانم چەند خەوتم، لە پڕ لە فەرمانی سەربازیی پڕ لە دیسیپلینی شێخ عەلی بەئاگا هاتمەوە: یەڵلا هەستن درەنگە بابڕۆین. بە نابەدڵی و بە بێدەنگی جەستەی قورس و هێشتا ماندو و خاوبۆوەم بەدوای خۆمدا ڕاکێشا، هیچ چارەیەکی ترم نەبو. دوای یەک سەعات ڕێکردن ئینجا لە پڕ هاتەوە بیرم کە لە سەر ڕێگاکە نایلۆنەکەم بیرچوە، گەڕانەوە تازە کارێکی نەکردەنی بو، کێ دەیتوانی بگەڕێتەوە؟

زۆر خەفەتم خوارد بە تایبەتی چونکە چیرۆکی (٢٤ سەعات در خواب و بیداری)ی (سەمەدی بیهرنگی) ی تێدابو کە لە فارسیەوە گۆڕیبومە سەر کوردی و هەر ئەو دەسنوسەشم هەبو کە لە نایلۆنەکەدابو، دواترهەرگیز نەمدیەوە! دوای چەند سەعات پیادەڕێ لە دێی سنوریی (ساوجی) ی سەر بە مەریوان گەیشتینەوە بە بەکری حاجی سەفەر کە لە چەند ڕۆژی پێشودا وردە وردە هەمو ئەو پێشمەرگانەی کۆکردبۆوە کە لە دەروپشتی مەریوان پەرش و بڵاو بوبون، ئەم هێزە کە نزیکەی حەفتا (پ.م) ە یەک دەبوین بەکری حاجی سەفەر و شێخ عەلی سەرپەرشتیان دەکرد. لە (ساوجی) کە گوندێکی شەستماڵی دەبو، بۆ نانخواردن و پشودان بەسەر ماڵەکاندا دابەش بوین، دوای نانخواردن لە مزگەوتی دێ دەرمان و کەل وپەلی پزیشکیم دەرهێنا و کەوتمە بینین و چارەسەرکردنی (پ.م) و خەڵکی گوندەکە. پاشان وردە وردە (پ.م) کان لە ماڵەکان هاتنە دەرەوە،هێزەکە پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ ساوجی مان بەجێهێشت و ملی ڕێگامان گرتەبەر، (پ.م) یەکی پێنجوێنیی شارەزا پێی وتم بەرە و ناوچەی شلێر دەچین، وردە وردە خاکی کوردوستانی ئێرانمان جێهێشت و هاتینە ناوچەی شلێری سەر بە پێنجوین.

## تەنیا دو بەردی دەستاڕ

هەمو دێهاتەکانی شلێر لە ساڵی ١٩٧٩ لە لایەن ڕژێمی سەدامەوە چۆڵ و وێرانکرابو. شەو داهات و ئێمەش دەبو پێش ڕۆژبونەوە ناوچەکە تێپەڕێنین و بگەینە سنوری شاری بانە. چەند دیمەنێکی ناخۆش و ترسناک و غەمباربو! ناوچەیەکی فراوانی بێئاوەدانی، هەتا چاو بڕبکات هەر تاریکی بو، جگە لە خۆمان زیندەوەرێکمان نەدەبینی، لێرە و لەوێ ئاگری گەورە گەورە کەوتبۆوە و ناو بە ناو تەقەی زۆر دەکرا. ئەو پێشمەرگانەی خەڵکی ناوچەکە بون وتیان ئەوە تەقەی جاشە لە ناوچەکەدا و هەر ئەوانیشن ئاگریان بەرداوەتە ناوچەکە، بەڕاستی لەوە تێنەدەگەیشتم ئاخر مرۆڤ چۆن ئاگر بەردەداتە وڵاتی خۆی ! تاریک و ڕونی بەیانی شەکەت و ماندو و برسی لە وێرانەی دێیەکدا لاماندا و بڕێک پشومان دا. بیرمە لە کەلاوەی ماڵێکدا دو بەردی دەستاڕم بینی کە بە ڕگەی وێرانکاریی ڕژێمی سەدامیان گرتبو و بە ساغی لەو دێیە مابونەوە.

## وێنەكان تێكەڵ بە یەك دەبن

لەو كات و شوێنەدا و بە بینینی ئەو دو بەردی دەستارە، وەک تەنیا پاشماوە و تەنیا بیرەوەریی دێیەكی پێشتر ئاوەدان و ئێستا چۆڵ و وێرانكراوی كوردوستان، زۆر شڵەژام و نائارام بوم. (ئیتر من ئاگام لە هـاوڕێ (پ.م) كانم نەما، هەڵۆی باڵتیژی خەیاڵم لە هێلانەی مێشكی هەژاوەمەوە هاتەدەر و كەوتە باڵ لێدان. بە چاوە تیژەكانی ڕۆژانی ئاوەدانیی ئەو دێیە و خەڵكەكەی بینی كە ئێستا لە زیندانی ئۆردوگا زۆرەملیەكانی (شانەدەری) و (ناڵپارێز) توندكرابون و ژیانێكی كولەمەرگیان بەسەر دەبرد. هەڵۆی بەرزە فڕ واوەتر درێژەی بە گەشتەكەدا بۆ ئاسمانی سلێمانی و بۆ نەخۆشخانەی منداڵانی سلێمانی. بۆ ئەو ڕۆژانـەی من وەک دوكتۆری نیشتەجێ ماندونەناسانە لەگەڵ هاوپیشەكانم كارمان دەكرد. وێنەی منداڵە زەرد و لاوازەكانی ئۆردوگاكانم هاتەوە بەرچاو كە وشكهەلاتو و نیوەمردو بۆ ڕزگاركردنی ژیانیان دەیانگەیاندە ئێمە). لە هەل و مەرجی ماندوێتی و برسێتیی ئەو بەیانیەدا و لە ژێر كارلێكی زیندەخەونەكەمدا، هەست وسۆزە بریندارکراوەكانی ناو دەرونم وردە وردە شێوازێكی تورە و توندوتیژانەی بەخۆوەگرت و، ئەو بیروبۆچونەی لێكەوتەوە كە ئەگەر توشی شەڕبین لە گەل جاشەكاندا و دیلی ئەوان كەوتە دەستمان، حەقیەتی ئەو جاشانە بە زیندویی بخەینە ناو ئەو ئاگرەی كە خۆیان بۆ سوتاندنی نیشتمانی خۆیان كردویانەتەوە. وێنە خەیاڵیەكانی ناو مێشكم بەرجەستەبون و شێوەی جاشی دیلی كوردیان لێدەرهات چۆن (پ.م) كان دەست و پێیان دەگرتن و یەک یەک فڕێیان دەدەنە ناو ئاگرەكەوە! ئەوەی بە شاخ و دۆڵ و چەم و پێچ و پەنا و ئەشكەوتەكانی كوردوستانا گەڕابێ، باش تێدەگات ئەگەر جاش و سیخوڕی كورد نەبێت لەگەڵ چەكی كۆكوژی نوێ، داگیركەرانی كوردوستان هەرگیز ناتوانن كۆنترۆڵی تەواوی كوردوستان بكەن و گەلەكەمان دیل و كۆیلەبكەن. ئەو ڕەقی و بێبەزەییە خەیاڵیەم ئەنجامی هەڵچون وكاردانەوەی هەست وسۆزی ئەو ناكات و ناشوێنە ڕوخێنەر و ترسناكە بو. بەڵام وردە وردە هۆشم بەخۆدا هاتەوە، ئاوەز و لۆجیک جڵەوی دەرونە هەژاوەكەمیان گرتەوە و هاواریان لێكرد: نەء نەء هەڵەیە هەڵە ! ئەو جاشانە خۆشیان قوربانیی دەستی ڕژێمی داگیركەرن و نابێت ماندو بین لە هەوڵی گەڕانەوەیان بۆ ڕیزی گەل و نیشتمانە داگیر و وێرانكراوەكەمان. بەشێكی جاشەكان بە هۆی هەڵەكانی شۆڕشەوە بوبون بەجاش، بەشێكی تریان بە هۆی برسیكردن و بێئیش كردنیان و كۆكردنەوەیان لە ئۆردوگا زۆرەملیەكانی ڕژێم، بەشێكیشیان بە هۆی

نەخوێندەواری و هێشتا مانەوەی نەریتە خراپەکانی خێڵەکایەتی، وەک تۆڵەسەندن و بەکارهێنانی لە لایەن دەسگا سیخوڕیەکانی ڕژێمەوە. باشبو توشی شەڕ نەهاتین. لەچیشتەنگاودا گەیشتینە دێی (سەیرانبەن) کە دێیەکی ئاوەدانی سەر سنوری سەر بە شاری (بانە) یە. دوای پشودان و نانخواردن لەم دێیە، درێژەمان بە ڕۆشتن دا تا گەیشتینە دێی (بلەکێ) ی سەر سنور کە ئەمیش سەر بە بانە بو. چوینە بنکەکەی خۆمان کە سێ چوار کیلۆمەترێک لە دەرەوی بلەکێ بو. دوای پشودان و نانخواردن، درێژەمان بە پیادەڕۆشتن دا بە گوندە سنوریەکانی بانە و سەردەشت (گەرماو، نیروان، چۆمان، بێژوێ، قەلەڕەش، کانیزەرد و...) تا گەیشتینە بنکەکانی سەرکردایەتی لە نێوزەنگ. من چومە ئەو نەخۆشخانەیەی لە هاوینی ١٩٨٠ دا لە چادرێکی گەورەدا لە توژەڵە کردبویانەوە و (دوکتۆر شادمانی فوئاد مەستی) دەیبرد بەڕێوە. هەتا لە سەرکردایەتی بوم پێکەوە لەگەڵ دوکتۆر شا دمان برینداز و نەخۆشەکانمان چارەسەردەکرد. ڕۆژێک (ئەحمەد مەولود) ی فەرماندەی کەرتی باڵەکایەتی برایەکی هێنا کە نەخۆشی زۆر لاواز و بێخوێنی کردبو. خەواندمان، هەستمان کرد پێویستی بە خوێنە. ئەو بە دلنیایەوە وتی گروپی خوێنی(O+)، هی منیش (O+) بو، توانیمان بێ کێشە بوتڵێک خوێنی خۆمی تێبکەین.

## کێ ئەڵێ هەر ئێستا نارِوخێ ؟

هێشتا لە نێوزەنگ بوم کە ڕۆژی ٢٢ ی ٩ ی ١٩٨٠ شەڕی نێوان عێراق و ئێران لە ڕادیۆی بەغداوە ڕاگەیەندرا. ئەم هەواڵە بۆ ئێمە زۆر دڵخۆشکەر بو چونکە سوپای عێراقی سەرگەرم دەکرد بە شەڕی ئێرانەوە و پەستان و گوشین بە تایبەتی هێرشی هێلیکۆپتەرە جەنگیەکان لە سەر ئێمە کەم دەبۆوە. کەس پێشبینیی ئەوەی نەدەکرد شەڕ درێژە بکێشی و ئاگرە وێرانکەرەکە ی کوردوستانیش بگرێتەوە. ڕۆژێک لە گەڵ (مامۆستا محەمەد سابیر- محەمەدی عەتێ) ی کادیری کۆمەڵە و چەند (پ.م) یەکدا لە توژەڵە لە بنکەیەکدا دانیشتبوین. مامۆستا محەمەد جگەرەیەکی بەدەمەوە بو، بە دەنگی بەرز وتی: «کوڕینە تەواو! بەهۆی ئەم شەڕەوە ڕژێمی سەدام زو دەڕوخێ، کێ دەڵی تا من ئەم جگەرەیە تەواو دەکەم هەر ئێستا ئەویش نارِوخێ؟ «. پێکەنین و خۆشی هەمومانی هێنایە جۆش. مامۆستا محەمەد تێکۆشەرێکی دێرینی کۆمەڵە بو، پیاوێکی قسە خۆش بو، نوکتە و گاڵتەوگەپی زۆر بو. ئەو وەک زۆرمان

و تەنانەت وەک زۆربەی سەرکردەکانیش بێئاگابو لە ململانێ و هاوکێشە ناوچەیی و نێونەتەوەییە ئالۆز و جۆراوجۆرە کان، بۆیە هەر بە ڕاستی شەڕی ئێران - عێراق پشکۆی ئەو ئومێدەی لای هەمومان گەشاندبۆوە کە ئیتر ڕژێمی سەدام زو دەڕوخێ و ئێمەش بە سەربەرزی دەگەڕێینەوە شارەکانمان. ئەوەی ئەگەر ڕژێمی سەددام روخا، دۆخی عێراق و کورد تێیدا چیی لی دێ؟ کەس هەر بیری لێنەئەکردەوە! ستەم و جەبەروتی سەدام هەمو شتێکی تری لە بیر بردبوینەوە.

## دەروازەی تر نیە؟

دڵخۆشیمان بە هەڵگیرسانی شەڕی ئێران وعێراق کورتخایەن بو، چونکە دو هەفتە دواتر لە سەرەتای مانگی ١٠ ی ١٩٨٠چەکدارەکانی پارتی بە پشتیوانیی ڕژێمی ئێران و (حسک) لە هێرشێکی کوتوپڕدا بنکەی (قەلاتوکان) ی یەکێتیان داگیرکرد. دوای ئەوە پارتی بە هێزێکی گەورەوە لە ژێر سەرکردایەتیی خودی مەسعود بارزانی کە هاتە گوندی دۆڵەتو، بەرزاییە ستراتیجیەکانی (قوتەی جاسوسان) ی ئەو بەری نیوزەنگ یان گرت، سەنگەریان لێمان گرت و بونە گەڤ و هەڕەشەی ڕاستەوخۆ لە سەربنکەکانی سەرکردایەتیی یەکێتی. وەک کاردانەوە و بەرگری لەخۆکردن (پ.م) کانی یەکێتی لە چەمەکە پەڕەینەوە بەری ئێران و چونە سەر بەرزاییەکان، بۆ ئەگەری شەڕ و بەرگری لەخۆکردن، بەرامبەر هێزەکانی پارتی سەنگەریان لێدا. پارتیەکان دەیانوت دەیانەوێ بە لای ئێمەدا بڕۆن بۆ قولایی کوردوستان بۆ شەڕی ڕژێمی بەعس، بەڵام گوایە یەکێتی ڕێگریان لێدەکات. سالار عەزیز لە کۆبونەوەیەکی فراوانی (پ.م) کانی سەرکردایەتیدا لە (زەڵێ) باسی هەستیاریی دوخەکەی کردو وتی: «لە سنورەکانی کوردوستان سەدان دەروازەی تری لێیە کە پارتی بێ هیچ کێشەیەک دەتوانێ لێی بپەڕێتەوە بۆ قولایی کوردوستان بێ ئەوەی بەرکەوتن لەگەڵ (پ.م) کانی یەکێتی دروستبێ، پارتی بۆ لەو دەروازانەوە ناچنە خوارەوە؟ جارێ بادینان دوای کارەساتی هەکاری ئەوە هەر پ.م ی خۆیانی لێیە، بۆ ناچن لەوێ پەلاماری هێزەکانی ڕژێم بدەن؟ «. لەم کۆبونەوەیەدا نیگەرانی وترسی شەڕی براکوژی و پەرۆشیم بۆ ئاشتی، هەڵیانساندمە سەرپێ و ڕوم کردە کاک سالار و پێم وت: «ئایا کێشەکان هەر دەبێ بە شەڕ چارەسەربکرێن؟ هیوادارم بە وتووێژی سیاسیی عەقلانی و بە ناوبژیوانیی

لایەنەکانی تر هەرچۆنێ بوە بە ئاشتی کێشەکە چارەسەربکرێت». لەو دۆخە پڕ لە گرژی و ترس و هەست بە زوڵملێکراوییەی یەکێتی دا، ئاسان نەبو پرسیارێکی ئاوا لە کۆبونەوەیەکی فراوانی (پ.م) دا بکەیت!

## جەژنێکی بەڕاستی قوربان !

هێشتا حیزبی شیوعی لە ناوبژیکردندا بو و کێشەکە لەگەڵ پارتی چارەسەرنەکرابو، کە بەیانی زوی ڕۆژی١٩ ی ١٠ ی ١٩٨٠ یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان هێزێکی ڕژێمی سەدام لە هەڵمەتێکی کوتوپڕدا بە یارمەتی و پێشڕەویی جاشەکان چەند لوتکە یەکی گرنگی شاخی مامەندەیان لە پشتەوەی دێی (شێنێ) داگیرکرد. هەڵبژاردنی ئەم ڕۆژە ڕێکەوت نەبو، ڕژێم دەرفەتی جەژنی بەکارهێنا کە (پ.م) ی گەلێکی زۆرموسوڵمانی وەک کورد چاوەڕێی پشویەکی چەند ڕۆژیی شەڕوەستان و لێبوردەیی و ڕەحم و بەزەیی دەکات نەک هەلمەت و هێرشی کوتوپڕ، یا هیچ نەبێ چاوەڕێ دەکات ڕژێمی سەدامی عەرەبی ڕێز بو ئاینی ئیسلام دابنێ کە ڕەگوڕیشەکەی لە عەرەبەوە سەری هەڵداوە. دیاربو هەلوێستێکی مەترسیداربو، چونکە ئەگەر ڕێگە بەو هێزە بدرایە لە سەر شاخی مامەندە خۆی دامەزرێنێ و لەوێدا بمێنێتەوە، ئەوا سەرکردایەتیی (ینک) لە نێوزەنگ دەکەوتە بەر ڕەحمەتی تۆپبارانی بەردەوامی ڕژێمی سەددام و ناچار دەبو ناوچەکە چۆڵ بکات. بۆیە دەبوایە بە هەر نرخێک بێت بەزوترین کات قوتە گیراوەکانی مامەندە لە دەست دوژمن دەربهێنرێت و بکەوێتەوە ژێر کۆنترۆڵی تەواوی (پ.م) ی یەکێتی. ئا لەم دۆخە هەستیارە دابو کاتێ (مولازم عومەری حاجی عەبدوڵا) کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەریی یەکێتی بو، خۆی بەسەر بنکەکانی سەرکردایەتیدا دەگەڕا و هەر (پ.م) یەکی لەناویاندا ببینیایە داوای لێدەکرد چەک و تفاقی شەڕببەستێ و بەرەو (شاخی مامەندە) بڕوات بۆ شەڕ. مولازم عومەر بە بڕێک شپرزەییەوە خۆی کرد بە نەخۆشخانەدا و داوای لە ئامادەبوان کرد چەکەکانیان هەڵگرن و بەرەو شوێنی شەڕ: مامەندە بڕۆن. من کۆڵەپشتی دەرمانەکانم دابە پشتمدا و شانەی فیشەکەکانم لە خۆم بەست و کلاشینکۆفەکەم خستە سەر شانم و بەرەو ژور کەوتمە ڕێ، دوکتور شادمان بەهۆی کەتەیی و قەڵەویەوە کەوتەدواوە. بە شاخەکەدا هەڵدەگەڕام کاتێک (حەمە تۆفیق ڕەحیم) م بینی، کە دواتر بوبە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتی، ئەویش وەک من بە چەکەکەیەوە بەرەو شوێنی شەڕەکە بە

شاخەکەدا هەڵدەگەڕا. گیڤەی هاوەن و تۆپ کە بەسەرماندا دەفڕی دەنگێکی ترسناک و بێزارکەری هە بو. دیاربو کاتێ ئێمە لە شوێنی شەڕەکە نزیکبوینەوە، تازە سەرباز و جاشەکەن شکا بون و لە کشانەوەدا بون.

## مستەفای سەعید زۆراب

لە نێوان چەند گابەردێکەوە هاواری (پ.م) یەک، تێکەڵ بە شریخە و قرمژنی گولە و هاوەن گەیشتە گوێم: «دوکتۆر هەژار خێرا فریای ئەم (پ.م) بریندارە بکەوە ». کە بە ڕاکردن خۆم گەیاندە سەر (پ.م) کە، بەداخەوە دوا هەناسەکانی هەڵدەکێشا، گولەیەک ڕێک دابوی لە تەختی تەوێڵی و مێشکی بە سەختی بریندارکردبو. بۆیە هیچ هۆشی بەخۆی نەبو، بەڵام بێئاگا و بێهودە دەست و پەلی دەجوڵان، پێش ئەوەی بتوانم هیچ شتێکی بۆبکەم لە نێوان هەردو دەستمدا دوا هەناسەکانی دا و ئینجا لە پەل و پۆ وهەناسەدان کەوت. ئەم قارەمانە، فەرماندەی دەستە (مستەفای سەعید زۆراب) ی پێنجوێنی بو. پێش دوسێ ڕۆژ لە گەڵ مستەفا لە بنکەیەکی نێوزەنگدا پێکەوە بوین، پێشتر یەکترمان دەناسی، پێکەوە بە دێهاتەکاندا گەڕابوین و پەیوەندیەکی هاوخەباتیی خۆشمان هەبو. بەڕاستی ڕوداوێک بو بۆ من هەژێنەر و تاسێنەر بو. دیاربو شەهید مستەفا لە پێشی پێشەوەی ئەو پێشمەرگانەی کەرتی (ئازاد دەرەمیانەیی) بو کە بەرەو لوتکەی مامەندە ملیان نابو بۆ شکاندنی هێزەکەی دوژمن. هێشتا جەستەی مستەفا لە بەردەمم دا تەواو سارد نە بوبۆوە کە دیمەنی ئەم یادگاریەم لەگەڵی وەک بروسکە هاتەوە پێش چاوم: (لە مانگی ٩ ی ١٩٨٠ دا نزیکەی پێش چەند هەفتەیەک لەم شەڕە، کاتێک لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر و شێخ عەلی کەشکۆڵ دا و هێزێکی پێشمەرگەی حەفتا کەسی کە بەرەو سەرکردایەتی دەچوین، ڕێمان کەوتە گوندی (ساوجی) ی مەریوان. لە بەردەم مزگەوتی دێدا چاوەڕیی کەسێکی خەڵکی دێمان دەکرد دابەشمان بکات بەسەر ماڵەکاندا بۆ پشودان و نانخواردن. مستەفا کوڕێک بو لە تافی لاویدا، ڕەنگی پێستی سپی وسورباو بو، باڵای نزیکەی ١٨٥ سانتیمەتر دەبو، کوانویەکی ئاگربو هاڵاوی وزە و ژیانی لێ بەرزدەبۆوە. جامانەیەکی قوتی دەبەست، بە تولەڕێی باریکی سەر شاخەکاندا وەک کەڵەکێوی بە نێوان کاچ و تاشە بەردەکاندا دەڕۆیشت و بازبازێنی دەکرد. بەکری حاجی سەفەر بۆ گاڵتە و خۆشی بە (مستەفای) وت تۆ خۆت

بکە بە لێپرسراوی هەمومان. ئەمیش دوای شکانی دیواری شەرم لە بەکری حاجی سەفەر، وەک ئەکتەرێک ڕۆڵەکەی خۆی بە سەرکەوتویی گێڕا. کابرای دابەشکەری (پ.م) کان بڕوای کردبو، چونکە هەیبەتی مستەفا لەوە گەورەتر بو گومان بکات لە وەی کە ئەو فەرماندەی ئەم هێزی (پ.م) ی حەفتا کەسیەیە. کابرا بە (قوربان فەرمو فەرمو) پێش مستەفا کەوت و بردیە ماڵی دەوڵەمەندترین کەسی دێ. ئێمەش لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر وەک بینەرانی دیمەنێکی شانۆیی کۆمیدی دابومانە قاقای پێکەنین).

ئەم شەهیدەی ئێستا، کە سەدان کیلۆمەتر دور لە کەس و کاری، لە نزیک لوتکەیەکی مامەندە راکشاوە ، ئەم شەهیدە کە من ئێستا بێدەسەلات و داماو بەدیاریەوە هەڵکورماوم، هەمان ئەو مستەفا لێوان لێو لە ژیانەی گوندی (ساوجی) یە، بەڵام ئەمێستا کاتی شین و شەپۆرە نەوەک قاقای پێکەنین. هەمو دیمەنەکانی ئەو شانۆ بچوکە گەرۆکە ی پێش پێنج هەفتە لە ساوجی نمایشکرا، ڕۆکێت ئاسا بە بەردەم چاوی خەیاڵمدا دا تێپەڕین. لەم شەڕەدا پێنج (پ.م)ی تریش شەهید بون و حەوت (پ.م) ش بریندار بون. ئەم شەڕە لە ڕوی مەیدانیەوە مولازم عومەر و مەلا بەختیار سەرکردایەتیان دەکرد، حەمەی حاجی مەحمود و عەبدولڕەحیم یش بەشداربون تێیدا.

## غەفورە جوجە

بریندارەکانمان تیمارکرد، یەکێ لە بریندارەکان فەرماندەی مەفرەزە (غەفورە جوجە) بو، برینەکەی سوک بو سەرشانی بریندار بوبو. لە کاتی تیمارکردنی برینەکەیدا بە زەردەخەنەیەکەوە پیی وتم «ئەها کاک دوکتۆر، من کوڕە چوختی و بزێوەکەی جارانی گەڕەکی مەڵکەندی نەماوم، لەبیرتە شەڕەگەڕەکمان دەکرد، کۆمەڵە کردومی بەم ئینسانە «. پێش پێشمەرگایەتی من غەفورم ئاوا دەناسی وەک خۆی وتی، گەنجێکی سەرکەش و نەترس. بەداخەوە غەفور دواتر لە شەوی ١٧ ی ٢ ی ١٩٨١ لە چالاکیەکی پێشمەرگانەی ناوشاری سلێمانیدا دا لە گەڕەکی دارۆغا شەهید بو.

دوای شەڕی مامەندە، بە ناوبژیوانیی کاریگەری حیزبی شیوعی و (حدکا) شەڕ لە نێوان یەکێتی و پارتی هەڵنەگیرسا و پ.م کانی پارتی ناوچەکەیان چۆڵکرد.

## «پایز پایز شان و مل ڕوت !»

دوای سەندنەوەی لوتکە گیراوەکانی مامەندە لە هێزەکانی ڕژێم و ئازادکردنی تەواوی زنجیرە شاخەکە، پاشنیوەڕۆیەکی پایزی ساڵە پڕ لە ڕوداوەکانی ١٩٨٠ لە گەڵ بەکری حاجی سەفەر چوین بۆ لای کاک ئازاد هەورامی لە چادرە بچوکەکەیدا لە توژەڵە، کاک سالار عەزیزی لابو. چەند خۆش ولەیادنەچو بو، چەند لە یادنەچوە! چەند ڕۆمانسی بو ئەو ڕۆژە! باران وردە وردە دەباری، ترپە و کرتەی تنۆکەکانی کە بە سەر چادرەکەدا دەکەوتن، تێکەڵ دەبو بە دەنەگە بە سۆزەکەی کاک سالار و ئاوازی ئەو مۆسیقا خۆشەی لە گیتارەکەی کاک ئازادەوە هەڵدەسا. کاک سالار بە دەنگی گیتاری کاک ئازادەوە گۆرانیی (پایز پایز شان و مل ڕوت من مات تۆ زیز هەردو کمان جوت) ی شاعیری مەزن (گۆران) ی دەچڕی. لەو دۆخەدا! وشەکان و واتاکانی، گۆرانی و مۆسیقا کە هەمویان، ڕۆحمانی دەدوان و دەلاوانەوە. ڕێک لە گەڵ دنیا ناخۆشەکەی دەوروبەرمان دەگونجا، ئەو دنیایەی پڕبو لە تاسەی کپکراو، لە حەسرەت، لە غەم و خەفەت بۆ هاوڕێ شەهیدەکانمان، لە کەموکورتی، لە ترس ونیگەرانی، لە ئێش وئازارە جۆراوجۆرەکان. وەرزەکەش هەر پایزی گەڵا ڕێزان بو.

## نەخۆشخانەی بلەکێ

لە دوا هەفتەی مانگی ١٠ ی ١٩٨٠هێشتا لە نێوزەنگ بوین کە لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر بڕیارماندا نەخۆشخانەیەک بکەینەوە لە تەنیشت بنکەکەمان لە دێی (بلەکێ) کە سەربە شاری بانە یە ولە شارباژێڕەوە زۆر نزیکە. پێکەوە لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر و دەستە کەیدا نێوزەنگ مان جێهێشت و بەرەو سنوری سەردەشت و بانە بە پێ کەوتینەڕێ تا گەیشتینە دێی (بلەکێ). لە پشتی بلەکێ وە لە بناری شاخی سورکێو لە شوێنێک بە ناوی (بانوان) لە سەر کانیاوێک، هەرێمی سێی (ینک) لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠ وە بنکەیەکی دروستکردبو وەک شوێنێکی سەلامەت بۆ حەوانەوەی (پ.م) لە پشتەوەی بەرەی شەڕ کە ناوچە فراوانەکانی شارباژێڕ و شارەزور و قەرەداخ بو. بەکری حاجی سەفەر داوای لە برادەرانی بنکەکە کرد هاوکاریم بکەن بۆ دروستکردنی نەخۆشخانەیەک، ئینجا خۆی و (پ.م) کانی ئێمەیان جێهێشت و بەرەو شارباژێر بەڕێکەوتن. من وەک ئایدیالیستێک بڕوای تەواوم بە یەکسانی و دیموکراسی هەبو، دەمویست بیروڕاکانم پیش خەڵک بەسەر خۆمدا پیادەی بکەم.

لەگەڵ (پ.م) کانی بنکەکە پێکەوە کەوتینە بەرد و قورکێشان، بە کاری هەروەزی و دڵسۆزانە توانیمان لە ماوەی دوسێ هەفتەدا بە بەرد و قوڕ دیواری ژورێکی ٣ بە ٤ مەتر و هەیوانێک بۆ نەخۆشخانە دروستبکەین و بە سپیدار و قوڕ سەریبگرین. ئاراس ئیبراهیم (شازاد) دەرچوی پەیمانگای پزیشکیی خۆپاراستن بو، لەگەڵ عومەر مەحمود مارف (شەماڵ) کە پەیمانگەی پزیشکیی تەواوکردبو لە سەرکردایەتیەوە هاتنە نەخۆشخانەکە، بۆ ماوەی سێ هەفتە خولێکی ڕاهێنان و فێربونی پزیشکیی گشتیم بۆ کردنەوە. هەر سێکمان پێکەوە نەخۆشخانەکەمان دەبرد بەڕێوە. هەمو (پ.م) نەخۆش و بریندارەکانی گەرمیان و قەرە داخ و شارەزور و شارباژێڕ و پێنجوین ڕویان لە بنکە و نەخۆشخانەکەمان دەکرد و ئێمەش بە پێی توانا چارەسەرمان دەکردن، ئەوەیشی پێویستی بکردایە دەمان نارد بۆ ئێران. جگە لەمانە نەخۆش و بریندارى خەڵکی ناوچەکە لە کوردی ئێران لە (پ.م) و خەڵکی ئاسایی گوندەکان و سەربازی هەڵاتوی نیشتەجێ لە ناوچەکە هەمویان ڕویان لە ئێمە دەکرد. بە هۆی شەڕی نێوان ڕژێمی ئێران و حیزبەکانی کۆمەڵە و دیموکرات و خەبات، خەڵک نەی دەوێرا بچێت بۆ بانە، یا ڕێگا گیرابو یا دور بو.

## وەك فريشتە فريايان كەوتين !

جارێکیان زستان نزیکەی شەست حەفتا سانتیمەتر بەفر زەویی داپۆشیبو،گەنجێکی لادێی هاتە نەخۆشخانەکەمان. بە پەرێشانی و پاڕانەوە تکای کرد یەکێکمان لەگەڵی بچێت بۆ کوێرەدێ کەیان بۆ لای ژنەکەی. ئەو چەند سەعاتێکە بەسەر منداڵەوەیە و بەڵام منداڵکەی نابێت، بیرم نەماوە بۆچی خۆم نەچوم. بە ئاراسم وت ئەویش یەکسەر ئامادەیی خۆی نیشاندا لەگەڵی بڕوات. منیش دوای ڕونکردنەوەی ئەگەری ساردبونەوەی ژان و لاوازبونی هێزی منداڵدان وەک هۆی منداڵنەبونەکە، دو شوشە خۆراکاو و چەند ئەمپول دەرمانی بەهێزکردنی ژان (syntocinon) م دایە دەست ئاراس کە ئەگەر پێویستیکرد بیکاتە ناو خۆراکاوەکەوە و بە دەمار لە نەخۆشەکەی بدات. گەنجەکە ئاراسی سواری ئێسرەکەی کرد و بە ڕێکەوتن بۆ لای ژنەکەی. پاش چەند سەعاتێک ئاراس بە ڕوی خۆشی سەرکەوتنەوە بە سواری ئێسرەکەوە گەڕایەوە نەخۆشخانە. بۆی باسکردم چۆن دوای پێدانی دو دەرزیەکە لە خۆراکاوەکەدا ژنەکە منداڵەکەی بوە و چۆن تەندروستیی دایک و منداڵ باشبوە

کاتێک جێیهێشتون. له گەڕانەوەیدا بەرەو بنکەکەمان، میردی ژنەکە کاتێ بەچاوی خۆی ڕزگاربونی ژن و منداڵەکەی دەبینێ، لە خۆشیدا تورەکەیک سەد تمەنیی کاغەز دەخاتە بەردەم ئاراس کە بە ئارەزوی خۆی چەندی لێدەبات بیبات. بێگومان ئێمە لەبەرامبەر چارەسەری نەخۆش و برینداردا بە هیچ جۆرێ پارەمان وەرنەدەگرت، ئاراس هیچ پارەی لێ وەرناگرێ. گەنجەکە کە لە گەڵ ئاراس گەیشتنەوە لامان هەوڵی لەگەڵ منیش دا بۆ وەرگرتنی پارە منیش وەک ئاراس نەم پەژراند. بەڵام لە بەرامبەر پێداگری و سوپاسگوزاری ئەودا لە لایەک و، لە لاکەی تریشەوە بە لەبەرچاوگرتنی باری نالەباری خۆراکیی (پ.م) کانمان کە چەند هەفتەبو گۆشتمان نەخواردبو، منیش پێم وت ئەگەر دەتوانێ لە بری پارە مەڕێکمان بۆ بکڕی بۆ (پ.م) کان. دوای چەند سەعاتێک کابرا بە سوپاسگوزاریەوە لە بری یەک مەڕ دو مەڕی بۆ هێناین، بەڕاسدتی بوبە جەژنی (پ.م) کان!

## لەمەشیاندا سۆشیالیزم!

زۆر جار گوندیەکانی دەوروپشتمان دەهاتن بە دوامدا تا بچم بۆ لای نەخۆشەکانیان لە ماڵەکانیاندا. منیش بە پێی دۆخەکە دو (پ.م) م لەگەڵ خۆم دەبرد و دەچوم بۆ لای نەخۆشەکە. (پ.م) کان لەگەڵ یەکتردا دەبوە کێبەرکێ کامیان لەگەڵما بێن، چونکە ئەگەری ئەوەی خواردنی باش و گۆشتمان بۆ دانێن زۆربو، منیش دەمکرد بە سەرە و هەرجارێ دو (پ.م)ی ترم لەگەڵ خۆم دەبرد بۆ ئەوەی هەمویان بەشداربن لە خواردنە خۆشەکان. بەڕاستی لەو بنکەیەدا ژیانێکی کولەمەرگیی پڕ لە کەموکورتی بو، چونکە پەستان و باری قورسی بەردەوامی بەسەرەوەبو. بنکەی بلەکێ بوبو بە ئیستگەی پشودان و حەسانەوەی هەمو ئەو (پ.م) ساغ و بریندار و نەخۆشانە ی لە ناوچەکانی گەرمیان وسلێمانی و دەوروپشتیەوە بەرەو سەرکردایەتی دەچون. زۆر جاریش سەربازی هەڵاتو لە شەڕی ئێران وعێراق دەبونە میوانمان و دوای یەکدو ڕۆژ بەرەو ئێران و لەوێشەوە بەرەو ئەوروپا بۆ پەنابەری ملی ڕێگایان دەگرتەبەر. (پ.م) کان بنکەکەیان ناو نابو (چێشتخانەکەی توزخورماتو) ی سەر ڕێگای بەغدا، بە جیاوازیی ئەوەی چیشتخانەکەی ئێمە تەنیا نان و چا وبرنج و ساوەری هەبو!

## چۆلەکە خۆت چی؟ گۆشتاوت چی؟

ژورێکی بچوک لە تەنیشت بنکەکەوە دروستکرابو وەک زیندان بەکاردەهێنرا بۆ ڕاگرتنی دیلی شەڕ و تاوانبار و ئەو کەسانەی تۆمەتی سیخوڕیان لە سەر بو، جار جار کە نەخۆش بکەوتنایە دەچومە لایان بۆ چارەسەرکردنیان. ڕۆژێک (عوسمانی حاجی حەسەن پێنجوێنی) کە لێپرسراوی بنکەکە بو پێی ڕاگەیاندم ژمارەی زیندانیەکان زۆر بوە و ئەگەر چارەسەری نەکەین خۆراک کورت دەهێنێ و بەشمان ناکات. پێکەوە چوینە لای زیندانیەکان، لە ناو ژورە بچوکەکەدا بەهۆی تاریکی و چرە دوکەڵی جگەرەی زیندانیەکان بریسکە بریسکی چاویان و کۆکەکۆکیان سەرنجی ڕاکێشام. گیراوان زۆر زۆرتربون لە سنوری ئاسایی و لە سنوری ئەوەی ئێمە بتوانین بەخێویان بکەین. بێ هیچ نەخشە و نیازێکی پێشینە، کەوتمە پرسیارلێکردنی یەکە بە یەکەیان بۆ زانینی هۆی گرتنەکەیان. بۆم دەرکەوت زۆربەیان خەڵکی شارباژێربون، لەوانەی کە بەردەوام ئێمەیان لەماڵەکانی خۆیان دەحەوانەوە ودڵسۆزانە خزمەتیان دەکردین. هۆی گرتنەکەیان شەڕ و ناکۆکیان بو لەسەر پارچەزەوی و لەوەڕ و شتی لەم بابەتانە. ئەمانە بکوژ نەبون، هیچیان تاوانی هاوکاریکردنیان لە گەڵ حوکومەت لە سەر نەبو، ئەمانە جگە لەوەی هیچ پێویست نەبو بگیرێن،بوبون بە باریش بەسەر شان و ملی بنکەکەمانەوە. کادیرێکی کۆمەڵە لێپرسراوی کۆمەڵایەتیی (ینک) بو لە یەکێک لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆمان، ئەم کەسانە هاتبونە لای ئەو بۆ چارەسەری کێشەکانیان، ئەویش لە بری چارەسەر گرتبونی و ناردبونی بۆ زیندانەکەمان. ئەو دەیویست بە مە خۆی بکات بە کوێخا بە سەر خەڵکە داماوەکەوەدا و دەسەڵاتی شۆڕش بەکاربێنێ بۆ خۆسەپاندن و خۆزلکردن بەسەریاندا. بێگومان خزم وکەسی گیراوەکان بۆ ئازادکردنی خزمە کانیان دەبوایە بچنە خزمەتی و لیی بپاڕێنەوە و داوەتی باشی بۆ بکەن یا تەنانەت لە ژێر ناوی دیاری برێک بەرتیلی پێبدەن هەتا ئازادیان بکات.

## چی گەوهەری ئینسانبونە ؟

ڕاوێژێکم بە کاک عوسمان کرد و نیازی خۆمم بۆ بەردانی گیراوان کە عەشایری خەڵکی گوندەکان بون دەربڕی، ئەویش کادیرێکی زۆر دڵسۆز و هاوسەنگ و ئارام بو، پێشنیازەکەمی پەسەندکرد. بۆ ئەوەی نەکەومە بەر ڕەخنە و ڕق و کینە ی کادیرە بە ئاغا بوەکە و دوایی پێم نەڵێت دوکتورهەژار لوت دەژەنێتە کاری کادیرەکان، لەگەڵ

کاک عوسمان کۆبونەوەیەکمان ساز کرد لە گەڵ (سامان گەرمیانی)ی سەرتیپی ٥٧ ی گەرمیان، ئەو بەرێکەوت لەگەڵ دەستەیەک لە (پ.م) کانی میوانی بنکەکەمان بو. کێشەکەمان تێگەیاند و بردمانە ناو ئەو کونە گورگە تاریک وچڵکنەی ناومان نابو زیندان. لە سەر داوای من پرسیاری کرد لەهۆی گرتنی ئەوکەسانەی نیازمان بو بەریان بدەین، کاک سامان یەکسەر ڕاستی و ڕەوایی زانیاریەکانی ئیمە ی بۆ دەرکەوت لە سەریان و پشتگیریی نیازەکەی ئێمەی کرد بۆ ئازادکردنیان. لە دڵی خۆمدا دڵنیا نەبوم لەوەی ئایا ئازادکراوان کە گەڕانەوە ناوچەکەی خۆیان ناکەونەوە شەڕ و ئاژاوە و لە خراپترین ئەگەریشدا کوشتاری لێناکەوێتەوە! جگە لەمە لە ڕوی پلەبەندی لێپرسراوەتیەوە واجوان بو پرس بە بەکری حاجی سەفەر بکرێت و لە کۆتاییدا هەر ئەو بڕیارەکە پەسەند بکات یا هەڵیوەشێنێتەوە. ئێمە لای خۆمانەوە بڕیاری ئازادکردنی پێنج کەسیانمان دا، بەڵام وەک مەرجی ئازادکردنیان داوامان لێکردن پیش ئەوەی بچنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەبێت بچنە لای بەکری حاجی سەفەر کە فەرماندەی هەرێمی سێ و لێپرسراوی یەکەمی ناوچەکە بو. نامەیەکم بۆ بەکری حاجی سەفەر نوسی لەسەر هۆی گیران و ئازادکرنی زیندانیەکان، جگە لە واژوی خۆم کاک سامان و کاک عوسمانیش لەسەر داوای من نامەکەیان واژوکرد، کە واتای ئەوە بو ئەوانیش ڕاوێژیان پێکراوە و کارەکەیان لا پەسەند و باشە.

ئێستاش کاتێک یادی ئازادکردنی ئەو کەسانە دەکەمەوە بە چی خۆشی و سوپاسگوزاریە کەوە ماڵاواییان لێکردین، موچڕکەیەکی خۆشی و شانازی سەرتاپام دادەگرێ. بە ڕاستی ئازادی و ئازادبون گەوهەری ئینسانبونە. خودی پرۆسەی زایین (منداڵبون) هەوڵ و کۆششی کۆرپەلەی ناو منداڵدانە بۆ ئازادی و دەربازبون لە تەنیایی و بێزاریی ناو ئەو شوێنە تاریک و تەنگە. دەسپێکی گرژبونی دیواری منداڵدان بۆ پاڵپێوەنانی کۆرپەلە بۆ دەرەوە، بۆ ئازادی، هەر لە خودی کۆرپەلەوە دەست پێدەکات ئەویش بە جم و جوڵ، نازانین لەوانەیە بە گریانیش، بەڵام ئێمە نایبیسین، گریان بۆ ئازادی ! کە تەمەنی کۆرپەلە لە چل هەفتە تێپەڕی و لەبەر هۆی پزیشکیی جۆراوجۆرهەر نەهاتە دەرەوە، ئیتر منداڵدان ئەو شوێنەی کۆرپەلەی تیا دەڕوێ و گەشەدەکات دەبێتە زیندان و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەرفەتی بە زیندومانەوە و ژیان کەمتر دەبێت بۆی، چونکە لەوە زیتر بەرگەی زیندان ناگرێ ! خودی بەرهەمە نەمرەکانی وێژە و هونەر و هەمو جۆرەکانی داهێنانی مرۆڤ هەموی بەرهەمی حەز و خولیای ڕزگاربون و ئازادبونە. هەمو داهێنان و بەرهەمەکانی مەعریفەی

ئینسانی پێش ئەوەی خۆری ئازادی ببینن، لە پێشدا لە دڵ و دەرونی کەسەکانی خاوەنیاندا کەرەسەی خاون، زیندانین، هەر لە خۆخواردنەوە و پەنگخواردنەوەدان. ئەوە حەز و تاسەی ئازادیە کە لە کۆتاییدا پاڵیان پێوەدەنێ بۆ دەرەوە، بۆ ئاسۆ فراون و ڕۆشنەکانی ئازادی. دیارە وەک چاوەڕێم دەکرد بەکری حاجی سەفەر بە برێ وردە گلەییەوە دەسپێشخەریەکەمانی قوبوڵکرد و ئازادکراوەکانی ناردەوە ناو ماڵ و حاڵی خۆیان. ئەو کادیرە دواتر خۆی دا بەدەستەوە و لە فایلەکانی ڕژێم کە لە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ دا کەوتە دەست یەکێتی، دەرکەوت پەیوەندیی نزیکی هەبوە بە دەسگای هەواڵنیریی ڕژێمی سەدام.

## مرۆڤدۆستیش سنور و بەهای خۆی هەیە!

یەکێک لە گرنگترین جیاوازیەکانی نێوان مرۆڤ و گیانلەبەرانی خوار خۆی توانای ڕەخنە لەخۆگرتن و بیرکردنەوە و پەندوەرگرتن و فێربونە لە ئەزمونەکانەوە. گیانلەبەران ئەم توانایەیان تیا نیە، مرۆڤ تیایەتی. بەڵام تیابون و هەبون شتێکە و دەربڕین و پیادەکردن و ژیان بەبەرداکردن شتێکی تری زۆر جیاوازە!

زستانێکی زۆر سەختی پڕ لە سەرما و بەستەڵەک بو، برسێتی و دابڕان و نائومێدی بو. ڕۆژێک پیاوێکی تەمەن سیساڵی ڕەشتاڵەی مڕوموچیان هێنا بۆ بنکەکەمان لە بلەکێ، ناوی (ب) بو. ئەم کەسە جاری یەکەم وەک چەکدارێکی (جەیش شەعبی) ی ڕژێمی بەعس لە شەڕدا لە گەڵ (پ.م) بە سەختی برینداربوبو، (پ.م) نەی کوشتبو و لە شوێنی شەڕەکە وەک خۆی جێیان هێشتبو. دوای چەند مانگێک برینەکەی چارەسەردەکرێ و هێز و تینی بۆ دێتەوە. لە بری ئەوەی لە چاکەی ئەوەدا کە (پ.م) وازی لێهێناوە ولێی بوردوە ئیتر واز لە ڕژێم بێنێ، ئەم جارێکی تر بە ڕق وکینەیەکی زۆرترەوە چەکی ڕژێم هەڵدەگرێتەوە. ڕۆژان دێ و ڕۆژان دەڕوا، جارێکی تر لە شەڕدا (پ.م) بە ساغی (ب) بە دیل دەگرێ. خوێنەری بەڕێز بیهێنە بەرچاوی خۆت و خۆت بخەرە شوێنی من، ئەگەرلەو شوێن و کاتەدا ئەم پیاوە، ئەم (ب) یە لەبەردەمی تۆدا بوایە چیت پێ دەوت و چیت لێدەکرد ؟ بە ڕاستی کە چیرۆکی ئەم پیاوەم بیست، خوێنی ناو لولەخوێنەکانی جەستەم کەوتە کەف و کوڵ، ئاگری تورەییەکی زۆر بەرچاومی تاریک کرد. هەڵچونێک سەرتاپای جەستەمی گرتەوە، جڵەوی ئەسپی ئاوەز و خۆکۆنترۆڵکردن لە دەستم بەربو، ئەسپ حیلاندی بەڵام چۆن

حیلانێک! کەوتمە لێدانی کەسەکە. ئەو (پ.م) انەی بەچەکەوە لەدەورمان ڕاوەستابون هیچیان دەستیان نەگرتم، دیاربو ئەوانیش هیچ بەزەییان بە (ب) نەدەهاتەوە. دوای یەکدو شەق و شەپازلە، (ب) کەوتە تکا و پاڕانەوە لێم، پەشیمانی دەربڕین و داننانی بە هەڵەکانیدا وەک ئاگرکوژێنەوە کڵپەی هەڵچون و تورەییەکەمی کوژاندەوە و وازم لێهێنا. بەڵام دوای خاوبونەوە و ئارام بونەوەم بەڕاستی هەستم بە شەرم و پرینگانەوە و پەشیمانییەکی قوڵ کرد، چونکە من لە هەڵوێستی هێز و دەسەڵاتە وە دەستم وەشاندوە لە کەسێکی دیلی بێدەسەڵات و شەرمەزار و لاوز. بۆیە دەمودەست وەک بەفرەکەی دەوروبەرمان ساردبومەوە، بە چاوی پڕلە فرمێسکەوە باوەشی میهر و سۆز و بەزەییم بە (ب) دا کرد و پێم وت: ئاخر بۆ وا لە خۆت دەکەیت؟ بۆ پەندت لە یەکەم برینداربونت وەرنەگرت؟

### «ئەی چی چاوەڕێ دەکەیت ؟»

دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام هاوڕێیەکی (پ.م) م بە سەردان لە ئەوروپاوە دەگەڕێتەوە و دەچێت بۆ لای (کۆسرەت ڕەسوڵ). لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ناو شۆڕش، هاوڕێکەم بە پەشیمانیەوە باسی تاوان و غەدر و دڵڕەقی و خوێنڕێژیەکان و بێویژدانیەکانی ناو شۆڕشی چەکداریی کورد و شەڕی براکوژی دەکات. کۆسرەت یش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: «کاکە ئەی تۆ چی چاوەڕێ دەکەیت لە شەڕ و لە شۆڕشی چەکداری ؟». بێگومان دەشێ ئەم پرسیارە ڕاست و دروستە بۆ ئامانجێکی نارەوا بەکاربهێنرێ و هەرچی تاوان و دەسدرێژی و کارە ناڕەواکانی ناو شۆڕشی چەکداریی کوردوستانی پێ پاساوبدرێ. بەڵام با لە کوردوستان بچینەدەرەوە و بەگشتی بۆ هەمو مرۆڤایەتی بپرسین: هەر بە ڕاستی چی چاوەڕێ دەکرێ لە شەڕ و شۆڕ؟ نەرم و نیانی؟ بەزەیی و هاوخەمی؟ هونەر و جوانی ؟ سەما و مۆسیقا ؟ هەست و سۆزە مرۆڤدۆستیەکان؟

بۆیە منیش دەڵێم: مرۆڤ کە دەستی چوە خوێنی مرۆڤی بەرامبەری، کە ئەمە قورسترینی هەمو تاوانەکانی ترە، ئیتر دەتوانێ و دەشێ هەمو شتێکی تری بەد و دڵڕەقانە بکات بەرامبەر مرۆڤ. لە ساڵی ٢٠٠٨ دا کە لە ئەڵمانیا بوم، سیاسەتوانێکی چەپی ئاشتیخوازی ئەڵمانی لە بۆنەیەکدا ئەمەی وت: «هەمو سەربازێک بکوژێکی سڕ و خەوتوە «. ئەم ڕستە کورتە پڕواتایە هەمو ڕاستڕەوەکانی ئەڵمانیای شێت و هارکرد.

وەک کاردانەوە، ڕاسترەوە کۆنەپارێزەکان وتیان: کەواتە هەمو سوپای نیشتمانیی ئەڵمانیا پیاوکوژی خەوتون؟ کەواتە ئەو چەندین ملیۆن سەربازەی باووباپیرمان کە لە شەڕی جیهانیی یەکەم و دوهەم دا کوژراون هەمویان پیاوکوژ بون؟

## «ئێستا هەمومان لە جاران عاقڵترین»

خوێنەری بەڕێز من ئێستا ئەم یەک دو شەپازلە و شەقەم بۆ تۆ درکاند و ڕەخنەم لە خۆم گرت و لە توندوتیژییەکەم پەشیمانیم دەربڕی. بەڵام کام سەرکردەی سیاسیی کورد؟ کام کادیر و فەرماندەی سەربازی تا ئێستا لە ڕەوتی خەباتیدا ڕەخنەی ڕاستگۆیانە و بوێرانەی لە ڕەفتار و ئاکار و کردارەکانی خۆی گرتوە؟

لە مانگی ١١ ی ١٩٨٥ مەلا بەختیار وشێخ عەلی کەشکۆڵ و پشکۆ نەجمەدین بە هۆی دروستکردنی (ئاڵای شۆڕش) بۆ ماوەی سێ تا ٥ ساڵ زیندانی کران. گرتنکەیان و مانەوەیان لە زیندان بەلای کەمەوە بە ئاگاداری و بە ڕازیبونی جەلال تاڵەبانی بو. لە دوای ڕاپەڕین (ئاڵای شۆڕش) گەڕایەوە بۆ ناو یەکێتیی نیشتمانی. بەو بۆنەیەوە جەلال تاڵەبانی ئاوای بە سەرکردەکانی (ئاڵای شۆڕش) وتبو: «ئێستا هەمومان لە جاران عاقڵترین». ئەڵا ئەڵا ! بە ڕوکەش ئەم ڕستە کورتە چ زمانپاراویەکە، چ قسەیەکی جوانە ئەم ئەندازیارەی وشە و پەیڤ بەرهەمی دەهێنێ!

بەڵام ڕاوەستە با چەند ملیمەترێک لە پێستی قسەکە تێپەڕین و بچینە ناو قوڵایی واتاکەی و بزانین مام ی سیاسەتوان چی ناڵێت کە دەبوایە لەو بۆنەیەدا بیڵێت؟ ڕەخنە لەخۆی ناگرێت، داوای لێبوردن ناکات، یا بەلای کەمەوە مەخابن و ئەفسوس دەرنابڕێ بۆ ئەوەی کە ئەو ماوە درێژە لە ژێر سایەی حوکمی ئەودا سێ هاوخەباتی دێرینی خۆی لە بەر جیاوازیی بیروڕا زیندانی کراون، بەڵام چۆن زیندانیەک ! بە پێچەوانەوە، مام ناڕاستەوخۆ لە پشتەوەی وشەکانیدا بە گەڕاوەکانی ئاڵای شۆڕش دەڵێت: ئەوساش کە ئێوەمان گرت هەر عاقڵ و ڕاستبوین، بەڵام ئێستا عاقڵتر و ڕاستترین کە ئێوە تێکەڵ دەکەینەوە لەگەڵ خۆمان و دەبینەوە بە یەک حیزب، ئێوەش لە جاران عاقڵترن کە دەگەڕێنەوە ناومان و چیی تر ناتانەوێ بە جودایی لە ئێمە درێژە بەخەبات بدەن. ئایا کاتی خۆی نەوشیروان مستەفا و جەلال تاڵەبانی نەیان دەتوانی نەهێڵن ئەو سێ سەرکردەیە زیندانی بکرێن ؟ ئایا مام نەیدەتوانی بە هاوکاریی میانەڕەوەکەنی ناو کۆمەڵە، وەک ئازاد هەورامی و بەکری حاجی سەفەر و... ببێتە

هەویێنی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە ؟ مەگەر هەر مام نەبو لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا نەیهێشت تەقینەوە گەورەکە ڕوبدات؟ ئایا نەوشیروان مستەفا و مەلابەختیار و هاوبیرەکانیان سەرپێچیان لەو هەوڵە دڵسۆزانەیەی مام دەکرد؟ من دەڵێم بەڵێ مام دەیتوانی هەمو ئەوانە بکات. ئەی بۆ نەیکرد؟

با یەک چرکە بگەڕێینەوە بۆ شۆڕشی ئەیلول و هاوینی ساڵی ١٩٦٤. ئایا مەلا مستەفای بارزانی نەیدەتوانی جیاوازی و کێشەکانی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی لە باڵی مەکتەب سیاسیی پارتی، بە ئاشتی چارەسەربکات؟ مەگەر تاوانی ئەوانیش هەر جیاوازیی بیروڕایان نەبو؟ من دەڵێم بەڵێ ئەویش دەیتوانی. ئەی بۆ نەیکرد؟

## ئاوڕێك لە ئیمڕۆی هەرێمی کوردوستان

خۆی گەوهەر و کرۆکی ڕژێمی سەرمایەداری بەدەستهێنانی زۆرترین سودی ماددیە بۆ خودی سەرمایەدارەکە. ئاینی نەگۆڕی سەرمایەداری لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایە دا بێت خڕکردنەوە و کەڵەکەکردنی پارە و سودە ماددیەکانی ترە. نیشتمانپەروەری لای سەرمایەدار یان هەر نیەتی یا دەکەوێتە دوای دواوەی بەها و ئامانجە ماددیەکانی تری. بۆ نمونە فرەملیۆنەر و فرەملیاردێرەکانی کوردوستانی دوای ڕاپەڕین و ڕوخانی سەدام، بە دەستێک چەند ملیۆن دینارێک دەدەنە دەسەڵاتدارێکی پارتی یا یەکێتی، پاش ماوەیەک و لەو سەرەوە لەڕێی وەرگرتنی موڵکی گشتی و پرۆژەوە بە نرخێکی زۆر زۆر کەم، بە دەستەکەی تر لە بری ئەوە چەند ملیۆن دۆلارێک (نەک دینار!) لە حکومەتی هەرێم، لە نانی دەمی خەڵک بە شێوەی یاسایی و نایاسایی دەردەهێنن. ئەڵبەتە پایە و بناغە فەلسەفیەکەی ئەو سەرمایەداریەی ئێستا لە کوردوستان فەرمانڕەوایە (لیبرالیزمی نوێ) یە، کە لە ئەمریکا وە سەری هەڵداوە، لیبرالیزمی نوێ ڕوتوقوتە لە هەر بەرپرسیارێتیەک بەرامبەر کۆمەڵ و ژینگە و کێشە نێونەتەوەییەکان. سەرمایەداریەکەی ڕۆژاوا و باکوری ئەوروپا (ئەڵمانیا و سوید و هۆڵەندا و...) لەوەدا جیاوازە لە (لیبرالیزمی نوێ) چونکە ئەم بۆ گەلانی خۆیان لایەنی کەمی دادپەروەریی ئابوری و کۆمەلایەتیان بەدەسهێناوە، یان بەلای کەمەوە برسێتیان نەهێشتوە.

## ڕێزپەڕێکی جوامێر

کاتێک باسی ئەو چەند مانگەی بەسەربردنی ژیان و خەباتم لە بنکەکەمان لە بلەکێ دەکەم، نابێت هەرگیز جوامێری و بەخشندەیی (ح.ب) م لەبیربچێت. (ح.ب) کەسایەتیەکی سەرمایەداری کوردی ئێران بو، لەسەر هەڵوێستی نیشتمانپەروەریی خۆی لە دەست ڕژێمی ئێران ڕایکردبو و لە گوندێکی نزیک شاری بانە دەژیا. زۆرجار کە پارەمان لێدەبڕا و برسی دەبوین، هانامان بۆ ئەو دەبرد. ئەویش مەردانە جێبە لاندرۆڤەرەکەی خۆی پڕدەکرد لە ئارد و شەکرو ڕۆن و چا و برنج، و خۆی بۆی دەهێناین. بە ڕویەکی خۆش و سادانە و بێفیز لامان دادەنیشت و بەدەم چاخواردنەوە باسی ڕوداوەکان و بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژانەمان دەکرد. ئەها چاوت لێیە ؟ سەرمایەداری ئاواشمان هەیە! بەڵام بەداخەوە هی ئاوا زۆر کەمن.

## بورهان قانیع

عوسمانی حاجی حەسەن کاروباری بنکەکەی بە جوانی و باشی دەبردبەڕێوە، زۆر هاوکاری منی دەکرد، و لە هەمو کارە گرنگەکاندا پرس و ڕای بە من دەکرد. کاک (بورهان قانیع) ی کوڕی شاعیری ناوداری کورد (قانیع)، پێشتر لە مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتی لە توژەڵە و دواتر لە نێوزەنگ کاریدەکرد، پاش ماوەیەک لەوێ بێزار بو و ناوچەی سەرکردایەتیی جێهێشت. لە قۆخێکی دوماڵیی نزیک بلەکێ بە ناوی (کۆسرەت) ژورێکی پەیداکرد و تیایدا دەژیا. کاک بورهان پیاوێکی زور قسەخۆشبو، وردە وردە هاوڕێیەتیەکەمان گەرمتر دە بو. بۆی گێڕامەوە: جارێک لەگەڵ بەرپرسیاری ناوچەی بلەکێی حیزبی دیموکرات (ق.ش.) کە کۆلکەخوێندەواریەکی هەبو، بە حساب کۆبونەوەی سیاسی دەکات. (ق.ش.) لە هەمان کاتدا بەرپرسیاری گومرگی بلەکێش بو. کاک بورهان لەگەرمەی باسکردن دەبێت دەربارەی پەیوەندیی زلهێزەکانی سوڤێت و ئەمریکا بە کێشەی کوردەوە. (ق.ش.) زوزو بە هاوارکردنە ئێسری قاچاخچیەکان بە (هۆش هۆش) و بە سەوداومعامەلەی گومرگ لەگەڵ قاچاخچیەکان، زو زو قسە بە کاک بورهان دەبڕێ و سەرەداوەکەی لێتێکداوە، ئەمیش سەرسوڕماو و دەم داچەقاو سەیری (ق.ش.) دەکات. جارێک کاک بورهان لەگەڵ خۆی بردمیەوە بو ژورەکەی لە قۆخی(کۆسرەت)، گەڵایەکی زۆری داربەڕو بڕابون و لە ناوقەدی داربەڕوەکاندا دانرابون تا وشکببنەوە بۆ خواردنی مەڕ و

بزنەکان لە زستان، کاک بورهان وتی دوکتور ئەوانە کارگەی مۆدێرنی باشترین ئالیک و عەلەفن. ئینجا کە بەلای گردۆلکەی سەنێر و تەپاڵەی پەزەکاندا تێپەڕین و بۆنەکەی هات بەڕوماندا، وتی دوکتۆر چیت دەوێ، ئیتر ئەمەش کارگەی پەینی سروشتیی نمرە یەکە پێشوازیمان لێدەکات.

کاک بورهان زو زو دەهاتە بنکەکەمان و پێکەوە ناو بە ناو شەوانە کۆڕی رۆشنبیریمان بۆ (پ.م) کان دەگرت، دەربارە ی مەسەلە فیکری و سیاسیەکان بەتایبەتی لە سەر نەتەوەخوازی و دیموکراسی و سۆشیالیزم و مافی مرۆڤ باس و لێدوانمان دەکرد. هەروەها هەوڵیشمان دەدا (پ.م) نەخوێندەوارەکان فێری خوێندەواری بکەین، (پ.م) کان ئەم کۆڕانەیان زۆر پێخۆش بو. بێگومان بە ڕێک و پێکی کۆبونەوە لەسەر کاروباری بنکەکەو کێشەکانی ژیانی ڕۆژانە ش دەکرا. بورهان قانیع دواتر وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا و رویکردە وەرگێران، چەند کتێبێکی گرنگی سیاسی و بابەتی تری وەرگێڕا بۆ زمانی کوردی، دەسگای ڕاگەیاندنی یەکێتی بۆی چاپ کرد و لە ناو شۆڕشدا بڵاوی کردنەوە.

## ئەها سەدام!

ڕۆژێک سەربازێکی عەرەبیان هێنا بۆ بنکەکەمان، ئەو لە سەنگەرێکی سەربازیی سوپای عێراق لە نزیک دێی سنوریی (سیاگوێز) ی سەر بە پێنجوێن ڕایکردبو. وێنە یەکی (لینین) بە دیواری ژورەکەدا هەڵواسرابو. کابرای سەرباز، بەهۆی ڕوناکیی لۆکس و ئەو سێبەرانەی دروستی دەکرد، وێنەکەی (لینین) ی لێبو بە وێنەی سەدام. ترس و لەرزێکی زۆری لێنیشت، وایزانی ئێمە چەکداری کوردی سەر بە سەدام ین. کەوتە هاوار و پاڕانەوە، هەرچۆنێ بو دوای ئەوەی تێمانگەیاند وێنەکە کێیە و ئێمە کێین و خەبات بۆ چی دەکەین، ئارام بۆوە. دواتر بەرەو ئێران بەڕێمان کرد.

## شایەتە سەیرەکانی من !

مامۆستا (کەمال حەسەن پینجوینی) لێپرسراوی دارایی هەرێمی سێ بو، بە سەردان هاتە بنکەکەمان. لە گەڵ بەرپرسی بنکە کاک عوسمان وردبینیی خەرجیەکانی بنکەکەی کرد. هاتە نەخۆشخانە بۆ لای من، بەگشتی لە هەل و مەرجی کارکردنم و خەرجی

و پێویستیەکانی نەخۆشخانەکەی پرسی. منیش لیستەیەکم پێدا کە خۆم ئامادەم کردبو دەربارەی خەرجیەکانی چەند مانگی پێشو. لە ڕاستیدا ئەو داوای ئەمەی لە من نەکردبو چونکە زۆرباش منی دەناسی و هاوڕێی نزیکی یەکتر بوین. لیستەکە بەوردی هەمو خەرجیەکانم تیا تۆمارکردبو، بە ڕۆژ و مانگی خەرجکردنەکەوە، بڕی چەند و بۆ چی خەرجکراوە ؟ ناو و واژوی ئەو شایەتانەی ئاگاداری پارە خەرجکردنەکە بون، نوسیبوم. شایەتەکان زۆربەیان هەر (پ.م)ی خۆمان بون. مامۆستا کەمال دایە قاقای پێکەنین و وتی: «کاک دوکتۆر ئێمە متمانەی گیانی خۆمان بە تۆ دەکەین، ئاخر تۆ چەند هێلکەیەک و چەند مریشکێکت بۆ (پ.م) ی بریندار ونەخۆش کڕیوە، چی پێویست دەکات کە ناوی دو شایەتت لە پاڵ هەمو بڕگەی کڕینێکدا نوسیوە،کە ئاگاداری کڕینی ئەو شتە بون؟  من جاری وابوە لیستەی بڕە پارەی زۆر گەورە خراوەتە بەردەمم کە گوایە بۆ کڕینی فیشەک و تەقەمەنی خەرجکراوە و لە چالاکیدا تەقێنراوە، ناچاربوم پارەکە بدەم بە کادیرە سەربازییەکە لەگەڵ ئەوەی گومانی زۆرم لە ڕاستیی زانیاریەکان هەبوە».

## پەنایەك بۆ سۆشیالیزم!

لە بنکەی بلەکێ جۆرە سۆشیالیزم ێکمان پیادەدەکرد، بۆ نمونە ئەگەر (پ.م) یەک لە خزم و کەسیەوە پارەی بۆ بها تایە، نەدەچو لە کەبابخانە و چێشتخانەکانی ناو بازاڕی بلەکێ بە تەنیا چەند ژەمە چەورێکی بەتام لە کەباب وگۆشتی برژاو بخوات، بەڵکو پارەی کەسەکان کۆدەکرایەوە و دەدرا بە گۆشت و خۆراک بۆ هەمو (پ.م) کانی بنکەکە. لەگەڵ کاک (سەلاحی حەمەی زێنەب) خەڵکی گەڕەکێکین، ئەو لە دەست سەربازی ڕایکردبو و لە بلەکێ چێشتخانەی دانابو، کاک سەلاح هەموجارێک کە دەچومە بازاڕی بلەکێ ویەکترمان دەبینی، خولێکی گەرمی دەکردم لە چێشتخانەکەی ژەمێک نان بخۆم. هەرچەندم دەکرد دڵم قوبوڵی نەدەکرد چونکە دڵم لای پ.م. هاوڕێکانی بنکەکەمان بو، بۆیە تەنانەت بۆ یەکجار تامی خواردنی چێشتخانەکەی کاک سەلاحم نەکرد. کاک سەلاح لە (گۆڤاری سلێمانی) بابەتێکی لەسەر ئەم هەڵوستەی من نوسیوە. بلەکێ بوبوە مەلبەندێکی گەورە و کارای قاچاخچێتی، قاچاخچیەکان ڕۆژ بە ڕۆژ ئاگاداری نرخی ئاڵتون و دراوەکان بون لە بەغدا و تاران و دنیا، زۆر سەیر بو!

## دوکتۆر حەسان (کەمال عەبدولڕەحمان سالحی قەرەداخی)

ڕۆژێکی زستانی مانگی ٢ ی ١٩٨١ لە چایخانەیەکی (بلەکێ) دانیشتبوم. لە ناو ژاوەژاو وچڕە دوکەڵی دانیشتوانی ناو چایخانەکە، دەموچاوی کەسێک سەرنجی ڕاکێشام کە دوساڵ بو نەمدیبو، هەواڵمان لەیەک برابو و چاوەڕوانیش نەبوم لە شوێنێکی ئاوا ببینم، ئەم کەسە هاوڕێی دێرین و زۆرنزیکم دوکتۆر کەمال بو. لە خوێندنی ناوەندیەوە تا تەواوکردنی کۆلیجی پزیشکی و تا ئێستا من و د.کەمال بە هاوڕێیەتی ماوینەوە، ئێمە لە بیروڕاکانماندا زۆر لە یەک نزیک بوین. ئەم لاولای یەکترمان ماچکرد و کەوتینە وتووێژ و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان. دوکتۆر کەمال بە زیرەکی و بوێریی خۆی لە بەرەی شەڕی ئێرانەوە لە باشوری عێراق خۆی دەربازدەکات و دەگەڕێتەوە سلێمانی و واز لە سەربازی دێنێ. لە ڕێی ڕێکخراوە نهێنیەکانی کۆمەڵە، لە سلێمانیەوە بە چاوساغی و یاوەریی دو (پ.م) کە یەکێکیان (ئاواتی شێخ جەناب) دەبێت خۆی گەیاندبوە شارباژێر، ئێستا بۆ پشو و نانخواردنێک لێرە لایانداوە و بەرەو سەرکردایەتی دەچن. پاش نان و چا خواردن و گفتوگۆیەکی چڕ و پڕ خواحافیزیی لێکردم وڕۆشت. د.کەمال کە دەگاتە نێوزەنگ چەند مانگێک لە سەرکردایەتی دەمێنێتەوە و کاری پزیشکی دەکات. هەر لە نێوزەنگ دوکتۆر کەمال نامیلکەیەکی بچوکی بە چاپ گەیاند بە ناوی (فریاگوزاریی سەرەتایی) و بە ناو (پ.م) دا بڵاویکردەوە و سودی باشی پێگەیاندن.

## کاتێك لەپی دەست دەبێتە کەوچکی شۆفڵ !

دوکتۆر کەمال لە سەرکردایەتی ناوی (د.حەسان) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. (د. حەسان عاکف) هاوڕێیەکی شیوعیی عەرەبی دەبێت کە پێکەوە پزیشک دەبن لە نەخۆشخانەیەکی بەغداد. دەسگای ئاسایشی ڕژێم چەند جارێک (د.حەسان عاکف) دەگرن وئازارێکی دەرونی و جەستەیی زۆری دەدەن، بەڵام د.حەسان بەرگریی هەموی دەکات و سەربەرزانە لێی دەردەچێت. لە خۆشەویستیی د.حەسان عاکف، د.کەمال ناوی ئەو بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. د. کەمال یش وەک من دوای چەند مانگ مانەوە لە نێوزەنگ بێزاردەبێ و بە ڕێکەوت سامان گەرمیانی ی فەرماوندەی کەرتی گەرمیان ی هەرێمی ٥ ی قەرەداغ دەناسێ. سامان باسی چالاکیەکانی کەرتەکەیان لە ناوچەی گەرمیان وەک کوانویەکی گەرمی شۆڕش بۆ د.کەمال دەکات. هەواڵی تازە

شەهیدبونی کارمەندی پزیشکیی تیپەکەیان (د. ڕێبوار) بە د.کەمال دەگەیەنێ. سامان داوا ی لێدەکات جێی شەهید ڕێبوار پڕبکاتەوە و ببێتە دوکتۆر لە ناوچەی گەرمیان کە زۆر پێویستیان بە دوکتۆرە. دوکتۆر کەمال وەک هەست بە لێپرسینەوە و وەک کەسێکی سەرڕێژ لە هەستی مرۆڤدۆستی و هەستی نیشتمانپەروەری، داواکەی سامان پەسەند دەکات و دەبێت بە دوکتۆری کەرتی ناوچەی گەرمیانی هەرێمی پێنج. دوای چەند ڕۆژێ لەگەڵ سامان و دەستە (پ.م) کەیدا، بە خۆی و کلاشینکۆفێک و چەند مەخزەنێ فیشەک و کۆڵەپشتێ دەرمان و کەرەسەی سادەی پزیشکیەوە، دەکەوێتە ڕێ بەرەو گەرمیان. بە چەندرۆژێ بە پێ ڕۆشتن دەگەنە شوێنی مەبەست لە گەرمیان. هەر لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنی بۆ گەرمیان دو هیلیکۆپتەر ئەو سەیارەیە دەدەنە بەر ساروخ کە د. کەمال و چەند (پ.م) یەکی تێدایە. د. کەمال کە هەرگیز توشی ڕوداوی وانەبوە، حەز و ویستی ژیان هێزوتوانایەکی زۆری پێدەبەخشێ و وەک (پ.م) بەئەزمونەکانی تر بە پرتاو بە بازێک لە سەیارەکە دێتەدەرەوە و خۆی دەگەیەنێتە پەنایەکی بچوکی شوێنە ڕوتەنەکە. لە ڕوی پزیشکیەوە لە دۆخی وادا کە مەترسیی ڕاستەوخۆ لە سەر ژیانی مرۆڤ هەیە، هەمو ئەندامەکانی جەستە بە تایبەتی دڵ و خوێنبەرەکان و سیەکان، بە هۆی دەردانی خۆبەخۆی هۆرمۆنی ئەدرینالین بۆ ناو خوێن و گۆڕانی تری کیمیاوی لە جەستەدا، دڵی مرۆڤ لە بری لێدان دەکەوێتە فرین و بەمەش دڵ زورترین خوێن و خۆراک دەگەیەنێتە ماسولکەکان. بە قوڵتربون و خێراتربونی هەناسەدان سیەکانیش زۆرترین بڕی ئۆکسجین هەڵدەمژن. بەم گۆڕانە خۆبەخۆ و خۆکردانە (ئۆتۆماتیکیانە) مرۆڤ ئامادە دەکرێت کە یا زۆر خێرا ڕابکات و خۆی قوتاربکات لە مەترسیەکە، یا بە ماسولکەکانی هەر چوار پەل ی بجەنگێ دژی هێرشبەر و بەمە خۆی لە کوشتن ڕزگاربکات. وەک خۆی بۆی گێڕامەوە د.کەمال بە دەستە بچوکەکانی بە کارایی و خێراییەکی بێوێنە وەک بە کەوچکی شۆفڵ چاڵێک هەڵ دەکەنێ وسەروملی تیا دەشارێتەوە و خۆی مت دەکا و وەک بەرد جوڵە لە خۆی دەبڕێ، لەم خۆشاردنەوەیە دا باڵا کوردتەکەشی یاریدەدەرێکی باش دەبێت. هێلیکۆپتەرەکان ئەوەندە نزم بەسەریا فڕیبون کە ئەم بە تیلەی چاوە زەقبوەکانی تەقەکەرەکانی ناویانی بینیبو. تا هێلیکۆپتەرە سەدامیەکانی تینوی خوێن و وێرانکردن شوێنەکە جێدێڵن ئەم ئاوا بێجوڵە لە شوێنەکەدا دەمێنێتەوە، د.کەمال و هاوڕێکانی بێ زیانی گیانی ئاوا خۆیان ڕزگاردەکەن. بەڕاستی بوێری وگیانبازی و دڵسۆزیەکی زۆری دەویست، کەسێکی غەریب بە ناوچەکە، تازە (پ.م) و بێئەزمون، بە ویست

و ئارەزوی خۆی خۆبەخشانە گەرمیانی پرمەترسیی ساڵەکانی ١٩٨٠ هەڵبژێرێ بۆ پێشمەرگایەتی. د.کەمال ڕێک ئەو کەسە ئازا و پاک و بێگەرد و دڵسۆزە بو. دواتر چەند جارێکی تریش ئاوا توشی شەڕی دەستەویەخە بوبو لەگەڵ جاش و سوپا دا و بە زیرەکی و ئازایی خۆی ڕزگاری بوبو لە مردن. د. کەمال هەر لە گەرمیان مایەوە تا شکستی وتووێژی یەکێتی لە گەڵ ڕژێمی سەدام و هەڵگیرسانەوەی شەڕ. د.کەمال لەگەڵ من لە ٢٠ مانگی ١٢ ی ١٩٨٤ کوردوستانی جێهێشت و لە ڕێی ئێرانەوە چوە لەندەن و لەوێ گیرسایەوە. دوای جێگیربون و وەرگرتنی ڕەگەزنامەی بەریتانی و پازدە ساڵ ژیان و کارکردن وەک دوکتۆر لە لە ندەن، د.کەمال گەڕایەوە کوردوستان و لە حکومەتەکەی کۆسرەت ڕەسول دا بوبە بەڕێوەبەری گشتیی کار و کاروباری کۆمەڵایەتی لە سلێمانی. د.کەمال لە سەر ئەوەی دەیویست بە دادپەروەری کاربکات و لەسەر ئەوەی زۆر دڵسۆز و ڕێک و دروست بو وە بەتوندی دژی گە ندەڵی بو، لە پۆستەکەی دەرینایەڕاند و ناچار خۆی خانەنشین کرد.

## ناوچەی شارباژێڕ

شارباژێڕ لە ڕوی ئیدارییەوە سەر بە ناحیەی بەرزنجە و قەزای چوارتایە. لە ڕوی تۆپۆگرافیەوە دەکرێت بە چوار بەشەوە، یەکەم: (شارباژێڕی تەخت) کە درەختی کەمە و پێچ و پەنا و شاخی زۆرسەختی لێنیە و دەکەوێتە نێوان پشتەوەی زنجیرە چیای گۆیژە وئەزمڕ و زنجیرە چیای پشتی گوندەکانی گورگەدەر و نۆدێ و چنگیان و باراو و وەندەرێنە، (کوڕەکاژاو) بەرزترین لوتکەی ئەم زنجیرە چیا یە پێکدەهێنێ. گوندەکانی تری (شارباژێڕی تەخت) جگە لەوانەی سەرەوە بریتین لە: قەڵاچوالان و تەگەران و کانی سارد و سیتەک و گەڕەدێ و بناویلە و شارستێن و ئاڵەسیاو وێڵە و عازەبان و بزەینان و گورگەدەر، نۆدێ، شوکێ، کانی دڕکە. دوهەم: شارباژێڕی دیوی ناحیەی بەرزنجە: چنارە، باساک، پوشێن، مایاوا، گێڵەرە و کاژاو و مۆریاس. سێهەم: (شارباژێڕی سروچک یا سەخت یا بەرکێو) دەکەوێتە پشتەوەی زنجیرە چیای (کوڕەکاژاو) و (شارباژێڕی تەخت)، دورتر لە سلێمانی و نزیکتر لە سنوری ئێران. سروچک درەختی سروشتی و ڕەز وباخ و کانی و ئاوی زۆرترە، شاخەکانی سەختتر و بەرزترن. زنجیرە چیای (تاریەر و لەرێ) سروچک جیادەکاتەوە لە ناوچەی پێنجوێن. گوندەکانی بریتیبون لە ڕەزڵە، قوڵە گیسکان، دۆسەدەرە، خانوە قوڕەکان،

چناره، پاڕەزان، حاجی مامەند، گویزەڕەشە، دۆڵپەمو، هەولو، هەرمێلە، سوێرەڵە، دۆڵەتو،....، پاڕەزان پایتەختی سروچک بو! حاجی مامەند گوندێکی گەورەیە کە لە هەر چوارلاوە بە شاخ دەورەدراوە. چوارەم: شاربازێری بەری قەزای چوارتا و زنجیرە چیای (سورکێو و گمۆ) کە بەشێکی زۆری لە لایەن ڕژێمەوە وێران و چۆلکرابو و تەنیا چەند گوندێکی کەمی مابو کە برتیبون لە: چناره، گۆڕەدێم، ناحیەی زەلان، ولیاوا، موبرە، مامەخەلان، باوزێ، زێوێ، چالەخەزێنە، سنجەڵێ، کەناروێ، باسنێ، کورەداوێ، کونجرین، گۆرانگە، ئامادین، گردەزبێر، قوتابیان، کەنارو، بەردە زەرد، وەڕاس، سمکێ، واژە و.... ناوچەی شاربازێر هەر لە سەردەمی بابانەکانەوە کە پایتەختی میرنشینەکەیان قەلاچوالان بو، دواتریش لە سەردەمی شیخ مەحمودی نەمردا، لانکی بەرخۆدان و شۆڕش بو. شاربازێر بۆ شۆڕشە نوێکەی یەکێتیی نیشتمانی دەورێکی گرنگی گێڕابو. خێلەکایەتی لە شاربازێڕدا باوی نەماوە، بەدەگمەن خۆفرۆشی ڕژێمی سەدامی تێدابو، زۆربەی خەلکی شاربازێڕ دۆست و لایەنگری یەکێتیی نیشتمانی بون. من ئەگەر بەتەنیاش لە شاربازێڕدا بگەڕامایە تەنانەت لە شاربازێڕی تەخت کە زۆر لە سلێمانیەوە نزیکە هەرگیز ترسی ئەوەم نەبوە دەستەیەکی سەر بە ڕژێم بمکوژن یا بمگرن و ڕادەستی ڕژێمم بکەن. شاربازێڕ ڕاستەوخۆ لە ژێر کارلێکی کۆمەلایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیریی شاری سلێمانی دایە.

## ناو خەڵك خۆشترە

لە ناوەڕاستی مانگی ١٢ ی ١٩٨٠دوای ئەوەی نەخۆشخانەکەی بلەکێ جێگیر بو، هەستم بە حەزێکی زۆرکرد بکەومە جەولە لەگەڵ (پ.م) کاندا لە ناوچەی شاربازێڕ. ڕژێم بە هۆی شەڕی تازە هەڵگیرساوی لەگەڵ ئێران لە ناوچەکەدا لاواز بوبو و کەمتر دەیپەرژایە سەر (پ.م). یەکێتی زۆرترین (پ.م) و ڕێکخستنی لە ناوچەکەدا هەبوە و قورسایی سیاسی و ناو و ناوبانگی لە ناو کۆمەلانی خەلکدا لە هەمو حیزبە کوردیەکانی تر زیاتر و باشتربو. مانەوەی بەردەوامم لە بنکەکە ی بلەکێ و ئەو ڕۆتینەی تێیدا دەژیام بیزاری کردبوم، بڕیاری جێهێشتنی بلەکێ م دا. شازاد و شەماڵ لە نەخۆشخانەکە مانەوە، منیش دو گونیە دەرمان و کەرە سەی پزیشکیم ئامادەکرد و بارمانکرد لە ئێسترێک و لەگەڵ کادیری (ینک) (شەوکەت هەورامی) کە بەڕێکەوت لە بنکەکەمان لایدابو کەوتینە ڕێ. لە ئاستی هەورازی (سورەبان) چیای (سورکێو) ی

سنورمان بڕی و به بەردەم دێی (سورەبان)ی چۆڵ و وێرانکراودا تێپەڕین و هاتینه سەر چەم و ئاوەکە. تراکتۆرێک بە باری قاچاخەوە کە لە ناڵپارێزەوە باری کردبو لەو بەری چەمەکە خەریکی داگرتنی بارەکەی بو. ئێمە بە ئاوەکەدا پەڕینەوە، بە ئومێدی تراکتۆرەکە بارە دەرمانەکەمان داگرت و ماڵاواییمان لە کابرای خاوەن ئێستر کرد کە کوردی ئێران بو، ئەویش بەخۆی و ئێسترەکەیەوە بەرەو ماڵەوە لە دێی بلەکێ گەڕایەوە.

## «دوکتۆر لاچۆ بۆ منی جێبێڵە»

کات پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ بو، من و شەوکەت چوینە لای تراکتۆرەکە و دوای چاک وچۆنی لەگەڵ شۆفێرەکەی، من بە شێوازێکی نەرم ونیان و ڕۆشنبیرانە و شاریانە تکام لێکرد خۆمان و دو گونیە دەرمانەکەمان هەڵگرێ و بمانباتە دێی (قەلاتێ) کە لەسەر ڕێگەکەی بو. هەمو تاکتیک و ستراتیجە عەقڵیەکانی قەناعەتپێکردنم بەرامبەر کابرای تراکتۆر تاقیکردەوە، هیچ سودی نەبو وشکستی هێنا! لە ڕاستیدا هیچ بەڵگەیەکی پێ نەوتین بۆ نایەوێ سواری عەرە بانەی تراکتۆرەکەیمان بکات، داوای پارەشی لێنەکردین! شەوکەت ی هاوڕێم کە تا ئەو کاتە هیچ قسەی نەکردبو، بەڵام دیاربو ورد چاودێریی دۆخەکەی دەکرد، ڕوی کردە من و وتی کاک دوکتۆر تۆ لاچۆ بۆ منی جێبێڵە تۆ لە زمانی ئەمانە نازانی! به دەنگێکی بڕێک زبر و بەرز بە کابرای تراکتۆری وت: ئەم بارە دەرمانە بۆ(پ.م) و خەڵکی ناوچەکەیە، بۆ ئێوەیە، تۆ غیرەتت قوبوڵی دەکات ئێمە بەم سەرمایە لەم چۆڵەوانیە بە تەنیا شەومان بەسەربێت و ناچاربین خاک بکەینە دۆشەک و ئاسمان بکەینە لێفە؟ ئێمە بە ئومێدی تۆ کابرای ولاغدارمان ناردەوە بۆ بلەکێ، یاڵلا خۆمان و بارەکەمان سوارکە و لێخوڕە! کابرای تراکتۆر بە ناچاری و بڕێک ترس و تەریقیەوە ملی دا، سواری تراکتۆرەکەی کردین و بە خۆمان و بارە دەرمانەکەمانەوە گەیاندینیە دێی (قەلاتێ). شەو لە قەلاتێ ماینەوە و بۆ بەیانی بارە دەرمانەکەمان بە ئێستر گواستەوە بۆ گوندی پاڕەزان کە چەمی ئاوی ناڵپارێز جیایدەکاتەوە لە قەلاتێ. هەر هەمان ڕۆژ خۆم گەیاندە بەکری حاجی سەفەر کە لە ناوچەکە جەولەی دەکرد، چەند هەفتەیەک بە گوندەکانی شارباژێڕدا کەوتمە جەولە لە گەڵی.

## قسەیەك لەم قسەیەك لەو تەق تەق تەق.......

هەڵچون و کۆنترۆل لەدەستدان هەمیشە ئەنجامی خراپیان لێدەکەویتەوە. کۆتایی مانگی ١٢ ی ١٩٨٠ بو لەگەڵ کاک بەکری حاجی سەفەر لە گوندی عازەبانی شارباژێری تەخت لە ماڵێکی گوندەکە نانی بەیانیمان دەخـوارد، پێشمەرگەیەک (سالار) کە بەسوکی برینداربو هاتە لای کاک بەکر و بە شلەژاویەوە ئەم هەواڵەی هێنا: لە سەر دەمەقاڵێی نێوان دو (پ.م) ی (ینک) لە گوندی گورگەیەر فەرماندەی کەرت (عومەری رەشەجوتەی قرگەیی) لە لایەن (کەریمی عەبدوڵا مارف) ی برای فەرماندەی کەرت (خەلیفە) کوژراوە و (پ.م) (رێبوار) بە سەختی بریندار بوە. دوای تیمارکردنی بەپەلەی برینەکانی سالار، خێرا خۆم گەیاندە گورگەیەر. پێشمەرگە و کادیری پێشکەوتوی کۆمەڵە (مامۆستا ئارامی شێخ محەمەد غەریبی باساکی) لە نامەیەکی تایبەتیدا ئاوا باسی ئەو دیمەنەی ڕوداوەکە دەکات کە پەیوەندیی بە منەوە هەیە:

«کاک ڕێبوار؛ لاوێکی دەوروبـەری ٢٠ تا ٢٣ ساڵان دەبـوو، ئەویش بریندار بوو، گولەیەک لە قورگی دابـوو، بارودۆخی ناجێگیر بوو. دکتۆر هـەژار، دکتۆرە خۆشەویستەکەی پێشمەرگە گەیشتە ئەوێ (دکتۆر هەژار ناوی عەبدولڕەحمان بوو، ئێستە دکتۆری دەروونییە لە سلێمانی، لە پێشمەرگایەتیدا لاوێکی چالاک و خۆشەویست بوو، لە لایەن خەڵک و پێشمەرگەوە زۆر ڕێزی لێ دەگیرا)، من پرسیم: دکتۆر من یارمەتیت دەدەم، چی بکەم؟ بەڵکوو ڕێبوار نەمرێت. هیچ دەرمانێکی چارەسەر نەبوو، بێجگە لە هەندێ بابەتی سەرەتایی و فریاگوزاریی زیاتر، ڕێبواریش بەخەستی بریندار بووبوو. دکتۆر هـەژار وتـی: «مامۆستا، خوێنی زۆری لێ ڕۆیشتووە! «، ئاوی دڵۆپاوی بۆ هەڵواسی، منیش بەپێوە وەستام و بە درێژایی ئەو کاتە ئاوەکەم بە دەستەوە گرتبوو، پاش تەواوبوونی ئاوەکە، کیسەی دووەمی ئاوەکەی بۆ هەڵواسی، بەڵام دکتۆر هەژار هەر خەریکی لەفاف گۆڕین و وەستانی خوێنەکەی بوو، ناوبەناو ڕێبواری بریندار چاوە جوانەکانی بەرز دەکردەوە، نیگایەکی من و دکتۆر هەژاری دەکرد، وەک ئەوەی پێمان بڵێت تکایە مەیەڵن بمرم! ئێستەش نیگای چاوەکانی ڕێبوارم لەبەر چاوە، لەگەڵ هەموو چاوهەڵبڕینێکدا نیگاکانی کزتر دەبوون. بەداخەوە، کاژێر پێنجی بەیانی، دەمەدەمی گزنگ، نیگای چاوەکانی ئەو لاوە کوژانەوە، ئیدی جارێکی دیکە هەڵنەکرانەوە، گیانی سپارد وماڵئاوایی کرد لە هاوڕێکانی. ئێستەش شێوەی دەموچاوە خەماوییەکەی دکتۆر هەژارم لەبەر چاوە دوای کۆچی شەهید ڕێبوار".

وەک لێکەوتەی ئەو ڕوداوە دواتر (خەلیفە) ی برای کەریم ی بکوژ بە فەرمانی سەرکردایەتی گولەباران کرا! لە سەر دەمەقاڵە و ناکۆکیەکی ڕۆژانە و ئاسایی سێ ئینسان کوژران. بەداخەوە ئێستاش کە چل ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ئەو ڕوداوەدا چەندین ڕوداوی هاوشێوەی کوشتن و ئاگربەردانە ماڵ و خەرمان و باخی خەڵک ڕودەدات، لە سەر شتی هیچ و بێواتای وەک فول لایت لێدان و هۆڕن لێدان و دەسشکانەوە و کێبەرکێی ئوتومبیل و ناکۆکی لە سەر چەند بستە زەویەکی بێبەها و بێبەرهەم.

## گرتنی نەوشیروان لە لایەن حیزبی سۆشیالیستەوە

لە سەرەتای مانگی١ ی ١٩٨١نەوشیروان مستەفا بۆ بینینی کەس و کاری بە شێوەیەکی نهێنی لەگەڵ دو (پ.م) بە پێ لە نێوزەنگەوە بە چەند ڕۆژێ خۆی دەگەیەنێتە گوندی (بەردەرەش) ی ناوچەی (چەمی گەلاڵ) کە نزیک ناڵپارێزە. لە ماڵێکی ئەو گوندەدا کەس و کاری دەبینێت و ئینجا لەگەڵ دوکتۆر کەمال شاکیری کادیری پێشکەوتوی کۆمەلە و (محەمەدی حاجی سابیر) کە لێپرسراوی سیاسیی ناوچەکەبو هەروەها سێ (پ.م) ی تر دەکەوێتە ڕێ بەرەو سەرکردایەتی بگەڕێتەوە. محەمەدی حاجی مەحمود دو مانگێکە بوە بە (حسک) و گەڕاوەتەوە ناوچەکە و بوەتە هۆی گرژی و ئالۆزی لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانی. دەستەیەک (پ.م) ی (حسک) لە دێی (سلێمانە) تەقەدەکەن لەو دەستە (پ.م) یەی لەگەڵ نەوشیروان دایە و (پ.م) یەک (کامەران عارف) بریندار دەکەن. نەوشیروان و محەمەدی حاجی سابیر و د.کەمال شاکر خۆیان دەربازدەکەن و دەگەنە گوندی قەویلە و بەمە لە پێشمەرگەکانی تری (ینک) کە لە ناوچەکەدان دادەبڕێن. نەوشیروان لە (قەویلە) وە نامەیەک دەنێرێ بۆ (مولازم تایەری عەلی والی) کە یەکێ لە بەرپرسە باڵاکانی هێزەکەی (حسک) دەبێ، بۆ هێورکردنەوەی دۆخەکە داوای کۆبونەوەی لەگەڵ دەکات. هێزەکەی (حسک) تا پێش بەدەست گەیشتنی نامەکە نازانن نەوشیروان لەگەڵ ئەو دەستەیەدا بوە کە لە (سلێمانە) تەقەیان لێکردوە. بە نامەکەدا ئاشکرا دەبێت نەوشیروان لەگەڵ (پ.م) کانی یەکێتی دایە و لە گوندی (قەویلە) یە. لە ڕۆژی ٥ ی ١ی ١٩٨١دەستەیەک (پ.م) ی (حسک) لە گوندی (قەویلە) بە پێی فەرمانی فەرماندەکانی هێزەکەیان نەوشیروان لە ماڵی (حاجی عەلی) دا دەگرن و دەیبەن بۆ

لای مولازم تایە ر. لە بری گفتوگۆ کردن بۆ ئاشتیی نێوان یەکێتی و (حسک) لە ناوچەکە، هێزەکەی (حسک) نەوشیروان موستەفا وەک دیلێک لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ بنکەکانی خۆیان لە شاخی سورێن.

## پزیشك لە هەمو شوێنێك پێویستە

بۆ پاراستنی ژیانی نەوشیروان و ئازادکردنی، جگە لە هێزەکانی (ینک) خۆی، حیزبی شیوعی و شێخ کاوەی حەفید و زۆر کەسی تر لە شاخ و لە شارەوە هەوڵی دڵسۆزانەیان دا، لە ئەنجامدا مەکتەبی سیاسیی (حسک) بریاری ئازادکردنی دا و نەوشیروانیان گواستەوە بۆ لای (حشع) لە ئەشکەوتی (هەزارئەستون). شێخ دارای حەفید کە سەرتیپ بو، بە یاوەریی فەرماندەی کەرت (شێخ عومەری حاجی شێخ کەریمی کەڵەکنی) لە گەڵ نزیکەی ١٢ (پ.م) چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بەرپرسانی (حسک) لە شاخی سورێن فەرمانی ئازادکردنەکە پیادە بکەن و، ئەم بچێت بۆ ئەشکەوتی (هەزارئەستون) نەوشیروانی ڕادەست بکەن و لەگەڵ خۆیدا بیهێنێتەوە بۆ شارباژێڕ. بۆ ئەم مەبەستە شێخ دارا لە دێهاتەکانی نزیک ناڵپارێز لە گەڕاندابو. منیش وەک پزیشکێک و بۆ ئەگەری چارەسەرکردنی نەخۆشی یا برینداربونی نەوشیروان و (پ.م) کان خۆم گەیاندە شێخ دارا و بە گوندەکاندا کەوتمە گەڕان لە گەڵیان.

## ژیان بە تاڵێك دەزوی باریکەوە بەستراوە!

لە دێی (بەردەبەل) ی نزیک ڕەزڵە شەوێکماینەوە، بەفرێکی زۆر کەوتەبارین، خەڵکی دێ هەژاربون، حەزمان نەکرد شەوێکی تریش لەوێ بمێنینەوە و ببین بە بار بەسەریانەوە. ڕێساکە ئاوا بو کە نابێت پتر لە سێ ژەم لە گوندێکدا نان بخوێن و بمێنینەوە. بە ناچاری چێشتەنگاو دوای نانی بەیانی، لە کاتێکدا کە بەفر دەباری لە دێ هاتینەدەرێ بە نیازی گوندی ڕەزڵە. بەفربارین خێراتر و زۆرتر و توندتر دەبو، ئینجا باهۆزێکی توندیشی هاتەسەر. بەهۆی پروشی بەفرەوە کە بە بایەکی توند بە خێراییەکی زۆر دەیدا بە دەموچاوماندا، دەوروبەرمان هەموی یەکپارچە و تەواو سپیی دەنواند، ئاسمان و زەوی تێکەڵی یەک بوبون و هەردوکیان یەک تابلۆی مەزنی سپیی بێچوارچێوە یان دروستکردبو، نەماندەتوانی لەیەکیان جیابکەینەوە. جگە لە

مەودای یەک دو مەتری بەرپێی خۆمان نەماندەتوانی دەوروبەرەکەمان بە ڕونی ببینین، بەفر مەودای نەدەدا سەرهەڵبڕین و چاوبکەینەوە. (عبدالرحمن سیتەکی) ی سەردەستە و ڕێبەرمان کە لە پێشەوە دەڕۆشت، ڕێگاکەی لێتێکچو، چەند جارێک ئەملاولای پێکردین، خولاینەوە و گەڕاینەوە بەدەوری خۆماندا. (پ.م) کان کەوتنە بۆلە بۆڵ بەسەریا و بوبە دەمەقاڵێ لەگەڵی. یەکەم جارم بو لە ژیانمدا شتی وا ببینم، ئێمە ئەو دەستە (پ.م) یە هەمومان لە ژێر مەترسیی مردندا بوین بە ڕەقبونەوە لە بەفرا. بە ڕاستی ژیانی (پ.م) لەو سەردەمەدا بە تاڵێ دەزوی باریکەوە بەسترابو، وەیەکان و مەترسیەکان جۆراوجۆر بون: گولە و پارچە هاوەن وساروخی فڕۆکە لە شەڕدا، لوغم پیاتەقان، لە تاریکی شەوا کەوتنەخوارەوە و هەڵدێران لەسەر شاخی بەرز، لافاوی لەناکاو یا پەڕینەوە لە چەمی بەخوڕی ئاو، لە ناکاو کەوتنە ناو تەنوری بۆسەی دوژمن، نەخۆشیی قورس لە نەبونیی دەرمانا، فیشەک لە دەستدەرچون، ژەهراندن، مار و دوپشک پێوەدان...

لەگەرمەی بۆڵەبۆڵەکەدا کە بەهۆی بزربونی ڕێگاکەوە بەرپابوبو، (پ.م) یەکی تر پێشمان کەوت و بوبە ڕابەرمان. ئەویش دوای پەنجا مەترێک هاواری لێهەستا و نەیتوانی بە دڵنیاییەوە ڕێبەریمان بکات. جارێکی تر دەنگی ڕەخنە و بۆڵەبۆڵ بەرزبۆوە.

«قیمەتی ئەشیا بە جێگەیە، مێشێ گەیشتە ڕوی نیگارێ بە خاڵ ئەچێ!»

لەم کاتە زۆر هەستیار و مەترسیدارەدا کە وردە وردە بەفر و سەرما کنەی لە ژیانماندا دەکرد، شتێکی سەیری چاوەڕوان نەکراو ڕویدا. لە پڕ پەردەی گوێمان بە دەنگی زەڕینی گوێدرێژێک لە پێشمانەوە کەوتە لەرینەوە، لەو دۆخە مەترسیدارەدا ئەو دەنگە بەرزە بۆ ئێمە وەک دەنگی لەرینەوەی تاری کەمان و گیتاری دەستی هونەرمەندانی مۆسیقاژەنی بەهرەدار و ناودار بو. بەڕاستی لەو کات و شوێن و هەل و مەرجەدا زەڕینی ئەو کەرە ژیانی ڕزگارکردین، بۆیە خۆشترین گۆرانی و ئاوازی مرۆڤی نەدەگەیشتێ. ئێمە سەرلێشێواو، گیرخواردو و بزربوی ناو بەفر بوین، ئێمە لە بەفر و ڕەشەبا و سەرما سڕ و ڕچیا بوین، زەڕینی ئەو کەرە باشترین قیبلەنما بو ڕێنمایی دەکردین، موگناتیسێکی بەهێز بو بەرەو لای خۆی ڕایدەکێشاین بۆ ئاوەدانی. دوای تۆزێک وەڕینی سەگێکیش لە پێشمانەوە و لە هەمان ئاراستەی زەڕینی گوێدرێژەکەوە بەرزبۆوە، شەپۆلەکانی دەنگی سەگەکە بەنازەوە کۆڵانە تەنگ وتاریک و پێچاوپێچەکانی ناو گوێمانی ئاوەدانکردەوە. ئەو تیشکی

ڕۆژەی لە ناکاو بومان هەڵهات سەرەتاتکێ و چاوبڕکێی عاشقانەی لەگەڵ دەکردین. بە ئاراستەی دەنگی زەڕینی گوێدرێژەکە و وەڕینی سەگەکە، کاروانە بچوکەکەمان بە ورە و وزەیەکی زۆرەوە کەوتەوە ڕێ، ڕچەی بەفری تا سەرئەژنۆمانی شکاند و گەیشتە ناو دێ. بە ترس و سەر سوڕمانەوە چەند پیاوێک هاتن بەرەوپیریمان، تومەز ڕێگەکەمان هەڵەکردبو و هاتبوینە دێیەکی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم کە (گولانی ناوەڕاست) بو. سەیر ئەوەبو بنکەیەکی سەربازیی عێراق (ڕەبیە) بەسەر گردە کەی ڕاسەری دێکەوە بو، وە زۆر نزیک بو لە ماڵەکانی سەرەوەی دێ. ئێستاش نازانم ئایا سەربازەکانی سەر گردەکە لە تاو بەفر و سەرما هەر نەهاتبونە دەرێ تا ئێمە ببینن ؟ یا ئێمەیان بینیبو؟ ئەگەر ئێمەیان دیبێت، ئەوا ئێمە ئەو چواردە ئینسانە ژیانمان قەرزاری بەزەیی و هاوسۆزیی ئەو سەربازانەیە. چونکە ئێمە چەند تۆپەڵە نیشانەیەکی خۆڵەمێشی و ڕەش بوین، لە ناو بەفرێکی سپییدا چەقیبوین و بەدەوری خوماندا دەسوڕاینەوە، دوای زەڕین و وەڕینەکە کیسەڵئاسا بەرەو ڕوی ئەوان ڕێماندەکرد، دودەسرێژی گولە بەشی هەمومانی دەکرد! یا دەیانتوانی کۆپتەری جەنگی مان بۆ بانگ بکەن و وەک گوڵەگەنم یەک لە دوای یەک بمان دورنەوە. بە ماڵەکانا دابەشبوین و نانی نیوەڕۆمان خوارد. وردە وردە بەفربارین بەرەو وەستان دەچو، پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ کاتێک دنیا وردە وردە تاریک دەبو، گەنجێکی شارەزا و بەتوانا کەوتە پێشمان بۆ گوندی ڕەزڵە، ئێوارە بە سەر ماڵەکانی ڕەزڵەدا دا دابەشیان کردین، نانمان لەگەڵ خێزانە جوتیارەکان خوارد، پێخەفیان پێداین و لە مزگەوتی دێ تێر خەوتین.

## پارویەکی چەور بو بەکەس قووت نەدەدرا !

دواتر و دوای ٣٢ ڕۆژ زیندانی لە ئەشکەوتەکانی (دەرەگولان) و (هەزار ئەستون) لە شاخی سورێن، پێش ئەوەی (حسک) بە ڕەسمی نەوشیروان ئازاد بکات، شێخ کاوە لە ئەشکەوتی (هەزار ئەستون) دەمانچەکەی خۆی دەداتە نەوشیروان و ئەمیش لەگەڵ کادیری کۆمەڵە و یەکێتی فەرەح هەورامی (سامان) ڕادەکات و بە پێ خۆیان دەگەیەننەوە (پ.م) کانی یەکێتیی نیشتمانی لە شاربازێڕ. ئێتر پێویستی نەکرد ئێمەش بە شەو لە جادەی سەرەکیی نێوان سەید سادق و پێنجوێن بپەڕینەوە بەرەو شاخی سورین بۆلای ئەو. منیش لە شێخ دارا و دەستە

(پ.م) کەی جودابومەوە و خوم گەیاندەوە بەکری حاجی سەفەر و وەمەلا بەختیار و (پ.م)کانی تر و درێژەمدا بە بە گەڕان بە دێهاتەکاندا وبە کاری پزیشکیی خۆم. لە گوندی (چنگیان) گەیشتینەوە بە نەوشیروان کە پیشمەرگەیەکی زۆر لە دەوری کۆبوبونەوە و هاتبون بۆ دیداری.

## «بۆ فیلم دەرکردنێك ئەمەی دەهێنا ؟»

دوای ئازادبونی نەوشیروان مستەفا هێزێکی نزیکەی شەست (پ.م) لە گوندەکانی شارباژێڕ کەوتە گەڕان لەگەڵی. بەیانی زوی ڕۆژی ١٨ ی ٢ی ١٩٨١ لە دێی (چنگیان) ی شارباژێڕی تەخت، بەدەنگی تەقە و گرمەی تۆپ و قڕەی هێلیکۆپتەری جەنگی بەئاگاهاتین. دەستوبرد هەمومان لە ناودێ هاتینە دەرێ و لە دەوروپشتی دێ سەنگەرمان گرت. (دوکتور نەبەز سەڕاجی هەڵەبجەیی) کە کارمەندی پزیشکی بو لەگەل دەستەکەی (وەهاب) دا بو لە گوندی (نۆدێ) کە چوار پێنج کیلۆمەتر لە خوار چنگیانە وەیە ، بەداخەوە نەبەز لە پشت دێی (نۆدێ) کە هێرشەکەی ڕژێم لەوێوە دەستپێکرد گولەی دوژمن پێکای و دەسبەجێ شەهید بو و جەستەکەیان هێنایەوە چنگیان. نەوشیروان مستەفا لە گەڵ دەستەیەک لە (پ.م) کان بەرەو شاخەکەی نێوان چنگیان و گوندی (باراو) ڕۆیشت و دەربازیان بو. وادیاربو ئامانجی هێرشەکە نەوشیروان مستەفا بێت چونکە حکومەت هەنگاو بە هەنگاو سۆراخی دەکرد و بە دوایەوەبو. دوای شەڕەکە نەوشیروان مستەفا ناوچەکەی جێهێشت و بەرەو سەرکردایەتی گەڕایەوە. (پ.م) یەکی مامۆستامان لەگەڵ بو بە ناوی (ش.ع) نەخۆشیی شیزۆفرینیای هەبو، ئەمیش لە شەڕەکەی نۆدێ دا بەشداربو، کە شەڕەکە دواییهات و بە شەهیدبونی دوکتۆر نەبەزی زانی، زۆر بە جید ی و بە تورەیی و غەمباریەوە ڕەخنەی لە وەهاب گرت. (ش.ع) هەڵقولاو لە دونیای دەرونیی ناوەوەی و لەو وەهمەی لە ژێریدا دەینالاند، بە وەهابی وت: "زۆر عەیبە کاک وەهاب بۆ فیلمێک (پ.م) یەکت بەکوشت دا "، تومەز (ش.ع) شەڕەکە ی وەک فیلم دەرکردنیکی دەسکردی پێشتر سیناریۆ بۆدانراو هەستپێکردوە و زانیوە. ئەم نیشانەیەی شیزۆفرینیا پێی دەڵێن (Derealization) بەواتای لێشێوان و لێتێکچونی ڕاستیەکانی دەرەوەی خود. باش بو کەس بە قسەکەی پێنەکەنی چونکە غەم و خەفەتی نەبەز زۆر لەوە گەورەتربو کەس

بتوانی پێبکەنی. من لەگەڵ وەهاب و بەکری حاجی سەفەر و سەلاحی موهەندس و محەمەدی تەیب و شۆڕش ئیسماعیل و کادیر و لێپرسراوەکانی تری کۆمەڵە هەتا کۆتایی مانگی ٤ ی ١٩٨١ لە شاربازێڕ مامەوە و بە هەمو گوندەکانی ناوچەکەدا دەگەڕاین و چالاکیمان دەنواند.

## کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردوستان (کۆمەڵە)

کۆتایی مانگی ٤ بو بەشداریکردن لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر و دوکتۆر کەمال شاکر گەڕامەوە بۆ سەرکردایەتی. دوهەم یا سێهەم ڕۆژی کۆنفرانس منیان وەک میوان بانگێشت کردبو. ئەمە بۆ من زۆر خۆش بو چونکە یەکەم جارم بو لە کۆنفرانسی حیزبیدا بەشداربم، ئینجا چ حیزبێک؟ ئەو کۆمەڵەیەی خۆشەویسترین ڕێکخراوی سیاسیی ئەو سەردەمەی کوردوستانی عێراق بو. هەروەها بۆ من شانازی بو لە ماوەی نزیکەی پازدە مانگی ئەندامبونم لە کۆمەڵەدا و پێشمەرگایەتیمدا لە ناو (ینک)، ئەو متمانە و بڕوایە لە ناو سەرکردایەتیی کۆمەڵە بەدەست بێنم. کۆنفرانسەکە لە حەوتی ئایاری ١٩٨١ لە (مالیمۆس) گیرا کە شوێنێکی چۆڵەوانیی پڕ پێچ و پەنا بو لە بناری شاخێکی سەختدا لە پشتی دێی (کانی زەرد) ی نزیک خڕی نێوزەنگ. مالیمۆس دەکەوێتە سەر سنوری نێوان سەردەشت و قەڵادزێ. من لە تەنیشت دوکتۆر کەمال شاکیرەوە دانیشتبوم، گوێم لە باس و وتوێژە گەرمەکان دەگرت. لەبەر ئەوەی لە ناو کۆمەڵە تازەبوم، ئاگاداری وردەکاریی ناکۆکیەکانی نێوان ئەندامانی سەرکردایەتیی کۆمەڵە نەبوم، بۆیە من هەر بە گوێگر مامەوە و هیچ قسەم تێیدا نەکرد. من لە ڕۆژی یەکەمی پێشمەرگایەتیمەوە هەمیشە خەونی ئەوەم دەبینی ڕیزەکانی کورد یەکبخرێ و هەمو وزە و تواناکان ئاراستەی ڕژێمی سەدام بکرێن، بۆیە هەرگیز نەمدەتوانی لە ژێر هیچ بەهانەیەکدا شەڕی براکوژی وەک شەڕێکی ناچاری کە بوە بە توشمانەوە، قبوڵ بکەم، لە ناخی دڵمەوە نەفرەتم لێدەکرد و بە ئێش و ئازارەکانیەوە دەتلامەوە. بە ئەسپایی بە دوکتۆرکەمال شاکرم وت: باشە چۆنە من ئێستا پێشنیاز بکەم کۆنفرانس وتووێژ لەگەڵ پارتی و حسک بکاتە بابەتی باس و لێکۆڵینەوە، بە ئامانجی وەستانی شەڕی نێوان ئێمە و ئەوان کە ناوبەناو لێرە و لەوێ کڵپەی دەسەند. دوکتۆر کەمال خاوەنی ئەزمونی سیاسیی کۆن بو لە (حشع) دا و هەروەها ئەزمونی تازەی ناو کۆمەڵەشی هەبو، پێشنیازەکەمی پێ باش

بو بەڵام کات و شوێن و بۆنەکەی پێ باش نەبو، ئاگاداری کردمەوە کە من تازەم و میوانم و لە کەشێکی سیاسیی وەک ئیمڕۆی ناو کۆمەڵە و یەکێتیدا داواکەم لایەنگر و پەسەندکەری زۆری نابێت، بە برێک دودڵییەوە بەگوێیم کرد، پێشنیازەکەم نەخستەڕو. د.کەمال ڕاستی دەکرد چونکە پێشتر دەیان دانیشتن و ڕێکەوتن لەگەڵ پارتی و حسک کرابون و سەریان نەگرتبو، متمانە لە خوار هیچەوە بو. هەڵەکان وبەرپرسیارێتیی حسک و بەتایبەتی پارتی لە شەڕی براکوژی لە هی (ینک) زۆرتر بون، بە تایبەتی برینەکانی (کارەساتی هەکاری) کە پارتی بەسەر (پ.م) و سەرکردەکانی یەکێتیی هێنا بو هێشتا خوێنیان لێدەچۆڕا و سارێژ نەبوبون. هەروەها پارتی بە پێچەوانەی یەکێتیە وە بە تـەواوی پشتگیریی ڕژێمی ئیسلامیی ئێرانی دەکرد لە دژی کوردی ئێران. جگە لە وانە کۆنفرانس زۆرتر سەرقاڵی کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە بو.  لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتیدا نەوشیروان مستەفا دەنگی یەکەمی کۆنفرانسی بەدەستهێنا و بوبە سکرتێری کۆمەڵە.

ڕاوبۆچونەکانی نەوشیروان دەربـارەی کێشەکان و ڕێی چارەسەرکردنیان کورت و پوخت و ڕون و کۆنکرێتی و مەنتیقی و یەکلاکەرەوە بون، بۆیە لە هە مو سەرکردەکانی تر زیاترسەرنجی ئەرێنیی منی ڕاکێشا.

## بەکری حاجی سەفەر و خێزانەکەی

دوای کۆنفرانسی یەک لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر گەڕامەوە بۆ بلەکێ، ئەو فەرماندەی هەرێمی سێ ی یەکێتی بو کە هەمو ناوچەی پێنجوێن وشارباژێڕ و قەزای چوارتای دەگرتەوە، هەروەها ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی بو. بەکری حاجی سەفەر کوڕی یەکێ لە بازرگانە دەوڵەمەندەکانی پێنجوێن بو، تێکۆشەرێکی دێرینی کۆمەڵە بو، پێش کۆمەڵە ئەندامی پارتی و بە هەرزەکاری ئەندامی یەکێتیی قوتابیانی کوردوستان و(پ.م)ی شۆڕشی ئەیلول بو. پیاوێکی نەرم و نیان و شیعردۆست و ئاغر و سەنگین بو. ژن و منداڵەکانی بە هۆی ئەمەوە ئازاری زۆریان چەشتبو. دوای ئەوەی بەکری حاجی سەفەر لە مانگی ٩ ی ١٩٧٦ دەبێتە (پ.م) ڕژێمی سەدام لە تۆڵەی بەکری حاجی سەفەر دا (کافێ خانی) هاوژینی کە دوگیان دەبێت زیندانی دەکات و بە زیندانی دەینێرێت بۆ (ناسریە) لە باشوری عێراق.  هەر لەوێ لە زیندانا لە ساڵی ١٩٧٧ (تانیا) ی دەبێت. کافیە خان دوای ئازادکردنی و گەڕانەوەی

بۆ سلێمانی جار جار سەردانی بەکری حاجی سەفەر دەکات. پاش ماوەیەک لە ساڵی ١٩٨٠جارێکی تر بە دوگیانی دەگیرێت و لە (هەیئەی کەرکوک) زیندانی دەکرێت، هەر لەو زیندانە بەدناوەدا (هێژا) ی کچی لە دایکدەبێ. بەکری حاجی سەفەر ویژدانی زۆر ئازاری دەدا کە ئاوا ژن و مندالەکانی لە سەر (پ.م) بون ی ئەو ئازار دەدرێن، شیعرێکی بەسۆز و جوانی نوسیبو لە سەر دۆخی دەرونی و کۆمەڵایەتیی خۆی و ژن و منداڵەکانی. لە نەورۆزی ١٩٨١ ژن و منداڵەکانی بەکری حاجی سەفەر بەیەکجاری شار بەجێدێڵن و لە گوندی پارەزان لە خانویەکی چەند ژوری نیشتەجێ دەبن. ئیتر ماڵی بەکری حاجی سەفەر بوبوە ئەو دیوەخانە سیاسیەی، ئەو میوانخانە هەردەم ئاوەدانەی بەردەوام (پ.م) و میوانی جۆراوجۆر نان و ئاویان تێدا دەخوارد و دەحەسانەوە. دواتر کە نەخۆشخانەی پارەزانمان دروستکرد، ئەم خێزانە بەخشندەیە خۆراکی تایبەتیان دەنارد بۆ ئەو بریندار ونەخۆشانەی لە نەخۆشخانەکەمان خەوێنرابون. بەتایبەتی (کافیێ خان) بە ڕویەکی هەردەم خۆش و دۆستانەوە پێشوازیی لە میوان دەکرد و خزمەتی دەکردن. زۆر جار جگەرەیەکی بە لا لێویەوە بو کە هەر لە خۆی دەهات، بەداخەوە دواتر بە هۆی ئەو جگەرە کێشانە توندەیەوە توشی سەرەتانی سیی کرد و مراندی. (هەوار) و (چنار) و (نیگار)ی کچیان و ئەرسەلانی کوڕیان هەمویان بەدڵ و بەگیان خزمەتی (پ.م) یان دەکرد.

بەکری حاجی سەفەر پیاوێک بو میانەڕەو و ناتوندوتیژ. جارێکیان لە کۆبونەوەیەکدا باسی ئازاردانی جوتیارێک کرا لە لایەن (پ.م) یەکەوە، بەکری حاجی سەفەر دەستی بەرزکردەوە و وتی: «من ئەم دەستەم دەبڕمەوە ئەگەر تەنیا یەک جار لە جوتیارێکی پێبدەم و ئازاری پێبگەیەنم!». ئەو هەڵپەی ئەوەی نەبو بە شێوەی نادروست و ناڕەوا یا خیانەت لە هاوڕێکانی پۆستی گەورە و دەسەڵاتی زۆر وەربگرێ. ئەو هەمیشە دەیویست ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵە و ناو یەکێتی بە شێوەی دیموکراتیانە و بە جۆرێک چارەسەربکرێت کە هەمو لایەنە ناکۆک و جیاوازەکان وەک براوە لە ململانێکە دەربچن. ئەو چارەسەرێکی دەویست کە کۆمەڵە و یەکێتی بەهێز بکات و بیانپارێزێ لە کەرت کەرت بون. ئەگەر مەلا بەختیار و هاوڕێکانی بە گوێی بەکری حاجی سەفەریان بکردایە هەرگیز (ئالای شۆڕش) یان دروست نەدەکرد. ئەگەر جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفایش بە گوێی بەکری حاجی سەفەریان بکردایە، چارەسەرێکی دیموکراتیانە و ناتوندوتیژانەیان بۆ ناکۆکیەکان دەدۆزیەوە و هەرگیز مەلا بەختیار و هاوڕیکانیان زیندانی نەدەکرد و ئازاریان نەدەدان.

## وەهاب (شێخ بەهادینی پیرخدری)

لە یەکەم جەولەمدا لە شارباژێڕ بۆ یەکەم جار لە نزیکەوە وەهاب م ناسی و پەیوەندیەکی دۆستانەی خۆش لە نێوانمان دروستبو کە تائێستاش بە هەمان تام وچێژ درێژەی هەیە. زۆربەی کات لەگەڵ ئەو کەرتە (پ.م) یەی کە ئەو فەرماندەی بو بە گوندەکانا پێکەوە دەگەڕاین. وەهاب یەکێ لە ئەندامە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە دەبێت و لە سلێمانی خەباتی ژێرزەمینی دەکات. دوای ئەوەی قوتابخانەی پیشەسازی لە سلێمانی بە نمرەیەکی بەرز تەواودەکات لە زانکۆی تەکنەلۆجیا لە بەغدا وەردەگیرێت. دوای یەک هەفتە لە خوێندن لەو زانکۆیە، لە مانگی ١٠ ی ١٩٧٦ وازلە خوێندن دەهێنێ و خۆبەخشانە بە ویست و حەزی خۆی دەبێتە یەکێ لە (پ.م) سەرەتاییەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێ. وەهاب خۆی دەگەیەنێتە ناوچەی مەرگە و دەکرێتە کادیر، دواتر لە سەر پێشنیازی شەهید ئارام دەگوازرێتەوە بۆشارباژێر. دوای کارەساتی هەکاری وەهاب بە هۆی چالاکیە پێشمەرگایەتیەکانیەوە واز لە کادیری دەهێنێ ودەبێت بە فەرماندەیەکی سەربازیی ئازا و بەتوانا. دەکرێت بە فەرماندەی کەرت و دواتر بە سەرتیپ، لە ساڵی ١٩٨٥ دا دەکرێتە فەرماندەی سەربازیی مەڵبەندی دو و ئەندامی دەسگای پێشمەرگایەتیی یەکێتی. وەهاب لە زۆربەی نەبەردەکانی ناوشاری سلێمانی و دەرەوەی شاردا وەک فەرماندە بەشداریی کاریگەری کردبو، بۆیە لەمێژ بو ڕژێم بەدوایەوە بو. لە یەکێک لە چالاکیە پێشمەرگایەتیەکانی ناو شاری سلێمانیدا لە شەوی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٨١، دو گەلفرۆشی سەر بە دەسگا جاسوسیەکانی ڕژێمی سەدام پلانێکی وردی دۆزەخیانە بۆ وەهاب دادەنێن. ئەو دوانە بەڵێن بە وەهاب دەدەن ڕێنمایی خۆی ودەستەیەک لە (پ.م) کانی بکەن بۆ چالاکیەکی کاریگەر دژی ڕژێم لە ناو شاردا لە گەڕەکی جولەکان. بە شەو پێشی وەهاب و دەستەیەک لە دە (پ.م.) هەرە ئازاکانی (نامیقی حەمە چەتە، جەلالی عەلی ورگە، وەستا کەمالی حەبێ، وەستا ئەنوەر، حەمەی ڕێحان، جەلال ماخۆلان..) دەکەون و دەیانهێننە ماڵ و حەوشەیەکی گەورەی پڕ لە کرێچی لە جولەکان. وەهاب و (پ.م) کانی خراونەتە ناو ئاگری تەنوری کەمینێکی گەورە و پرچەکی سەرباز و هێزە تایبەتەکانی ڕژێم. ئەمان کاتێک بە نەخشەکە دەزانن کە گوێیان لە هاواری سەربازی عەرەب دەبێت «سلمو انفسکم «واتا خۆتان بدەن بە دەستەوە. دەبێتە شەڕێکی دەستەویەخەی قورس کە تێیدا دو پیاوەکەی ڕژێم لە گەڵ دەیان سەرباز دا دەکوژرێن و دەیانی تریش بریندار دەبن. (پ.م) خۆیان لە تەنوری سەرەکیی شەڕەکە دوردەخەنەوە، بەڵام

له سەر ڕێگای گەرانەوە دەیان تەنوری بچوکی تریان بۆ داخراوە. وەهاب له ژێر ئاگری دوژمندا بریارێکی زیرەکانه دەدات: پێشی (پ.م) کان دەکەوێت بۆ ناو زێرابی سەرەکیی چڵکاو و پیساوی جولەکان، چەند سەد مەترێک به ناو پیساوی ڕەشدا که تا سەرئەژنۆیانی داپۆشیوە دەڕۆن تا خۆیان له شوێنی شەڕەکه تەواو دوردەخەنەوە و ڕزگاریان دەبێت. بێ هیچ زیانێکی گیانی و به دەسکەوتی تفەنگێک و دەمانچەیەکەوە شەو له ڕێی قرگە و وێڵەدەرە وە دەگەڕێنەوە شارباژێڕ.

## شەهید سەلاحی موهەندیس

سەلاح هاوڕیی منداڵیم بو، کوڕی حاجی ڕەفیقی خەراجیانیه که یەکێ بو له موڵکدارە دەوڵەمەندەکانی سلێمانی. سەلاح که له بەغدا دەیخوێند جارێک چوم بۆلای، به دیواری ژورەکەیدا وێنەیەکی ڕابەری شۆڕشی چین (ماوتسی تۆنگ) ی هەڵواسیبو. ئەو پێش من بوبو به (پ.م)، له تۆڵەی ئەوەدا ڕژێمی سەدام حاجی ڕەفیقی باوکی و حاجی خانمی دایکی و سەلام و بەکر ی برای پێکەوە زیندانی دەکات، دوای چوار مانگ دایکی و باوکی ئازاد دەکەن و سەلام و بەکریش دەنێرن بۆ زیندان له بەغدا، لەوێش ساڵێکی تر دەمێننەوە، ئینجا ئازاددەکرێن. که بۆ یەکەم جار کاک سەلاح م له نێوزەنگ بینی هەستم کرد به گشتی له بارودۆخی یەکێتی ڕازی نەبو. ئەو بەتایبەتی ڕەخنەی لەوە دەگرت که جەلال تاڵەبانی له بری پشتگیریکردن و هێنانەپێشەوەی لاوە تێکۆشەرە کانی کۆمەڵە و نەوەی نوێ به گشتی، پشتگیریی هاوڕێ و هاوخەباتە کۆن و بەتەمەنە کانی خۆی دەکات. وام هەست کرد کاک سەلاح له قسەکانیدا و به دەربڕینی دەموچاوی بەزەیی به مندا دێتەوە که بوم به (پ.م)، زو زو لەگەڵ سەلاح له شارباژێڕ جەولەم دەکرد.

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگی ڕۆژێکی سەرەتای بەهاری ١٩٨١ لەگەڵ سەلاحی موهەندیس وەک فەرماندەی کەرت و نزیکەی پازدە (پ.م) ی کەرتەکەی، له دیوی شارباژێڕەوە وەک مێروله بەدوای یەکدا کش و مات ملمان نا به شاخی گۆیژەوە. بەسەر شاخەکەدا سەرکەوتین و له ئاستی لوتکەی ستراتیجیی (مەحمود خان) که بنکەیەکی سەربازیی گرنگی پێوەبو، بەرەوخواربوینەوە بۆ دێی (وێڵەدەر) که دەکەوێتە دیوی سلێمانیی شاخی گۆیژە. که ئێمه بەرەو (وێڵەدەر) بەرەوخوار بوینەوە هێشتا دنیا بولێڵ بو، بەراستی ئێستاش نازانم ئایا سەربازەکانی ئەو بنکەیە ئێمەیان بینی یان نا؟ ئەگەر ئێمەیان بینی چۆن بو تەقەیان لێنەکردین؟ ئایا ئەوانەی بەڕێکەوت لەوێدابون

ناحەز و دژی ڕژێمی سەدام بون بۆیە تەقەیان لێنەکردین؟ یان لێپرسراوەکەیان پیاوێکی بێ وەی و ناتوندوتیژ بو و پێی وتبون ئەگەر هێرش نەکرێتە سەرتان تەقە لە کەس مەکەن! نازانم.

ئێوارە بۆ نانخوردن و پشودان بەسەر ماڵەکاندا دابەشکراین، دوای پشودان و نانخواردن هەمو لە بەردەم مزگەوتەکەدا کۆبوینەوە، سەلاح یەک یەک چەند (پ.م) یەکی بانگکرد و بەدوای یەکدا ڕیزیکردن، بەرایی ڕیزەکە ڕوی لە سلێمانی بو، تێگەیشتم نیازی وایە چالاکیەک لە ناو شار ئەنجام بدات، منی بانگ نەکرد. بەڵام من حەزم دەکرد بەشداربم، بۆیە منیش سودم لە تاریکیی شوێنەکە وەرگرت و بە ئەسپایی و بێدەنگی خۆم خستە ناو ڕیزەکەوە، سەلاح پێی زانیم و وتی بە هیچ جۆرێ ڕێگە نادات من لە چالاکیەکەدا بەشداربم. سەلاح وەک برایەکی غەمخۆر نەیدەویست ژیانی من لە چالاکیەکی پێشمەرگانەی ناوشاردا بکەوێتە مەترسیەوە، پێی وتم تۆ شتێکت لێبێ کێ چارەسەرمان بکات؟ بە چپە پێی وتم ئەگەر شتێکت لێبێ چی بە سۆیبەخانی دایکت و بە براکانت بڵێم؟ ناچاربوم لە گەڵ دو (پ.م) لە وێڵەدەر بمێنمەوە. پاش یەک دو سەعات تەقە و گرمە و ناڵە لە ناو شارەوە بەرزبۆوە. دەستەکە بێ هیچ زیانێک گەڕانەوە، لە چەند بنکەیەکی هێزەکانی ڕژێمیان دابو و چەند کەسێکی جەیش شەعبی یان بە دیل گرتبو و لەگەڵ خۆیان هێنابویان. بە هەمان ڕێگەی هاتنماندا بە بەردەم بنکە سەربازییەکەی لوتکەی مەحمودخاندا بە سەر شاخی گۆیژە هەڵگەڕاین و گەڕاینەوە دیوی شارباژێر و لە گوندی (بناویلە) لاماندا بۆ حەسانەوە.

چەند ڕۆژێ دوای ئەو چالاکیە، لەگەڵ سەلاحدا دا بە دێکاندا دەگەڕاین، نزیکی ڕێی بەرزنجە بوینەوە. چەند مەترێ لە کەنار جادە قیرەکە لە کەلاوەی خانویەکی ڕوخاودا بۆسەیەکی دانا، (پ.م) کانی ڕو لە جادەکە دامەزراند، منیشی لەگەڵ خۆی لە شوێنێکی بەرزتر، لە پشت تلە بەردێکی گەورەوە دانا بۆ چاودێری کردنی جادەکە. سەلاح بە هیوای ئەوەبو لە سەربازگە گەورەکەی دەشتی (زەڵێ) وە ئوتومبیلی سەربازی بێت و بکەوێتە بۆسەکەمانەوە. بەڵام ڕێکەوت لەگەڵمان نەبو، لە بری ئەوە چەند سەیارەیەکی خەڵکی ئاسایی کەوتە کەمینەکەمانەوە، بەخۆشی دابەزێنران و باسی ڕێبازی شۆڕشمان بۆکردن. پاشان ڕێگەدران زو بڕۆن و جێگەکە چۆڵبکەن نەوەک دوای ئەوان ئوتومبیلی سەربازیی بێت. بەڵام هێزی دوژمن هەر نەهات و ئێمەش کەمینەکەمان هەڵگرت. دواتر کاتێک کاک سەلاح بو بە سەرتیپی ٤٧ ی پیرەمەگرون، خۆی و (پ.م) کانی لە ناوجەرگەی هێزەکانی سوپای عێراق، بە ڕۆژی نیوەڕۆ

له چیای (دابـان) نزیک گوندی (سەرگەڵو) چالاکییەکی کوتوپڕی سەربازیی زۆر سەرکەوتوانەیان لە دژی هێزێکی سوپای عێراق ئەنجامدا. بێ ئەوەی خۆیان هیچ زیانێکیان پێ بکەوێت گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. کاک سەلاح ئەو پارەیەی باوکی بۆی دەنـارد خەرجی دەکرد لە (پ.م)ی کەرتەکەیدا، بۆیە (پ.م) کانی لە چەک و فیشەک و جلوبەرگدا پۆشتەوپەرداختر بون لە وانی تر.

ئەم کەسایەتیانەی خەڵکی سلێمانی کە (پ.م) ی دێرینی (ینک) و کادیری کۆمەڵە بون: وەهاب، سەلاح، شۆڕش ئیسماعیل، حەمەی تەیب، سورکێو ی کادیر، بەختیاری حاجی فارسی بێسەری، مامۆستا سەرداری وێڵەیی، جێی متمانە و بڕوای خەڵکی ناوچەکە و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی بون، ناوبەناو وەک هاوڕێی نزیک و جێی متمانەی تەواو لەگەڵیاندا جەولە و چالاکیم دەکرد، لەوانە بەداخەوە سورکێو و مامۆستا سەردار و بەختیار شەهیدبون.

## محەمەد تۆفیق ڕەحیم

محەمەد هاوڕێی منداڵیم و هاوپۆلم بو لە قوتابخانەی ئامادەیی سلێمانی، ئامۆزای شەهید سەلاحە، ئەمیش باوکی لە دەوڵەمەند و موڵکدارەکانی شاربو. دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی لە سلێمانی لە سەر حسابی خۆی باوکی دەینێرێ بۆ پاریس، دوای ساڵێک پاریس جێدێڵێ و لە لەندەن جێگیردەبێ و هەر لەوێ کۆلیجی ئەندازیاری بەشی میکانیک تەواودەکات. لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانی دا ئەم لە ڕێی شازاد سائیبەوە دەچێتە ناو یەکێتی، پاشان لە ڕێی سوریا و ئێرانەوە لە زستانی ساڵی ١٩٧٩ دا خۆی دەگەیەنێتە سەرکردایەتی و دەبێتە (پ.م). محەمەد زۆرتر لە سەرکردایەتی لای نەوشیروان مستەفا و جەلال تاڵەبانی دەبێت. بە هۆی خەباتی ئەمەوە دایک و باوکی و برا و خوشکەکانی توشی گرتن و دورخستنەوە و سزای تر دەبن. محەمەد هاوژینگیری لەگەڵ خوشکێکی نەوشیروان مستەفا دەکات، محەمەد پاشان دەبێتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. دوای ڕاپەڕین دەبێتە وەزیری کاروباری ئینسانی لە حکومەتی هەرێم دا ، دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام دەبێتە وەزیری پیشەسازی لە حکومەتی عێراقدا. دواتر محەمەد دەبێتە یەکێ لە دامەزرێنەرانی بزوتنەوەی گۆڕان و بەرپرسی ژوری دیبلۆماسیی ئەو بزوتنەوەیە.

## ئێمەی بۆرجوازی و ئەوی ڕەنجدەر!

(پ.م) و کادیرەکانی کۆمەڵە نمونەی لەخۆبوردەیی ودڵسۆزی و پاکی بون، دەبوایە خۆیان بە مێژوی کورد و سیاسەت و بیر و فەلسەفە، بەتایبەتی بیری سۆشیالیستیی زانستی (مارکسیزم- لینینزم) ڕۆشنبیر بکەن. هەندێکیان مارکسیبونەکەیان گەلێک تۆخ و خەست وخۆڵ بو، هەندێکیشیان کاڵ و ڕوکەشی بو. جارێکیان لەگەڵ هاوڕێم د.کەمال عەبدولرەحمان لە ژێر چادرێکی بچوک لە توژەڵە کە کردبومانە بنکەی تەندروستی دانیشتبوین. کادیری دڵسۆزی کۆمەڵە و سەردەستەی (پ.م) (هێمن سەراوی) خەڵکی گوندی (سەراو) ی بنار شاخی (گمۆی) شارباژێڕ بو، وەک نەخۆش هاتە لامان، ئێمەش چارەسەرمان کرد و چایەکمان بۆ لێنا. بەدەم چایی خواردنەوە بوبە وتووێژی سیاسی و ئاڵوگۆڕی بیروباوەڕ لە نێوانماندا. ئەو سوربو لەسەر ئەوەی ئێمەی دوکتۆری ناو شۆڕش سەر بە چینی بۆرجوازیی بچوکین، ڕەنجدەران و کرێکاران (پرۆلیتاریا) هەر لە خەباتی ڕزگاریی کوردوستانا پێویستیی بە ئێمەی بۆرجوازی بچوک هەیە و بۆمان هەیە شانبەشانیان خەبات بکەین، بەڵام کە کوردوستان ڕزگاری بو لەداگیرکەرانی عەرەب ، ئەوسا ڕێگامان لە یەکتر جودا دەبێتە وە و نۆرەی ئێمە ی بۆرجوازیی بچوک دێت بۆ خەباتی چینایەتیی ڕەنجدەران لە دژمان. سەیرەکە لەوە دا بو کاتێک ئەمانەی دەوت، ئێمەی دوکتۆر و ئەوی ڕەنجدەر هەمان پێڵاوی لاستیکمان لە پێدابو و لە هەمان دەفر نانی کولەمەرگیمان دەخوارد و لە هەمان فڕۆکەوە بۆمباباران دەکراین. ئاوایە پەروەردەکردنی ئایدۆلۆجیی یەک ئاراستە و ڕەش و سپی: سەرکوێرکردن و لەقاڵبدانی بیرکردنەوەی ئازادانەی مرۆڤ! بەداخەوە هێمن لە دوای شکستی وتووێژی ینک لەگەڵ ڕژێمی سەدام لە شەڕدا شەهید بو.

## «لێگەڕێ با هەر پاڵێوراو بم !»

جارێکیان من پێشنیازم کرد (کەریم چوارتایی، بەخاڵەکەریم ناسرابو) لە پاڵێوراویەوە بەرزبکرێتەوە بۆ ئەندامی کۆمەڵە کە لەو سەرەمەدا شەرەفێکی گەورە بو. خاڵە کەریم سوپاسی کردم و داوی لێبوردنی لێکردم، ئەو وتی «نا نا کاک دوکتۆر زۆر سوپاس بۆ ئەو بڕوا و باوەڕەت بە من، بەڵام من شتی وام ناوێ، چونکە کە بومە ئەندامی کۆمەڵە دەبێت بەردەوام خەریکی کتێب خوێندنەوە بم بۆ خۆڕۆشنبیرکردنی ئایدیۆلۆجی و سیاسی، منیش تاقەتی ئەو هەموە کتێب خوێندنەوەم نیە "، زۆر پێکەنین. وازمان لێهێنا و لێگەڕاین هەر بە پاڵێوراوی بمێنێتەوە.

## حسەین بەفرین

حسەین بەفرین هاوپۆلی قوتابخانەی سەرەتایی من بو، هەرچەندە یەکێ بو لە خوێندکارە زۆر زیرەکەکان کەچی لە دوای دواوە دائەنیشت چونکە کورسیەکانی پێشی پێشەوە بۆ دو زیرەکی تر دانرابون کە برا بون و کوڕی دەوڵەمەندێکی شار بون! ئەو شاعیرە، هاتبوە دەرێ و لە سەرکردایەتی لە ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتی بو. حسەین دانەری چامەیەک لە شیعری بەرگری بو لە سەردەمی شکست و نائومێدیی دوای ئاشبەتاڵ کە ئاوا دەست پێدەکات:

**وڕ و کاس و سەرگەردان نیم        دەستەمۆی ئەشکی گریان نیم**

**هەرچەند بە ئازار تەزیوم        سەربەرزبووم نەبەزیووم**

ئەم شیعرە شۆڕشگێڕیە دوای ئاشبەتاڵ دانابو و لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێدا کرا بە یەکی لە سرودە خۆشەکانی ئەو شۆڕشە. بەتایبەتی (پ.م) کانی کۆمەڵە زۆر جار لە کاتی جەولەدا لە ڕێوبانەکاندا بە دەنگی بەرز ئەم سرودەیان دەچڕی. حسەین بەفرین کۆمەڵە بو، زۆر سەرسام بو بە شەهید ئارام. یەکێ بو لەوانەی لە وتووێژە ئایدیۆلۆجیە کاندا زۆر چالاک بو، ڕای ئەو کە لەو وتووێژانە دەریبڕیبو ئەوەبو کە ئەو مارکسیە بەڵام لینینی نیە، ڕەخنەی توندی لە لینینزم دەگرت، ئەم ڕایە زۆر جار لە ناوکادیرانی کۆمەڵە دا وەک ڕایەکی سەیر و ڕیزپەڕ باسی لێدەکرا، چونکە لە بلۆکی وارشۆی سۆشیالیستی و حیزبە شیوعیەکانی سەر بەو بلۆکەدا ڕای ڕەسمیی باو و زاڵ ئەوەبو کە لینینزمیان بە تەواکەر و پیادەکەری مارکسیزم دادەنا. حسەین بەفرین پاش ماوەیەک لە کۆمەڵە و لە یەکێتی و لە ناوچەی سەرکردایەتی بێزاربو و بەجێیهێشت. پاشان حسەین لە کۆمەڵەی ئێران نزیک بۆوە، دواتر لە (بلەکێ) گیرسایەوە و هاوژینگیریی لەگەڵ کچێکی کوردی ئێراندا کرد. حسەین بەفرین ڕۆژێک لە چاخانەیەکی (بلەکێ) توشی وتووێژێکی ئایدیۆلۆجی و ئاینیی توند دەبێت لەگەڵ (مام عەلیی ئیقدامی بانەیی). مام عەلی لە دەست ڕژێمی ئێرانی ئیسلامی ڕایکردبو، ئەو سێ کوڕ و دوکچی هەبو کە هەمویان مارکسی بون، دوانیان لە ڕێکخراوی چریکی فیدائی بون، ئەوانی تر لە کۆمەڵەی ئێران. بەڵام مارکسی بونی منداڵەکانی بەم چی؟ ئەم پیاوێکی کوردی نیشتمانپەروەری موسوڵمانی سونە بو کە بەهۆی منداڵەکانی و زوڵمی

ڕژێمی شیعەگەریی ئێران ڕایکردبو. کاتێک دەرگای وتووێژەکەی نێوان حسەین و مام عەلی تەواو دەکەوێتە سەرپشت، قسەیە لەم و قسەیە لەو، وتووێژەکە کڵپە دەسەنێ، مام عەلی خەنجەری بەر پشتێنەکەی لە حسەین هەڵدەکێشێ و پێی دەڵێ تۆ "کافریت و خوێنت حەڵاڵە!". ئیتر دانیشتوانی چاخانەکە دەکەونە ناوبژیوانی و لە یەکیان جیادەکەنەوە. ئەڵبەتە حسەین بەفرین پیاوی شەڕ و شۆڕ نەبو، ئەو شاعیرێکی بیرکەرەوەی هەستیاربو، لایەنگری چینە نەدارەکانی خوارەوەی کۆمەڵ بو، هەر لە هەرزەکاریەوە ئامانجە باڵاکانی وەک ئازادی، یەکسانی، سۆشیالیزم، دادپەروەری.... بونە خولیای ژیانی و هەر ئەمەش وای لێکرد کە نەیتوانی خوێندنی زانکۆیی تەواوبکات، دەنا ئەو شایەنی بەرزترین کۆلیجەکان بو. بە داخەوە کاک حسەین (جەبار) ی برای کە (پ.م)ی (حسک) بو لە شەڕی یەکێتیدا لە (ڕزڵە) کوژرا، ئەویش هاوپۆل و هاوڕێی من بو.

## کەوانە ڕەنگینە بەرامبەر بە تونێل !

لە پەروەردەکردنی ئاینی و مەزهەبیی داخراو و یەک ئاراستەدا، یا موسوڵمانی باشیت یا کافری خراپ، یا سونەی باشیت یا شیعەی ڕافزی و سیغەکەری ناموسوڵمان! ئیتر بۆ سەیرە لە دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام لە سەر ناسنامە (ناوت عومەرە یا عەلی؟) شیعە و سونە ی عەرەب کەوتنە گیانی یەکتری؟ بە هەمان شێوە، باوەڕبونی کوێرانە و دەروێشانە بە ئایدیۆلۆجیا و فکری سیاسی و حیزبی و بنەماڵەیی، هەروەها باوەڕبونی نارەخنەگرانە و کوێرانە بە هەر سەرۆک و ڕابەرێک، لە کۆتاییدا هەر بە شەڕ و خوێنڕشتن و وەحشیگەری کۆتایی دێت.

حیزبی بەعس خوێنی هەمو شیوعیەکی حەڵاڵ کردبو، کەچی هەندێ لە شیوعیە کورد و عەرەبەکانی عیراق لە ناو خۆیاندا لە ساڵەکانی دوای ١٩٦٨ کە حیزبەکەیان دولەت بو، لە سەر بیروڕای جیاوزی ئەوەی کامیان شیوعیی ڕاستەقینەیە ئازاری یەکتریان دەدا و تەنانەت چەند کەسێکیان لە یەکتر کوشت. ئامانجی کۆتایی ئایدیۆلۆجیای مارکسیزم دامەزراندنی کۆمۆنیزمە. لە سیستمی کۆمۆنیستی دا وا گریمانە کراوە کە ئیتر کۆمەڵ و تاکی مرۆڤ ئەوەندە پێش دەکەون کە پێوست بە دەوڵەت نامێنێ و هەڵدەوەشێتەوە، هەمو جۆرەکانی چەوسانەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە نامێنێ و، هەمو پێویستیە ڕۆحی و مادیەکانی ئینسان بەدیدێت. کەچی بەناوی ئەم بیروباوەڕە

مرۆڤدۆستیەوە و لە ژێر ئاڵاکەیدا، ڕژێمەکانی (ستالین) ی سۆڤێت و (ماوتسی تۆنگ) ی چین و (پۆل پۆت) ی (خمێری سور) ی کەمبۆدیا، دەیان ملیۆن مرۆڤی هاوبیری خۆیان و دژەبیری خەڵکی وڵاتەکانیان بە شێوازی جۆراوجۆر لەناوبرد. تەفسیری توندڕەوانە، یەکلایەنە، یەکئاراستە و یەک ڕەنگ، بۆئاین و ئاینزاکان، هەروەها بۆ بیر و ئایدیۆلۆجیە تێکڕاییەکان (مارکسیزم، سەرمایەداری، نەتەوەپەرستی..) کەسانێک بەرهەم دێنن کە خۆیان بە سپی و پاک دەزانن و، دنیای دەرەوەی خۆیان بە ڕەش و کرێش یا نەزان و گومڕا دەزانن. تێگەیشتنی نەزانانە و بیرتەسکانە لە دەقە ئاینی و نائاینیەکانی بیر وهزر، پەیڕەوانێک دادەتاشی کە لە نێوان ڕەش و سپی دا ئەو هەموە ڕەنگەی (کەوانە ڕەنگینە) ی دوای باران نابینن. ئەوان وەک ئەوەی لە تونێلێکی تەسک دا بن هەر پێشی خۆیان دەبینن، کادیری ئایدیۆلۆجی و ئاینی و سیاسی سەرکوێری کردون و ناتوانن و نایانەوێ ڕەنگە جیاوازەکانی تر ببینن.

## پەیوەندیی پارتی لە گەڵ ئێران:

پارتی هەر زو لە گەڵ دروستبونی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە گێڕی حەمە ڕەزا شا و ساواکەوە گۆڕی بۆ گێڕی خومەینی، پەیوەندیە هەمەلایەنەکانی لەگەڵ ڕژێمی نوێی ئیسلامیی ئێران دروست کرد و توندوتۆڵ کرد. هەر زو کۆمەڵەی ئێران هەستی بە مەترسیی پارتی کرد و توانی زۆرینەیەک لە ناو نوێنەرانی کوردی ئێران دا دروست بکات بۆ بەندی هەشتی داخوازیەکانی گەلی کورد لە نوێنەری حکومەتی کاتیی ئێران (مەهدی بازرگان) لە مهاباد کە داوای دەرکردنی چەکدارەکانی پارتی (قیادە موەقەتە) دەکات لە کوردوستانی ئێران، بەڵام (حدکا) دژی ئەم بەندی هەشتە بو. لە کۆنفرانسی گەلان لە تارانیش کە نوێنەری زۆر لە حیزب و ڕێکخراوە سیاسی یە ناوچەیی و سەرتاسەری یەکانی ئێرانی تێدا بو بە زۆرینەی دەنگ بڕیارێک لە دژی قیادەی موەقتە پەسەند کرا، (حدکا) دژی ئەم بڕیارەش بو چونکە دەیویست خۆی لە شەڕی پارتی لابدا، بەڵام دوایی ئەو شەڕە هەر یەخەی گرت. ئەوەبو لە مانگی ٩ ی ١٩٧٩ کە هێرشی کۆماری ئیسلامی لە پاوە وە دەستی پێکرد پارتی لە گوندی (دزلی) ڕێگەی گرت لەو چەک و تەقەمەنییەی حیزبی دیموکرات ناردبوی و دەیویست بیگەیەنێ بە (پ.م) کانی لە پاوە، ئەمە یەکێ لە هۆکانی شکان و پاشەکشەی (پ.م) کانی (حدکا) بو بەرامبەر هێرشی پاسداران. چەکدارەکانی پارتی هەمان ڕۆلی

پشتگیرکەری هێزە هێرشبەرەکانی کۆماری ئیسلامیان بینی لە مەیدانەکانی شەڕ لە نەغەدە و خانێ و شنۆ. کاتێک شاری شنۆ کەوتە ژێر دەسەلاتی قیادە موەقەتە خەلکی شار خۆپیشاندانێکی ناتوندوتیژانەیان دژی چەکدارەکانیان کرد و ئەوانیش تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد و شەش کەسیان لێ کوشتن و یازدە کەسیان لێ بریندار کردن. کە لە بەهاری ١٩٨٠ خولی دوهەمی شەڕی ئێران لە دژی کورد دەستیپێکردەوە، چەکدارانی پارتی هێرشیان کردە سەر (پ.م) کانی (حدکا) لە دزلی و ١٥ (پ.م) یان لێ شەهید و بریندارکردن و ڕێگای ستراتیجیی نێوان مەریوان وپاوەیان ڕادەستی ڕژێمی ئێران کرد. دواتر چەکدارەکانی پارتی لە کۆتایی بەهاری سالی ١٩٨١ وە یارمەتیی هێزە چەکدارەکانی ئێرانیان دا لە گرتنەوەی ناوچە ڕزگارکراوەکانی مەرگەوەر و تەرگەوەر ی سەر بە خانێ و شنۆ و نەغەدە کە لە ژێر دەسەلاتی (پ.م) کانی (حدکا) دا بون، چەکدارەکانیان بە کۆمەکی ئێران توانیان (پ.م) کانی (حدکا) لە شارۆچکەی شنۆ دەرپەڕێنن و شنۆ ڕادەستی ڕژێمی ئێرانی بکەنەوە. بەو خزمەتە گەورانەی پارتی ئەو پەیوەندیی خۆشەویستیەی پارتی وئێران گەیشتە لوتکەی خۆی و بە مانگی هەنگوینی (شهر العسل) لە شنۆ کۆتاییهات، بەو بۆنەیەوە ئیدریس بارزانی وتارێکی سیاسیی بۆ خەلکی شنۆ دا. پارتی بۆ گرتنی شنۆ بەهانەی ئەوەی هێنایەوە گوایە لە ناوەڕاستی مانگی ٦ ی ١٩٨١ بە پیلانی حیزبی دیموکرات تەرمی مەلامستەفای بارزانی لە گۆڕەکەی هێنراوەتە دەر بە مەبەستی ڕادەستکردنەوەی بە ڕژێمی سەدام. دواتر دەرکەوت ئەو سندوقەی تەرمەکەی تێدابو بە داخراوی وساغی وەک خۆی لە نزیکەی بیست مەترێک ئەولاترەوە دانرابو. زۆرترین گومان لە سەر ئێران بو کە بکەری ئەو کارە دزێوە بو بێت بۆ ئەوەی بەهانەی تۆلەسەندنەوە لە (حدکا) بداتە دەست بنەمالەی بارزانی. بە پێی بیرەوەریەکانی (ئەحمەد بانیخێلانی، چاپی دوهەم، لاپەڕە ٣٨١ بۆ ٣٨٥) حیزبی شیوعی هەولێکی زۆری لەگەل پارتیدا دابو کە شەڕی گرتنەوەی شنۆ نەکەن. ئەحمەد بانیخێلانی لە لاپەڕە ٣٨٣ دا دەنوسێت: «لە سەرەتادا چومە (نواوێ) شەو لای شەهید قاسملۆ مامەوە، قاسملۆ گوتی هەوالی تەئکیدمان هەیە کە ئێرانیەکان فشاریان خستۆتە سەر پارتی کە شاری شنۆ یان بۆ بگرن، تۆ کە ئەوان دەبینی تکایان لێبکە کە ئەم کارە نەکەن و پەیمانی ئەوەشیان پێ بدە با شنۆ هەر بەناو بەدەستی ئێمەوە بێت و ئەوان ئازادانە کار و هاتوچۆی خۆیانی تیا بکەن، بەلام با ئەم هێرشە نەکەن و زیاتر دەستمان نەچێتە خوێنی یەکتر».

## پەیوەندیی یەکێتیی نیشتمانی لە گەڵ ئێران:

بەپێچەوانەی پارتیەوە پەیوەندیەکانی نێوان (ینک) و حکومەتی ئێرانی ئیسلامی بەردەوام لە هەڵکشان وداکشاندا بو، زۆرترین کات نەباش یا خراپ بو. بێگومان یەکێتی هەوڵی دەدا پەیوەندیی لەگەڵ ئێران باش بێت چونکە پێویستی پێی بو، بەلام بەمەرجێ پەیوەندیەکە زیان بە شۆڕشی کوردوستانی ئێران نەگەیەنێت، ڕاگرتنی ئەم هاوسەنگیە گەلێک سەخت بو. (ینک) بوبوە جێی متمانەی سەرجەم ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیی دژی سەدام و نێو زەنگی کردبوە پایتەختی ئەو ئۆپۆزیسیۆنە، بەلام لە هەمان کاتدا لە خەباتی ڕۆژانەیدا وەک هێزێکی کوردوستانی ڕەفتاری دەکرد، بۆیە هیچ سەیر نە بو هەر لەسەرەتای دروستبونی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە پشتگیریی هەمەلایەنەی شۆڕشی کوردوستانی ئێرانی کرد. (ینک) لە پایز و زستانی ١٩٨٢ ڕاستەوخۆ و بە ئاشکرا وەک (هێزی پشتیوان) لە شەڕەکانی بەرگری لە سەرکردایەتیی (حدکا) لە ناوچەی سەردەشت و خانێ بەشداریی کرد و ئەم پشتیوانیە گەیشتە ترۆپکی خۆی و پتر لە سەد (پ.م) ی قارەمان و فەرماندەی سەربازیی یەکێتی لەو شەڕانەدا شەهید بون. جەلال تاڵەبانی خۆی لە گوندی (ساوان) وە سەرپەرشتیی شەڕەکەی دەکرد. هاوڕێی تێکۆشەرم د.کەمال کە لە گەرمیان (پ.م) بو، لەگەڵ هێزێکی گەورەدا بە سەکردایەتیی سامان گەرمیانی بە پەلەیەکی زۆر وەک هێزێکی فریاکەوتن لە گەرمیانەوە هاتن و بەشداریەکی کاریگەری ئەو شەرانەیان کرد. ئەم بە هاناهاتنە پێشمەرگانەیە ی یەکێتی بۆ حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە، یارمەتیی سەرکردایەتیی هەردو حیزبەکەی دا بەشێوەکی ڕێکوپێک بەرەو سنوری کوردوستانی عێراق پاشەکشەبکەن و نەهێڵن بەڵگەنامە و کەل وپەلە گرنگەکانیان بکەوێتە دەست ڕژێمی ئێران. هەڵوێستی ئێرانی ئیسلامی بەرامبەر یەکێتی لە ساڵەکانی ١٩٧٩ تا ١٩٨٥هەڵوێستێکی گوماناوی و دڕدۆنگ بو. پێموایە بۆ ئێران یەکێتی نیشتمانی ئەو ئە سپە بەهێز و سرک و کێویە بو لە هەمو مەیدانە گەرمەکانی خەباتی کوردایەتی سمکۆلانی دەکرد، کە دەوروبەر ئارام دەبۆوە ئەم هەر لە سمکۆلان و ئامادەباش دابو بۆ هەمو ئەگەرەکان بە ئەگەری شەڕی دەستەویەخەشەوە. ئاوابو یەکێتی و (پ.م) کانی یەکێتیی ئەو ساڵانە! ئەسپە شێیەکی ڕامنەکراو ی سنور و لەمپەرنەناس! یەکێتیی ئەو ساڵانە پەکەکەی ئێستا بو! لە ساڵی ١٩٨١ لیبیا ی قەزافی وسوریای (حافظ الأ سد) لە ڕیی ئێرانەوە بڕێکی زۆر چەک و تەقەمەنیی سوک و ناوەند وقورسیان ناردبو بۆ یەکێتی، بەلام ئێران

دەستی بەسەراگرت و جگە لە چەند دەمانچە و کلاشینکۆفێک نەیان هێشت هیچی تر بگاتە دەست یەکێتی. کاتێک وەفدێکی ڕەسمیی حکومەتی سوری هەوڵدەدات بۆ ئەوەی ئێران چەکەکان رادەستی یەکێتی بکات، لێپرسراوێکی گەورەی ئێرانی بە وەفدە سوریەکەی وتبو: (ئێوە نازانن! واباشە کورد لە دەمانچە گەورەتری نەبێت).

## گەڕانەوەمان بۆ شارباژێڕ

دوای تەواوبونی کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە بەیانیەکی مانگی شەشی ١٩٨١ لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر و دەستەکەیدا نێوزەنگمان جێهێشت و بە پیادەڕێ خۆمان گەیاندە بلەکێ و چەند ڕۆژێ لەوێ ماینەوە. ئینجا بلەکێ مان جێهێشت و بە سێ سەعاتێک پیادەڕەو چیای سورکێومان بڕی و بە (هەورازی سورەبان) دا داگەڕاینە خوارەوە، (دێی سورەبان) ی وێران وچۆڵکراو یەکەم دێی کوردوستانی عێراق بو هاتە ڕێمان، لە چەمەکەی بەردەمیەوە پەڕینەوە و بە نیو سەعاتە ڕێیەک گەیشتینە دێی (چاڵە خەزینە) کە دواگوندی ئاوەدانی شارباژێڕ بو ڕژێم چۆڵی نەکردبو. لە پێش مزگەوتی دێ پیاوک (پ.م) کانی دودو بەماڵەکاندا دابەشکرد، من و بەکری حاجی سەفەری بەیەکەوە لە ماڵێکدا دامـەزرا ند و پێکەوە نانی نێوەڕۆمان خوارد. پاش حەوانەوەیەکی باش لە مزگەوتی دێ بە پێ کەوتینەوە ڕێ، بە دێی (قەلاتێ) دا تێپەڕین و لە چەماوەکە پەڕینەوە و خۆمان گەیاندە گوندی پـاڕەزان. بەکری حاجی سـەفەر بردمیەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، ژن و منداڵەکانی بەکری حاجی سەفەر بە رویەکی خۆش و دڵێکی فراوانەوە خزمەتێکی شایستەیان کردم. چەند ڕۆژێک لە پـارەزان لە ماڵی بەکری حاجی سەفەر مامەوە، ئینجا کەوتینە گەڕان بە گوندەکانا.

## پاسۆك (پارتی سۆشیالیستی کورد)

کاژیک (کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوە و یەکێتیی کورد) لە ١٤ ی ٤ ی ١٩٥٩ لە کوردوستانی عێراق دروستکرا، کاژیک لە شۆڕشی ئەیلولدا وەک ڕێکخراێکی نیوە ئاشکرا و نیوە نهێنی بەشداربو. پاسۆک لە دوای ئاشبەتاڵی شۆڕشی ئەیلول و هەڵوەشانەوەی ڕێکخراوی دایک (کاژیک) وەک میراتگری (کاژیک) لە مانگی ٩ ی

١٩٧٥ دروستكرا، پاسۆكیەكان هەڵگری بیری نەتەوەیی بون و لە دوای ئاشبەتاڵ پێشمەرگەیان ناردە ناو شۆڕشی نوێ كە (ینك) دەستی پێكردبو. دروشمی پاسۆك (كوردوستانێكی ئازاد و گەلێكی یەكسان) بو. كە من ١٩٧٩ بوم بە (پ.م) بنكەیەكیان لە دراوی دۆڵەتو هەبو لە پاڵ (حسك)، پێشتر بارەگاكەیان لە شێنێ بو لە نزیك بارەگاكانی سەركردایەتیی یەكێتی، دیاربو لەگەڵ دروستبونی (حسك) پاسۆك یش لە ڕوی سیاسیەوە لە یەكێتی دوركەوتبونەوە. پاسۆك حیزبێكی بچوك بو، جگە لە شاربازێڕ و لە ناو شاری سلێمانی و كەركوك، لە شار و دەڤەرەكانی تری كوردوستان (پ.م) و ڕێكخستنی نهێنیان زۆر كەم هەبو یان هەر نەیان بو.

## نەتەوەیی بون ئاوایە؟

سالی ١٩٨١ سالێكی پڕ لە شەڕ بو، شەڕی براكوژیی نێوان یەكێتی لە لایەك و پارتی و (حسك) لە لاكەی تر. ڕۆژی ٢٢ی ٦ ی ١٩٨١لە دێی (مامەخەلان) لە شاربازێڕ شەڕ لە نێوان دو دەستە (پ.م) ی پاسۆك و یەكێتی دروستدەبێ، دو(پ.م) ی پاسۆك و یەك (پ.م) ی یەكێتی دەكوژرێن. بۆ ڕۆژی دوایی پاسۆك لە دێی (گەرە دێ) ی نزیك سیتەك (پ.م) كانیان كۆدەكەنەوە، پەنجە لە سەر پەلەپیتكەی تفەنگەكانیان دادەنێن و خۆیان مەلاس دەدەن بۆ (پ.م) ی یەكێتی. بە ڕێكەوت دەستەیەك (پ.م) ی یەكێتی كە لە حەوت كەس پێكهاتبون، بێتاوان وبێئاگا لە ڕوداوەكە ی مامەخەلان، لە سیتەكەوە دێن بەرە و گەرەدێ، هەر كە دەگەنە ناودێی گەرەدێ پاسۆكەكان لە تۆڵەی دوانەكەی خۆیاندا دەسرێژیان لێدەكەن و لە ماوەی چەند خولەكێكدا هەر حەوتیان دەكوژن، یەكێ لە كوژراوەكان فەرماندەی كەرت و كادیری كۆمەڵە (مامۆستا جەمال عەزیز پێنجوێنی) بو كە باوكی چەند منداڵێك بو. پاسۆك خۆی بە حیزبێكی نەتەوەیی و دڵسۆز دەزانی، بەردەوام نەفرەتی لە شەڕی براكوژی دەكرد و لە سەر شەڕی براكوژی ڕەخنەی لە هەمو حیزبەكانی تر دەگرت. كەچی لەو یەكەم تاقیكردنەوەیەدا دەرنەچو و هەڵەیەكی گەورەی كرد. ئەویش هەمان كاردانەوەی هەڵچون و توڕەیی و ناعەقڵانیەتی حیزبە بەشداربوەكانی تری شەڕی براكوژیی نیشاندا.

## ڕێکەوت و شانس، تۆڵەسەندنی کوێرانە

چەند (پ.م) و کادیری تری یەکێتی و حیزبەکانی ترلەو ڕۆژە ڕەشانەدا ئاوا بێتاوان و بێئاگا، ڕقی کوێری حیزبایەتی دڕندانە بەسەریاندا ڕژێنرا و کوژران. ئێستا کە بیر دەکەمەوە لەو ڕۆژە مەترسیدار و تا ریکانە، دەشیا و دورنەبو منیش یەکێک بومایە لەو حەوت (پ.م) بێتاوانەی لە گەڕەدێ کوژران، چونکە منیش پێشتر دەیان جار چوبومە ناو دێی گەڕەدێ و ئەو گوندانەی تر کە (پ.م) کانی تێدا کوژرابون. هەر واش بو، هاوپیشەم (دوکتۆر مەجید هەولێری) لە شەڕی (حسک) لە دەڤەری هەولێر بەسەختی مێشکی بریندار بو و بە کەمئەندامی لە وڵاتی سوید جێگیربو. بەڕاستی ڕێکەوت و شانس لەگەڵ مندا بو!

یەکێک لە ناشرینترین و قیزەونترین و دڕندانەترین نەریتە خێڵەکیەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری و گەلانی خۆرهەڵاتی ناوەڕست بەگشتی تۆڵەسەندنەوە یە. تاوانترین جۆرەکانی تۆڵەسەندنەوە ئەوەیە کاتێک لە بری سزادانی قانونیانە ی خودی بکەری ڕاستەوخۆی تاوانەکە، تۆڵەسەندەوەکە لە خزم وکەسی بێگوناهی تاوانبارەکە دەکرێت. حیزبە کوردیەکان ئەم نەریتە ناڕەوا و دڕندانەیان بێ دەسکاری هێنایە ناو خەباتی خۆیانەوە. بێگومان ئەمە هەمان نەریتی حزبی بەعسیش بو کە کەس و کاری (پ.م) یان لە بری (پ.م) کە خۆی نەفی و زیندانی دەکرد و ئازاریان دەدا. نازیەکانی ئەڵمانیای هیتلەریش هەمان نەریتیان لەگەڵ پارتیزانە دوژمنەکانیان پیادە دەکرد.

## لە مارکسەیەتدا شتی وا هاتوە ؟

ڕۆژێـک لە هاوینی ١٩٨٠ لەگەڵ دەستەکەی بەکری حاجی سەفەر لە دێی (گوێزەڕەش) ی پاڵ (پارەزان) بوم، دوای نانی ئێوارە پێخەفمان لە خانەخوێکانمان وەرگرت و بەرەو پشتی دێ بۆ بناری شاخەکە ملمان نا. لە تاریکایی شوێنەکەدا بۆ تەختاییەک دەگەڕاین بیکەین بە ژێرڕاخەرمان بۆ پشودان و خەوتن، لایتمان زۆر بەکارنەدەهێنا بۆ ئەوەی کەس نەزانێ لە کوێدا خەوتوین! (عەبدول وەندەرێنەیی) فەرماندەی مەفرەزە و شـارەزا وچاوساغمان بو، دوای گەڕانێکی زۆرنەیتوانی شوێنێکی تەختانی و لەبارمان بۆ بدۆزێتەوە تیا بسرەوین و بخەوین، شوێنەکە زۆر بەردەڵان بو. (عومەری دەرویش عەبدوڵای پێنجوێنی) کە (پ.م) یە کی بەتەمەنی

ڕەبەن بو، زۆر قسە خۆش بو و پیاوێکی کۆمەڵایەتی بو، گەیشتە تینی و بە دەنگی بەرز چەند جنێوێکی تەڕ و بڕی بە (مارکس) و(لینین) دا، ئینجا ڕوی دەمی لە من کرد و بە تێکەڵەیەک لە گاڵتە و بیزاری پرسی «باشە دوکتۆرهەژار توخوا ئەمە حاڵە؟ باشە لە مارکسەیەتدا شتی وا هاتوە مرۆڤ شوێنێکی تەختی دەست نەکەوێ بۆ خەوتن؟». لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بە پێ هەمو گوندەکانی شارباژێڕی تەخت مان بەسەرکردەوە، لە هەمو گوندێکدا شوێنێکیان بۆ تەرخاندەکردم بۆ بینین و چارەسەری نەخۆشی خەڵکی گوندەکان.

## نەخۆشخانەی پارەزان

لەگەڵ زۆرتر سەرقاڵبونی ڕژێم بە شەڕی ئێرانەوە چالاکیی (پ.م) زۆرتر دەبو، بەهۆی ئەمەوە برینداریشمان زۆرتردەبو، شارباژێر ئیتر وەک ناوچەی ڕزگارکراو سەیردەکرا، ڕژێم تەنیا لە ڕێی فڕۆکە جەنگیەکانیەوە دەیتوانی زیانمان پێبگەیەنێ. ئیتر پێویستیی دروستکردنی نەخۆشخانە لە شوێنێکی نزیک لە چالاکیەکانی (پ.م) هاتە ئاراوە. لە کۆتایی بەهاری ١٩٨١دوای جەولەیەکی چەند هەفتەیی گەڕاینەوە بۆ پارەزان. دوکتۆرقادر تازە لە سەرکردایەتی گەڕابۆوە، من و دوکتۆرقادر و بەکری حاجی سەفەر دوای ڕاوێژکردن و باسکردنی دۆخەکە، هاوڕا بوین لە سەر کردنەوەی نەخۆشخانەیەک لە پارەزان، پێکەوە بڕیاری کردنەوەی نەخۆشخانەیەکمان دا، ئەوە لەو دۆخەدا بڕیارێکی بوێر و پێویست بو. لە مانگی تەموزی ١٩٨١ خانوە چۆڵەکەی ناو دێی (پارەزان) کە پێشتر بنکەی تەندروستیی حکومەتی بو و دواتر بە هۆی بونی بەردەوامی (پ.م) لە ناوچەکەدا حکومەت چۆڵی کردبو، بە هاوکاریی (پ.م) و خەڵکی دێ کەموکورتیەکانمان چاککردەوە وئاوەدانمان کردەوە، ژورێکیش مان دانا بۆ پشودان وژیانی خۆمان. هەمو نەخۆشە قورس و بریندارەکانی ناوچەکانی شارباژێڕ و پێنجوێن و شارەزور و هەورامان و قەرەداغ و گەرمیان دەهێنرانە ئەم نەخۆشخانەیە و دەمانخەواندن، دواتر ئەوانەی بۆ تەواکردنی چارەسەریان پێویستیان بە ئێران بو، دوای جێگیرکردنی باری تەندروستیان دەمان ناردن بۆ ئێران. پێکەوە لەگەڵ دوکتۆرقادر و کارمەندی پزیشکی دوکتور شاخەوان (غەفور کەرکوکی) و دواتر (هیوا محەمەدئەمین ئەردەلانی) ی خوشکەزام و (ستار کەرکوکی) کە بە (جیهانگیر) ناسرابو نەخۆشخانەکە مان دەبرد بەڕێوە. جارێک مامۆستا

جەمالی حاجی محەمەد کە کادیری پیشکەوتوی کۆمەڵە بو نەخۆشیی گورچیلەی هەبو، زوزو دەهات بۆ دەرزی لیدان. جاریک داوای لیکردم فیری دەرزیلیدانی بکەم. جوتیاریک هات دەرزیی لیبدەم منیش بە هەلم زانی لەسەر دەم پالمخست و پیش لیدانی دەرزیەکە لە سمتی، بە پەنجە پیشانی مامۆستا جەمالم دەدا دەرزیەکە لە کویی سمتی دەدریَ، کابرا لە پڕ هەستایە سەرپێ و وانەوتنەوەکەی پێ بڕیم و نەیهێشت دەرزیەکەی لیبدەم، بە تورەیی و بێزاریەوە وتی: "چیە دوکتۆر هەژار دەتەوەیَ لەسەر قونی من خەڵک فیری دوکتۆری بکەیت؟ "

## پەپولە و فیشەك!

رۆژیکی هاوینی ١٩٨١ لە ناکاو (تانیا) ی تەمەن چوار سالی کچی بەکری حاجی سەفەریان هێنا بۆ نەخۆشخانە، خالیکی تانیا گولەی دەمانچەکەی لە دەست دەرچوبو و بەر تانیا کەوتبو، بەداخەوە برینەکەی کوشندەبو، کە گەیشتە لامان بە دواهەناسەکانی ژیانی سلاوی لیکردین. لەگەڵ ئەو هەوڵە زۆرەی دامان لە گەڵی نەمان توانی ژیانی رزگاربکەین، زۆر غەمم بۆخوارد. تانیا پەرەی ناسکی گولالە سورەیەکی تازە گەشاوەی بەهاری کوردوستان بو، پەپولەیەکی نەشمیلانەی رەنگاورەنگ بو، هێشتا چێژی شیلەی ژیانی نەکردبو، لە زیندانی تاریک وتەنگی رژێمی سەدامدا لە دایکبوبو، بە باڵە تەنکەکانی تازە ئاشنای فرینی ئازادانە بوبو لە ئاسمان و مێرگ و باخچەکانی کوردوستانی دایکیدا، ئاخر ئەوی پاکتر و ناسکتر و بێگوناهتر لە فریشتەکان چۆن دەیتوانی بەرگەی ئەو فیشەکە زبر و رەق و بێرەحمە بگرێت؟ بۆ چەند کاتژمێرێک مردنەکەیم شاردەوە و بە ناراستەوخۆ پێموتن کە مردوە، چونکە دەترسام لەوەی خالی کە فیشەکەکەی لە دەست دەرچوبو شتێ لە خۆی بکات.

## هەواری خالی!

لە کۆتایی مانگی ٧ ی ١٩٨١محەمەدی حاجی مەحمود وەک سەرکردەی هێزێکی چەکداری (حسک) تازە گەڕابۆوە ناوچەی سروچکی شارباژێڕ و ناڵپارێز، بە گەڕانی بە گوندەکاندا ناوچەکەی گرژ و  نا ئارام کردبو، مەفرەزەیەکی هێزەکەی دو (پ.م) ی (ینک) ی چەک کردبو. من بە تەنیا لە ناودێی پارەزان مابومەوە، چاوەڕێی خێزانەکەمانم

دەکرد لە سلێمانیەوە بێن بۆلام. شەو محەمەد دەستەیەک لە (پ.م) کانی خۆی ناردە سەر دێ و کەوتنە ئازاردانی لایەنگرانی یەکێتی، لێدانێکی زۆری جوتیاری دێ و ئەندامی کۆمەڵە (عوسمانی حاجی فەرحان) یان کرد، داوای چەک وفیشەکیان لێدەکرد کە پێشتر محەمەد لای ئەو دایانابون. ئەوان بەدوای منیشدا دەگەڕان و داوای (ویزی) کەیان لە من دەکرد کە کاتی خۆی محەمەد دابوی بە من و منیش دابوم بە (ئەبو شەهاب). بە هاوکاری و جوامێری و وەفای خەڵکی دێ، بەتایبەتی شێخ حەسەنی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوێخای دێ، هەروەها بە ڕاوێژ و ڕێنمایی ڕاستەوخۆی کافی خانی هاوژینی بەکری حاجی سەفەر، توانیم بە تەنیا بەو شەوە ئەنگوستەچاوە بە ناو دڕک وداڵ و پەرژینەکانی دێدا خۆم دەربازبکەم و لە چەمەکەی بەردەم پاڕەزان بپەڕیمە وە وبگەمەوە بە (پ.م) ە کانی خۆمان لە دێی قەڵاتێ. بۆ بەیانی کە خێزانەکەمان هاتبون بۆ لام، بە سەر هەواری خاڵیدا کەوتبون. کاتێک ڕوداوەکەیان بیستبو زۆرسەرسام و غەمباری کردبون و بە ناچاری بێ ئەوەی بتوانن من ببینن گەڕابونەوە سلێمانی.

## شان بە شانی پاسدارانی ئێران ؟

لە ڕۆژانی ١٥ و ١٦ ی ٩ ی ١٩٨١ هێزێکی هاوبەشی ١٢٠٠ کەسی کە پێکهاتبو لە: (حسک) بە سەرکردایەتیی محەمەدی حاجی مەحمود، پارتی بە سەرکردایەتیی (نادر هەورامی و عبداللە ئاغا) و هەروەها پاسۆک بە سەرکردایەتیی (مولازم شوان کەرکوکی)، لەگەڵ هێزێکی ١٥٠ کەسیی پاسدارانی ئێران بە تفاق و کەلوپەلێکی زۆری جەنگیەوە، لە شاخی (سورین) وە هێرشێکی فراوانیان کردە سەر سەنگەرەکانی یەکێتی لە گوندی (ڕەزڵە)ی نزیک شارۆچکەی (ناڵپاریز) و شاخەکانی دەوروبەری. شەڕێکی قورس و خوێناوی بەرپابو، دیل و بریندار و کوژراوی زۆری لێکەوتەوە. شەڕەکە بە شکانی هێزە هاوبەشەکەی پاسدار و (حسک) و پارتی و پاسۆک کۆتایی هات. ئێمە لە نەخۆشخانەکەی پاڕەزان توانیمان بە باشی و بێجیاوازی چارەسەری برینداری هەمو لایەنەکان بکەین. برینداری یەکێتیی و (حسک) و پارتی و پاسۆک بێ هیچ کێشەیەک لە تەنیشت یەکەوە خەواندبومانن. برادارێکی پارتی ناوی (عەلی) بو برینەکەی سەخت بو، کوڕی پیاوێکی کوڵهەڵگری (حەماڵ) گەڕەکی ئازادی (خانوە قوڕەکان) ی سلێمانی بو.هەردو هێلکە گونی بە دەمارەکانیانەوە شۆڕ بوبونەوە، تیمارێکی باشی برینەکەیم کرد و کیسەیەکی نوێم لەو پێست وگۆشتی ژێرپێستەی بە

ساغی مابنەوە بۆ هەردوو گونی دروست کرد و جوان دوریمەوە. عەلی چیترخەمی شەڕی نەمابو، پارتی و سیاسەتی لەبیرچوبۆوە و هەمو بیر و هۆشی لای هێلکەگونەکانی بو، خەمی مانەوەی توانای نێرێتیەکەی بو. دایک و باوکی عەلی هاتن بۆلای بۆ پارەزان، دیاربو ڕێکخراوی پارتی لە ناوشار وایان تێگەیاندبون دۆخی کوڕەکەیان زۆر خراپە و یەکێتیەکان ئازاری دەدەن. بەڵام کە بینیان دۆخی باشە و تیماری باشمان کردوە و مرۆڤدۆستانە ڕەفتاری لەگەڵ دەکەین، ئارامبونەوە و شەو لامان مانەوە. ڕێزێکی زۆرمان لێگرتن و دڵنیامان کردنەوە کە ژیانی کوڕەکەیان پارێزراوە، باوکی عەلی زۆر لۆمەی عەلیی کرد و پێی گوت: «ڕۆڵە من تۆم بۆ ئەوە ناردە دەرەوە کە برای خۆت بکوژیت ؟»، بۆ بەیانی بە غەم و بە دڵێکی شکاوەوە گەڕانەوە سلێمانی. فەرماندەی کەرتی چواری جەباری حەمە ڕەش (شێخ محەمەد) فیشەکێک لای چەپی دەم و لێو و لاچاوی هەڵدڕیبو، بە شێوازی matressing کە لە کاتی پزیشکیم دا لە سلێمانی فێری بوبوم، برینەکەیم زۆر جوان بۆ دوریەوە. ئەم عەمەلیاتە سەرکەوتویەی عەلی و (شێخ محەمەد) زۆر سەرنجی دەوروبەری ڕاکێشا. حەمە ڕەش یەکێک بو لە سەرکردە سەربازیە پاڵەوانەکان کە بەداخەوە لە ڕاپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ لە لایەن (موجاهیدینی خەڵک - ئێران) وە کە بەرگریی سەربازیان لە ڕژێمی سەدام دەکرد، لە نزیک توزخورماتو شەهیدکرا. دواتر کە بریندارەکانی پارتی چاکبونەوە و ئازادکران، سوپاس و پێزانینی خۆیان بۆ ئێمە لای لێپرسراوەکانیان دەربڕیبو، بریندارەکان سەرسوڕمانی خۆیان دەربڕیبو بەرامبەر بەو ڕەفتارە باش و مرۆڤدۆستیەی ئێمە لەگەڵیان کردبومان. دیارە کادیر و بەرپرسەکانی پارتی بە پێی پەروەردەی حیزبایەتیی پارتی وایان لە (پ.م) سادەکانی خۆیان گەیاندبو کە (پ.م) کانی یەکێتی و بە تایبەتی (پ.م) کانی کۆمەڵە وەک دڕندە وان. دوای شکستی ئەو هێرشە گەورەیەی پارتی و هاوپەیمانەکانی لە شەڕی ڕەزڵە، ئیتر دەسەڵاتی یەکێتی لە هەمو شارباژێردا چەسپا و بنجی قایمی خۆی داکوتا.

## کۆن دەبێت، بەڵام بیرناچێت !

لە مانگی حوزەیرانی ۲۰۰۹ کۆڕێکیان لە شاری (میونیخ) ی ئەڵمانیا بۆ گێڕام. کۆڕەکە بۆ ناساندنی بزوتنەوەی گۆڕان بو کە تازە دروستکرابو و بەڕیوەبو بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردوستان لە ۲۲ ی ۷ی ۲۰۰۹. دوای تەواوبونی

کوڕەکە کوڕێک هاتە لام لێی پرسیم: «تۆ دوکتۆر هەژارەکەی پاڕەزانی ؟ «، وتم بەڵێ، باوەشی پێداکردم و ئەملاولای ماچکردم. خۆی پێناساندم کە یەکێک بوە لە (پ.م) دیل و زامدارەکانی پارتی لە شەڕی ڕەزڵە دا. ئەو بە بیری هێنامەوە چۆن لە نەخۆشخانەکەی پاڕەزان ئێمە بە باشی و مرۆڤدۆستی چارەسەرمان کردبو و ڕەفتارمان لەگەڵ کردبو. دوای ٢٧ ساڵ ئەو کوڕە وەک دوێنێ بێت ڕێزێکی زۆری لێگرتم، سوپاسێکی زۆری کردم و بانگێشتی کردم بۆ خواردن. ئاوایە وەفای ئینسانی سادەی گەلەکەمان. کاری باشە لەبیرناچێت و گوم نابێت و دێتەوە ڕێت، زو یا درەنگ، کاری خراپیش هەروەها! چی دەچێنیت، هەر ئەوەش دەدوریتەوە.

## دوکتۆر قادر حەمە شەریف گێلدەرەیی

دوکتور قادر پەیمانگەی دەرمانسازی لە بەغدا تەواو دەکات و لە سلێمانی لە پیشەکەی خۆیدا دادەمەزرێ. دوای پەیوەندیکردن بە ڕێکخستنە نهێنیە کانی کۆمەڵە لە هەڵەبجە و نواندنی چالاکیی ڕێکخراوەیی، پەستان و گوشین لەسەری زیاد دەکات و لە ساڵی ١٩٧٨دەبێت بە (پ.م). دوکتۆر قادر پیاوێکی بوێر و ئازابو، تۆپێکی چڕوپڕ بو لە وزە و توانا، خاوەنی سەلیقەی جۆراوجۆر بو، نەسرەوت وچالاک بو، ڕوخۆش و کۆمەڵایەتی بو. لە یەک کاتدا چالاکیی ڕێکخراوەیی بۆ کۆمەڵە دەکرد لە دێهاتەکاندا، لە گەڵ (پ.م) کانی شارەزور و هەورامان چالاکیی سەربازیی دەکرد. سێ جار بریندار بوە، جاری یەکەم لە ٢٨ شوباتی ١٩٧٩ لە گوندی (ناوگردان) نزیک سەید سادق، جاری دوهەم لە ٧ی تەموزی ١٩٧٩ لە شاری مەریوان، دواجاریش لە مانگی ٢ی ١٩٨١ لە هەڵەبجە. دوکتۆرقادر دوکتۆری خەڵک و (پ.م) بو. لە کاتی پشودان لە ناو بنکەکاندا ڕێکخەری ئیشەکانی بنکە بو، بێ ئەو نە خواردن بە ڕێک و پێکی دروستدەکرا، نە پاک و خاوێنی ڕادەگیرا، نە سەربانەکان لە بەفر پاکدەکرانە وە و نە دەگێڕدران بە بانگردێن، ئەو ڕێکخەری گشتیی هەمومان بو. دوکتۆرقادر برایەکی بەناوی (عەبدول) (پ.م) بو، براگەورەکەشی بە ناوی (محەمەد) چالاکوانێکی زرنگ و باوەڕپێکراوی (کملک) و یەکێتی بو لە ناوشاردا. لە کاتی وتوێژی یەکێتی لەگەڵ ڕژێمی سەدام د.قادر نوێنەرمان بو لە شارەکان بۆ بەڕیوەبردنی ئیش و کاری (پ.م) نەخۆش و بریندارەکانمان. لە کاتی وتووێژدا بە دەسپێشخەریی ئەو پێکەوە لەگەڵ دوکتۆرشاخەوان و هیوا و (عەبدولی شۆفێر) کەوتینە کوتانی منداڵانی گوندەکانی

شاربازێڕ. له ١٩٨٥ دوکتۆر قادر بوبه (ئاڵای شۆڕش) و نوێنه‌ریان له ئێران. پاشان له سوید جێگیر بو و له سه‌ر لیستی پارتی ژینگه‌ی سویدی وه‌ک ئه‌ندامی یه‌ده‌کی په‌رله‌مانی هه‌رێمی هه‌ڵبژێردرا، هه‌روه‌ها جێگری قسه‌که‌ری سه‌رۆکی ئه‌نجومه‌نی شاره‌وانی (مێۆندال) ی سه‌ر به شاری (یۆته‌بۆری) یه له سوید.

## تراجیدیای کاوه حه‌مه ساڵح پێنجوێنیی پێشمه‌رگه و هونه‌رمه‌ند

گومان و ڕه‌فتاری نادۆستانه‌ی ئێران ی ئه‌و ساڵانه به‌رامبه‌ر (ینک) ته‌نانه‌ت بواره ئینسانیه بێلایه‌نه‌کانیشی گرتبۆوه. ئێمه هه‌ندێ جار ناچار ده‌بوین بریندار‌ه سه‌خته‌کانمان و نه‌خۆشه قورسه‌کانمان که به خۆمان چاره‌سه‌ر نه‌ده‌کران و مه‌ترسیی مردن و که‌مئه‌ندامبونیان له سه‌ربو، بیاننێرین بۆ ئێران بێگوێدانه ئه‌وه‌ی له‌و کاته‌دا په‌یوه‌ندیه‌کانی ئێران و یه‌کێتی باشه یا خراپه چونکه چاره‌یه‌کی ترمان نه‌بو! سیروان لێت ده‌م ده‌مبه‌یت و لێشت نه‌ده‌م هه‌ر ده‌مبه‌یت! ڕۆژی ٢٢ ی ١٠ی ١٩٨١ له نه‌خۆشخانه‌که‌ی بله‌کێ بوم که له ناو دێوه هاتن به‌دوامدا بۆ لای (پ.م) یه‌کی زامدارمان به ناوی (کاوه حه‌مه ساڵح پێنجوێنی). کاوه تازه له شاربازێڕه‌وه به ئێستر هێنابویان، ئێش و ئازاره‌کانی جه‌رگی ده‌تاوانه‌وه، بێژنگی جه‌سته‌ی له چه‌ند شوێنێکه‌وه تنۆک تنۆک خوێنی لێده‌چۆڕا. له هه‌موی کاریگه‌رتر بریندار‌بونی ده‌ماری سه‌ره‌کیی پشتی بو که بوبو به‌هۆی لاوازبون و خاوبونه‌وه‌ی ماسولکه‌ی میزدانی و لاقه‌کانی، بۆیه نه ده‌یتوانی به پێوه ڕاوه‌ستێ و بڕوا، نه ده‌یتوانی میزبکات. خێرا هه‌مو برینه‌کانیم پاککرده‌وه و تیمارم کردن، ئینجا سۆنده‌یه‌کی یه‌کجاربه‌کارهێنان م له چوکه‌وه بۆ ناو میزدان دانا و به‌مه میزه گیراوه‌که‌ی به‌ربو، ده‌رزیی دژه به‌کتریا و دژه ئازارم لێدا. من له‌وه زیاترم بۆنه‌دکرا، بۆیه به کامه‌رانی برایم وت هه‌رچی زوتره ده‌بێت بیبه‌یت بۆ نه‌خۆشخانه‌یه‌ک له‌شارێکی گه‌وره‌ی ئێران.

کاوه له ساڵی ١٩٨٢ له ڕێی ئێران و سوریاوه ده‌گاته سوید و له‌وێ خێزان دروست ده‌کات، ئێستا له سوید له‌گه‌ڵ هاوژین و دو منداڵه‌که‌یدا ده‌ژی و کارده‌کات. سرودی پڕله‌غه‌می (ئه‌گه‌ر وتیان هه‌واری کاروانی ئێوه بۆ چی دوره ئه‌گه‌ر وتیان داروبه‌ردی وڵاته‌که‌ی له مه‌ر ئێوه بۆچی سوره) له نوسینی شاعیر (ڕه‌زا حه‌مه فه‌ره‌ج)، کاوه له به‌هاری ١٩٨٨ دوای کیمیابارانی هه‌ڵه‌بجه و به‌و بۆنه‌یه‌وه، له سه‌رکورسیه تایه‌داره‌که‌یه‌وه له مه‌یدانێکی ناوه‌ڕاستی ستۆکهۆلم به ده‌نگێکی به‌سۆزه‌وه چڕی

و زۆرکـاری کرده سـەر ئامـادەبوان. ئەمە چیرۆکی کاوەیە بێ دەسکاریکردنی ناوەڕۆکەکەی، لە شەوی ١٣ ی ٧ ی٢٠١٥ بە مەسینجەر بۆی ناردم و زۆر سوپاسی دەکەم، فەرمو خوێنەری هێژا:

"لە بەرەبەیانی ١٩ی١٠ی١٩٨١ لەناوچەی شارەزور لە دێی قاجر بە ساروخی هێلیکۆپتەری ڕژێمی سەدام بریندار کرام و دوای شەڕێکی سەخت شەهید فەرەیدون ی برام ومامۆستا شاهۆ و چەند هاوڕێ یەکی تر منیان بە کۆڵ هەڵگرت و کەمێک دوریان خستمەوە و مامەوە بە برینداری هەتا شەو. دواتر بەتراکتۆر و بێ گوێدان بە مەترسیەکانی سەر ژیانی خۆیان لەسەرجادەی سەرەکیی نێوان سەیدسادق و سلیمانی پەڕاندمیانەوە بۆ گوندی کانی سپیکەی پەرخ. شەومان بەڕێکرد و بەیانی هێزەکەمان گەڕانەوە بۆ شـارەزوور. کامەرانی برام و ڕەحمەتی دوکتور ساجد و چەند (پ.م) ی تر کە نازانم کێ بون، بەداخەوە من بێ ئاگابووم، ئیتر بەڕێ کەوتین و لە دۆلی گەلاڵ مام ڕۆستەم و بەکری حاجی سەفەرهاتن بەدەنگمانەوە. دوای سەختیەکی زۆرو بەئازارێکی زۆرەوە لە سەر پشتی ئێستر گەیاندیانمە بلەکێ. لەوێ منیان بردە ماڵی ڕەحمەتی کاک جەمال جەلال، هاوڕێی ماندونەناسم دوکتۆرهەژار هەندێ پێویستی بۆ ئەنجام دام. ئیتر دواتر کامەرانی برام منی گەیاندە سەردەشت و دواتر بۆ سەقز و ئینجا بەرەو شاری ورمێ. بەگەیشتنمان بۆ ورمێ و لە ناو سەربازگای ئەوشارە، کامەرانی برام بەچاوبەسراوی گرتیان و سوپای پاسداران بردیان. ئیتر منێکی تازە بریندارو ماندو بردمیانە ماڵێک وابزانم بارەگا بو، چەند کەسێکی لێبو بە قسەی ناشرین و سوکایەتی ڕەفتاریان لەگەڵ کردم. چەند ڕۆژێک مامەوە نازانم چەن بو، دواتر یەکێک لەوانە زۆر تورە بو لە هاوڕێکانی و منی بردە نەخۆشخانەی ورمێ. ئیتر من بە دەستبەسەری لەلایەن پاسدارانەوە لەسەر جێگا کەوتم بێ ئەوەی هیچ چارەسەرێک بکرێم. بێ هاوکاری تەنانەت نەم ئەتوانی نانیش بخۆم، لەوێ برادەرێکی سوشیالیست بە ناوی (کاک سابیر ئاڵیاوایی) زۆر بەتەنگمەوە بو، تەنانەت ئەگەر بۆی بکرایە نانی ئەکرد بەدەممەوە، مامەوە هەتا ١٨ یان ٢٠ ڕۆژێـک. هەتا ڕۆژێک کەسێک هاتـە تەنیشتمەوە و وتـی کاکە تۆیت بردارەکەی یەکیتی ؟ وتم بەڵێ، وتی من ناوم (سـەلاح) ە و خەڵکی کەرکوکم، لە ساڵی ١٩٧٤ وە لێرەم و لە خەستەخانە کاردەکەم، ئەمەوێت یارمەتیتان بدەم چی بەمن ئەکرێت؟ وتم ئەگەر ئەتوانن بمگەیەننە تاران و لە ئوتێل پارس نوێنەرمان هەیە، نەم ئەزانی کێ بو نوێنەر، دوکتۆر فوئاد مەعسوم بو یان کەسێکی کە. بەهەر

حاڵ وتی تۆ دەست بەسەریت ئەگەر توانیم ئەو کارە ئەکەم. ئیتر بۆ بەیانی هات و منی بەدزیەوە خستە ناو ئامبولانس و بەرەو تاران بەڕێکەوتین، دوای ١٥ بۆ ٢٠ سەعات منی گەیاندە تاران. هەرچۆن بو ئوتێل پارسی دۆزیەوە و (مامۆستا موحسن ئەکبەر) نوێنەری یەکێتی بو لە تاران، خەبەری کردەوە کە بێت یا رمەتیمان بدات. کاتێک کە هاتە دەرەوە ئەوەی لەبیرم بێت وتی ئێمە بەینمان تێک چووە لەگەڵ ئێران و هیچم پێ ناکرێت و ئەبێت ئێمەش بگەڕێینەوە بۆ سەرکردایەتی، ئیتر ئەو برادەرە توڕە بو و پێی وت وەرە سەرێکی دارەمەیتەکەم لەگەڵ هەڵبگرە. ئەوەندەی بیرم بێت چەن نەخۆشخانەیان بردم هیچ کەس منیان وەرنەگرت، ئینجا مامۆستا موحسن ئەکبەر وتی تەنها ئومێدێک کە مابێتم نەخۆشخانەیەکە لەسەروی تاران کە پەرەستارێک ی ناسیاوم لەوێ کاردەکات، لەوانەیە بتوانێت یارمەتیمان بدات. کە گەیشتینە نەخۆشخانەکە ئەو خانمە زۆر مەردانە منی وەرگرت و بە کاک سەلاحی وت من لەسەر جێگایەک دای ئەنێم و ئەیبەمە ناو ڕێڕەوەکە، ئیتر ناتوانم خۆم بکەمە خاوەنی. چار نەبو ڕازی بوین، هەر سێکیان بە ناچاری منیان بەجێ هێشت بێ زمان و بێ دەسەڵات. ئیتر پاش کەمێک لەوێ چەند کەس هاتن و بە فارسی پرسیاریان کرد تۆ کێ هێناویتی و کێیت و لەکوێوە هاتویت، من کە نەم ئەتوانی وەڵامیان بدەمەوە ئیتر کەوتنە سوکایەتی پێکردنم تەنانەت یەکێک لە پاسدارەکان تفێکی لێ کردم وای ئەزانی من سەربازی عێراقیم و دیلم، دواتر بۆی ڕون بۆوە. ئیتر چەن ڕۆژ بەو شێوەیە منیان پشت گوێ خست لەناو ژورێکی بچوکدا کە وابزانم پێشتر تەوالێت بو. نازانم و چۆن بو لەپڕ دیم مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم) هاتە لام، بیرم نیە چیی پێ وتم و چۆن منی دۆزیبۆوە ئەوەندەم لەبیرە وتی من بەرەو ئەڵمانیا دەچم. ئیتر من بەبێ چارەسەر هەروا بە بێ لێپرسینەوە و لەسەر جێگا مامەوە، هەمو گیانم بوبە برین تەنانەت گەیشتە سەر ئێسکم. ئیتر وردە وردە چەن هاوڕێیەک منیان دۆزیەوە و لەوانە شەهید (عەبدوڵا بچکۆل) بو کە بە یەک دەسەوە چەند ڕۆژ خزمەتی کردم و پاکی کردمەوە، دواتر (حاکم قاسم کۆیی) هاتە لام و ئەویش زۆر خزمەتی کردم، دوای ماوەیەک کاک (دلێری سەید مەجید) هات و وتی هەوڵ ئەدەم هەرچۆن بوە بەرەو سوریات بەرێ بکەم، هەڵبەتە ئاسان نەبو چونکە لە فرۆکە خانە نەیان ئەهێشت بەتەنیا بڕۆم. ئیتر کە کارەکەم تەواو بو توانیان پسولەیەکی سەفەرکردن (لیزەپاس) ێکم بۆ دروست بکەن.هاوڕێی خۆشەویستم کاک (هیوای حاجی ئەحمەدی ئایش ناسراو بە کاردۆیی) ئەیویست بچێتە ئەڵمانیا بەڵام لەبەر من ڕێگاکەی گۆڕی

و بەرێزیان و کاک (شۆڕشی شەهید عەلی عەسکەری) لەگەڵم هاتن بەرەو سوریا، منیان بردە نەخۆشخانەی سەربازی. کاک (ئەمیری ئازیز برای شەهید سەلاحی موهەندیس) دو مانگ دڵسۆزانە شەو و ڕۆژ خزمەتی کردم کە ئەو دڵسۆزیە هەرگیز ناتوانم پاداشتی بەمەوە، لەسوریاش هەر بێ چارەسەر مامەوە. ئیتر دوای دوومانگ منیان بەرێ کرد بەرەو سوید و ڕاستەو خۆ بۆ خەستەخانە. ئەو سۆندەیەی کە بۆ میزکردن د. هەژار بۆی دانابوم کە ئەوە تەنها لە چەن ڕۆژێک زیاتر نابێت بەکار بێت، لە سوید بە پارچە پارچەیی دەریان هێنا لە ناو میزەڵانمدا، نزیکەی دوساڵ و دوای چەنەها نەشتەرگەریی برینەکانی پشتم و لەشم توانیان لە مردن ڕزگارم بکەن. ئیتر ماوەی ٣٤ساڵە من لەم وڵاتە ئەژیم و هەستم نەکردوە کە مرۆڤێکی کەمئەندامم. ئیتر هەرچیم کردوە و بەسەرهاتوە تەنها من بە ئەرکی سەرشانمم زانیوە بەرامبەر بە گەل و نیشتمانم و سوپاسی هەموو ئەو ئازیزانە ئەکەم کە خەم خورم بون و یارمەتیان داوم. دوکتور گیان لەبەر ئیهمالی، هیچ کەس لە خەستەخانە نەهات بەلاما تەنانەت هەر لەسەر جێگا خۆشم پیس ئەکرد، کەس نەبو پاکم کاتەوە تەنانەت ئەوهەمو کاتە چەرچەفی سەر جیگاکەم یەک جار شەهید عەبدووڵا گۆری و یەک دو جاریش حاکم قاسم، ئیتر من یەک حەب چیە وەرم نەگرت لە خەستەخانە. لە مانگی ٣ی١٩٨٢ چومە سوریا و لە ٢٤ی٥ی ١٩٨٢گەیشتمە سوید)).

خوێنەری بەڕیز ئەم بەسەرهاتە مشتێکە لە خەرواری سەدان بەسەرهاتی هاوشێوە. ئاوا بو بەسەرهاتی ئێش و ئازاری ئەوانەی ئەم ڕۆژەیان دروستکرد!

## سەربازە هەڵاتوەکان

بەهۆی شەڕی ئێران و عێراقەوە وردە وردە دەسەڵاتی حوکومەتی عێراق لە ناوچەکاندا کەمتر دەبو، سەربازە کوردەکان لە کوشتارگاکانی شەڕی ئێران - عێراقەوە هەڵدەهاتن و پەنایان بۆ ناوچە ڕزگارکراوەکان دەبرد. بە پێی توانای خۆیان لە گوندەکاندا ژوریان دروستدەکرد یا لە ماڵی خزمەکانیان لەو گوندانە دەژیان و چاوەڕێی دۆخەکەیان دەکرد تا بزانن چیی لێدێ. کادیرێکی کۆمەڵە کە ئێستا ئەندامی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیە و وەزیریشە ڕقی لە سەربازی هەڵاتو بو و ڕێزی نەدەگرتن. دەیوت ئەمانە لە ژێر سایەی ئێمەدا دەژین، ئێمە پاسەوانیان دەکەین، (پ.م) کانمان کە ژیانی ئەمانە دەبینن، لە خەبات سارد دەبنەوە، بە تایبەتی کە لێبوردنێکی

گشتی ڕادەگەیەنرێ زۆربەیان خۆیان بەدەستەوە دەدەن و دەگەڕێنەوە ناو شارەکان و ئەمەش هەر زیان بە ورە ی (پ.م) کان دەگەیەنێ. من بە پێچەوانە وە دەموت دەبێ ڕێز لە سەربازی هەڵاتو بگرین، ئەم بەڵگانەم بۆ دەهێنایەوە: ئەگەر سەرباز هەڵنەیەت دەبێت لە پێناوی ڕژێمی سەدامدا لە شەڕی ئێراندا یا لە شەڕی دژی خۆماندا بکوژرێت یا بریندارکرێت یا بە دیل بگیرێت، سەربازە هەڵاتوەکان ئاوە دانیی گوندەکان زیاتردەکەن، کەس وکاریان لە شارەوە دێن بۆ لایان و ئێمە دەتوانین لە ڕێی کەس وکاری ئەوانەوە پەیوەندیمان بەشارەوە بەهێزتربکەین، زۆریان بانگێشتی (پ.م) کانمان دەکەن بۆ خواردن و حەسانەوە، ڕێکخستنیان تیا دروست دەکەین، هەندێکیشیان دوای ماوەیەک دەبن بە (پ.م) لە ڕیزەکانماندا، یا دێنە ناو ڕێخستنەکانی یەکێتی و کۆمەڵە وە، لە هەندێ شوێنیشدا بەشداردەبون لە هێزی بەرگریی میللی گوندەکان کە بۆ بەرگریی چەکدارانە لە گوندەکان دروستکرابون، هەندێکیشیان دەچن بۆ دەرەوەی وڵات و ئەمەش لە کۆتاییدا هەر بە سودی گەلەکەمان تەواودەبێت. بەهۆی ناوچە ڕزگارکراوەکانە وە هەزاران سەربازی کورد و عەرەب و نەتەوەکانی تر لە کوشتن و زامداربون و بەدیلگیران لە بەرەکانی شەڕی ئێران وعێراق ڕزگاریان بو. هەزارانیشیان لە ڕێی ئێرانەوە خۆیان گەیاندە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژاوا و مافی پەنابەریان وەرگرت، بونە هاوڵاتیی ئەو وڵاتانە و وەک سامانێکی نەتەوەیی بەنرخ مانەوە بۆ گەلەکەمان.

## محەمەد مەجید: پاڵەوانە گومناوەکان !

کات ئێتر مانگی ١٢ ی ١٩٨١ بو، لە نەخۆشخانەکەی پاڕەزان بوم، لە گوندی (ڕەزڵە) وە ناردیان بەدوامدا بۆ چارەسەری (پ.م) (فوئاد عەبولە هەورامی) کە لە شەڕێکا لەگەڵ پارتی لە گوندی (گوڵانی حاجی مەحمود ی سەر بە ناحیەی وارماوا) بە سەختی بریندارکرابو. دوای تێڕوانین و تیمارکردنی برینەکانی بڕبڕەی پشتی، بۆم دەرکەوت دەماری سەرەکیی پشتی (الحبل الشوكی) و دەمارەکانی کە لێی دەبێتەوە پێکرابون، بۆیە نەیدەتوانی میزبکات، ئەمە بوبوە هۆی میزگیران و پڕبونی میزدانی لە میز. لە تاو ئێشی پشتی و بەشی خوارەوەی سکی (بەرمیزدان) دەیناڵاند. دەرزیەکی دژەئێشی بەهێزی (پەسەدین) م لێدا، سۆندەی بۆریی میزم پێبو کە بە هەتوانی زایلۆکایینی دژە ئێش چەورم کرد، لە چوکەوە بەرەوژور پاڵم پێوەنا بۆ ناو میزدان،

میزەکە بە تەوژمێکی بەهێز بە ناو لولەکەدا هاتە دەرەوە، ئازارەکانی بڕێک هێواش بۆوە. ئینجا برینەکانیم پاککردەوە و دوریـم.ەوە و جوان دامپۆشین. بڕێکی باش دەرمانی دژە بەکتریا و دژەئازارم م پێدا. برینەکانی زۆر و کاری بون، بۆم دەرکەوت بۆ ڕزگارکردنی ژیانی دەبێت هەرچی زوترە بیگەیەنینە شاری (بانە). مەلا بەختیار کادیری باوەڕپێکراو و جەربەزەی کۆمەڵە (مامۆستا پێشڕەو) ی وەک سەردەستە لە گەڵ دو (پ.م) ی تردا ناردبو کە تا جێی مەبەست لەگەڵماندابن. لەگەڵ گزنگی بەیانی دا هەستاین و دوای نان و چا خواردن کەوتینە خۆسازدان. بە دو داری ڕاستە چنار و لق و چڵی درەخت، لەگەڵ پشتوێن و قایشێ پشت دەستەبەرەیەکی گواستنەوەی بریندارمان دروستکرد، فوئاد مان خستەسەری، بە پشتوێن بە دەستەبەرە کەمان بەستەوە، بە درێژی خستمانە سەر ئێستریێک و بە ناو بەفر و قوڕ و چڵپاوی ناوچەی ڕەزڵە و سروچک دا بەرەو سنوری ئێران ملی تولە ڕێگاکانمان گرت. دوای هەشت نۆ سەعات پێڕەوی و وچان و پشودان لە گوندەکانی سەررێمان، کە گەیشتینە دوا گوندی چۆڵنەکراوی سەر سنور (چاڵە خەزێنە) ئیتر پاشنیوەڕۆ بو. چاڵە خەزێنە لە پشتی چوارتایە و چۆماوێک لە دێی چۆڵکراوی سورەبان جیای دەکاتەوە. دێی سورەبان لە دامێنی هـەورازی کووڕ و پشتشکێنی (سورەبان) دایە کە یەکێکە لە لوتکەکانی زنجیرە چیای سورکێو، ئەودیوی سورکێو ئێرانە. لە ماڵی جوتیارێک دامەزراین بە ناوی (محەمەد مەجید)، خۆی و ژنەکەی بە میهرەبانی وەک برا و خوشکێک خزمەتێکی زۆریان کردین، محەمەد مەجید ویستی پێم بسەلمێنێ شەو لە ماڵەکەیدا بمێنینەوە و بەیانی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتن لە هـەورازی سورەبان بدەین. نیگەرانیی ئەو لە جێێ خۆیدابو، گەواڵە ی هەورە سپی و خۆڵەمێشیەکان ئاسمانیان داگیرکردبو، بەفر و ورد ورد دەباری و ئەگەری ئەوە هەبو بگۆڕێ بە کرێوە، تا خوار ئەژنۆ بەفر هەورازی سورەبانی داپۆشیبو، بە دیوی ئەودیوی هەورازەکەشدا کە ئێران بو، وامەزەنە دەکرا لەوێ بەفرەکە لە سەرو ئەژنۆ وە بێت. محەمەد مەجید ی بەئەزمون و شارەزای زستانی ئەو شاخ و کێوانە، دەترسا لە ڕێگا لە سەرما ڕەقبینەوە، نیگەرانی منیش لە جێی خۆیدابو، چونکە دەترسام بەفرەکە زۆرتر بێت و بۆ چەند ڕۆژێک ڕێگەمان لێبگرێ و بەمە ژیانی فوئاد بکەوێتە مەترسیەوە و بمرێت. محەمەد مەجید کە بۆی دەرکەوت من پێداگری لە سەر ڕۆشتن دەکەم، بێ ئەوەی من ڕاستەوخۆ یا بە هێما و ناڕاستەوخۆ تکای لێبکەم لەگەڵمانا بێت، بڕیاری دا بێت لەگەڵمان. جلی گەرم وگۆری لەبەرکرد و پوزەوانەی لە پێکرد، بە ژنەکەی وت بڕێکی

زۆر هەنگوین و ڕۆنەکەرەی خۆماڵی و نان بپێچێتەوە. ئێسترەکەی خۆی و ئێسترێکی تریشی لە ناودێ بۆ پەیداکردین. دوای تیماری برینەکەی و پێدانی دەرمانی دژەئێش و دژە هەوکردنی بەکتریایی، فوئادمان دانایەوە لە ناو دەستەبەرە کە و نامانە سەر ئێستریکیان، ئیستری دوهەممان بە بەتاڵی هێشتەوە بۆ ئەگەری پەککەوتنی ئێستری یەکەم. بە شەودا مانەوە لەبەفردا بە برینداریکی سەختەوە یاریکردن بو بە ژیان، لە ڕێگادا نەدەبو ڕاوەستین، ژیانمان بەسترابۆوە بە درێژەدانی ڕۆشتن بەرەو پێشەوە، بزوتن وجولاّن گەرمایی بە جەستە دەبەخشن!

محەمەد مەجیدی پاڵەوان و دڵسۆز و هاوغەممان جڵەوی ئێسترەکەی گرت و بە بێدەنگی کەوتە پێشمان، بۆ ئەگەری پەککەوتنی ئێستری یەکەم، ئێستری دوهەممان وەک جێگرەوەی، بە بەتاڵی دایە پێش خۆمان. بە پێ بەناو چەمی بەفراوی سورەبان پەڕینەوە. دوایین سواڵە و تاوە بێتینەکانی خۆر جارناجار لە نێوان گەواڵە هەورەکانەوە سەرەتاتکێ و چاوبرکێ یەکی دڵدارانەی لەگەڵ دەکردین و دڵی خۆشدەکردین، بەلاّم بەداخەوە بەرە و ئاوابون دەچون. تارمایی هەورازی بە بەفر داپۆشراوی سورەبان وەک خێوێکی سپیی ترسناک لە بەردەم مانا قوت بوبۆوە و هەڕەشەی مەرگی لێدەکردین، وردە وردە نیگەرانی و ترسەکانم زیاتر دەبون.

## خواستی مردن !

من لە هەمو ژیانی پێشمەرگایەتیمدا یەکجار ئاواتم خواستوە کە بمرم، ئەویش چەند مانگێ پێشتر بو لە کاتی هەڵگەڕانێکی ترم بو بە سەر ئەم هەورازی سورەبانەدا. ئەو جارە بە خۆم و کۆلەپشتێ دەرمان و کتێب و کلاشینکۆفێک و شەش مەخزەنی پڕ لە فیشەکەوە بەم هەورازە نەگریسەدا هەڵدەگەڕام. لەو کاتەدا زۆر ڕەشبین و بێ هیوا و لە ژیان بێزار بوم. ئاواتم دەخواست کۆپتەرێکی جەنگیی ڕژێم بێت و پڕاوپڕ یەک ساروخی تەواوم پێوە بنێ بۆ ئەوەی بێ ئێشی درێژخایەن و پەککەوتەیی ناوجێ لە یەک چرکەدا بمکوژێ و لەو ژیانە کولەمەرگیە ڕزگارم بکات، هەندێ جار مردن ڕزگاربونە لە ئێش و ئازارە زۆر و بێکۆتاییەکان. دەبێت ددانی پێدابنێم زۆرتر نائومێدیی سیاسی و نەبونی ئاسۆیەکی ڕونی سەرکەوتن بو کە لەو چرکەساتەدا ئەو حەزی مردن و نەمانەی لا بەهێزکردبوم، نەک بە تەنیا ماندوبون و سەختیی پرۆکێنەری سورەبان و تاڵیە مادیەکانی تری ژیانی پێشمەرگایەتی بەگشتی. بەلاّم

ئەم جارەیان ریک بە پێچەوانەوە بو، هەمو جەستە و ڕۆحم ورە و وزە بو بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کاروانە بچۆکەلەیە و گەیشتن بە ئامانج، کە ڕزگارکردنی ژیانی ئینسانێک بو! تازە یەک لە سێی هەورازەکەمان بڕیبو کە ئیتر تاریکایی داهات. بە منداڵی بیستبوم (شەو قەڵای مەردانە)، لەم شوێنکاتە پڕلە مەترسیەدا ئەم پەندەم بەبیرهاتەوە و ترسەکانمی کەمکردەوە.

## بەرە لە تەنکی دەدڕێ !

ڕێک وابو! ئا لەم دەمی ڕۆژئاوابونەدا شتێکی سەیر و چاوەڕواننەکراو و پارادۆکس، لە هەمان کاتدا پێکەنیناوی ڕویدا: ئێستری دوهەم پەکی کەوت و چیتر نەیدەتوانی بە هەورازەکەدا سەربکەوێت، ورەبەردان و ڕوخانێکی سەیر بو، هەر ئەوەندەمان زانی ڕوی وەرگێڕا و بەرەو خوار ملی شۆڕکرد و لە ناوەڕاستی هەورازەکەدا جێیهێشتین. ئەو ئێسترەی وەک (ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش) بە بەتاڵی دابومانە پێش خۆمان و کەسمان دڵمان نەدەهات سواری بین و ماندوی بکەین، ئاوا لەو تەنگانەیەدا جێیهێشتین.

## سێ جار تەوێڵیم ماچ کرد!

ئێستری یەکەم ئارام ئارام بەکاوەخۆ و بە شێنەیی، بێ وەستان درێژەی بە ڕەوتی خۆیدا تا گەیاندینیە ئەو شوێنەی پێی دەڵێن (کەلە گۆم)، ئەم شوێنە نزیک لوتکەی سورەبانە، بریتیە لە چەند دارگوێز و داربییەک بە ڕاسەری کانییەکی سازگارەوەوە. کە گەیشتینە کانیەکە هەناسەیەکی قوڵی سەرفرازیم هەڵکێشا، بەرامبەر بەو ئێسترە بەهێز و ئارام و پشودرێژە کە ژیانمانی لە مەترسی دەربازکرد هەستم بە ڕێز وسۆز و خۆشەویستی و سوپاسگوزاریەکی زۆر ڕاستگۆیانە و گەرم وگوڕکرد، بۆیە لە خۆشیاندا خۆبەخۆ سێ جار تەوێڵیم ماچکرد. لە سەر کانیەکە پشویەکی نیوسەعاتیمان دا، ئا لیک و ئاومان دا بە پاڵەوانی یەکەمی ئەم سەفەرە، خۆیشمان تێر نان و هەنگوین و ڕۆنەکەرەی خۆما لیمان خوارد و ئاوی ساردی کانیەکەمان کرد بە دوایاندا، ئینجا هەستاینەوە بۆ تەواوکردنی ڕێگاکەی لەبەرمان مابو.

ئێستر و گوێدرێژ و ئەسپەکانی کوردوستان وەک هاوڕێکانیان لە وڵاتانی

خواپێداو ناژین، ئەوانیش وەک مرۆڤەکانی کوردوستان ژیانێکی کولەمەرگی و کورت بەسەردەبەن. تەماشاکە ئێستا کە ساڵی ٢٠٢٠ چۆن پاسدارانی ئێران و ژاندارمی تورک (بۆ نمونە لە ڕوداوی ڕۆبسکی) لە سەر سنورەکان خوێنی خۆیان و خاوەنەکانیان پێکەوە دەڕێژن لەسەر ئەوەی بەدوای پارویەک ناندا لە سنورەکان کاری کڕین و فرۆشتن دەکەن.

## پێڵاوە لاستیکەکانی!

هێشتا نزیکەی دو سەعات ڕێگامان مابو بە ناو بەفردا بڕۆین تا دەگەینە یەکەم دێی ئێران (چەمپاراو) کە سەر بە شاری بانەیە. هەستاینە سەرپێ و خۆمان توندوتۆڵ کردەوە، بە دەستەبەرە وە فوئاد مان خستەوە سەر پشتی ئێسترە پاڵەوانەکەی هاوڕێمان. ئیتر شەومان بەسەردا هات، بەفر کەمێک ڕێگاکەی بۆ ڕۆشن دەکردینەوە و جارناجاریش لایتەکانمان لە ڕێگەکەدەدا. زۆر سارد بو، بەفری سەر ڕێگاکە بە ئاستەم ڕێگای دەداین لێی دەربچین، لە هەندێ شوێنا بەفرەکە دەبو بە تێکەڵەیەک لە سەهۆڵاو و بەفراوی پێ تەزێن. (ناسر) یەکێ بو لەو دو (پ.م) ی لەگەڵمان بون، جگەرەکێشێکی توندبو، خیزەی سنگی دەهات. یەکەم جار (ناسر) و ئینجا هاوڕێکەی کەوتنە بۆڵەکردن بەسەر مندا و تەشەری ئەوەیان لێدەدام گوایە من بۆ (پ.م) یەکی زامدار خەریکە چەند (پ.م) یەک دەدەم بە ڕەقبونەوە لەناو بەفردا. محەمەد مەجید قسەکەیانی پێناخۆش بو، بەرگریی لە من کرد و ئینجا وەک کۆمەکێک تفەنگەکەی لە (ناسر) وەرگرت و کردیە شانی خۆی. لەو کاتە ناسک و ناخۆشەدا منیش وەک (ناسر) و هاوڕێکەی شەکەت و ماندو بوم، لە سەرما خەریک بو دەتەزیم، خۆم گرت وهیچ وەڵامی ڕەخنە نارەواکەیانم نەدایەوە.

مامۆستا پیشرەو نمونەی ڕەوشتی شۆڕشگێڕانە و دڵسۆزی و ئارامی وئازایی بو. وادیار بو ئەویش ئەو ڕەخنە بریندارکەر و بێبەزەییەی (ناسر) و هاوڕێکەی لە منیان گرت پێی ناخۆش بو، بەڵام وەڵامی نەدانەوە. مامۆستا پێشڕەو هەروا بە دەم ڕۆشتنەوە هاتە پاڵم و بە دەنگێکی نزمی وا کە دو (پ.م) کە گوێیان لێنەبێ، کەوتە دڵدانەوەی من کە لە ڕەخنە نارەواکەی (ناسر) و هاوڕێکەی دڵم نەئێشێ چونکە ئەوان بڕێک خێڵەکی و ناتێگەیشتون. هەرچەندە ئەو سێ ساڵێک لە من گەنجتر بو بەڵام وەک باوکێکی میهرەبان یان برایەکی گەورە دڵنەوایی منی دەکرد. ئا لەو کاتەدا

مامۆستا پێشڕەو دڵخۆشیی منی دەدایەوە، لە ژێر تیشکی لایتەکەم و ڕوناکیی بەفرە سپیە بێگەردەکانا سەرنجم چوە سەر پێڵاوە لاستیکەکانی، هەردو پێ ڕوتەکەی لە ناو بەفراوی ناویاندا مەلەیان دەکرد، لەو شەوە کش و ماتەدا شڵپە شڵپیان بە سافی دەگەیشتە گوێم.

## مامۆستا پێشڕەو (ئاراس عەبدولڕەحمان عەبدوڵا)

ناڵێم چەند دیمەنێک لە ژیانی پێشڕەو بەڵکو دەڵێم چەند دیمەنێک لە خەباتی پێشڕەو، دەزانن بۆ؟ چونکە پێشڕەو وەک هەزاران تێکۆشەری گیانبازی تری ئەم نەتەوە کۆڵنەدەر و بەخشندەیە جگە لە خەبات بۆ کورد و کوردوستان، بۆ خۆیان وەک تاک هیچ نەژیان و هیچ خۆشیەکی ژیانیان وەک گەنجێک نەبینی و نەبیست و نەچەشت. پێشرەوەکانی کوردوستان بەناکامی سەریان نایەوە. بەڕاست تۆ بڵێی لاوێکی وا دڵگەرم و بەسۆز و هـەژاو، فەرهادئاسا چیرۆکێکی شەیدابونی تری جگە لە شەیدابون بۆ کورد و کوردوستانەکەی لـەدوای خۆی جێنەهێشتبێ؟ من پێشڕەوم ناسیبێ، باوەڕ ناکەم، داخۆ ئەو شیرینە کێبێت؟ بەتەمەنی شازدەساڵی کە لە قوتابخانەی ئامادەیی کشتوکاڵ لە بەکرەجۆ - سلێمانی وەردەگیرێ، ئیتر ئەم لە ڕێکخراوی کۆمەڵە دا وەک ئەندامێکی زۆر چالاک و بوێر و باوڕپێکراو دەکەوێتە خەباتێکی دەروێشانە. بەهۆی چالاکیە سیاسیەکانیەوە چەند جارێک دەگیرێ و لە زیندانەکانی ڕژێمدا توشی ئەشکەنجەی دڕندانە دەبێت. پێشڕەو دەبێتە ئەو پاڵەوانەی هەرگیز یەک وشە لە سەر هاوڕێکانی ناو ڕێکخستن نادرکێنێ. دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی لە ساڵی ١٩٧٩، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دا چالاکیەکی پێشمەرگانە لە ناو شاری سلێمانی بەسەرکەوتویی ئەنجام دەدەن، دوای ئەوە دەچنە شاخ و دەبنە (پ.م). پێشڕەو لە ساڵی ١٩٨٠ خولی کادیرانی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی بە سەرکەوتویی تەواو دەکات. ئەستێرەی پێشڕەو وەک کادیری خۆشەویستی کۆمەڵە و یەکێتی لە ناو (پ.م) و خەڵکی شارباژێڕ و گوندەکانی نێوان عەربەت و سلێمانی بە خێرایی دەکەوێتە درەوشانەوە. دواتر پێشڕەو لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١١ ی ١٠ ی ١٩٨٢ لە نزیک گوندی خەراجیان دەکەوێتە کەمینی جاشەکانەوە و بە زامداری دەگیرێ. دوای ئەوەی (دوکتۆر نەوزاد ساڵح ڕەفعەت) لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی نەشتەرگەریی بۆدەکات، پێشڕەو دەبرێتەوە قاوش.

دوکتۆر نەوزاد دەڵێت: «چەند ئەفسەرێکی ئەمن هاتبون بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا، یەکێکیان پێی وت: چەند (مخرب) ی ترت لەگەڵ بو(نوسەر: مخرب بە واتای وێرانکەر و کاولکەر دێت)، پیشڕەو بە توندی و تورەیی وەڵامی دایەوە و وتی: ئێمە (مخرب) نین ئێمە (پ.م)ی یەکێتین، ئەفسەرەکە لێی تورەبو و پەلاماری بوتڵە موغەزیەکەی (نوسەر: خۆراکاو) دا و لێیکردەوە و بەو بریندارییە بردیانەوە بۆ ئەمنی سلێمانی».

(دوکتۆر نەجات محەمەد یوسف) دەڵێت: «لە ژیانمدا قارەمان و خۆڕاگری وەک ئەم (پ.م) یەم نەبینیوە، بەو هەمو ئازار و خوێن و برینە قوڵەوە، لە سەر قەرەوێڵەکەیەوە بە کەلەپچەکراوی وەکو شێر بەگژ جەللادەکاندا دەچوەوە و لێیان توڕەدەبو».

ئازاد ی برای شەهید پێشڕەو دەڵێت: «دەستە دەستە خەڵکی ئەو گوندانەی پێشڕەو پێشمەرگایەتیی تیا کردبو، دەهاتنە ماڵمان و بە باوکمیان دەوت: ئەگەر مامۆستا پێشڕەو بە پارە ئازاد دەبێ ئامادەین چیمان هەیە بیدەین لە پێناوی ئازادکردنیدا، ئەو ڕۆژانـە هەستمان دەکـرد پێشڕەو تاجی شاهانەی خستۆتە سەرمان، ئای لە گەورەیی ئەو خەڵکە چیان بۆ کردین». لە مانگی یەکی ١٩٨٤ لە کاتی وتووێژی یەکێتی و ڕژێم بە پێی ڕێکەوتنێک، پێشڕەو لە گەڵ شازدە خەباتگێڕی تری سەر بە یەکێتی کە حوکمی ئیعدام بەسەریاندا سەپێنرابو ئازاد دەکرێ. پێشرەو دوای ئازادکردنی بە (مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد) دەڵێت: «ئەوەندە گەرمم، ئەوەندە ڕقم لەو ڕژێمە دەبێتەوە، ئەوەندە تاوان و کاری خراپی ئەو ڕژێمەم بینیوە، حەزدەکەم خۆم بتەقێنمەوە «. (ڕەزاقی حاجی ئەحمەد)ی هاوڕێی پێشمەرگایەتیی پێشڕەو دەڵێت: «جل و پێڵاوەکانی خۆی دڕابو، پینەی پێوەبو، کەچی کە لەلایەن کەس و کاریەوە جل و پێڵاو و پارەی بۆ دەهات دەیدا بە هاوڕێکانی». هاوڕێی پێشمەرگایەتیی پێشڕەو (حەسەن هەڵەبجەیی) دەڵێت: «مامۆستا هەرچیەکی لە شارەوە بۆ بهاتایە بێ وەستان دابەشی دەکرد بەسەرماندا، هەمو جارێک دەیوت: «هەق نیە (پ.م) گیرفانی هەبێت». مەخابن دواتر لە شەوی ٦ ی ٧ ی ١٩٨٤ لە سلیمانی بە دەستی کوردێکی جاسوسی ڕژێم شەهیدکرا، پێشڕەو هاتبو بۆ ماڵەکەی ئامۆژگاری و تەمێی بکات کە واز لە سیخوڕی و ئازاردانی خزم و کەسی (پ.م) بێنێ. ئای چەند جوامێر و ئازا و مەزن و خۆشەویست بویت پێشڕەوی مامۆستا، ئەی جوانەمەرگ !

## با بگەڕێمەوە بۆ شەوەکە

چیرۆکەکانی گیانبازیی خەباتگێڕانی شار و شاخی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە و یەکێتی کە کۆمەلانی خەڵکیان لە پشت بو لەم بیرەوەرییانەی مندا جێیان نابێتەوە، بۆیە با بگەڕیمەوە بو کاروانە بچوکەکەی خۆمان و شەوە بەفراویەکە. هەرچۆنێ بو بە شەکەتی و تەڕوتوشی، شەو درەنگانێک خۆمان گەیاندە گوندی چەمپاراو. خەڵکی دێ لە شیرین خەودابون، بەلام مزگەوتی لێبو. ماڵی شێخی چەمپاراو مان لە خەو هەستاند، بە ڕوی خۆش و سنگی فراوانەوە دەرگای مزگەوتیان بۆ کردینەوە، زۆپای داریان بۆ گەرمکرد ین. بەو خۆراک و خواردنەوەیەی کە ئامادە ولە بەردەستیان بو توینێتی و برسێتیان شکاندین. بۆ بەیانی تیمارێکی باشی برینەکانی فوئادم کرد و دەرزی دەرمانی دژی هەوکردن و دژەئێشم لێدا. بۆ چارەسەرکردن بە نەشتەرگەری بە جیبێکی لاندرۆڤەر لەگەڵی ڕۆشتین هەتا دێیەکی نزیک بانە. لەبەر خراپیی پەیوەندیی نیوان یەکێتی و ئێران نەمان توانی خۆمان لەگەڵی بچینە ناو بانە، بۆیە لەوێ مالاواییمان لە فوئاد کرد و بە شۆفێری جیبە کە ناردمانە ناو شاری بانە. خۆیشمان گەراینەوە بۆ بنکەکەمان لە بلەکێ و دوای چەند ڕۆژێ حەسانەوە گەڕاینەوە شاربازێڕ. فوئاد ئێستا لە سوید دەژی، با بزانین لەم نامەیەیدا کە لە ١٥ ی ٧ ی ٢٠١٥ بۆی ناردم، لە سەر ڕوداوەکە و بەسەرهاتی خۆی دەڵێ چی.

"من فواد هەورامی، لەساڵی ١٩٧٩ هاتمە دەرەوە، چومە ناو ڕیزی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، لە زستانی ساڵی ١٩٨١ جەولە مان ئەکرد لە ناوچەی شارەزور لەگەڵ کەرتی شەهید شەوکەتی حاجی موشیر و چەند کەرتێکی تر کە باش ناوەکانم لە بیر نەماوە. دوای دابەشبونمان بەسەر چەند گوندێکدا وابزانم ئەوەی ئێمە ناوی گوندی گولان بو، دەمەو ئێوارە بو، چەکدارەکانی پارتی ئەوکاتە بەینمان باش نە بو هاتن بۆ هەمان دێ و بو بە شەڕ لەبەینی هەردولامان، لە شەڕەکەدا ئێمە دو (پ.م) مان لێ شەهید بو بەناوی (یاسین) و (ڕێبوار)، دو کەسیشمان لێ بریندار بوو یەکێ لەوانە من بوم. من زۆر بە سەختی بریندار بوم، برادەران منیان بە بەلەم و تراکتۆرو هێستر گەیاندە شاربازێر. لەوێ دکتۆرێکی خۆمانی لێبو بەناوی دوکتۆر هەژار کەزۆر یارمەتی منی دا و منی لە مردن ڕزگار کرد. بەهەمان شێوە دانیشتوانی گوندەکان زۆر هاوکاری و یارماتی منیان دا. دکتۆر هەژار ئەیزانی کە برینەکانی من زۆر سەختە و لەوێ ناتوانێ چارەسەرم بکات چونکە پێویستیم بە نەشتەگەری هەبو، لەبەر ئەوە هەوڵی زۆری دا بەزوترین کات بمگەیەنێتە نەخۆشخانەی بانە لە ئێران. کە گەیشتمە

نەخۆشخانەی بانە بۆ رۆژی دواتر نەشتەگەریان بۆ من کرد، بەڵام گولەکە لەلای بربڕەی پشتم وەستابوو لە نەخۆشخانەی بانە نەیانتوانی نەشتەگەریەکەم بۆ بکەن، ناچار منیان ڕەوانەی نەخۆشخانەی تاران کرد، لەوێ نەشتەرگەری تریان بۆ کردم و گولەکەیان دەرهێنا. من زۆر سوپاسی دوکتۆر هەژارو خەلکی گوندەکان ئەکەم کە ژیانی منیان لە مردن ڕزگار کرد». دواتر فوئادیان گەیاندە سوید و لە شاری ئۆپسالا جێگیر بو. فوئاد خێزانی دروستکرد و ئێستا لەگەڵ هاوژین و منداڵەکانیا هەر لەوێ دەژی.

## ئۆخەی حەزارەت !

لەمانگی٣ ساڵی ١٩٨٢ لە گەڵ هێزێکی ٨٠ کەسی کە مەلا بەختیار و کاک (شەوکەتی حاجی مشیر) و (کاک حامدی حاجی غالی) سەرپەرشتیان دەکرد بەرەو چەمی گەڵاڵ کەوتینە ڕێ. پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ گوندی (بیوک) مان جێهێشت، بە ناو گوندی (قەویلە) دا تێپەڕین و بە ئاراستەی شارەزور کەوتینە ڕێ، بە خێراییەکی وا دەڕۆیشتین کە تاریکایی داهات ئینجا بگەینە دێی (کانیسپیکە) کە یەکێکە لە دەرگاکانی چونەژورەوەی دەشتی شارەزور. چاومان بە گڵۆپەکانی دێ ڕێشکەوپێشکەی دەکرد، ئەمە یەکەم دێی شارەزورە لەم جەمسەرەوە. هەمومان خۆمان وریا و گورجوگۆلکرد بۆ هەر پیشهاتێکی چاوەڕواننەکراو. خێرا چەند (پ.م) یەک نێردرانە سەر گردەکەی بەسەر ئاواییدا دەڕوانێ بۆ پاسەوانی و چاودێریی دەوروبەری دێ. بۆ دڵنیابونمان لە کاتی پەڕینەوە، چەند (پ.م) یەکی تریش بە کەمین نێردرانە نزیک جادەی قیری نێوان سلێمانی و هەڵەبجە کە بە دوریی دو سێ کیلۆمەترێک بە بەردەم (کانی سپیکە) دا تێدەپەڕێ. من لەگەڵ (حامیدی حاجی غالی) دا بوم، بردمیە دوکانی دێ، کاتێک گڵۆپی کارەبا و مریشکی بەستراو و بیبسی و ئایسکرێمی پێچراوەم بینی، بێ بیرکردنەوە هاوارم کرد و وتم (ئۆخەی حەزارەت). ناحەقم نەبو، چونکە چەند ساڵێک بو شتی وام نەبینیبو، جگە لەوە جیاوازیی نێوان (بیوک) و (کانی سپیکە)، جیاوازیی چەمی گەڵاڵ و شارەزور لە هەمو ڕویەکەوە زۆر گەورەبو. دواتر لە کۆڕ و دانیشتنەکانی (پ.م) ی ناوچەکەدا لە بۆنەی هاوشێوەدا (پ.م) کان بە پێکەنینەوە (ئۆخەی حەزارەت) کەی منیان دەوتەوە. دوای خواردنی نانی ئێوارە و حەسانەوەیەکی باش لە ماڵی دانیشتوانی گوندەکە، ئینجا بە وریاییەکی زۆرەوە لە جادە قیرەکە پەڕەینەوە و خۆمان گەیاندە

دێی (قوماش) کە چەند کیلۆمەترێک لەوبەری جادەکەوەیە لە دامێنی گردێکی بڕێک بەرزدا، شەو لەوێ ماینەوە. نزیکەی دە ڕۆژێک بە گوندەکانی شارەزورا گەڕاین، لەم گەڕانەدا جگە لە کاک شەوکەت و کاک حامید، کوڕانی بەئەمەک و دەرچوانی ڕۆژانی تەنگانە، هەردو فەرماندەی ئازای کەرت (مەحمود گەرمیانی) و (ئەحمەد شاتوانی) کە شارەزای بستبەبستی شارەزور بون ڕێپیشاندەر و چاوساغمان بون.

## تەنگانە بیرکردنەوەت فراوان دەکات

ڕۆژێک دو (پ.م) هاتن بە دوامدا بۆ چارەسەری فەرماندەی کەرت، ڕۆڵەی بەوەفا و ئازای گەلەکەمان (دلێر جاف)، ئەو لە ماڵێکدا لە دێی (ناوگردان) ی پاڵ شاری (سەیدسادق) نەخۆشی خستبوی و بەدەم ئازارێکی زۆرەوە دەیناڵاند. دوای پرسیار و تێڕوانین لە باری تەندروستیی بۆم دەرکەوت میزی گیراوە. هاتەوەبیرم کە ساڵی پارلە شەڕی ڕەزلەدا بنی هەردو هێلکە گونی برینداربوبو و خۆم تیمارم کردبو، دەمزانی میزەڕۆی سەرەکی بەو شوێنی برینەدا دەڕوات، بۆیە ئەنجامگیریی ئەوەم کرد ئەگەری بەهێزی هۆی میزگیرانەکە تەنگبونەوەی میزەڕۆ ی بێت بەهۆی برینە کۆنەکەوە. شیشی فراوانکەری میزەڕۆ ی تایبەت بەم حاڵەتەم پێنەبو، میزگیرانەکە چەند سەعاتێکی خایاندبو، لەوە زیاتر تەحەمولی نەدەکرد، جگە لەوەش شوێنەکەمان تەختانی بو جێی خۆشاردنەوەی تیانەبو، وە زۆر زۆر لە هێزەکانی ڕژێمەوە نزیک بو، ئەگەری ئەوە هەبو لەسەر نەخۆشیی (دلێر جاف) زانیاری بگات بە جاش و جەیش، کە بە دڵنیاییەوە دەبوە هۆی هێرشی گەورە و فراوان بۆ سەرمان، هێلیکۆپتەری جەنگیش دەهێنرایە سەرمان؛ بە نەخۆشێکی وا قورسەوە دەربازبون و ڕزگاربونمان زۆر ئەستەم دەبو. هەمو ئەم بیر و ئەگەرانە وەک بروسکە بە مێشکمدا تێپەڕین، خودایە چی بکەم؟ بەڕاستی هیچ شتێک نیە لە دونیادا هێندەی بیرکردنەوە و خەیاڵ خێرا و بێ سنور بێت! تومەز جگە لە بیرکردنەوەیەکی ڕاستەوخۆ و قوڵ و چڕ لە خودی کێشەکە کە میزگیرانەکەیە، شوێنێکی تری بیر وهۆشم، ئەوەی کە (سیگمۆند فرۆید) ی داهێنەری (شیکردنەوەی دەرونی) پێی دەڵێ (ناخۆئاگایی یا بێخۆئاگایی یا لاشعور)، سەرگەرمی هەمان کێشەیە. بە هەردوکیان پێکەوە: هێزە نادیارەکانی ئاگایی و نائاگایی قوڵایی دەرونم چارەیەکی کردەنی و باشیان دۆزیبۆوە کە ڕێک لەگەڵ بارە مەترسیدار و نالەبارەکەدا دەگونجا. بە خاوەن ماڵم وت هەرچی زوترە چەترێکم بۆ

پەیدا بکات، ئەو بە سەرسورمانەوە تەماشای کردم، وەک ئەوەی بە هێما پێم بڵێت، ئاخرچەتر پەیوەندیی بە ئێشی لە ڕادەبەدەری میزگیرانەوە چیە! کە بە بڕوابەخۆبون و دڵنیاییەوە داواکەم دوبارەکردەوە، ئینجا زانی بە ڕاستمە. چەترێکی بۆ هێنام، چەند تەلێکی چەترەکەم دەرهێنا و بۆ ماوەیەکی درێژ لە ئاودا کوڵاندمن تا لە بەکتریا و پیسی پاکبنەوە، سێ تەلی چەترەکەم توند بە دەزو بەیەکترەوە بەستەوە و بە سەرە خڕ و کولەکەیاندا وەک شیشێک کردمە ناو سۆندەی میزدەرهێنان (کەثیتەر). سۆندە کە بەتەنیا لە لاستیک بو، بۆیە نەرمبو و بێ ڕەقکردنی بە تەلەکان نەمدەتوانی شوێنی تەنگایی ناو بۆری میزەکەی پێ بکەمەوە. دەرزیەکی (پەثەدین) ی دژەئێشم لە (دلێر جاف) دا، کە ئێشەکەی کەمبۆوە سۆندەکەم بە تەلەکانی ناویەوە لە سەری چوک (زەکەر) وە بە ناو میزەڕۆدا وردە وردە و زۆر بە وریایی پاڵ پێوەنا، کە لە پاڵنانی سۆندەکە دا توشی بەرگری دەبوم پاڵنانەکەم بڕێک توندتر دەکرد. بەم جۆرە وردە وردە ئەو گۆشتە جیڕ و ڕەقەی دیواری ناوەوەی میزەڕۆ کە هۆی میزگیرانەکە بو، دەمبڕی و میزەڕۆکەم فراوان دەکرد، بەم شێوازە سۆندەکەم گەیاندە ناو میزدان، میزە گیراوەکە وردە وردە بەناو سۆندەکەدا هاتەخوارەوە و بەمجۆرە کۆتاییم بە میزگیرانەکە و بە ئێش و ئازارەکانی (دلێر جاف) هێنا. دواتر کە کارلێکی دەرزیەکەی لەسەر نەما، ئەو کە (پ.م) ە یەکی کەڵەگەتی ناوقەدبارێکی ئەسمەر بو، قیت و قوت ڕاستبۆوە و هاتەوە سەرپێی خۆی. بەداخەوە ئەو سێ فەرماندەی کەرتە (مەحمود و ئەحمەد و دلێر) دواتر هەمویان شەهید بون.

## گوندی ئەحمەدبڕندە و دیداری کەس وکار

هێزەکەمان دابەش بو بۆ چەند دەستەیەک، من لەگەڵ دەستەکەی کاک شەوکەت دا بوم، لە گوندی (کانی بەردینە) لاماندا، کە لەگەڵ گوندەکانی (قەڵبەزە)، (عالان)، (حاسڵ)، (دەق)، (تەپەکەل)،(سویلەمیش)،(کانی مرواری) و... خێڵی گلاڵی تیایاندا دەژی. گلاڵیەکان لە گەرمیانیش نیشتەجێ بون و لەوێش چەندین گوندیان ئاوادانکردۆتەوە. خێڵی گلاڵی زۆر بڕوایان بە موسوڵمانێتی و شێخایەتیی باپیرەی من (شێخ مەعروفی نێرگسەجاڕ) هەیە. لە ماڵێکی کانی بەردینە کەوتمە بینینی نەخۆش، کاک شەوکەت پێی وتن من کوڕەزای شێخ مەعروفم، زۆریان پێخۆش بو. کە نەخۆشەکانم دەبینی و دەرمانم پێدەدان، کلۆشەکریان پێدەدام وتکایان لێدەکردم نزا بخوێنم بە سەریدا

تا نەخۆشەکانیان بیخۆن و موبارەکیی باپیرەم و دەرمانەکان پێکەوە نەخۆشەکانیان چاکبکەنەوە. پاشنیوەڕۆ کانی بەردینە مان جێهێشت و بە سەر گردەکانی پشتەوەیدا و لە چیای (سێبڕ) ە وە بەرەو گوندی (ئەحمەد بڕندە) ی ناوچەی (وارماوا) کە ڕو لە شاری دەربەندیخانە کەوتینە ڕێ. لە ئێوارەدا گەیشتینە ناو دێ. گۆڕی باپیرەم شێخ مەعروف لەم گوندەیە. هەروەها ماڵی مەلا شێخ محەمەدی مامم و دو ئامۆزام (شێخ ڕەوف و شیخ سەعید)، لەگەڵ ماڵی زاوایەکمان (شیخ ئەحمەدی مامۆستا شێخ عەبدولکەریمی خانەشوری) کە پێشمەرگەی دێرینی حیزبی شیوعی بو، ئەمانە هەمویان لەم لەم دییە دەژیان. شێخ ڕەوف شاعیر بو، (هۆشیار) ناوی شاعیریەتی و هەروەها ناوی دیوانەکەی، شیعرەکانی سۆفیگەری و نیشتمانپەروەرین. بۆ من بۆنەیەکی خۆشبو کە بە دیداریان شادبومەوە، ئیتر پێویستم بە دامەزران نەبو چونکە ماڵەکانیان وەک ماڵی خۆم وابون. بۆ بەیانی ئەندامانی خێزانەکەمان لە سلێمانیەوە هاتنە لام و بەیەک شادبوینەوە. لە وانەی لە سلێمانیەوە هاتبون بۆ لام (هیوا) کە خوشکەزام بو لە هەمویان زیاتر سەرنجی ڕاکێشام. هیوا ئارام و کەمدو بو، دەتوت دەریایەکی مەنگە و لەبنەوەیدا سونامیەکی بچوک لە دروستبوندایە و شەپۆلەکانی وردە وردە بەرەو ژور دەبنەوە. دواتر دەرکەوت کە هەر ئاواش بو! ئێوارەی ڕۆژی دوهەم ماڵاواییم لە خزمان کردو بەرەو شارەزور کەوتینەوە ڕێ. بەڕاستی کاک شەوکەت پیاوێکی شارەزا و زرنگ و هۆشیار و بە پلان بو، بێکێشە بەناو ئەو هەموە ڕەبیە و سەربازگە و مۆڵگەی جاشەدا بێ هیچ زیانێک گەیاندینەوە شارباژێڕ. لەم گەڕانەدا هیچ شەڕێکی گەورە ڕوینەدا. زیاتر چالاکیی حیزبایەتی و پڕۆپەگەندە ئەنجامدرا.

## عەلی چوارتایی

شارباژێڕی بەری (کەناروێ و کونجرین و وەڕاس و سمکێ...) فەرماندەی کەرتی ٣٧ ی هەرێمی ٣ ی شارباژێڕ(شەهید عەلی چوارتایی) بەرپرسیار بو لێی، لە سەر داوای کاک عەلی و حەزی خۆیشم لە مانگی ٤ ی ١٩٨٢ گەڕانێکم لەگەڵ کردن کە چەند هەفتەیەکی خایاند. کاک عەلی پیاوێکی باڵابەرزی گەنمڕەنگ بو، کەسێکی ڕوخۆشی، بەشەرمی، دەنگنزمی ڕەوشتجوان بو، قوتابخانەی تەواو نەکردبو، (پ.م) یەکی میانەڕەوی ئارامی بە نەخشە و پلان بو، بۆیە لە چالاکیە سەربازیەکانی کەرتەکەیدا

کەمترین قوربانیی دەدا. کە لەو گەڕانەدا باشتر ناسیم لە دڵی خۆمدا وتم ئەگەر لەوڵاتێکی ئەوروپی بوایە سەرکردەیەکی بەتوانای سەندیکای کرێکارانی لێدەردەچو. بەلام ئاخخخ... لە ساڵی ١٩٨٥ دوای شکستی وتووێژی یەکێتی و حکومەت ئەمیشمان لەدەستدا، ئەوەبو لە بەرەنگاربونەوەی شاڵاوی سوپای عێراق بۆ سەر شارباژێر لە شاخی (کەتو) ی نزیک چوارتا شەهید بو. هەر لەو کەرتە دا کادیری پێشکەوتوی کۆمەڵە (مەلا حەمەئەمینی بەرگدرو) بە هۆی خیانەتی چەند کەسێکەوە لە کاتی خەودا لە نزیک گوندی وەراس شەهیدکرا. چەند کادیر و سەردەستەی تر بە هۆی چالاکیەکانیانەوە بوبونە خۆشەویست و جێی بڕوای خەڵکی ناوچەکە وەک شاڵاو و مەجیدی حاجی عەلی و کەمال وەڕاسی.

## تالیب کەنارویی و کوردە و سیروانی مستەفا کونجرینی

لە (پ.م) کانی تیپی ٣٧،بەتایبەتی دو (پ.م) بە هۆی نتمی و ئارامیان، وە لە هەمان کاتدا ئازایەتی و دلسۆزی و چالاکیە (پ.م) ییەکانیان سەرنجیان ڕاکیشام، ئەوانە (تالیب کەنارویی) و (کوردە مستەفا کونجرینی) بون. کاتێک لە پایز و زستانی ١٩٨٢ بنکە کانی سەرکردایەتیی (حدکا) کەوتە بەر شاڵاوێکی ڕاماڵەری ڕژێمی ئێران، یەکێتیی نیشتمانی هێزێکی دروستکرد بەناوی (هێزی پشتیوان) و سەدان (پ.م) ی ئەم هێزەی نارد بۆ شەڕ شان بە شانی (پ.م) کانی (حدکا)، (تالیب) یەکێ بو لەو (پ.م) قارەمانانە کە لە شەڕی بەرگری لە کوردوستانی ئێران لە ناوچەی سەردەشت - خانێ شەهیدبو. بەهۆی چالاکیەکانیەوە ڕژێمی سەدام ڕقێکی زۆری لە (تالیب) بو، ئەوەبو کاتێک خەریکی ناشتنی تەرمەکەی بون لە سەر گردێک نزیک دێی (دێگەڵ)، سوپای عێراق کەوتە تۆپبارانی خەڵکەکە بەجۆرێک ناچاربون بڵاوەی لێبکەن. دواتر کە دنیا تاریک بو گەڕانەوە سەر مەیتەکەی و ئینجا ناشتیان، ئاوابو ڕقی سەدامیە داگیرکەرەکانی کوردوستان بەرامبەر بە وانەی بە چالاکیی پێشمەرگانە داخیان کردبوە دڵیان. ئەم ڕق و کینەیە لە کاتێکدا بو ڕژێمی سەدام دەیزانی (تالیب) بە دەستی دوژمنە سەرسەختەکەیان (ڕژێمی ئێران) شەهیدکراوە! بەڕاستی هەرگیز چاوە شین و زیت و وریاکانی (شەهید تالیب کەنارویی) م بیرناچێت! (کوردە) کوڕی (مستەفا کونجرینی) بو کە یەکێک بو لە خاوەن موڵکە بەخشندە و نیشتمانپەروەرە ناودارەکانی سلێمانی، ئەو لە دروستکردنی زانکۆی سلێمانیدا پارچە زەوی و پارەی

باشی بەخشی. لە دوای وتووێژە سەرنەکەوتوەکەی یەکێتی و ڕژێمی سەدام، (کوردە) کەوتە ژێر کارلێکی بیروباوەڕی کۆمەڵەی ئێران و وازی لە یەکێتیی هێنا، بەداخەوە دواتر لە کاتی مەلەدا لە ئاوی دەربەندیخان خنکا. برای بچوکی کوردە (سیروان) ئەندامێکی کارای ڕێکخستنەکانی پارتی دەبێت لە سلێمانی. ئەو کەسە پارتی یەی پەیوەندیی پێوەدەبێت دەگیرێت، ئەو نەک هەر ناوی (سیروان) دەدرکێنێ، بەڵکو ئەشکەنجەدەرەکانی ئاسایش دەباتە سەر ئەو چاڵەی سیروان لە حەوشەکەی ماڵی باوکیدا دەمانچەکەی خۆی تێدا شاردۆتەوە. سیروان دەگیرێ و پاش ئەشکەنجەیەکی زۆر لە سێدارە دەدرێ.

تالیب و کوردە و سیروان هەر سێکیانم لە نزیکەوە دەناسی، ئەوان لە کش و ماتی و ڕواڵەت و ڕوخساری دەرەوەیان دەتوت گۆمی مەنگن، بەڵام لە ناخی خۆیاندا بۆ خۆشەویستیی کوردوستان گڕکانێکی بەوزە و توانابون بون، بۆیە کورد دەڵێ (لە گۆمی مەنگ بترسە!). ئەم جۆرە کەسێتیانە لە دەرونناسیدا پێیان دەڵێن (introvert). پێچەوانەی ئەم جۆرە کەسێتیە پێی دەڵێن کەسێتیی (extrovert)، ئەمانە زۆربڵێ و دەنگبەرز و کەمکردارن، زۆرتر ڕو لە دەرەوەی خۆیانن هەتا لە ناوەوەی خۆیان، وەک پەندە کوردیەکە دەڵێت: لە هەمو قازانێکدا کەوچکن. هەر لەم گەڕانەمدا بو کە لە ئۆردوگای سەدوبیستی پاڵ کەناروێ لە بڵندگۆی مزگەوتەوە داوای خۆپیشاندان و ڕاپەڕینم لە خەڵکەکە کرد.

گەڕانەکەم بە ناوچەکەدا گەیاندمیە گوندی (کوڕەداوێ) لە بناری شاخی (گمۆ)، کوڕەداوێ دواگوندی ئاوەدان بو لە ناوچەکە. پاش ئەوەی شەوێک ماینەوە، لەگەڵ سێ (پ.م) بەسەر بەرزاییکەی پشتی کوڕەداوێ هەڵگەڕاین و بە دیوی ناوچەی (ئالان) بۆ گوندەکانی شانەخزێ و گرگاشێ و مەروێ داگەڕاینە خوارەوە. سروشتی ناوچەی (ئالان) گەلێک جوان و دڵڕفێنە، پێش وێرانکردن و گواستنەوەی گوندەکانی، خەڵکەکەی خەریکی کشتوکاڵ و باخداری و مەڕومالات بەخێوکردن بون، ژیانێکی سادەی خۆشیان بەسەردەبرد. بەڵام ئەو ڕۆژە ی من بە ماندوێتی و شەکەتی بە ناو گوندەکانیا دەڕۆشتم، هەمویان چۆڵ و هۆڵ بون، هەر دیواری ڕوخاو و کەلاوە و باخ و باخاتی بەجێهێڵراوم دەبینی. ئای دیمەنی دێی وێرانکراو و چۆڵ و هۆڵ چەند ئێش و ئازاری دەدام! درێژەمان بە ڕۆشتندا، (چەمی گەورە) هاتە ڕێمان. چەمی (کەلوێ) لە سەردەشتەوە دێ و دەڕژێتە ناو (چەمی گەورە) و دەبێتە ڕوباری

(زێی بچوک) کە بە پشدەردا دەڕوا هەتا لە دەربەند دەڕژێتە ناو دەریاچەی دوکان. بە تەل لە چەمەکە پەڕینەوە بۆ بەری ئێران و خۆمان گەیاندە گەورەترین گوندی ناوچەکە کە دێی (بێژوێ) بو کە لە ژێر دەسەڵاتی (پ.م)ی کۆمەڵە و دیموکراتدا بو. لە (بێژوێ) دیوەخانەکەی (محەمدی مەلا عەلی) کەسێتیی ناسراو و دۆستی نزیکی یەکێتی تا بەیانی باوەشی میهرەبانی خۆی بۆ کردینەوە، نان وچای بەیانیمان خوارد و بە بەرزاییەکەی پشتی (بێژوێ) هەڵگەڕان و بە لای گوندی (قەلەڕەش) ی نزیک سەردەشت تێپەڕین و دوای چەندین سەعات پێڕەوی خۆمان گەیاندە سەرکردایەتی لە (نێوزنگ).

## دایکە (ئامینە سور) و مامۆستا (سنەوبەر محمود)

ڕژێمی سەدام زۆرتر بە هۆی سەرقالبونیەوە بە شەڕی ئێران، هەروەها بەهۆی چالاکیە سەربازی و سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی حیزبە کوردی و عێراقیەکانی موعارەزەوە کە لە کوردوستانەوە دەیاننواند، وردە وردە دەسگا سەرکوتکەرە جۆراوجۆرەکانی ماندو و شەکەت دەبون و ئەو ترس و سامەی جارانیان نەدەما. بەهاری ١٩٨٢ بە بۆنەی هەشتەمین ساڵیادی بۆمبابارنکردنی قەڵادزێ کە لە ٢٤ ی ٤ ی ١٩٧٤ دا ڕویدابو، خەڵکێکی زۆری قەڵادزێ ئەو یادەیان لە گۆڕستانی شارەکە کردەوە. دواتر خەڵکەکە بە خۆپیشاندانێکی گەورەوە بەرەو ناوشار ملیان نا، هێزە سەرکوتکەرەکانی ڕژێم تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد و لە ئەنجامدا (ئامینە سور) ی کەیبانو و (سنەوبەر محمود) ی مامۆستا شەهید کران، لە ڕادیۆی یەکێتیەوە بە دایکە ئامینە و خوشکە سنەوبەر چەند جارێک باسی چۆنێتیی شەهیدبونەکەیان کرا. لە چەند ڕۆژی دواییدا ئاگری ڕق و کینەی خەڵک لە ڕژێمی سەدام، ئۆردوگا زۆرەملیەکان وشارەکانی دەڤەری پشدەری گرتەوە و پریشکی ئەو ڕاپەڕینە گەیشتە سلێمانی و هەولێر. لە سلێمانی کچانی خوێندکاری هەرزەکار ڕۆڵێکی سەرەکیان بینی لە خۆپیشاندانەکان، دواتر ژمارەیەکیان لێگیرا و دڕندانە ئەشکەنجەدران. ڕێکخراوە نهێنیەکانی کۆمەڵە دەورێکی سەرەکیان بینی لە پشتگیریکردنی ڕاپەڕینەکە. یەکێتی لە ڕادیۆکەیەوە و لە ڕێی بڵاوکراوەی نوسراوەوە هانی خەلکی دەدا بۆ فراوانکردن و درێژەپێدانی خۆپیشاندان. حیزبی شیوعی و پارتی نەیانتوانی لە بادینان هیچ خۆپیشاندانێک ڕێکبخەن، بۆیە بادینان کش و مات مایەوە.

## له بڵندگۆی مزگەوتەوە!

له كاتی خۆپیشاندانەكانا من له شارباژێری بەری (كەناروێ) له گەڵ (عەلی چوارتایی) جەولەم دەكرد، دو خوێندكاری هەرزەكاری ئەندام و لایەنگری كۆمەڵە كە دانیشتوی ئۆردوگای زۆرەملێی (سەدوبیست) ی پاڵ دێی (كەناروێ) بون، ئێمەیان له گوندی (وەڕاس) دۆزیەوە، داوایان لێكردین شەو بچین بۆ ئۆردوگاكەیان وهانی خەڵكەكە بدەین بۆ خۆپیشاندان و ڕاپەڕین. به یاوەریی دو (پ.م) و كادیری كۆمەڵە (شالاو)، و به چاوساغیی دو خوێندكارەكە، كاتێك تاریكی تەواو باڵی میهرەبانی خۆی بەسەر دونیادا كشاند، له ماڵە كانی سەرەوە ڕا خۆمانكرد به ئۆردوگای (سەدوبیست) دا. شەپۆلی شنه و شادیەكی زۆر دڵ و دەرونمی هەژاند و هێنامیه سەما. بەلامەوە زۆر خۆش و سەرنجڕاكێش و هاندەربو، كاتێك چەند كەسێكی گەنجی شۆڕشگێڕی ناوشار كه من هەر نەم دەناسین، له تاریكایی قەراخ ئۆردوگاكەوە به خۆیان و لایته دەستیەكانیانەوە چاوەڕێیان دەكردین. دوای چاك و چۆنی، پێشمان كەوتن بۆ مزگەوتی ئۆردوگاكە، دو (پ.م) كه وەك پاسەوان له دەرەوە ڕاوەستان، بێگومان چەند كەسێكی تریش بڕێك دورتر هەر چاودێریان دەكردین. لەگەڵ شالاو و دو خوێندكارەكە چومە شوێنی نوێژكردنی ناو مزگەوتەكە، بڵندگۆ ئامادەكرابو. له پێشدا به كوردی به دەنگێكی بەرزی زوڵاڵ و سۆزاوی و دڵگەرمانه كەوتمە وتاردانی سیاسی له مەڕ سیاسەته شۆڤێنیەكانی ڕژێمی بەعس به تایبەتی سیاسەتی وێرانكردنی دێهاتی كوردوستان و بەعەرەبكردن و به بەعسی كردنی گەلەكەمان. ڕاستەوخۆ داوام له دانیشتوان كرد دژی ڕژێم بكەونه خۆپیشاندان و ڕاپەڕین. پاشان به زمانێكی عەرەبیی پاراو درێژەم به وتارەكەمدا، باسی سیاسەتی ڕەسمیی یەكێتی م كرد كه بریتیبو له به عێراقیكردنی شۆڕشی كوردوستان له پێناوی ڕوخانی ڕژێمی سەدام و گۆڕینی به حكومەتێكی دیموكراتیی پەرلەمانی. داوام له سەربازان و ئەفسەرانی سوپای عێراق كرد دەستی خۆیان سورنەكەن به خوێنی كورد، تكام لێكردن هەرچی زوتره ڕیزەكانی ڕژێم جێبهێڵن و پەیوەندی بكەن به هێزی (پ.م) ی كوردوستانەوە كه به ئامێزی گەرمەوە پیشوازیان لێدەكات. هێزە چەكدارەكانی ڕژێم كەوتنه خۆیان، وردە وردە له بنكەكانی ڕژێمەوە له ناو ئۆردوگاكە وە و له بەرزاییەكانی دەوروپشتی ئۆردوگاكەوە تەق و تۆق دەستپێیكرد، ڕەوشەكە بەرەو نائارامی دەڕۆشت. یاوەرەكانم هێمایان بۆكردم كۆتایی به وتارەكەم بێنم و هەرچی زوتره مزگەوتەكە جێبهێڵین و له ئۆردوگا بچینه دەرێ. هەمو وتارەكەم نزیكەی نیوسەعاتێكی خایاند. بێ هیچ زیانێك

شوێنکه و ئۆردوگامان جێهێشت. بەڕاستی ئەزمونێکی سیاسیی بچوک بو لە گرێدانی سەرکەوتوانەی خەباتی پێشمەرگانە لەگەڵ خەباتی سیاسیی ناوشار، وەک ئەوەی لە مێژوی شۆڕشەکانی جیهان خوێندبومانەوە.

## لەشکری ئیسلامیی کورد (لاک)

دەسگای جاسوسیی دەوڵەتی ئێران لە سەرەتای مانگی دوی ساڵی ١٩٨١ لە تاران، لە خەڵکی ئیسلامی سیاسی و خێڵەکی، پارەویست و دواکەوتوی جۆراوجۆر و گومانلێکراو رێکخراوێکی دروستکرد بە ناوی (لەشکری ئیسلامیی کورد). ئامانجی ئێران لەم سیاسەتە، ئاژاوەنانەوە و دەستێوەردان بو لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانی، هەروەها بۆ هەراسانکردن و خستنە ژێر گوشاری یەکێتی بو وەک هێزی سەرەکیی ناوچەکە. (لاک) وردە وردە خەریک بو بەهێز دەبو و بۆ دەسەڵاتی یەکێتی دەبوە کێشە و هەڕەشە. بۆیە لە یەک کاتی دیاریکراودا لە ڕۆژی ٢٥ ی ٧ ی ١٩٨٢ لە بەری مەرگە و ناوچەی سەرگەڵو و لە دۆڵی حاجی مامەندی شارباژێر هێرشی بروسکەئاسا کرایە سەر بنکە سەرەکیەکانیان لەو سێ شوێنە. لەگەڵ وەهاب و (پ.م) کانی کەرتەکەیدا بە ئۆتۆمبیل لە گوندی (بزەینان) ە وە خۆمان گەیاندە بن (هەورازی سێیەر) کە گوندەکانی هۆنگەرێنە و باراو و شوکێ لە دیوی شارباژێڕی تەخت جیادەکاتەوە لە گوندی حاجیمامەند لە دیوی شارباژێڕی (سروچک). ئێمە بە هەورازی سێیەردا سەرکەوتین و بەرامبەر حاجیمامەند لە نێوان داربەڕوەکانا خۆمان دامەزراند، بنەکەکەی (لاک) لە دۆڵەکەی پشتی حاجیمامەند بون، چواردەوریان گیرابو. شریخە و قرمژنی تەقەیەکی زۆر لەوێوە لە نزیک بنکەکەیانەوە بەرزبۆوە، دوای نزیکەی یەک دو سەعات شەڕ، هێزەکەی لەشکری ئیسلامی شکا و بنکەکەیان گیرا. ئیتر ئێمە پێویستی نەکرد ڕاستەوخۆ لە شەڕەکەدا بەشدار بین. دوای ئەوەی تەقە بە تەواوەتی وەستا ئێمە لە شوێنەکانی خۆمان هەستاین و هاتینە ناو گوندی حاجیمامەند. بە پەلە بانگیان کردم بۆ ماڵێک بۆ تیمارکردنی (پ.م) یەکی خۆمان کە یەکێک بو لە (پ.م) زۆر بەڕەوشت و ئازا و خۆشەویستەکان بە ناوی (محەمەد عەلی مەلا وەیسەیی). محەممەد تەمەنی بیستودو ساڵ بو، ڕەبەن بو، باڵای ١٨٢ سم دەبو، کوڕێکی جوانخاسی جەستە تۆکمەی تەندروست بو، ئەو خزمی (حەمەی حاجی سابیر) ی کادیری پێشکەوتوی کۆمەڵە بو. پێشتر چەندین جار پێکەوە جەولەمان

کردبو و له ماڵاندا دامەزرابوین. لەگەڵ د.کەمال شاکیردا چوینە سەری. ئەوەندە خوێن لە برینەکەی ڕۆشتبو ئیتر هۆشی بە دەوروبەری خۆی نەمابو و لە قسەکردن کەوتبو، لە گیاندانا بو. محەمەد ی خۆشی لە ژیان نەدیو لە شەڕی (لاک) لێبوبۆوە، ئێستا لە شەڕدابو لەگەڵ مردن، لەویاندا سەرکەوتبو،ئەی لە میان؟ گولەیەک دابوی لە خوێنبەری سەرەکیی ڕانی چەپی. ئەوەندەی بۆمان کرا بە باندیجی لاستیکیی بەهێز خوێنەکەیمان وەستاندەوە، برینەکەیمان تیمارکرد، چەند بوتڵێ خۆراکاومان کردە لولەخوێنە بەتاڵبوەکانی، بە لولەی خوێنهێن دەرزیی ئێشمان لێدا. بەدیاریەوە لە ژورسەری

کش و مات و غەمبار کزۆڵەم کردبو، دڵنەواییم دەکرد و جارجار دەستم دەهێنا بە ناوچاوانیدا کە خڵتانی ئارەق و جواناو بوبو. دوای نزیکەی نیو کاژێر چاوەکانی بۆ هەمیشە لێکنا و ماڵاوایی لێکردین. ئای.. ئۆفف..! نیو سەعاتێکی چەند تاریک و کارەساتبار و یەڵدایی بو، دەتوانم بڵێم تا ئەوکاتە هەرگیز تاڵاوی غەم وکۆڤانی و مەخابنی ئاوا دەرونهەژێن و گورچکبڕم نەچەشتبو!

## ژیاندۆستی لە ناوەڕستی مەرگ دا !

بە شەکەتی و کەمهێزی وغەمێکی قوڵ و فراوانەوە، بە غەم و کۆڤانیەکی بێ پەی و بێ کەنارەوە، لە ماڵەکە هاتمە دەرەوە. بە خۆم و کۆڵەپشت و کلاشینکۆفەکەمەوە بە زۆرلاقەکانم بەدوای خۆمدا ڕاکێشا تا گەیاندمیانە سەر حەوزەکەی مزگەوتی حاجی مامەند. بەنیازی دەست و دەم وچاو شتن و حەسانەوە هاتبوم، بەڵام تکایە ڕاوەستە! بزانە چیم دی، چیم نەدی! لە سەر بەردەنوێژی دەوری حەوزەکە سێ لاشەی بێگیان لەپاڵ یەکتردا ڕیزکرابون، ئەمانە کوژراوەکانی (لاک) بون.ئاخخ خوایە گیان ! منێک کە سەرتاپای وجودم و ڕۆحم و هەموهەستی و نەستیم ژیاندۆستیە، ئێستا توشی چی بوم و چی دەبینم؟ باری دەرونیم لەو چرکەکات و شوێنەدا، ئێستا چەند وەک کارەساتبار بۆت وەسف بکەم، بەڵام هەرگیز ناتوانم ئەفسوس و کۆڤانیم، داماوی و بێدەسەڵاتی و نائومێدیم پراوپڕ بۆت دەربڕم و پیشانت بدەم، بمبورە! من پێشتر ئەم سێ کوژراوەی (لاک) هیچیانم نەدیبو، بەڵام غەمی ئەمانیشم خستەسەر غەمەکەی (محەمەد عەلی) ی هاوڕێ و هاوسەنگەرم. ئەوان هەر سێکیان قوربانی بون، قوربانیی شەڕە بێکۆتاییەکان، قوربانیی خەپاندنیان لە لایەن ڕژێمی ئێران و

بەکرێگیراوە کوردەکانیەوە. ئێران لە سەر بنەمایەکی جاسوسی و خێڵەکی و ئاینی (لاک) ی دروستکرد. مەبەستی ئەوە بو یەکێتی وەک هێزە سەرسەخت و سەرچڵ و ڕام نەبوەکەی مەیدانی خەبات، بخاتە ژێر گوشین و پەستانەوە و ناچاری بکات بە ملکەچکردن بۆی. ئێران هەمیشە سەیری یەکێتیی دەکرد وەک مەترسی بۆ سەرخۆی، ناحەقیشی نەبو! لەو ڕۆژانەدا یەکێتیی نیشتمانی بە پیچەوانەی حیزبە کوردیەکانی تر هێزێکی بەڕێز و قورس، ڕەسەن و پاک و بەشکۆ بو، هێزێکی سەرەکیی نەتەوەیی و سەربەخۆی چەپی پێشکەوتنخوازی مەیدانی خەبات بو، بەرامبەر بە داگیرکەرانی کوردوستان سرک و سڵنەکەر بو، سەدان (پ.م) ی لە پێناوی کوردوستانی ئێرانا شەهیدکرابون. ئەو سەردەمە یەکێتی نیشتمانی بە کۆمەڵەی داینەمۆ یەوە، لە بینایی چاوی کۆمەلانی خەڵکی کوردوستانەوە، بەتایبەتی لە هی گەنجانەوە! ئێستا و ئاینده بو، سۆمایی چاویان بو!

ڕۆژێ دواتر جارێکی تر جەرگم بڕایەوە و کانیە بەهارەی چاوەکانم تەقیەوە. لە شەڕی لەشکری ئیسلامی دا لە ناوچەی سەرگەڵو هاوڕێی منداڵی و پێشمەرگایەتیم، قارەمانی چاونەترس و قاڵبوی مەیدانەکانی شەڕی دەستەویەخە، فەرماندەی هەرێمی ٤٧ ی پیرەمەگرون (سەلاحی موهەندس) شەهید بوبو.

## کۆنفرانسی دوی کۆمەڵە

لە لایەن سەرکردایەتیی کۆمەڵە وە منیش بانگێشت کرابوم وەک ئەندام بەشداری بکەم لە کۆنفرانسی دو دا. لە مانگی ٨ ی ١٩٨٢ لە (هۆڵی شەهید شەهاب) لە نێوزەنگ کۆنفرانسی دویکۆمەڵە بەسترا، کورسی نەبو، هەمو لەسەر زەوی دانیشتبوین.

جەلال تاڵەبانی وەک میوان ئامادەبو. ئەو باسی فراونبون و پێشکەوتنەکانی یەکێتی و دروستکردنی (مەکتەبی پەیوەندیەکانی دەرەوەی) ی کرد، هەروەها باسی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دەسگا و پێکهاتەکانی ناو یەکێتیی کرد. لەمێژبو لە کۆڕ و دانیشتنە تایبەتیەکانی کۆمەڵە دا باسی تاکڕەویی جەلال تاڵەبانی دەکرا. لێرا ئەم چیرۆکەم هاتەوە یاد کە لە دەیان کۆڕ و دانیشتنی کادیر و سەرکردە کانی کۆمەڵە وەک نوکتە دەگێڕدراوە و منیش چەند جارێ بیستبوم. دلێر (ئەکرەم ی سەید مەجید) ئیش و کاری دارایی و ئیداریی یەکێتیی دەکرد، بەردەوام لە هاتوچۆدا بو لە نێوان تاران و نێوزەنگ. دلێر جارێک لە ئێران دەگەڕێتە وە نێوزەنگ، لە ڕێگای

چونی دا دەبێت بۆ لای جەلال تاڵەبانی، توشی سالار عەزیز و مەلا بەختیار دەبێت، ئەمان دەیانەوەێ باس و خواسی لەگەڵ بکەن، دلێر دەڵێت با جارێ جەلال تاڵەبانی ببینم، بەس لێرا ڕاوەستن ومە ڕۆن دوای چەند دەقیقە یەک دێمەوە لاتان، ئەوانیش دەڵێن: ئاخر چۆن دیدارەکەت لەگەڵ مام وا کورت دەبێت؟ دلێریش ئاوا دەڵێ: ئەگەر لەگەڵ مام بیروڕامان جیاواز نەبو ئەوا زو دەیبڕێنینەوە، ئەگەر جیاواز بو، ئەو چی بە من دەڵێت من دەبێ بڵێم وایە و قسەی تۆیە! کەواتە لەم ئەگەرەش دا هەر زو دە یبڕێنینەوە.

## «ئەم قومبەلەیە چی بو تەقاندت ؟»

ئێستا با پێکەوە بگەڕێینەوە ناو هۆڵی کۆنفرانس. من لە تەنیشت (مەلا بەختیار) وە لە ڕیزی پێشی پێشەوە دانیشتبوم. دوای ئەوەی جەلال تاڵەبانی قسەکانی تەواوکرد، من داوام کرد قسەبکەم. چومە سەر سەکۆی پەیڤین و لە سەر قسەکانی جەلال تاڵەبانی وتم: «ئینجا با دەسگای نوێش لە ناو یەکێتیی نیشتمانی دروستبکرێ و پێکهاتە کان و شێوە و تان وپۆی یەکێتیش سەرلەنوێ ڕێکبخرێتەوە، ئەمە هیچ لە ناوەڕۆک و لەو ڕاستیە ناگۆڕێ کە دەسەلاتی سەرەکی و یەکلاکەرەوە لە هەمو مەکتەب و دەسگاکانی یەکێتی دا لە کۆتاییدا هەر لە دەست یەک کەسدایە ئەویش.... «، چرکەکاتێکی وەستان، پەشۆکاوی، پرینگان و دڵەکوتە بەربینی گرتم، ئینجا نیگایەکی برێک پەشۆکاویم گرتە جەلال تاڵەبانی و قسەکەمم بەوە تەواکرد کە وتم: «......لە کۆتاییدا لە دەست (جەلال تاڵەبانی) دایە». پاشان بۆ پشتگیری لە ڕاوبۆچونەکانم دەقێکی عەرەبیی ڕابەری ناوداری سۆشیالدیموکراتی ڕوسی (بلیخانۆف) کە لەمێژبو لەبەرم بو، بۆ ئامادەبوانم وتەوە. پوختەی قسەکەی (بلیخانۆف) ئەوەیە کە دەبێت سەرکردایەتیی حیزبە شۆڕشگێڕەکان و دەسەلاتی سیاسی بە کۆمەڵ بێت نەوەک تاکڕەوانە و بە خۆسەپاندن. ئینجا ڕەخنەم لە شەڕی براکوژی، بەتایبەتی شەڕی نێوان (حسک) و یەکێتی گرت و داوای ئاشتیم کرد لەگەڵیان، وتم: ئەمە شەڕی چینایەتی نیە وەک لە ناو یەکێتیدا دەوترێ، ئەوەتا دەبینین لە هەندێ ناوچەدا ئاغا و شێخەکان لەگەڵ ئێمەدان و جوتیارە ڕەش و ڕوتەکان لەگەڵ (حسک) دان، بۆ سەلماندنی بۆچونەکەم و وەک نمونە ناوی چەند بەرپرسێکی ناوچەی پشدەری یەکێتی م هێنایەوە وەک (شێخ سەدرەدین و قادر ئاغا). کە گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم (مەلا بەختیار) بە

زەردەخەنەیەکی نەرم و سەرسوڕمانەوە، بە دەنگێک کە دەروبەرەکەی گوێیان لێبو، پێی وتم «د.هەژار ئەم قومبەلەیە چیبو تەقاندت؟».جەلال تاڵەبانی دەمودەست بە گوژم و گوڕوتینەوە بۆ وەلامدانەوەم هەستا و ڕویکردە ئەندامانی کۆنفرانس، بە هەڵچون و لاقرتیەکی بریندارکەرانەوە، هێرشی شەخسیی ئەوەی کردە سەرم کە من کاتی خۆی (حسک) بوم و ئێستاش وەک کادیرێکی (حسک) قسەدەکەم نەک وەک ئەندامێکی کۆمەڵە. جەلال تاڵەبانی وەڵامی کۆنکرێتیی کرۆکی ڕەخنەکەمی نەدایەوە کە پێم وتبو تاکڕەوە و دەسەلاتەکان هەموی لەدەستی خۆیدا کۆکردوتەوە و شەڕی حیزبی سۆشیالیست شەڕی چینایەتی نیە. جەلال تاڵەبانی لێرەش و جارێکی تریش نا ئارامی و ناهاوسەنگی وهەڵچونەکانی پیشاندایەوە.

## «تەنەکەی خۆڵی حیزبەکان!»

نەوشیروان مستەفا هەستا بۆ وەلامدانەوەم، بێ هەڵچون و توڕەبون و بریندارکردنی شەخسی، ئەو وتی: «(حسک) وەک پارتی یا شیوعی، حیزبێکی ئاسایی و ڕەسەنی هەڵقولاوی بیروڕایەکی سیاسیی دیاریکراو و تایبەت بە کۆمەڵی کوردوستان نیە، (حسک) ئەسڵەن هەر حیزب نیە، بەڵکو وەک تەنەکەی زبڵی حیزبەکانی ترە، هەمو گومانلێکراو و چەتە و دز و بێکەڵکەکانی ناو حیزبە کوردیەکانی تر کە بە هۆی بەدکاری و خراپەکاریەوە لە حیزبەکانیان دەردەکرێن، دێنە ناو (حسک) و قبوڵ دەکرێن و دەکرێن بە مەسئول». نەوشیروان وەڵامی بەشەکەی تری ڕەخنەکەمی نەدایەوە کە لە جەلال تاڵەبانی م گرتبو، پەندێک دەڵێت: بێدەنگی کردن لە شتێک واتای پەسەندکردنی شتەکەیە! لە ئەندامانی کۆنفرانس یەکێک هەڵنەسا، یەکێک نەیوێرا ڕای خۆی دەربڕێ لەسەر رەخنەکەی من لە جەلال تاڵەبانی. یەکێک داوای لە جەلال تاڵەبانی نەکرد وەڵامی ڕەخنەکەی من بداتەوە، یا بەلای کەمەوە بەرگری لە من بکات لەوەی جەلال تاڵەبانی هێرشی ناڕەوای شەخسیی کردە سەرمن. دیار بو هەموان دەترسان لەوەی جەلال تاڵەبانی توڕەبێت و هێرشی شەخسی بکاتە سەریان.

وتنی ڕەپ و ڕەوانی راستی (حەق) بەرامبەر کەسی دەسەڵاتدار و ستەمگەر، ئازایی و بوێریی زۆرتری دەوێت هەتا شەڕی دەستەویەخە بە چەک، چونکە لەمیاندا بە بەکارهێنانی چەکەکەت دەرفەت و ئەگەری خۆڕزگارکردن و خۆقوتارکردنت هەیە، بەڵام لەویاندا تۆی بێچەک ئەم دەرفەتەت نیە و دەکەویتە بەر ڕق و تۆڵەی

کەسە زۆردارەکە ! بەڵام خۆ لەم حاڵەتەی من دا ئێمە هەمومان چەکداربوین و یەک چارەنوسمان هەبو، کەسیش لولەی چەکەکەی نەدەکردە برا و هاوخەباتە (پ.م) کەی. لە نێوان سەرکردەکان و کادیران و (پ.م) سادەکاندا بایی ئەوەندە ڕێز و خۆشەویستی و پێزانین مابو کە ڕاستیەکان بوترین. بەڵام بەداخەوە کەس لەو نزیکەی ١٨٠ ئەندامەی بەشداربوی کۆنفرانس بە وشەیەک بەرگریەکیان لە من نەکرد، نەک هەر ئەوە بەڵکو هەر هیچیان لەسەر ڕەخنەکەی من نەگوت!

## دوای ئاپورە و (باو) کەوتن

سێ ساڵ و چوار مانگ دوای کۆنفرانسی دو، لە ڕۆژی ١٠ ی ١٢ ی ١٩٨٥، لە ژێر ئاگری تۆپبارانی خەستی ڕژێمدا، جا وەرە بیبیسە و سەر ڕاوەشێنە! پلونۆمی نائاسایی کۆمەڵە لە (بەرگەلو) گیرا. بابەتی سەرەکیی پلونۆمەکە کێشەی (ئالای شۆڕش) بو. لە پلونۆم کۆدەنگیی ئەوە دروستبو گوایە سەرکردەکانی (ئالای شۆڕش): مەلا بەختیار و مەحمود کەشکۆڵ و پشکۆ نەجمەدین خیانەتیان لە کۆمەڵە کردوە. لەو ٥٨ یا ٦٠ کادیر و سەرکردانەی کۆمەڵە کە بەشداربون لە پلونۆمەکەدا، تەنیا کادیرێکی هەولێری بەناوی (عەبدوڵا تۆفیق) واژۆی ئەو نوسراوەی نەکرد کە وەک سزای (گوایە- خیانەتەکەیان) داوای کوشتنی ئەو سێ سەرکردەیەی دەکرد. ئەم ڕوداوەی ناو پلونۆم و ڕوداوە بچوکەکەی بەسەر من هات لە کۆنفرانسی دو، دو ڕوداوی بە شێوە جیاواز بون لە دو کاتی جیاوازدا، بەڵام یەک ناوەڕک و یەک واتایان هەیە ئەویش: ١. ترس لە دەربڕینی ڕای خۆت، ترس لە دەسەلات و دەسەڵاتداران، ترس لە سزا و ترس لە لەدەستدانی پۆست و پلە و پایە، ترسی لەدەستدانی سود و قازانجە کەسیەکان، ترس لە دابڕان و تەنهاکەوتن، ترس لە ئایندە. ترس دەرونی مرۆڤ دەکرۆژێ! ٢. بێزاری، بێوزەیی، وەڕسی و نائومێدی لە دۆخی شۆڕش بە گشتی ؛ بێگومان شوێنکەوتنی زۆرینە و پەسەندکردنی بیروڕا و ڕەفتارە باوەکان بێکێشە و بێ سەرئێشەترە لەوەی لەگەڵ زۆرینە و باودا نەبیت یا جیاوزبیت یا تەنانەت دژەباو بیت و تەنیا بکەویت. ٣. نەبونی ڕامان و بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە، نەبونی ڕا و بۆچونی سەربەخۆی هەڵقوڵاو لە هۆش و دەرونی خۆت، وتنەوەی توتی ئاسای بیروڕای زاڵ و باو، گوێڕایەڵی بۆ حوکم و بڕیاری دەسەڵاتداران. هەمو ئەم هۆکارانە وایان لەو هاوڕێیانە دەکرد خۆیان بپارێزن لە سەرئێشەی ئەوەی ببنە

ڕەخنەگر و دەرخەر و دەربڕی ڕاستیە تاڵەکان. دەنا هەمو ئەو هاوخەباتگێڕە بەڕێزانە لە مەیدانەکانی شەڕی دەستەویەخەدا لەگەڵ دوژمن نەترس و گیانباز بون، بەڵام گوتنی وشەی حەق لایان قورستر و سەختتربو لە هەڵمەت بردنە سەر سەنگەری دوژمن! بەس سەیرەکە لەوەدابو ئەم هەمو ترسە لە دەسەڵاتداران و لە وتنی حەق، لە دەسگایەکی سەربازی یا دەسگایەکی جاسوسیی نهێنی یا حیزبێکی فاشیستی نەبو، بەڵکو لە ڕێکخراوێکی نیشتمانی دیموکراتی بو کە داوای دیموکراتی و سۆشیالیزم و ئازادیی بیروڕای دەکرد بۆ هەمو کۆمەڵ!

## خرۆشۆف و ڕەخنەگرەکەی!

ئەم دو ڕوداوە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی شیوعیی سۆڤێتی هێنایەوە یادام کە لە ساڵی ١٩٥٦ دا بەسترا. لەو کۆنگرەیەدا (نیکیتا خرۆشۆف) ی سکرتێری گشتیی تازەی حیزب، پەردەی لەسەرهەڵە و ناڕەوایی و تاوان و تاکڕەویەکانی (ستالین) هەڵدایەوە. ئەندامێکی کۆنگرە هەر لە سەر کورسیەکەیەوە، سەرزەنشتانە ڕەخنەی لە (خرۆشۆف) گرت و پێی وت: ئەی باشە هەتا (ستالین) لە ژیانا بو ئێوە بۆچی لە ڕەفتارە دیکتاتۆریە خوێنڕێژیەکانی ئاوا بێدەنگ بون؟ پرسیارکەرەکە نەی وێرا هەستێتە سەرپێ و ناسنامە و روی خۆی دەربخات کە کێیە. (خرۆشۆف) لە وەڵاما پێی وت: لەبەر ئەوەی ئێمەش وەک ئێستای تۆ بوین، لەو جێیەی تۆدا بوین !

کە کۆنفرانسی دو تەواو بو، لە ڕێی گەڕانەوەماندا بەرەو شارباژێڕ، وەهاب و مام ڕۆستەم وچەند هاوڕێیەکی دڵسۆزی تر پێیان وتم: دوکتۆر گیان هەمو تویان خۆشدەوێ و ڕێزت لێدەگرن، ئیتر بۆچی بەم ڕەخنانە سەرئێشە بۆ خۆت دروست دەکەیت؟ هەر دوکتۆریەکەی خوت بکە باشترە لە سیاسەتکردن. منیش لەوەڵام دا پێم وتن: ئەگەر بە ژمارەی ئەو کەسانە بێت من خزمەتگوزاریی پزیشکییان پێشکەش دەکەم، ئەوا وەک پزیشکەکانی هاوپیشەم لە ناو شارەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەت دا بم باشترە، چونکە بە دڵنیاییەوە نەخۆشی زۆرتر دەبینم و چارەسەریان دەکەم هەتا لە ناو پێشمەرگە و لە ناو خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکاندا، بۆیە ناکرێت وەک دوکتۆرەکانی هاوڕێم لە شار لە ژێر سایەی ڕژێمی سەدامدا، منیش لە ناو شۆڕشدا سەری خۆم کزبکەم و هەر خەریکی کاری پزیشکی بم و لە بەرامبەر کێشەکان و کەم و کورتییەکانی ناو شۆڕش و کۆمەڵە و یەکێتی چاو و دەم وگوێی خۆم دابخەم.

## پسپۆڕە بێعەقڵەکان !

لە پەیوەند بەم بابەتەوە، لە سەردەمی حوکمی (ئەدۆلف هێتلەر) هەزاران زانا و پرۆفیسۆر و بیرمەند لەگەڵ سەدان هەزار دوکتۆر و ئەندازیار و کەسانی پسپۆڕ لە هەمو بوارەکانی زانست و تەکنۆلۆجیا، ڕۆژانە سەری خۆیان کزکردبو بە دیار ئیشەکانی خۆیانەوە و بوبونە کۆڵەکە و پایەکانی ڕاگرتنی دەوڵەتەکە. ئەو سوپا گەورەیە لە خەڵکی پسپۆڕ خۆیان بە دور دەگرت لە بابەتە فکری و سیاسیەکانی بەڕێوەبردنی وڵات و خەڵک. ئەوان بەو گرنگی نەدانە بە مژارە سیاسیەکانی ڕۆژانە، مەیدانەکەیان بۆ هیتلەر و حیزبەکەی چۆڵکرد و ئەنجامەکەشی ئەوە بو بینیمان، ئەڵمانیا لە شەڕدا شکا و یەک لە چواری خاکەکەی دۆڕاند. لەسەر ئەمە، نەوەی نوێی ئەڵمانەکانی دوای شەڕی جیهانیی دوهەم ڕەخنەی زۆر توندیان لە نەوەی پێش خۆیان گرت و پێیان دەوتن پسپۆڕە بێعەقڵەکانی (Fachidiot) باو و باپیرمان ! ئینجا خوێنەری هێژا ! منیش لە ناو شۆڕش دا نەمدەتوانی هەر پزیشک بم و حەقم بەسەر سیاسەتەوە نەبێت، ئەگەر ئەوەم بتوانیایە خۆ هەر نەدەبوم بە پێشمەرگە و منیش وەک هاوپیشەکانم لە ژێرسایەی ڕژێم دا دەژیام. من بە هۆی ئەوەی لە ناو یەکێتی و کۆمەڵەدا بەدوای هیچ پلە و پایەیەکەوە نەبوم، بۆیە ئازادیەکی تەواوم هەبو لە دەبرینی بیروڕاکانم. من لە هیچ نەدەترسام لەدەستی بدەم، نە لە ئێستا نە لە داهاتو، بۆیە ڕاستەوخۆ و ڕەپ و ڕەوان ڕا و سەرنج و ڕەخنەکانم دەردەبڕین. ئێ لە هەمو خۆشی و ئازادیە کەسیەکانی تاک هەر ئەو ئازادیەم هەبو، ئەوەش بەکارنەهێنم؟ بێگومان خۆ باش دەمزانی ئەم شێوازەی من نادبلۆماسی و ناحیزبیە، ناحەز و دژ و بگرە دوژمنم بۆ دروەست دەکات لە ناو سەرکردایەتیدا، بەڵام نەم دەتوانی و نەم دەویست خۆم سانسۆر (چاودێر) بە سەر بیروڕا کانی ناخی دەرون و هۆشی خۆمەوە دابنێم. یەکێ لە بڕیارەکانی کۆنفراسی دوەمی کۆمەڵە بڕیاری دروستکردنی مەڵبەندەکان بو. دوای تەواوبونی کۆنفرانس، لە مانگی ٩ ی ١٩٨٢ گەڕامەوە نەخۆشخانەکەی پارەزان.

## میوانێکی ناوەخت!

تازە گەیشتبومەوە پارەزان، ئێوارەیەکی سەرەتای مانگی ٩ ی١٩٨٢ (هیوا محەمەدئەمین) ی خوشکەزام لە ناکاو خۆی کرد بە ژوردا، من ئەوم پێش شەش

مانگ لە گوندی (ئەحمەدبرندە) بینیبو کاتێک لەگەڵ کەس و کارم لە سلێمانیەوە هاتبون بۆ لام، دواتر بیستبوم کە بە بڵاوکراوەیەکی زۆری کۆمەڵە وە گیراوە و چارەنوسی لە مەترسیدایە وچەند مانگێکە کەس هەواڵی نازانێ.

## هەر لە پشتی باوکیدا !

باوکی هیوا (موحەمەد ئەمینی ئەردەڵانی) فەقێ دەبێت، لە سەردانێک دەبێ بۆ لای برا بچوکەکەی لە گوندی (پلورە) ی نزیک شاری (سنە). شەوێک ئاغای دێ داوای لێدەکات کچێکی دێ کەی لێ مارە بکات بێ ئەوەی ئەم کچەکە ببینێ و پرسیاری لێبکات ئایا ڕازیە شو بە ئاغا بکات یان نا. موحەمەدئەمین داواکەی ئاغا دەداتەدواوە و بەگوێی ناکات، ئاغا لە هەمان شەودا بە دو کەس لە پیاوەکانی موحەمەدئەمین دەگرێ و فەرمانی کوشتنی دەردەکات. شەو کە دو پیاوەکە دەیبەنە دەرەوەی دێ، پێی دەڵێن حەیفە پیاوی ئازای وەک تۆ بکوژین، برۆ ڕاکە و ئێمەش دو تەقە بە ئاسمانا دەکەین و دەڵێین لە دەستمان ڕایکردوە. موحەمەدئەمین بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خۆی هەر بەو شەوە بە شپرزەیی ڕادەکات و بە دوسێ ڕۆژ دەگەڕێتەوە ناوچەی سلێمانی. لێرە درێژە بە خوێندنە ئاینیەکەی دەدات، تەواوی دەکات و دەبێتە مەلا لە گوندی (نێرگسەجاڕ). باوکیشم لە خۆشەویستیی ئاینەکەیدا کچە قورئانخوێنەکەی (عائیشە) ی لێ مارەدەکات. هیوا بەرهەمی ئەم هەڵگەڕانەوە و سەرپێچیە بو لە زبری و زۆرداری و زوڵمی کۆمەڵایەتیی دەرەبەگی کورد. هیوا هێشتا لەدایک نەبوە کاتێک بزوتنەوەیەکی چەکداری لە کوردوستانی باشور وردە وردە دەسپێدەکات و پارتێکی سیاسیی کوردی پشتگیری لەم بزوتنەوەیە دەکات و دواتر ناوی شۆڕشی ئەیلولی لێدەنرێ! بەهۆی پشتگیریکردن لە شۆڕشی ئەیلول مەلا موحەمەد ئەمین دوردەخرێتەوە بۆ شارۆچکەی (سەعدیە) ی نزیک جەلەولا. لەوێش هەر مەترسیە بۆ حکومەتی عێراق بۆیە دورتری دەخەنەوە بۆ شارۆچکەی (شێخ سەعد) ی نزیک شاری (عەمارە) لە باشوری عێراق و چەند ساڵێ لەوێ دەمێنێتەوە. هیوا لە ماڵی ئێمە لە گەڕەکی گۆیژە – جادەی ئیبراهیم پاشای بابان لە ساڵی ١٩٦٣ لە سلێمانی لەدایک دەبێ.

## تانك لەبەردەم کتێب !

هیوا ئاوا بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە:

«بۆ یەکەم جار خۆرسکانە بە تەمەنی ١٣ ساڵی لە مانگی ١١ ی ١٩٧٦، لە خۆپیشاندانی ناشتنی تەرمی یەکەم سەرکردەی ئیعدامکراوی کۆمەڵە (شەهابی شێخ نوری) بەشداریم کرد. ساڵی ١٩٧٨ بو لە قوتابخانەی ئامادەیی هەڵکەوت لە پۆلی سێی ناوەندی بوم. ڕۆژێک پیاوەکانی ڕژێم هاتن و کتێبە کوردیەکانیان لێسەندین و کتێبی عەرەبی یان پێداین، لەوکاتەدا هەستم بە سوکایەتیەکی گەورە کرد. وەک لە زۆربەی قوتابخانەکانی تر، خوبەخۆ وەک کاردانەوە لە قوتابخانە هاتینە دەرێ و بە ڕێپێوان لە بەردەرکی سەرا یەکمان گرت و دروشمی (خوێندن بە عەرەبیمان ناوێت و بەکوردی دەخوێنین) مان دەوتەوە، کتێبە عەرەبیەکانمان فڕێدایە سەرجادەکە. سوپایەکی زۆر بە تانک و زرێپۆشەوە دەورەیان داین و چەند قوتابیەکیان بریندار کرد. من لە ١٩٧٩ وە پەیوەندیم بە ڕێکخستنە کانی کۆمەڵە وە کرد لە سلێمانی. دەیان جار بە شەو لە کۆڵانەکاندا بڵاوکراوەی کۆمەڵەم بڵاوکردۆتەوە و بە سپرەی لە سەر دیواری ماڵەکان دروشمم دژی ڕژێمی سەدام و بۆ پشتیوانیی کۆمەڵە نوسیوە. کەم خۆپیشاندان هەبووە لە سالەکانی ١٩٨٠ و ١٩٨١ و ١٩٨٢ بەشداریم تێدانەکردبێت، هەمیشەش لە پێشەوە بووم».

## دیداری هەڵۆکان

هیوا بە نیازی ئەوەی ببێتە (پ.م) ساڵی ١٩٨١دێت بۆ پاڕەزان و چەند ڕۆژێک لەوێ لە ماڵی کوێخای دێ (حاجی شێخ ئەحمەد) دەمێنێتەوە. ڕۆژێک هەڵۆیەکی تر (سەلاحی موهەندیس) لەگەڵ دەستەیەک لە (پ.م) دێنە ناودێ، هیوا زۆر دڵخۆش دەبێت، دەچێتە لای و خۆی پێ دەناسێنێ، هیوا ئاوا باسی ئەو دیدارە دەکات:

«ئەو پیاوە بەڕاستی شەخسیەتێکی زۆر سەیر و جوانی هەبو، من هەم شەرمم لێدەکرد هەم سام و ترس، خۆیشم نازانم بۆچی ؟ کە وتم دەبمە (پ.م) ڕازی نەبو، زۆر ئامۆژگاریی کردم کە ئێمە نەوەی دواڕۆژین و شۆڕش پێویستی بە خەباتی نهێنیی ناوشار هەیە، من هەرپێم داکوتا و زۆر زۆرم لێکرد. پێی وتم دوکتۆر هەژاری خاڵت بەڕێگەوەیە و ماوەیەکی تر دەگاتە ئێرە، دەترسم دڵی دوکتۆرهەژارم لێ بئێشێ. لەم قسانەدابوین کاتێکم زانی سوپایەکی زۆر بە سێ چوار هێلیکۆپتەری بارهەڵگر

و جەنگیەوە کەوتنە سورانەوە بەسەر ئاسمانی ئەو ناوەدا و کاتێکمان زانی ئەوناوە پڕ بوو لەسەرباز. کاک سەلاح زۆر لەسەرخۆ و بەئارامیەوە بەبێ ئەوەی تێکبچێت، وتی ئێمە حەزناکەین لەناو ئەم دێیە شەڕبکەین، دەچینە پشتی دێ و لەوێ خۆمان دەشارینەوە، ئەگەر شەڕمان توش بوو، ئەوا ناچار دەبین بیکەین. من هەربەدوایەوە بوم، ویستم منیش بچمە شاخەکە لەگەڵیان، وتی هیوا دوایی دێمەوە و دەتبینم. شەڕ ڕوی نەدا و سوپاکە کشایەوە. لەئەخیردا وتی ناتوانم وەرت بگرم،ئەوە بو منیش گەڕامەوە سلێمانی».

## هەڵۆیەکی شەکەت بە دوای هێلانەیەکدا

هیوا درێژە بە گێڕانەوەکانی دەدات و دەڵێت: «بە بۆنەیساڵیادی بۆمبارانی قەڵادزێ لە ساڵی ١٩٧٤ لە ڕۆژی ٢٤ ی ٤ ی ١٩٨٢ خۆپیشاندان لە قەڵادزێ وە دەستی پێکرد، لە سلێمانیش چەند خۆپیشاندانێک کرا. لە یەکێ لەوانەدا لەبەردەرکی سەرا داوای ئازادکردنی زیندانیانی خۆپیشاندانەکانی چەند ڕۆژی پێشترمان دەکرد، پێنج کەس لەو خۆپێشاندانە بریندارکران. من لەگەڵ چەند کەسێک بوم لەپەنای دیواری کۆڵانەکان و لە سەرشەقامی ئورزدی یە وە کەوتینە بەردبارانکردنی هێزەکانی ڕژێم، ئەوانیش تەقەیان دەکرد و بەدوامانەوە بون، بەکۆڵانەکانی شەقامی پیرەمێرد و گەڕەکی شێخان دا کەوتینە ڕاکان ڕاکان و خۆشاردنەوە، وەکو باڵندەیەکی لەلانە وە دەرنراو پەڕەوازەی کۆڵان و شەقامەکان بوم.

## (تەلعەتخان): ئەوان نەبونایە لەتوپەتیان دەکرد!

هەرگیز لە ژیانم دا هێندە رام نەکردبو تاکو توشم بو بە شێرەژنێکەوە بە ناوی (تەلعەتخان) کە خوشکی عیزەدین و فاروقی مەلا مستەفا یە. پێی وتم کوڕم وەرە ماڵەوە، منی کرد بەماڵەکەی خۆیان دا و کردمی بە کوڕی خۆی، وتی من ناوم تەلعەتە، سێ کچی عازەبی هەبو ناوەکانی پێوتم. ئەوان لەسەر سفرە بون، زۆرم برسی بو، دەستم بۆ یەکەم پارو برد و کاتێکمان زانی سەربان و حەوشەی ماڵ پڕبو لە سەرباز، خێرا چومە یەکێ لە ژورەکانەوە. تەلعەتخان خۆی تێک نەدا، ئەفسەرێکی عەرەب وتی کوڕێک لێرە خۆی شاردۆتەوە بماندەرێ، ئەویش نکولیی لێکرد. زۆڵەکوردێک بە دەم

و لوتی داپۆشراوەوە هات و وتی من خۆم بینیم کە هاتەماڵەکەتەوە. کە گوێم لەو قسانە بو ئیتر نەمویست ماڵەکە توشی کێشە بن، وتم با هەرخۆم قوربانی بم نەک ئەم ژنە و کچەکانی، ترسایشم کە کچەکانیشی بەرن. بۆیە لە ژورەکە هاتمە دەرەوە و خۆمم ڕادەستی سەربازەکان کرد، زۆڵەکوردەکە وتی ئەمەیە خویەتی، ئیتر منیان گرت و باڵبەستیان کردم. تەلعەتخان و سێ کچەکەی بە تف و جوێن پەلاماری زۆڵە کوردەکەیان دا و ئەگەر سەربازەکان لەوێدا نەبونایە لەتوپەتیان دەکرد. دوا وتەی تەلعەت خانم گوێ لێبو کە بەزۆڵە کوردەکەی وت: «جا ئەوەی تۆ دەیکەیت باشە؟ وا ئەو کوڕە منداڵەیان برد، خوادەزانێت چیی لێدەکەن؟».

## کاتێك چاو دێتەزمان و دەدوێت!

«کە منیان برد تەلعەتخان زۆر دڵتەنگ بو، بەچاوەکانی دا کە زیرەکی و وریاییان لێدەباری تێی گەیشتم کە دەیەوێت پێم بڵێت: کوڕم خەمت نەبێ هەر فریات دەکەوم. تەلعەتخان دراوسێیەکی کوردی سیخوڕ و خۆفرۆشی هە بو کە نزیکترین هاوڕێی مولازم موحسین بو، ئەو عەرەبە جەللادە دەستڕۆشتوەی ڕژێم لە سلێمانی. تەلعەتخان پێ بەجەرگی خۆیدا دەنێت و تکایەکی زۆر لە کابرای سیخوڕ ولە ژنەکەی دەکات بۆ بەردانی من، تکاکەی پەسەنددەکەن. بردبومیانە مقەڕی تەواریەکە لەگەڕەکی چوارباخ، گوێم لێ بو مولازم موحسین هەواڵی منی پرسی لە پاسەوانەکان و ئەمانیش دەرگای ژورە تاکە کەسیەکەیان بۆکردەوە. من دانیشتبوم، مولازم موحسین بە جوێنەوە هاتە ژورەوە، هێندە زل و قەبە بو من لەچاویدا چۆلەکە بوم، وتی هەستە سەرپێ و لێی پرسیم تۆ (هیوا) ی، وتم بەڵێ. بە دەست بەسراوی و بە فەرمانی ئەو سێ چوار پاسەوان کەوتنە لێدانێکی زۆرم، ئینجا بەتوڕەییەوە پێی وتن بەسە،غەزەب لەدەموچاوی دەباری، ناوچاوانی هەموی عارەق بو، لە دڵی خۆمدا وتم ئێستا دەمبەنە پەنایەکەوە و گولەبارانم دەکەن. هاتە نزیکمەوە و پێی وتم یەکجاری تر خۆپیشاندان بکەیت هەر دەتکوژم، ئینجا دو زلەی لێدام و وتی دەبڕۆ. دەرگایان بۆکردمەوەو ئازادیان کردم. یەکسەر چومەوە مالی تەلعەتخان و بە سوپاسگوزاریەوە ئاگادارم کرد کە من ئازاد کراوم».

## خوليا وشەيدابون

(هيوا) درێژە بە گێرانەوەی بەسەرهاتەکانی خەباتی نهێنیی ناوشاری دەدات و دەڵێت: «دوای دوسێ هەفتە لە ئازادکردنم دەستم کردەوە بە بڵاوکردنەوە ی بەیان و ڕاگەیەنراوی کۆمەڵە و دروشم نوسین لەسەر دیواری ماڵەکان. یەکێک لەو جارانە لە ساڵی١٩٨٢ بو ڕۆژی یەکی ئایاری جەژنی کریکاران بو. کاتژمێر یەکونیوی شەو ملپێچێکم لەمل و دەممەوە ئالاندبو، وەک هەموجارێ لە حەوشەی ماڵەکەمانەوە کە لە (گردی جۆگە) بو بازم دایە کەلاوەکەی تەنیشتمان و لەنێو تاریکایی کۆلانە پێچاوپێچەکاندا ونبوم و هەندێ جاریش دەکەوتمە بەر ڕوناکیی گڵۆپی سەرجادەکان. بەناو چەند کۆڵانێک دا دەرباز بوم و بەنێو ماڵانێکی زۆر دا بەیانەکانم بڵاوکردەوە. ئینجا دەمویست لەکۆلانی تاریک و تەنگەبەرەوە خۆم بگەیەنمە ئیسکان و مامۆستایان و خوێندنگەی ئامادەیی ئاشتی».

## کەروێشك و گەلەسەگ !

«هەرکە گەیشتمە سەری کۆلانێک، کۆمەڵێک هێزی چەکداری تایبەت (قوات خاسە) کە دیاربو پێشتر چاودێریی منیان کردبو هاتنە دەرەوە و ڕێگەیان لێگرتم، بە ناچاری خۆمم کرد بە ناو (مزگەوتی پیرەمەگرون) دا. ژێر جلەکانم پڕ بون لە بەیانی چاپکراو کە هانی خەڵکی دەدا بۆ ڕاپەڕین. ویستم بچمە ئاودەسەکان و لەوێ بەیانەکان فڕێبدەم، بەڵام دو سەرباز پێشیان لێگرتم و بەدەست ئاماژەیان بۆ ژوری مزگەوت کرد کە بڕۆم بۆ ئەوێ. کەمێک سەرمام بو، خۆم وەکو کەروێشکێک دەهاتە پێشچاو کە ڕاوچیەک تولە و تانجیی دنیای تێبەردابێ. ئاوڕم بۆهەرلایەک دەدایەوە سەرباز بو. ئاوڕم بۆ لای ڕاستی حەوشەی مزگەوتەکە دایەوە، سەرنجم چوە سەرئەو سەکۆیەی ڕۆژگارێک ڕەمەزانان لەسەری بە پاقلاوە و لوقمەقازی و زلوبیا ڕۆژومان دەشکاند و دواترتەراویحمان دەکرد. لەو چرکەکاتەدا ئەوانە وەکو فیلمی یادگاری بەبەرچاوم دا هاتن. رومکردە ناو نوێژگای مزگەوتەکە و دو سەربازەکەش بە دوامەوە بون، تەنیا و بێ ئەهلی جەماعەت و مەلای مزگەوت خۆم نوێژم دابەست، سەردەستەی سەربازەکان چاوەڕێی کردم تاکو نوێژەکەم تەواو کرد. هاتە تەنیشتم و وتی نازانی ئێستا زوە بۆ نوێژکردن ؟! وتم نا ئێستا سەعات پێنجە، بۆ نەگبەتی

سەعاتم لەدەست دا بو، وتی سەعات چەندە ؟ وتم سەعاتەکەم هەڵەیە، ئیتر زانیم وردە وردە ڕێگەیان لێگرتوم، سەیرێکی سەعاتەکەی خۆی کرد، وتی نا سەعاتەکەت زۆر تەواوە. کەمێکی تر نزیک بۆوە و وتی ئەوە چیە لەبەرباخەڵ و سەرسینگت ؟ وتم: چاپکراوی خۆئامادەکردنە بۆ تاقیکردنەوەکانی قوتابخانە ! وتی ئادەی بۆم بخوێنەرەوە ! ئیتر زانیم هیچ شتێک سودی نیە و ڕزگارم نابێت، هیچی ترم نەوت و ئەویش پرسیاری تری نەکرد و هەمو بەیانەکانیشی لێسەندم. لەوکاتەدا بیرم لای ماڵەوەبو چۆن ئاگاداربکرێن کە من گیراوم، چاوم گێڕا و سەرم هێناوبرد بۆ ژوری مجەور تاکو بمبینێت، بەڕێکەوت مجەورەکە سوچی پەردەی ژورەکەی لادا و بینیمی، دڵنیا نەبوم ئایا منی ناسیوەتەوە یان نا ؟».

## ڕۆح لە سەرەوە، جەستە لە بەردەمیان!

«لەپێشی دەرگای مزگەوتەکە بەکەلەپچە دەستیان لەدواوە بەستم، بەقۆناغە تفەنگ بەربونە گیانم، سەرم پڕ بو لەخوێن. سواری موسەلەحەیەکی سەربازیان کردم و بردیانمە ئیدارەی ئیستیخباراتی عەسکەریی و فڕێیاندامە ژورێکی تەنیایی. ژورەکە نەگڵۆپی تێدا بوو نە پەنجەرە، پێوانەکەی ۸۰ بە ۱۳۰ سم دەبوو. پاش سەعاتێک چەند کەسێک هاتن و چاویان بەستمەوە، بە کێبڵی کارەبایی ئەستور بەربونە گیانم، بەجۆرێک کە خەریک بو لەهۆش خۆم دەچوم. عەرەبێک کەوتە پرسیارکردن لێم، بەڵام من نەمدەتوانی بە عەرەبی وەڵامی بدەمەوە، ئەوە بوو کوڕێکی کوردیان هێنا بۆ وەرگێڕان. هەڵیانواسیم بەقولاپێک دا، دو یا سێ کەس بوون کە بەکێبڵ لێیان دەدام، هەستم کرد خوێن بەهەمو گیانم دا هاتە خوارەوە و وردە وردە لەهۆش خۆم دەچوم ، هێزم لێبڕابو، تەحەمولی ئەشکەنجەکانم زۆر کرد، باڵەکانم خەریک بوون دەردەهاتن. پاش لێدانێکی زۆر لە قولاپەکەیان کردمەوە و بەبوراوەیی بە دووکەس بردیانمە ژورەکەم و فڕێیاندام.» «پاش نازانم سەعاتێک بو یان دوو سەعات کەمێک هۆشم بەخۆمدا هاتەوە. هەمدیسان دوو نەفەرهاتن، منیان بەزۆر هەستاند و بردیانمەوە هەمان ژور بۆ لای هەمان لێکۆڵەر و وەرگێڕی کوردی. بەپێوە وەستاندیانم و بەکێبڵی ئەستور کەوتنە دارکاریکردنی قاچەکانم بەتایبەتی پوزی قاچم، هێزی وەستانم نەمابو دەکەوتم و بەدو کەس بەرزیان دەکردمەوە و دیسان بەردەبومەوە». «لەویادا بەزەییم بەخۆم دا دەهاتەوە، بەزەییم بەلاشە و جەستەی خۆم دا دەهاتەوە. پێم سەیر بوو

مرۆڤ هێندە دڕندە بێت، من نێچیرێک بوم لەبەردەم کۆمەڵێک ڕاوچیی دڕندە دا کە دەیانویست کەوڵم بکەن. ئەمجارە منیان لەسەر تەختێک ڕاکێشا و شتێکی بەرزیان لەژێر قاچم دانا، بە دوو کەس و بەکێبڵ بەربوونە ژێر پێم، پێکانم هەستیان تیا نەما، هەستم کرد زۆر ئاوسا بون».

## ئەگەر ئەدیسۆن بیزانیایە؟

«بەوحاڵەشەوە دو وایەری کارەبایان هێنا، سەرێکیان بەست لە پەنجەیەکی دەستم و سەرەکەی تریشی لە پەنجەگەورەی قاچم. گوێم لە قرەقری شتێک بوو، وەکو بڵێی هاندڵی لێبدەن، ئیتر بەدوایدا تەزویەکی بەهێزی کارەبایی خۆی بەناو لەشم و دەمارەکانم دا کرد، برستی لێبڕی بوم، خەریک بو لەهۆش خۆم دەچوم. گوێم لە یەکێک بو بەعەرەبی دەیگوت کافی (بەسە)، ئینجا منیان لەسەر تەختەکە داگرت. لەبەرئەوەی پێکانم ئاوساو بوون، نەمتوانی بەپێوە بووەستم، کەوتم. پێکانم ئازارێکی زۆریان دەدام، دەسوتانەوە وەکو بڵێیت وەجاخێک پشکۆ لە ژێریان بێت. پاشان لەسەرزەویەکی تەخت و ڕەقی بێ فەرش منیان لەسەر پشت ڕاخست و جارێکی تر کەوتنەوە لێدانی بنی پێکانم، لەلێدان وەستان. ئینجا کاتێکم زانی زەلامێکی زۆر قورس بە هەردو پێی هاتە سەر سنگم، جارێک دادەبەزی و جارێکی تر دەهاتەوە سەرسنگم، جارجارەش زۆر دەمایەوە، هەناسەم بەتەواوی تەنگ بو بو. دیسانەوە کەوتنەوە کارەبا لێدانم، هەستم بەخۆم دەکرد وەکو مریشکی سەربڕاوم لێهاتوە کە چۆن هەڵبەزودابەز دەکات. ئەو کارەبایە زۆر ئازاربەخش بو، لەگەڵیشی دا بەکێبڵ لێیان دەدام. بەهەرحاڵ، بەدوای لێدانەکان ئەوەی ڕویدا،ڕویدا........ !».

## بە هێندەی شاخی پیرەمەگرون !

«دوای دو ڕۆژ کەوتنەوە ئازار و ئەشکەنجەم، جلەکانم لە خوێن و ئارەقی جەستەم هەڵکێشرابون و بۆنێکی ناخۆشیان لێدەهات، لەشم پڕ بو لە ئەسپێ. لەو شوێنە دا خەو نەبو، زەمەن و ڕۆژگار بەتەواویی وەستابون و مانای خۆیان لەدەست دابو، نەتدەزانی شەوە، ڕۆژە، چەندی مانگە و......لەو شوێنەدا تەنیا گوێت لەناڵە و

گریان بو، دەتبینی مرۆڤیان دەبرد بۆ ئەشکەنجە و لەوسەرەوە لەتویی بەتانیەک دا دەیانهێنایەوە و فرێیان دەدا. شەو خەو نەبوو. شەوان لەسەعات هەشتەوە دەستیان دەکرد بە لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان. من شەوی واهەبووە سێ جار دەیانبردم بۆ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە. نەیاندەهێشت بۆ سەعاتێکیش بخەویت، سەردڵت هەمیشە پڕ بو لە خەفەت و ترس، ترسێک کە هەندێکجار هەناسەی سوار دەکردیت. ڕۆژێکیش لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە نەبوایە، پاسەوانەکان دەهاتن و دەکەوتنە جنێودانی زیندانیان و گوێگرتن لە چرپە و قسەیان، بەکێبڵ هەتاکو تین و هێزیان تێدا بو دەیانکێشا بە دەرگاکانمان دا و ئێمەش دادەچڵەکین.

ڕۆژێکیان دڵم قوڵپی گریانی دەهات. تەنیایی و خەفەت و ئەو زوڵم و لێدانانە لە هەناومدا پەنگیان خواردبۆوە و لەسەر دڵم بەئەندازەی شاخی پیرەمەگرون قورساییان هاویشتبوە سەرم. لە پڕ کۆنترۆلی خۆمم لەدەستدا، دەنگم بەرزکردەوە و هاوارم دەکرد و دەگریام. زیاندانیەکان دەیانگوت براکەم چیتە ؟ لەڕای خوادا هاوار مەکە وەڵاهی دەمانکوژن. هاوارم دەکرد دایکتان ب.....م، ک... م بەشەرەف و سەرۆکتان و زۆر شتی تر. زیندانیەکان زۆریان هەوڵدا تاکو ئارامیان کردمەوە».

## چۆن کێچ دەبێت بە مێش؟

«پاش نزیکەی مانگ و نیوێک لە ژوورە تاکەکەسیەکەمەوە گواستمیانەوە بۆ ژورێکی زۆر بچوک کە هەشت کەسی تێدا بو، چەند بەتانیەکی بۆر و قاوەیی کرابونە ڕاخەری ژورەکە، بەتانیەکان زۆر بەئاسانی ئەسپێت لەسەریان دەبینی. ئەسپێکان هێند خوێنی زیندانیان مژیبو قەڵەو بوبون و ڕۆیشتنیان گران و خاو بو، کێچەکانیش بەهەمان شێوە کە بازیان دەدا، دەتگووت مێشن و دەفڕن. ژورەکە دیوارەکانی چڵکن و پلکن و پڕ لە نوسینی یادگاریی زیندانیان بو. لەسوچی سەرەوەی ژورەکە دەبەیکی گەورە دانرا بو کە زیندانیان بەبێ شەرم ناوسکی خۆیان تێدا خاڵیی دەکردەوە، بۆگەنی ژورەکە تەواو وەڕسکەر بو، ڕۆژ نەبو زیندانی بەسەر داروبەردی ژورەکە دا نەڕشێتەوە، وەزعم لەو ژورە ئێجگار نارەحەت بو، زۆر پەرێشان بوم. هیوام بەوە دەخواست بڕۆمەوە ژورە تەنیاکەم، باش بو تەنیا سێ چوار ڕۆژ تێیدا مامەوە».

## هاوخەمیی نێوان مرۆڤ و چۆلەکە !

«بە چاوی بەستراوەوە بە ئۆتومبیل گواستیانمەوە بۆ (بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشی سلێمانی). بردیانمە ژورێکی نزیکەی بیست مەتر دوجایی کە بیست کەس زیاتری تێدابو. پێنج کەسیان کە لە ئێمە زۆر بەتەمەنتر بون لە سەر حیزبی شیوعی گیرابون، هەمویان خەڵکی هەڵەبجە بوون. ئەوەی زۆر سەرنجی منی ڕادەکێشا ئەوە بو کە لەماوەی زیندانیم دا ڕێکەوتی کەسێکم نەکرد کە لەسەر پارتیی بارزانی گیرابێت. زۆربەی گیراوەکان بریتی بون لە یەکێتی، ئینجا شیوعی، ناوبەناو حیزبی سۆشیالیستی کوردوستان و قلەقلەیش لەسەر پارتی گەلەکەی سامی عەبدوڕەحمان گیرابون. لەچاو ژورەکانی ئیستیخبارت ئەوەی ئاسایش گەورەتر و پاکتر بو، ئەگەرچی هەمیشە تاریک بو بەڵام پەنجەرەیەکی بچوکی نزیک لە بنمیچی ژورەکەی تێدا بو کە بە سێ چوار شیشی ئەستور گیرابو. حەمامێکی تێدابو تەنیا ئاوی ساردی هەبو. گەورەترین خەڵات کە هی خۆمم کرد ئەوەبو یەکسەرچومە حەمام و خۆم لە ئەسپێ و چڵک و ئارەق و خوێن پاککردەوە. ئەوەی تر کە زۆر دڵمی خۆشکرد بونی پەنجەرە بچوکە شیشبەند کراوە کە بو. ئەو پەنجەرەیە توانای بە ئێمە بەخشی بتوانین هەست بە کات بکەین، ئاسمانێکی شین ببینین و جارجارەش گوێمان لەدەنگی خەڵکی دەرەوەی زیندان بێت.

جارجارە چۆلەکەیەک دەهاتە بەردەم پەنجەرەکە و جریوەیەکی دەکرد، یەکێکی تر دەهاتە بەردەم پەنجەرەکە و ملی بەملاولادا لاردەکردەوە و سەیرێکی ناو ژورەکەمانی دەکرد، وەک بڵێی هاوخەمی ئێمە بێت یا پەیامێکی پێبێ و بیەوێت بە ئێمەی بگەێنێت، کاتێکیش باڵەکانی لێکدەدا و دەفڕی لە دڵی خۆمان دا خواحافیزیمان لێدەکرد. چاوی زۆرێک لە زیندانیەکان لەسەر ئەو پەنجەرەیە بو، چاومان لەچاوەڕوانیی ئەو چۆلەکەیە بو کە لە بەردەم پەنجەرەکە دەنیشتەوە. ئەگەر چۆلەکەکە دیار نەبوایە دەمانگوت ئاخۆ چی بەسەرهاتبێت، داخۆ چ منداڵێکی چەتون و لاسار بەردی لە کەلانی دارلاستیکێک هاویشتبێت و جەستەی ناسکی بێ هەست و جوڵە کردبێت و ئێستا بێناز لەسەر چ زەویەک کەوتبێت. ئێمە ئەگەرچی زیندانی بوین و لە دنیای ئازاد بێبەش بوین، بەڵام ئەو چۆلەکەیە بۆخۆی هێزێک بو تەوژمی ئازادیی پێدەبەخشین. ئەو دیمەنە سروشتیانەی لە دەروازەی پەنجەرەکەوە دەمانبینی دانسقە بون و زۆر جیاواز و دور بون لەگەڵ کەشی پڕلە ترس و پڕ لە خەمی ناو زیندان».

## (سۆران) ی ئیسکان

«ڕۆژێک کوڕێکی منداڵکاریان برد بۆ ئەشکەنجە ناوی سۆران بو ماڵیان لە گەڕەکی ئیسکان بو. لەو سەر کە هێنایانەوە، پاسەوانەکان لە سەر بەتانیەک ڕایاندەکێشا، سۆران بوبو بە لاشەیەکی ساردوسڕ و بێجوڵە و بێگیان. خوا دەزانێت دواتر لە کوێ ناشتبوویان».

## بەریەککەوتنی کێبلەکان

«بەیانیەک دوو ئەمن هاتن بۆ ژورەکەمان، چاویان بەستم و کردیانم بەژورێکدا، لەسەر کورسیەک دایاننیشاندم و دو سێ کێبڵیان تێسرەواندم. کابرای لێکۆڵەر پێیانی گوت: هسە کافی (ئیتر بەسە) ! دوو جەلادەکە هەر لە ژورەکە دا مانەوە. لێکۆڵەرەکە گوێم لێ بو فایلێکی دەرهێنا و چەند پەڕەیەکی ئەم دیواودیو کرد، پێی گوتم گوێبگرە: کەوتە خوێندنەوەی چەند دێڕێک و وتی ئەو شتانەی خوێندمەوە قسەی تۆن ؟ وتم نەخێر قسەی من نین، ئەوانە هیچیان ڕاست نین و لەخۆیانەوە شتی وەهایان نوسیوە. هەرکە وەهام گوت، دیار بوو ئاماژەی بۆ دو کەسەکە کرد لێم بدەن. پڕ بەدنیایەک جنێوی ناشیرینی پێدام، دوسێ زلەی بەهێزی لێدام کە خەریک بو لەسەر کورسیەکە بکەومە خوارەوە. کەوتە نەڕەنەڕ، لە ڕاستی دا دەنگی زۆر سامناک بو. من بەلێدان ڕاهاتبووم، وامدەزانی یاریم لەگەڵ دەکەن، پێستم خۆشە بوبو، دیسانەوە پێی گوتم ئەوانە قسەی تۆن و شاهیدیشمان هەیە کە تۆ ئەو قسانەت کردووە. من سوێندم خوارد کە ئەو قسانە هی من نین و من شتی وەهام نەگوتوە. ئیتر دوو جەلادەکە بەکێبڵ بەربوونە گیانم، کێبڵ لەدوای کێبڵ، هەندێک جار لێیان تێکدەچو و کێبڵەکانیان بە سەر جەستەی لاوازم دا بەریەک دەکەوتن، هێندەی نەمابو گیانم دەربچێت».

## وەك لێزمەی باران!

«لێدانیان وەستاندەوە، کابرای لێکۆڵەر دیسانەوە لێی پرسیمەوە ئەوانە قسەی تۆن و دەبێت ئیمزای بکەیت. وتم بەخوا ئەوانەی تۆ خوێندتەوە من ئەوشتانەم نەگوتوە و کەسیش ناناسم، ئەو کەسانەیشی ناویان لە فایلەکەم دا هاتووە من نایانناسم، پێی گوتم گواد بن گواد (گەوادی کوڕی گەواد) تۆ وادەزانیت ئێمە قەشمەری تۆین ؟! ئێستا تێتدەگەێنم کە قەشمەریات یەعنی چی ! فڕێیاندامە سەرزەویەکە، بەو دو

جەلادە، کە بەلێدانەکانیان دا دیار بو کەتە و زل بون، کەوتنە گیانم. من وا لە ئەشکەنجە شارەزا بوبوم ئەگەر کێبلێکیان لێم بدایە، دەمزانی ئەو کەسە بەهێزە یاخود لاواز. بە هەردوکیان کە شێوازێکی زۆر بێبەزەییانە و دڕندانەیان هەبو، بەجۆرێک لێیاندام، هەستم دەکرد لە مێژە ئەشکەنجەی کەسیان نەداوە و بیری ئەشکەنجەدانی مرۆڤ دەکەن. لەسەر زەویەکە لول بوبوم، لە ژێر قامچیەکانیان بەڕاست و چەپ دا ئەمدیدیوم دەکرد، هەولم دەدا جەستەی خۆم لە قامچیەکانیان بپارێزم، بەلام سودی نەبو، ئەوانە زۆر شارەزای ئەشکەنجە بون، ئەگەر شوێنێکت بپاراستایە لە لێدان، خێرا بەردەبوونە شوێنێکی تری جەستەت، من نەمدەزانی چ شوێنێکم لە قامچی بپارێزم. گورزی کێبل وەکو لێزمەی باران بەسەر لاشەم دا دەباری، گورزەکان بەجۆرێک بەهێز بون ئیتر لەشم لەوە زیاتر بەرگەی نەگرت، هەستم دەکرد بوراومەتەوە، بەجۆرێک ئاگام لەخۆم نەبو، کە ئیتر هەستم بەگورز وەشاندنی کێبلەکان و ئازارەکان نەدەکرد. پشتم یەکپارچە بو بەخوێن و بە جەستەمدا دەهاتە خوارەوە. کابرا ی لێکۆڵەر لێدانەکانی وەستاند و وتی: ها ئێستا دەڵێی چی، وەلاهی ڕاستی نەڵێیت هەرئێستا دەتکوژم ؟ وتم بەخوا من ئاگاداری ئەو شتانە نیم. ئیتر دوسێ کێبلی تریان لێدام و ئەمری کرد بە دوانەکە بیبەنەوە ژورەکەی، وتی ئێستا عەفوت دەکەم و بڕۆ بیری لێبکەرەوە. هێنایانمەوە ژورەکەم و لەسەر زەویەکە فڕێیان دام. دوای چەند خولەکەێک زیندانیەکان لێم کۆبونەوە و کەوتنە دڵنەوایی و شێلانم و تیمارکردنی برینەکانم. ئیتر بەگشتی لێکۆڵینەوە وەستا بو، بەلام ئەشکەنجەدان بەردەوام بو. من ئەوە دواهەمین لێکۆڵینەوەبو لەگەڵم کرا».

دوای چەند ڕۆژێک و بە بێ ئەوەی چاویان ببەستن، هیوا لەگەڵ دە زیندانیی تر دەبەن بۆ ژورێکی بەڕیوەبەرایەتیی ئاسایش، هیوا ئاوا ڕوداوەکە دەگێڕێتەوە:

## بە گریانی وشك بە نالەی بێدەنگ

«پاش ماوەیەک دانیشتن لەو ژورە، کاتێکم زانی کۆمەڵێک ژن و پیاو بەبێدەنگی خۆیان کرد بە ژوردا. ئەوەی بەچاوی خۆم بینیم بڕوام نەدەکرد ڕاستی بێت، وامدەزانی خەونە. وادیاربو پێشتر ئاگاداری ئەو ژن و پیاوانە کرابو کە نابێت کەس دەنگی لێوە بێت یا بگری، بۆیە زۆر لەسەرخۆ و ئارام هەنگاویان بەرە و ژورەکەی لای ئێمە دەنا. باوکمم لەنێو ئەوانەدا بینی. دۆخێکی سەیر بو، بەتەواوی واقم وڕما بو،

نەمدەتوانی بڕوا بکەم بە نزیکترین هاوڕێی خۆم، کە چاوەکانم بو. بینینی باوکم بۆ من بوە مایەی هەژان و سەرهەڵدانی خەمێکی قوڵ و گران و پڕ ناسۆر لە ناخم دا.هەستم کرد باوکم بەبینینی من بەتەواوی سیمای دەموچاوی تێکچو، هەستم بە ناخی دەرونی دەکرد، هەستم کرد باوکم بوەتە دەریایەک لە هەستی پڕ لەباوکایەتی، بەڵام نەیدەزانی بە چ کون و قوژبنێکی ئەم دنیایە دا بیڕژێنێت و دەریبڕێت. کە منی بینی باوەشی پێمدا کرد و بەبێدەنگی بەسەرم دا گریا، منیش دەمم بەسترابو، نەمدەزانی چۆن پێشوازی لەباوکم بکەم، هەروا بەواقوڕماویی لەبەردەمی دا چەقیبوم، دەتگوت زۆنگاوێک قوڕ و لیتە منیان بەرەو قوڵایی خۆی ڕاکێشا بێت. باوکم لەوێ دا نەیتوانی بەرگەی ئەو دیمەنە بگرێت، چەند هەنگاوێک لە من دورکەوتەوە و ڕوبەڕوی ئەفسەرێک ڕۆیشتو و پێی وت: بەڕێز بۆ واتان لەو منداڵەم کردوە، دەبینم وەزعی زۆر خراپە. من بیرم نەماوە کابرا چۆن وەڵامی باوکمی دایەوە. بەهەرحاڵ باوکم هاتەوە لای من، دەستێک جلی بۆ هێنا بوم، بەو جلانە زۆر دڵخۆش بوم، چونکە بەڕاستی جل نەبو لەبەرم دا».

## دە خولەك خەونێکی سەیر

«من جەستەم بەتەواویی تێکچوبو، ئەوەندە لاواز بوبوم بەئاسانی دەتتوانی بزانیت چەند پەراسو بە بەدەوری سینگم دا چەقێنرا بون. ڕەنگم پێوە نەما بو، سپی سپی، زیاتر لە مردویەک دەچوم وەک لە زیندویەک، چاوەکانم بەقوڵایی کاسەی سەرم دا ڕۆچوبون و دیمەنێکی ترسناکی پێبەخشیبوم. ئاوێنەیەک لەوێدا بو، کەسەیری خۆمم کرد لەخۆم ترسام. لە نێوان حەپەسانی من و باوکم دا هیچ وشەیەک ئاڵوگۆڕ نەکرا. ئاگاداری باوکم و کەسەکانی تر کرابو، کە ئێمە یارمەتیدەری تێکدەر و یاخیەکانین و چارەنوسێکی باش چاوەڕێمان ناکات، ئەم قسانە باوکمیان وا ترساند بو، کە لەوانەیە تەرمەکەشم نەبینێت. ئەم دیدارە هەموی دە خولەکی خایاند. وەکو خەونێکی درۆزنانە بەبەردەمم دا گوزەری کرد و کۆتایی هات. باوکم و ئەوانی تر ڕویان لێوەرگێڕاین و بە گوزەرێکی تر دا ڕەوانەکرانەوە و ئێمەش بەرەو ژوری زیندان».

چەند ڕۆژێک دواتر هیوا لەگەڵ پێنج زیندانیی تردا و دوای نزیکەی سێ مانگ ئەشکەنجەدانی درندانە لە زیندانەکانی سلێمانی، لە قەفەزی مکوم داخراوی ئۆتومبیلێکی ئاسایشدا دەگوازرێتەوە بۆ زیندانی بەدناوی دەستەی لێکۆڵینەوە (هیئة تحقیق) لە کەرکوک، ئاوا باسی ئەم ڕوداوە دەکات:

## مێش و مەگەزی زیانبەخش !

«هەم ترسم هەبو، هەم دڵیشم خۆش بو، ترسم لە مەرگێک هەبو، کە ئیتر مرۆڤە جوانەکان، سروشت، باڵندە، هونەر، ئەدەب....هتد نابینمەوە ؛ دڵیشم بەوە خۆش بو، کە دۆسیەکەم لابەلا دەبێتەوە، جا بەمەرگ بێت یاخود حوکم، چونکە لە زیندان و ئەشکەنجە بێزار و بێتاقەت بوبوم. سەیارەکەمان لەبەردەم بینایەک دا وەستا کە لە ڕوکاری دەرەوەی هەم بچوک بو هەم هیچ کەسێک بیری بەلای ئەوە دا نەدەڕۆشت کە ئەوشوێنە گەورەترین دەستگای لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە بێت. بیناکە زۆر سادە دیار بو، زیاتر لە فەرمانگەیەکی مەدەنیی دەکرد. چاویان بەستین و ئینجا لە ئوتومبیلەکە دایانبەزاندین و بەناو دەرگایەکدا کردیانینە ژورەوە. پاسەوانەکان کەوتنە جنێوباران وپەلاماردانمان، بەچەند کەسێک بە کێبڵ بەربوونە گیانمان، لێدانەکان زیاتر لە قاچ و ڕان و باڵمان بو. گیانم بەوەبو پشتم بەدیوارەکەوە بو دەنا ئەو برینانەی کەبەپشتمەوە بون و لەژێر ئازاریاندا خەو و پشوم نەبو، دەکولانەوە و دیسانەوە گیانم دەبوەوە خوێن. بەوجۆرە تاکو دەمەو ئێوارە نۆ سەعات بەبێ نان و ئاوماینەوە. هەبێە بۆنێکی زۆر ناخۆش و بێزارکەری هەبو بۆیە کەس ئیشتیهای خواردنی نەدەکرد. بۆنی ناخۆشی هاڵاوێکی شێدار دەهات بە ڕوماندا کە زیاتر لە بۆنی ڕشانەوە و خوێنی وشەکەوەبوی دەکرد. ئەو چەند سەعاتە چەندین جار دارکاریان کردین، ئێمەش زەلیل و چاو و دەست بەسراو توانای ئەوەمان نەبو خۆمان لە قامچیەکانیان بپارێزین، لێدانەکان زۆر بێڕەحمانە و دڕندانە بو. جارجارە گوێمان لە هاوار و ناڵەی ئەو زیندانیانە دەبو کە دەیانبردن بۆ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەیان دەدان، تەنانەت گوێم لە قیژە و هاواری ژنیش دەبو. ئازاری قاچ و باڵ و ڕانمان زریکەی دەهات بەڵام ڕێگەیان پێ نەدەداین قاچ درێژ بکەین. جارێکیان قاچم درێژ کرد، لەپڕێک دا زەلامێک هات و پێیەکی کردە سەر قاچم و بەجۆرێک پانی دەکردەوە وەخت بو ڕۆحم دەربچێت، لەتاوا هاوارم کرد، کاتێکم زانی بەدوکەس بەکێبڵ بەربونە گیانم و زۆر بێڕەحمانە و دڕندانە ئەشکەنجەیان دام، ئیتر بەناچاریی قاچەکانم هەڵکێشایەوە دواوە. ئەو هەمو ماوەیە نە نانیان پێداین نە ئاو، نە ڕێیان پێداین بچینە ئاودەس. لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەی ڕۆژانە بوە ناوبەناوە و لەپڕێک دا نەما. ئێستاش کە بیردەکەمەوە نازانم چۆن ئەو مانگەم لەوێ بردەسەر،

چۆن توانیم لە ژورێک دا بژیم کە چل و یەک کەسی تیادا خزێنرا بو، ژورێک نە هەناسەی تێدا دەدرا نە ئارامیی دەرون هەبو نەخەو. لەو ماوەیەی من لەوێ بوم دو کەس مردن و زۆر بە بێڕێزی و دور لە هەمو و نەریتێکی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی جەستەیان ڕادەکێشا، من تەواو هەناسەم لێبڕا بو، بەجۆرێک کە هەموو ساتێک چاوەڕێی مردن بوم. ئێمە لەوێ دا بێبایەخترین مرۆڤ بوین، کاتێک پاسەوانەکان دەرگایان دەکردەوە و بەناو ئێمەدا دەیانڕوانی ئێمە لەچاوی ئەواندا مێش و مەگەزی زیانبەخش بوین و دەبێت پان بکرێینەوە. من شانسم هەبو نەیانبردم بۆ هەیئە ی کۆن، لەوێ ئەشکەنجەدان زۆر سەختتر و دڕندانەتر بو، هەرلەوێش دەنێردرایتە شوێنێک بۆ حوکومدان بەسەرت دا، یان دەبرایتە موسڵ یان بەغداد. من ئەوە دوا تەحقیق بو لە هەیئە لێم کرا».

هیوا پێش ئەوەی بۆ دادگاییکردنی کۆتایی بنێردرێتە بەغداد یا موسڵ، ئەم ڕوداوە کوتوپڕ و چاوەڕێنەکراوە دەگێڕێتەوە کە زیاتر لە پەڕجو (موعجیزە) دەکات نەک ڕوداوێکی مرۆڤکرد:

## ئەڕۆن، بەڵام دێنەوە!

«ڕۆژێک گۆرانکاریەکی سەیر لە هەلسوکەوتی پاسەوانەکان ڕویدا، کە ئێمەی زۆر سەرسام کرد. نانیکی باشیان بۆهێناین کە بریتی بو لە مریشک و برنج و شلە، ماوەی سەردانمان بۆ تەوالێت درێژکرایەوە، دەرگای هەموو ژورەکانیان کردە سەرپشت و ڕێگەیان پێداین تێکەڵی یەکتربین، بووە ماچ وموچ و پێکەنین و شادی. پاسەوانەکان دەرگای ڕاڕەوەکانیان کردەوە و کەوتنە هەواگۆڕکێ ی ژورەکان، ئەمە دو ڕۆژ بۆ سێ ڕۆژی خایاند، کەس نەیدەزانی نهێنیەکە لە چیدایە، بەڵام بەگشتی هەمومان چاوەڕێی مژدەیەکی خۆش بوین. پاسەوانەکان هەڵسوکەوتیان لە دوژمنکارانە و دڕندانەوە بۆ نەرمی دەڕۆیشت، هەستی بەزەییت لەنێو چاویاندا دەبینی، بەڵام لێکۆڵەرەکان کە لە پلە دا لە پاسەوانەکان بەرزتر بون گۆڕانکاری لە هەست و سۆزیان دا بەدی نەدەکرا، بگرە چاویان ئاگراویی تر دەبو، وەکو بڵێی ئەوان بەئازادبونی زیندانیان بێکار و بێدەسەڵات دەبون. وادیار بو لە ڕۆحیەتی گەلی کورد تێگەیشتبون کە گەلێکی کۆڵنەدەرە و ژێردەستەیی قبوڵ ناکات، بۆیە دەیانزانی ئیمڕۆ زیندان چۆڵ دەبێت و سبەینێ سەرلەنوێ پڕدەبێتەوە».

## لەدایکبونەوەیەکی تر!

«بەیانیی ڕۆژێکی هەتاویی گەرم هەمو زیندانیەکانیان لە حەوشە چیمەنڕێژەکە کۆکردەوە و دایان نیشاندین، سێ بۆ چوار کچی کوردم لەوێدا بینی. (موهەیمەن) ی پارێزگاری کەرکوک هاتە پێشەوە و کەوتە قسەکردن. پاش مەدح و سەنای بەعس و سەدام حسێن، ئینجا وتی: سەرکردەمان خوا بیپارێزێت فەرمانی لێبوردنی بۆ هەمو زیندانیانی سیاسی لە مەنتیقەی شیمال دەرکردوە، هیوادارم حورمەتی ئەم بڕیارە بگرن و وەکو سۆزی باوکێک بۆ منداڵەکانی لێی بڕوانن. ئەو شەوە تاکو بەیانی خەو نەچووە چاومان. بەیانی زو سەرتاشیان هێنا و کەوتنە تاشینی سەر و ڕیشمان. جلیشیان بۆداناین کە کێ جلی پێویستە جلێک هەڵبگرێت، منیش هەستام و کراسەکەم کە لە خوێن هەڵکێشرا بو دامکەند و کراسێکم هەڵگرت و لەبەرم کرد. لە دەرگایەکی زۆر بچوک لە دیواری پشتی ئیدارەی هەیئەوە ئێمەیان ئاودیو کرد و ڕێگەیان داین بە ئازادی شوێنەکە جێبێڵین و بڕۆین، من وام هەستکرد کرد کە تازە لەدایک بوم. گۆڕەپانێکی گەورە و فراوان خۆی بە ڕومان دا کردەوە کە شوێنی مەشقی سەربازیی بو، بەلامەوە سەیر بو، کاتێک لە دەروازەی گشتیی هەیئەوە چوینە ناو هەیئە بازاڕ و قەرەباڵغیی بو، کەچی لە پشتەوە چۆڵەوانی بو. ماوەیەک ڕۆیشتین وگەیشتینە سەر جادەیەک، لەسەرجادەکە چاخانەیەکی لێ بو کە لە حەسیر دروست کرابو. کۆمەڵێک ئۆتۆمبیل وەستا بون و چەند پیاوێک هاواری نەفەری سلێمانیان دەکرد. لەگەڵ شۆفێرێک ڕێکەوتین، تێمان گەیاند کە ئێمە زیندانی بوین و ئازاد کراوین و بەرەو سلێمانی دەڕۆین، سواری سەیارە بوین بەرەو سلێمانی. لەبەر ئەوەی ناسنامەمان پێ نەبو لەچەند خاڵێکی پشکنین ڕایانگرتین، کەوتنە تەلەفون کردن بۆ ئەملاوئەولا تاکو بڕوایان پێکردین کە ئێمە زیندانی بوین و ئازاد کرابوین. بەهەرحاڵ گەیشتینە سلێمانی و لەبەرامبەر باخی گشتی لەبەردەم ماڵێک دا وەستاین، زیندانیەک دابەزی و وتی ئێرە ماڵی ئێمەیە. کە دەرگا کرایەوە بوبە پەلاماردان و گریان و ماچ وموچ، دەنگی گریان و پێکەنین تێکەڵ بەیەک بون، کورەکە لەنێو ئاپۆڕەی کەسوکار نوقوم بو. ئەو ناوی (دوکتۆر ئاراس) بو، قوتابیی کۆلیژی پزیشکی بو. چەندجارێکی تر بەوجۆرە لەبەردەم ماڵی چەند زیندانیەک وەستاین و گەیاندمانە ماڵەوە».

## ڕۆژێك: بۆ ئێمە سپی، بۆ ئەوان ڕەش!

«سلێمانی ئەو ڕۆژە چۆڵ و هۆڵ بو، دوكان و بازاڕ داخرابون، بۆنی خوێنی لێدەهات، كەسێكت بەسەر شەقامەكانەوە نەدەبینی. كاتێک سەیارەكەمان گەیشە فولكەكەی بەرخانەقا، وەزعەكە زۆر ترسناک بو، بۆنی باروت خوێن دەهات. سەربان و بنبان، شەقام و قوژبن و ژێر گوێسوانەكان ئاخنرا بون بە سەدان سەربازی هێزی مغاویر و هێزی تەواری. شۆفێرەكە زۆر ترسا، پێی وتین بمزانیایە وەزعەكە ئاوایە ئێوەم هەڵنەدەگرت. سەربازەكان چواردەوریان گرتین و كەوتنە پرسیاركردن، یەكێک هات و داوای ناسنامەی لێكردین، كە بینی پێمان نیە یەكسەر دایانبەزاندین. چەند سەربازێک چەكەكانیان لێراكێشاین، بە زۆر و پاڵپێوەنان بردیانینە بەردەم جێبێكی ئەفسەری، كە چەندین ئارێلی پێوە بەسترا بو. ئەو زیندانییەی لەگەڵمابو عەرەبیەكی باشی دەزانی. پیاوێک كە چەند ئەستێرە و تاجێكی بەسەر شانەوە بو پرسی ناوتان چیە و بۆ كوێ دەڕۆن و چی دەكەن لەم ناوە ؟ ئێمەش ناوەكانمان پێدا، لەسەر كاغەزێک نوسی و وتی پیشەتان چیە ؟ وتمان قوتابی. كابرا كەوتە جیهازكردن بەملاولادا، دیار بو تێیان گەیاندبو كە زانیاریەكانمان ڕاستن، ئیتر ئەم بەزم و هەرایە كاتژمێرێكی خایاند و پاشان كابرا ئازادی كردین و سواری سەیارە بوینەوە.

بەهەرحاڵ من دواكەس بوم كە گەیشتمە ماڵەوە. دواتر زانیم كە ئەو ڕۆژە بۆ ڕژێم ڕۆژێكی ڕەش بو، چونكە شەوەكەی (پ.م) هاتبونە ناوشارەوە و یانزە سەربازی هێزی تایبەتیان كوشتبو. پێش من زۆر زیندانیی تری ئازاد كراو خۆیان گەیاندبۆوە سلێمانی، بۆیە ئەو درەنگ كەوتنەی من بوبوە مایەی خەم و نیگەرانی بۆ كەسوكار. باوكم دو ڕۆژ پێشتر چو بو بۆ كەركوك بۆ سۆراخی من، كە من گەیشتمە ماڵەوە، باوكم هێشتا نەهاتبۆوە. كاتێک لە سەیارە دابەزیم، دراوسێكانمان كەوتنە باوەشپیاكردن و ماچباران كردنم، چەند ژنێكی دراوسێمان دەستیان كردە شیوەن و گریان، كوڕانی گەڕەک هەمویان بەرەولای من كەوتنە ڕاكردن و لەئامێزگرتنم، ئیسماعیلی هاوڕێم زۆر گریا بەسەرم دا. منیش لاواز و سپیهەڵگەڕاو زیاتر لە مردویەک دەچوم تاكو زیندویەک، بێهێز و شەكەت و ماندو، وڕ و گێژ و كاس، هەمو شتێكم لا نامۆ بو، دەتگوت لە ئەستێرەیەكی تر بەربومەتەوە. دڵم تەنگ بو، خۆشم نەمدەزانی بۆچی، هێشتا هەر لەنێو كەشی زیندان و پاسەوان و ئەشكەنجە و چاوبەستنەوە دا دەژیام. ئەو ئاپورەیەی دەورم هێندەی تر ماندوی كردم. لەم غەڵبە غەڵبە دا كە زۆر كەمی خایاند دەرگای ماڵمان كرایەوە، یەكەم كەس كە هاتە دەرەوە

(شـۆڕش) ی جوانەمەرگی برام بو، منی توند لە ئامێزی خۆی گرت و بەباوەش گەیاندمیە ژورەوە. ئیتر دایکم و کەسوکار هەموی لە ماڵ بون، لەنێو ئاپۆرە دا نوقمیان کردم، ماڵمان جمەی دەهات، هەمو چاوەڕێی باوکم بون لە کەرکوک بێتەوە و نوێترین هەواڵی من بـهێنێتەوە. دوای چەند کاتژمێرێک باوکم هاتەوە، کە بینیمی شادیەکی زۆر لە ڕوخساری دا پرشنگی دەدایـەوە، هەستم کرد بـاری دەرونیی لاسەنگ و شێواو بو، لاواز بوبو، فرمێسک تێزرایە چاوەکانی و باوەشمان بەیەک دا کرد. ئیتر دوای ئەوە شتەکان هەموی بون بە ڕۆتین، چەند ڕۆژێک ماڵمان پڕ بو لە مێوان. منیش کفت و ماندو ئارەزوم ئەوە بو لەشوێنێک بخەوم، خەوتنێک هێند قوڵ، کە هەرگیز بێدار نەبمەوە».

## لە خەونیشدا ناهێڵن !

«من ئێستاش خەونەکانم لە چوارچێوەی زیندان و ڕاکردن و هەوڵی هەڵهاتنە لە زیندان. هەندێک جار بەزیندویی دەنێژرێم، هەندێ جاری تر لە خەونم دا شاخێک یان دۆڵێک یان دیوارێک دەبێتە لەمپەر لە ڕێی ڕۆشتنم بەرە و ئازادی. من لە خەون دا چێژی مردنم کردوە بەڵام هەرگیز ئاودیوی دیوار و کێوەکان نەبوم. ئێستاش لە خەونەکانم دا سەرباز و ئەمن و قوات خاسە بەدوامدا دەگەڕێن، دەستگیرم دەکەنەوە و دیسانەوە لەدەستیان هەڵدێم. لە خەونەکانم دا لە هەر شوێنێک، لە قایمترین و دوردەسترین شوێن خۆم بشارمەوە، دەمدۆزنە و ڕاوم دەنێن، من ئێستاش هەر هەڵدێم و هەناسەم سواردەبێت. لە خەونەکانم دا گەیشتن بە دیوی ئەودیوی چیایەک یا دیوی ئەودیوی دیوارێک یا کۆتایی دۆڵێک، دەبنە ئەو ئاواتەی وەک باوەش بە تیشکی خۆر دا بکەم و دەستم لە ئازادی گیربێت. بەڵام من هەرگیز خەونەکانیشم ڕێگەیان پێ نەداوم بگەم بەو ئازادیەی کە ناخ و ویست و ئیرادەی خۆم دەیخوازێت و دەیەوێ تێر تێر چێژی لێ ببینێ. من ناتوانم پێناسەی ئازادی بکەم بەڵام هێندە دەزانم، کاتێک مرۆڤ توانی ئاودیوی دیوارەکان بێت، ئەو دیوارانە ئەگەر هی زیندان بن یاخود هی هەر نەریتێکی کۆمەڵایەتیی نەخوازراو بن، ئیتر ئەو مرۆڤە دەیشتوانێ سواڵەیەک تیشکی ئازادی لە باوەش بگرێت، من ئەگەرچی لە شێوە دا کەسێکی ئازادم، بەڵام لەناخ و دەرونی خۆم دا هێشتا کەسێکی زیندانیم».

هیوا دوای چەند ڕۆژێ لە ئازادکردنی دەچێتەوە سەر خوێندنەکەی لە خوێندنگای پیشەسازیی سلیمانی، بەڵام دوای چەند هەفتەیەک، لە بەر مەترسیی گرتنەوەی واز لە خوێندنەکەی دەهێنێ و لە شار ڕادەکات. لە مانگی ئەیلولی ١٩٨٢خۆی گەیاندە لای من لە (پارەزان) بۆ ئەوەی ببیتە (پ.م).

## ئەزمونە دەرونیە کپکراوەکان

لە کۆمەڵە ئیسلامیە خۆرهەڵاتیەکاندا، هەندێک لە مەلا و ڕابەرە ئاینیە توندڕەو و دەمارگیرەکان دەربڕینی خەستوخۆڵ و ڕاستەقینەی خەم وخەفەت بە شیوەن و گریانی زۆر لە کەس و کاری پرسەدار قەدەغەدەکەن بەپاساوی ئەوەی گوایە ئیسلام ڕیگە بەو جۆرە دەربڕینەی خەم و کۆڤانی نادەن. بیری خێڵەکیی زبر و توند، هەروەها پاڵەوانبازیی نێرایەتی هۆیەکی تری ئەم بیروڕا هەڵەیەیە کە بەتایبەتی لە پیاو قەدەغەدەکات هەست و سۆزە ناسک و نەرم و نیانەکانی خۆی دەربڕێ، بۆ نمونە گریان، چونکە بە لاوازی لە سەر کەسەکە حساب دەکرێ. بەڵام سەدان لێکۆڵینەوەی زانستی دەرونناسی سەلماندویانە، بۆ ئارامی و هاوسەنگیی دەرونی، هەروەها بۆ تەندروستیی جەستەیی واباشترە مرۆڤ لای کەسە زۆر نزیک و دڵسۆز و هەستیارەکانی دەردی دڵ و بەسەرهاتە کانی خۆی، هەست و سۆز و بیروڕاکانی لە پەیوەند بەو ڕوداوانە بگیڕێتەوە، خۆی نەخواتەوە و نەهێڵێ کەڵەکەبن و پەنگ بخۆنەوە. تاک دەبێت ئەو هەست و سۆزانە بەشێوە جۆراوجۆرەکانی دەربڕین دەریانبڕێ، ئەگەرهەر نەیتوانی لای کەس دەریانبڕێ خۆ دەتوانێ خۆی بە شێوەی ئەدەبی یا هونەری (شیعر، شانۆ، مۆسیقا و گۆرانی، چیرۆک و ڕۆمان، پەیکەرتاشی، نیگارکێشی،....هتد) دەریانبڕێ، ئەگەر هەیە شێوازی دەربڕینەکەی کاری ئەدەبی و هونەریی مەزنی لێدەربچێ. ئێستا لە نەخۆشخانە دەرونیە پێشکەوتوەکانی دنیا کێشە و نەخۆشیی دەرونی جگە لە دەرمان، بگرە لە هەندێ نەخۆشدا هەر بێ دەرمان، بە شێوەکانی دەربڕین وەک:هونەر، ئەدەب، مۆسیقا، ئیشی دەست و شانۆ و چارەسەری دەرونی بە وتوویژی قوڵ چارەسەر دەکرێت.

ئەوەی هیوا دوای ٣٥ ساڵ دەربارەی خەباتی نهێنیی خۆی و ئەزمونەکانی ئەشکەنجە لە زیندانەکانی ڕژێمی سەدامدا نوسیویەتی و بۆمنی گێڕاوەتەوە، من شیلەکەیم لێرا داناون، هەمو ئەو بەسەرهاتانە هیوا ٣٥ ساڵ لە دڵ و دەرونی خۆیدا

هێشتبونیەوە و لای کەس باسی نەکردبون، پەندێک دەڵێ: باشترە هەر شتە لە کاتی گونجاوی خۆیدا بیڵێیت و بیکەیت، بەڵام پەندێکی تریش دەڵێ: هەرگیز درەنگ نیە، مەیبەرە ناو گۆڕ، بیڵێ و بیکە !

با میلی نیشاندەری کات بگێرینەوە بۆ دواوە، ئێستا سەرەتای مانگی ٩ی ١٩٨٢ وە، من لە نەخۆشخانەکەمانم لە پارەزانی ڕزگارکراو لە دەسەڵاتی ڕژێمی سەدام، هیوا تەمەنی لە ٢٠ ساڵ نزیک دەبێتەوە. کوڕێکی گەنمڕەنگ، باڵابەرز(١٨٤ سم)، برۆ پەیوەست، مەنگ و کەمدو. بێ ئەوەی پێشتر لە هاتنی خۆی ئاگاداری کردبمەوە هاتە پارەزان، لە ناکاو خۆیکرد بە ژورەکەمدا. دوای لە ئامێزگرتن و ڕاموسانی یەکتر و چاکوچۆنیی گەرم و گوڕی خاڵ و خوشکەزا کە لە کۆمەڵی کوردەواریدا تاموچێژێکی تایبەتیی هەیە، زۆر بە کورتی حەز و ویستی خۆی بۆ دەربڕیم کە دەیەوێت ببێت بە (پ.م) لەگەڵ مندا. هیوا نە لە ڕۆژەکانی سەرەتای هاتنی، نە لە دوساڵ و نیوی پێشمەرگایەتیدا کە زۆر بەیەکەوەبوین، نە دواتر لە ئەڵمانیا کە ماڵەکەی نزیک ماڵمان بو، باسی ئەزمونی خەباتی نهێنیی ناوشار و ئەزمونی دو جار زیندانیی ڕژێمی سەدام و ئەشکەنجەکانی کە چەشتبوی، بۆ نەکردم. هەر ئەوەندە وتی دوای چوار مانگ گیران بە هۆی چالاکیی سیاسیی نهێنیەوە لە ناو کۆمەڵە، چاوەڕێی حوکمی لە سێدارەدانی کردوە، بێ ئەوەی چاوەڕێ یا ئومێدی ڕزگاربونی هەبوبێت، لە ناکاو بە لێبوردنی گشتیی سەدام (عەفوات) ئازادکراوە.

بە هەست و شعور و تێڕوانینی ئێستام وەک پسپۆڕێکی بەئەزمونی دەرونی، هەم من هەڵە بوم کە لەو ٣٥ ساڵەدا جارێک داوام لە هیوا نەکرد باسی ژیان و بەسەرهاتی خەباتی ژێرزەمینی و کاتی زیندانیی خۆیم بۆ بکات، هەم هیوا ش هەڵە بو کە خۆی دەسپێشخەریی نەکرد بۆ گێرانەوەی ئەزمونەکانی خەباتی ژێرزەمینیی شار و دو جار گرتنی.

داواکەی هیوام پەسەندکرد بۆ بون بە (پ.م). بەڵام کە شەو داهات هەر بۆ تاقیکردنەوەی ئەوەی بزانم دەترسێ یان نا، نامەیەکم نوسی بۆ موختاری گوندی (چنارە) کە سەعاتێک لە پارەزانەوە دورە، دامەدەستی کە بیبات بۆی. ئێستا دوای ٣٥ ساڵ کە هیوا لە ڕێی ئیمەیلەوە لە ئەڵمانیاوە بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە، پێکەنینم بە خۆم دێ و کەمێکیش شەرم دامدەگرێ لەوەی ئەو شەوە پێش ٣٥ ساڵ ویستم کێ تاقیبکەمەوە ؟ گەنجێکی، ئەندامێکی گیانبازی قاڵبوی خەباتی نهێنیی کۆمەڵە لە ساڵەکانی ١٩٨٠ی سلێمانیی شاری هەڵمەت و قوربانی دا! بە

هەر حاڵ هیوا بە پلەی نایاب لەو تاقیکردنەوە بێواتا وناپێویستەدا دەرچو و بوبە پێشمەرگە و لە نەخۆشخانەکەی پارەزان مایەوە. دوای بینینی خولێکی ڕاهێنانی دەرزیلێدان و برین تیمارکردن کەوتە خزمەتکردنی خەڵکی گوندەکان و پێشمەرگە تا جێهێشتنی کوردوستان لە مانگی ١٢ ی ١٩٨٤ و گیرسانەوە لە ئەڵمانیا.

## قاوغی بێدەنگی و خۆخواردنەوە بشکێنن!

من دڵنیام لە خەباتی ڕەوای نەتەوەکەماندا لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی، هەزاران بەسەرهاتی لەوەی هیوا ناخۆشتر و قورستر بە سەر خەباتگێرانی نەتەوەکەماندا هاتوە لە هەر چوار پارچەی کوردوستان، بەڵام بەداخەوە بەدەگمەن نوسروانەتەوە و کراون بە کتێب. من دڵنیام لەوەی چیرۆکە ڕاستەقینەکانی تێکۆشەرانی کورد لە مەیدانە جیاجیاکانی خەباتی کوردایەتی دا بەشی سەدان فیلم دەکەن. وەک پزیشکێکی پسپۆڕی دەرونی، داوادەکەم لە خەباتگێرانی کورد قاوغی ئەم بێدەنگی و خۆخواردنەوە پڕ لە خەفەت و نائومێدی و تورەییە بشکێنن و بێنەدەرەوە. تێکۆشەرانی خەباتی نیشتمانی و چینایەتی، چەکداربوبن یا بێچەک، با بەسەرهاتە ڕاستەقینەکانی ژیان و خەباتی خۆیان بۆ منداڵ و نەوەکانیان بگێڕنەوە و بۆ مێژوی نەتەوەکەیان تۆماری بکەن. من دڵنیام بەم کارەیان خۆیان ئازاد دەکەن لە بارێکی قورسی سەر دڵ و دەرونیان، باری ژیانی ڕابوردویان. ئینجا دەتوانن خۆشتر و شادتر و تەندروستر ژیانی ئێستا و داهاتویان بەسەربەرن!

## پارەزان پایتەختی نارازیەکان

وەک یەکێک لە لێکەوتەکانی کۆنفرانسی ٢ ی کۆمەڵە، لە مانگی ١ ی ١٩٨٣ وە ئەم (پ.م) انە لەگەڵ هاوژینەکانیان لە پارەزان جێگیر بون: سالار عەزیز، مەحمود کەشکۆڵ (شێخ عەلی)، مامۆستا عومەر شیرەمەڕی، مامە حەمەی ئەندازیار، فەرەیدون حەمە ساڵحی پێنجوێنی. ئەم ڕەبەنانەش هەر لە پارەزان دەژیان: کادیرانی دێرین و پێشکەوتوی کۆمەڵە پشکۆ نەجمەدین و حەمە ئاوات سدیق، دارا جەمیل نەقسبەندی، من، د. قادر حەمەشەریف. دارا جەمیل دوای تەواوکردنی کۆلیجی کشتوکاڵ بوبو بە (پ.م). سالار عەزیز و شێخ عەلی دانیشتبون و هیچ پۆست و لێپرسراوێتیەکی

ڕەسمیی ناو کۆمەڵە و یەکێتیان نەبو. مەلا یاسین، مامۆستا شاهۆ و لەتیفی حەمەی مەلاسابیری فەرماندەی کەرت زۆرجار لە شارەزور و هەورامانەوە بۆ پشودان وحەسانەوە دەگەڕانەوە بۆ پارەزان و چەند ڕۆژ و هەفتە دەمانەوە. هەمو ئەمانە پێکەوە لە گەڵ بەکری حاجی سەفەر کە ئەویش ماڵی لە پارەزان بو لە پەیوەندیەکی خۆشی هاوڕێیانە و پڕ متمانە و بڕوا دەژیان. بە جۆرێک لە جۆرەکان پارەزان لە ناوچەی سلێمانی بوبو بە پایتەختی ڕەخنەگران و نارازیانی ناو کۆمەڵە، ئەو کادیر و پێشمەرگانەی کۆمەڵە کە ڕەخنەی زۆریان لە سیاسەتی کۆمەڵە هەبو دەهاتنە ئەوێ بۆ باس و لێدوانی ئادیۆلۆجی و سیاسی. باڵەکەی تری کۆمەڵە کە گەلێک بەهێزتر بو و نەوشیروان مستەفا ڕابەرایەتیی بێهاوتای دەکرد، وەک بەکەمزانین و سوکایەتی پێکردن بە دەستەی نارازیەکانی ناو کۆمەڵەیان دەوت (عێراقچیەکان)، بە خۆیشیان دەوت (کوردوستانی).

## ڕۆحی فرۆید لە پارەزان !

پزیشک و دەرونناسی جولەکە ی نەمساوی (سیگمۆند فرۆید) لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٠٠ وە وردەوردە قوتابخانەی دەرونشیکاری هێنایە ناو جیهانی دەرونناسیی مرۆڤەوە. یەکێ لە شتە نوێکان کە ئەو هێنایە کایەوە و پەیوەندیی بەم باسەی منەوە هەیە، ئەمە بو: هەمو ڕەفتار و ئاکارەکانی مرۆڤ ئەنجام ودەرهاتوی بیرکردنەوەی لۆجیکیی عەقڵ و هۆش نین. بەشێکی زۆری ڕەفتاری مرۆڤ لە شوێنێکی قوڵ و نادیار و تاریک و شاراوەی دەرون هەڵدەقوڵێ، فرۆید بەم بەشەی دەرون دەڵێت (ناخۆئاگا) بە عەرەبی (اللاشعور). ناوەڕۆکی ناخۆئاگایی لە خەونەکانی مرۆڤ دا دەردەکەوێ و هەروەها کاتێک دەردەکەوێ کە قسەیەکی ناچاوەڕوان و پێچەوانەی چاوەڕوانیی دەوروبەر دەکات، فرۆید بە مە دەڵێت هەڵەی زمان یا لەدەمدەرچون (زلة لسان). گاڵتە و گەپ و قسەی خۆش واتا و وەزیفەی دەرونیی خۆیان هەیە، جۆرێکن لە بەرگریی دەرونیی مرۆڤی تاک بەرامبەر هەل ومەرجە زۆر ناخۆش و سەختەکانی ژیان، زۆرێک لە قسەخۆشەکان لە ناخیان دا غەمبار و ناشادن!. ساڵەکانی، ١٩٨١، ١٩٨٢، ١٩٨٣ لێوانلێو بون لە شەڕی براکوژیی وێرانکەر، ناکۆکیەکانی ناو سەرکردایەتیی کۆمەڵە وردە وردە توند وتیژتر دەبو. بۆیە هیچ سەیر نەبو کە ڕۆژانی ژیان و خەباتمان لەو چەند مانگەی پارەزاندا کە ئەو هاوڕێیانە هاتن پڕبو لە قسەی خۆش

و نوکته و گاڵته، ئەمانە جۆرێک بون لە چالاکیی ناخۆئاگایی و ڕاکردنی هۆش و عەقڵی پڕ لە ئێش و غەم و نائومێدیمان لە سەختیەکانی خەباتی ڕۆژانەمان. خۆزا و بێ پلانی پێشینە و بێ مەبەست، هەروا وردە وردە ناکامیە جۆراوجۆرەکان و بێبەشی لە خۆشیەکانی ژیانێکی ئاسایی، هەروەها ڕق و توندوتیژی و ترس و حەزە جۆراوجۆرەکانمان وەک حەزی سێکسی و...... هەمو ئەمانەمان سڕدەکرد و دەمان سپارد بە شوێنە تاریکەکانی لەبیرچون و گوێ پێنەدان لە نائاگایی دەرونماندا. ئەم ڕفتار و ئاکارە خورسک و خۆبەخۆیەی ئێمە لە پارەزان دەماننواند باشترین دەرمانی ناکیمیاویی بو بۆ خۆپاراستن لە توشبونی نەخۆشیی خەمۆکی و بۆ دورکەوتنەوە لە کێشەی کۆمەڵایەتیی جۆراوجۆر.

## لەدەرەوەی قالبە حیزبیەکان !

من لە ڕاستیدا کەوتبومە نێوان ئەم دو باڵەی کۆمەڵە و هیچیان نەبوم بە تەواوەتی، بۆیە لە کار و چالاکیی ڕێکخراوەیی نەکەوتبوم. لە گەڵ دارا و و (مامۆستا جەمالی حاجی محمەد) کۆبونەوەکانی شانەی کۆمەڵەمان دەکرد، زۆرمان دەخوێندەوە و زۆر موناقەشەی فیکری و سیاسیمان دەکرد. مامۆستا جەمال کادیرێکی زۆر چالاک و دڵسۆز و بێرق و کینەی کۆمەڵە بو، لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ناوچەکەبو. ئەم نەیدەویست پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەبێت بە ناکۆکیەکانی ناو سەرکردایەتیی کۆمەڵە وە. بۆیە وەک کادیرێکی کارا و جێی بڕوای کۆمەڵە لە ناو (پ.م) و خەڵکە سادەکەی ناوچەکەدا سەرگەرمی خەبات بو، بۆچونێکی هاوسەنگی میانەڕەوی هەبو، تازە ژنی هێنابو وماڵەکەی لە دۆڵپەمو بو.

## خۆشەویستیەکی ناکام

لە و ڕۆژانەدا لە پارەزان تۆوی خۆشەویستیەکی دوربەدور و پاک و بێگەرد لە نێوان کچێک و کوڕێکی (پ.م) وردە وردە و بێدەنگ، بێ خۆنواندن و خۆدەرخستن، سەری لە خاکە بە پیت و ڕێژەنەکەی پارەزان دەرهێنا. چرۆی ناسکی ئەو شەیدابونە کەوتە وەرگرتنی خۆری ئازادی وهەڵمژینی هەوای پاکی دێیەکی ڕزگارکراو لە پۆستاڵی ڕژێمی سەدامی داگیرکەر. بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکە ڕێگەی نەدەدا ئەم

چیرۆکی خۆشەویستیە برێک درێژەبکێشێ. خۆشەویستان نەیانتوانی ئازادانە و سەربەستانە دەست لە ناو دەست گەشت و سەیران بکەن، تێر تێر ئازادانە لەگەڵ یەکتر بدوێن و ڕاز و نیازی دڵیان بۆ یەکتری هەڵڕێژن تا باشتر لەیەکتر تێبگەن. چیرۆکەکە هەر بە نهێنی مایەوە، بۆیە دڵخوازان نەیانتوانی دڵی ئاسمانی ساماڵ و کانیاوی سارد و کەژ و کێو و ڕەز و دار میوەکانی پشتی دێی پاڕەزان خۆشبکەن و بگەشێننەوە.

لەم کوردوستانەی خۆمان زۆر سەیرە! زوڵم و زۆرداری و تاوانە جۆراوجۆرەکانی کوشتن و دزی و دەسبەسەراگرتنی ماڵی گشتی و ماڵی خەڵکی بێ دەسـەلات، هەروەها هەمو شتە خراپەکانی تر، بە پیلان لە ژورە داخراوەکاندا و بە نهێنی، یا زۆر جاریش هەمو ئەوانە بە ئاشکرا و بێشەرمانە و ملهوڕانە لە لایەن دەسەلاتدارانی جۆراوجۆرەوە ئەنجام دەدرێن و عەیب نین. بەلام جوانترین و خۆشترین ڕوداو و بەسەرهات کە خۆشەویستیەکی پاک و ڕاستەقینەیە، دەبێت بۆچی هێشتا لە کوردستاندا هەتا ئیمڕۆش عەیب بێت و بە نهێنی و ژێربەژێری بکرێت؟ من کە کوڕەکە یەکەم جار چیرۆکەکەی لا درکاندم زۆرم پێخۆش بو، هەردوکیان ساغ و تەندروست و سەرنجڕاکێش بون، بێ بیرکردنەوە و بێ پلان یەکسەر چاوی فەنتازیام منداڵێکی زۆر زۆر تەندروست و جوانی بینی کە دەستێکی بەدەست باوکیەوە و دەستەکەی تری بە دەست دایکیەوە بو. بە هاوڕیکەمم وت: "زۆر زۆرم پێخۆشە خۆشەویستیەکەتان سەربگرێ و خێزانێکی بەختەوەر دروستبکەن و ماڵێکی ئاوادان بخەنە سەر ماڵەکانی تری ئەم گوندە میواندۆست و سەربەرزە". ئینجا بە خەندە و گاڵتەیەکی ڕاستگۆیانەوە پێم وت: "جگە لەوە بۆ کوردیش باشە چونکە تۆ و ئەو (DNA وGen) کانتان ئەوەندە ساغ و تۆکمەیە کە مادەی بۆماوەیی توخمی کورد باشتر ودەولەمەندتر دەکەن". پێشمەرگەکە زۆر پێکەنی، دواتر کە چیرۆکەکە ئاشکرا بو قسەکەی من لە ناو پێشمەرگەکاندا بوبە نوکتە و بۆیەکتریان دەگێڕایەوە. چەند ڕۆژێ دواتر لە سەر داوای هەردوکیان بە ڕەسمی خوازبێنیی کچەکە کرا. بەداخەوە چەند ڕۆژێ دواتر وەلامی نائومێدکەرانەی باوکی کچەکە گەیشت، زۆرم پێناخۆش بو. بەم جۆرە ئەم چیرۆکی خۆشەویستیە پاک و بێگەردە بە ناکامی کۆتایی هات. هەزاران چیرۆک و بەسەرهاتی خۆشەویستیی کچ و کوڕی ئەم کوردوستانە بەهۆی دواکەوتویی کۆمەلایەتی و کۆت و بەندە جۆراوجۆرە خێڵەکی و ئاینی و ئابوریەکانەوە بە ناکامی کۆتاییان هاتوە، هەندێکیشیان خوێنڕشتن و دوژمنایەتیی قورسیان لێکەوتۆتەوە.

## کەس شێت نیە ! شێتی نیە !

کوڕێکی ڕەبەنی ٣٠ ساڵە بە ناوی (قالە شێت) لە پارەزان دەژیا، لە پێینی دێ تاقە دوکانێک هەبو پشتکوماوە و تاریک و ڕوتەلە، زۆرجار (پ.م) کان لە بەردەم ئەو دوکانە ڕادەوەستان و لەگەڵ (قالە شێت) دا دەکەوتنە قسەی خۆش. قالە کوڕێکی ڕوت و ڕەجاڵ بو، بارودۆخە کۆمەلایەتی و ئابوریەکەی شایەنی بەزەیی و کۆمەک بو، بەڵام بە پێچەوانەی دۆخەکەی، ئەو بەردەوام ڕوخۆش و دەم بە خەندە و پێکەنین بو، قسەکانی زۆرجار باسی سێکس و ژن و شتە قەدەغەکراوەکانی تری لەم بابەتانە بو، ئەمە دەبوە هۆی پێکەنینی زۆری (پ.م) و پیاوانی دێ. من ئێستا کە ٣٠ ساڵە پزیشکی پسپۆڕی دەرونی و چارەسەری دەرونیم، کاتێک وەک پسپۆڕێکی دەرونی بیر لە قالە ی ئەو ڕۆژانـە دەکەمەوە، بە دڵنیاییەوە دەڵێم قالە نەخۆشیی دوانەی شادی و خەمۆکیی (دوجەمسەری) هەبو. ئەم شێوانە دەرونیە تێکەڵەیەکە لە شادی و خەمۆکی بە نۆرە و ناوبەناو. خوێنەری هێژا تۆ ئێستا لەوانەیە ڕەخنەگرانە و سەرسامانە بپرسی، بۆچی کەسێک کە ڕوی خۆش و قسەی خۆش بێت نەخۆشیی دەرونیی هەیە؟ بێگومان نەخێر، بەس ئەم جۆرە کەسانەی وەک قالە ناوبەناویش خەمۆکیەکی قورس دەیانگرێ و بەدەم خەم و خەفەت و تەنانەت بیری خۆکوشتنەوە دەناڵێنن، لە ئیش و کاری ڕۆژانە و چالاکیی کۆمەلایەتی دەکەون، کەس لێیان تێناگا و لێیان ناپرسێتەوە و کەس نازانێ نەخۆشیی دەرونیان هەیە، بۆیە نابرێن بۆ لای دوکتۆری دەرونی. من خۆم قالەم لە دۆخی خەمۆکیدا نەبینی، بەس زۆرجاریش بزر دەبو و ئیتر لەناو دێ و لەبەردەم دوکانەکەی دێدا نەدە بینرا، وادیارە هۆی ئەمە دۆخی خەمۆکیەکەی بوە و (پ.م) ش بەمەی نەدەزانی و نەدەچون بۆلای بۆ ماڵەوە بزانن بۆ نایەتە دەرەوە. جگە لەوە دۆخی شادیەکەیشی هەر ناسروشتی بو، لە ڕادە بەدەر و ناهاوسەنگ بو، شادیەکەی نەدەگونجا لەگەڵ بارە کۆمەلایەتی و ئابوریەکەی کە شایەنی بەزەیی و غەمخواردن بو بۆی، شادیەکەی بوبوە مایەی گاڵتەپێکردنی نەک کۆمەک و دەسگیرۆیی بۆ خێزان دروستکردن و ژیانێکی ئاسایی شایستە بە مرۆڤ و پێوەرەکانی مرۆڤایەتی. لکاندنی ناسناوی (شێت) بە ئینساندا کارێکی خەوش و ناشایستەیە. کردنی قادر بە (قالە) و لکاندنی ناسناوی (شێت) پێوەی، نیشانەی ئەوەیە خەڵکی دێ بۆیان دەرکەوتوە ڕەفتاری قادر ئاسایی و سروشتی نیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆشنبیریی دەرونیان نەبوە نەیانزانیوە چیەتی و کەس بیری لەوە نەکردۆتەوە بیبەنە لای پزیشکێکی دەرونی.

## وەك تۆپی فتبۆڵ !

ئەوە پیش ٤٠ ساڵیک لە گوندیکی پەنا و دوردەستی وەک پارەزان ئاوا بوە، مەگەر ئێستا جۆرێکی ترە؟ نەخێر خوێنەوری هێژا ئێستاش هەر ئاوایە، نەک لە گوندەکانی کوردوستان بەڵکو لە ناو شارەکانی وەک دهۆک و هەولێر و سلێمانی و هەڵەبجە هەر ئاوایە، یا بە هێندەی ئەستورایی مویەک تۆزێ باشتربوە. بە پێی ئاماری ڕەسمیی ساڵی ٢٠٠١ ی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، لە هەر سەد کەس دانیشتوانی هەرشوێنێک نزیکەی ٢٥ کەسیان کێشەی دەرونی یا شێوانی دەرونی یا نەخۆشیی دەرونیی هەیە بە ئەندازەیەک کە دەبێت بچێتە لای پسپۆڕی دەرونی بۆ ڕاوێژ و دەسنیشانکردنی کێشەکە و چارەسەرکردنی. بە پێی ئەزمونی پتر لە ١١ ساڵ کارکردنم لە کوردوستان وەک دوکتۆری دەرونی لە نۆرینگەی خۆم و لە نەخۆشخانە دەرونیەکانی سلێمانی، مەزەنە دەکەم لەو ٢٥ کەسەی کە لە هەر سەد کەسی کوردوستان نەخۆشی و شێوانی دەرونیان هەیە تەنیا پێنج کەسیان لە پێشدا دەبرێن یا خۆیان دەچن بۆ لای پزیشکی دەرونی، بیست کەسەکەی ترلە پێشدا دەچن یا دەبرێن بۆلای ئەم کەسانە: دوکتۆری جەستەیی (هەناوی، نەشتەرگەری،....)، مامۆستای ئاینی، سەید و شێخ، جادوگەر، فاڵگرەوە، جنۆکەدەرهێنەر، بورجناس، بەتاڵکەرەوەی کارلێکی چاوی پیس و سیحر..... کاتێک ئەوانە هیچیان نەخۆشەکەیان بۆ چارەسەر نەکرا، ئینجا دەچن بۆ لای پزیشکی دەرونی. نەخۆشەکە تا دەگاتە لای پزیشکی پسپۆری دەرونی وەک فتبۆڵ شەق شەقێن یکی چاکی پێدەکەن و سەدان هەزار دیناری پێ خەرجدەکەن. ئەم شەق شەقێن و پەت پەتیە جاری واهەیە پێنج ساڵ دەخایێنێ ! لە کوردوستانا کاتێک کەسێکی دڵسۆز و تێگەیشتو بە کەسێکی نەخۆشی دەرونیی خزمی یا هاوڕێی دەڵێت بچۆ بۆ لای دوکتۆری دەرونی، ئەو بە عاجزی و گرژیەوە ڕەدی دەداتەوە و پێی دەڵێت: خۆ شێت نیم بچم بۆ لای دوکتۆری دەرونی. لە کوردوستان هێشتا چون بو لای دوکتۆری دەرونی عەیبەیە و شەرمەزاریە.

## گەڵاکان بە دەم باوە

بە ڕاستی لە پێشمەرگایەتیی ئەو سەردەمەی ئێمەدا نەتدەزانی کات چۆن تێدەپەڕێ. جموجوڵ و گەڕان بە ناوچەکاندا کەمتر بە پێی نەخشەی سەربازی بو. تۆ بۆ خۆت وەک مرۆڤێکی تاک هیچ بەرنامەیەکی شەخسیی خۆتت نەبو، بە ڕێژەیەکی زۆر کەم سوکانی ژیانت بەدەستی خۆتەوەبو. تەنانەت پێویستیە سەرەتاییەکانی

ژیان وەک خواردن خۆت دابینت نەدەکرد، بەڵکو بەسەر ماڵە جوتیارەکاندا دابەش دەکرایت و چیان هەبو لەگەڵیان دەتخوارد. بە پێی وەرزی ساڵ و دەرفەتەکان هەر دو تا پێنج هەفتە جارێک لە سەر حەوزی مزگەوتێک یا لە سەر چەم و ئاوێک خۆت دەشت. ڕوداوەکان لە دەروەی ویست وحەز و نەخشەی تۆبون، ئەگەر نەخشەیەکت هەبوایە! لە پڕ بروسکەیەک یا نامەیەک دێت وتۆش دەبێت بە پێی فەرمانی ناو ئەو بروسکەیە لەگەڵ چەند (پ.م) یەکی تردا بەرەو شوێنێک، دێیەک، بنکەیەک، شاخێک، شەڕێک.... دەبێ مل بنێیت و بڕۆیت. زۆر جار نازانی بۆ، پرسیار لەم دۆخانەدا هیچ واتایەک و سودێکی نیە، ڕوداوەکان وەک لەهی و لافاو ڕاتدەماڵن و نازانی لەکوێ دەگیرسێیتەوە و لە چ دۆخێکدا دەگیرسێیتەوە: ساغ یا دەست و پێ شکاو یا تەنانەت وەک لاشەی بێگیان! چەند ساڵێک دواتر کە گەیشتمە ئەڵمانیا، بینیم ئەڵمانیەکان هیچ شتێک بێ پلان ناکەن. هێشتا ساغن و هیچ هەواڵێک لە نەخۆشیی کوشندە و مردن نیە، کەچی بە نوسراو (وەسیێت) لای دادنوس دەسنیشانی دەکەن ئەگەر کەوتنە بێهۆشیی درێژخایەن دوکتور چۆن چارەسەریان بکات. یا کە مردن چی لە جەستەیان بکەن، لە کوێ بیان نێژن. ئەڵمانەکان هێشتا لە مانگی ئوکتۆبەری ئیمساڵدان دەسنیشانی دەکەن لە پشوی هاوینی ساڵی ئایندە دا بۆ گەشت و پشوی ساڵانە بۆ کوێ بچن و چەند ڕۆژ بمێننەوە و کام ژوری کام ئوتێل بە کرێ بگرن.

## وەك پێستە خۆشەبوم !

من تەندروستیەکی باشم هەبو، کەمێک لاواز بوم و بەژن وباڵا ولاقم درێژ بو، لە ڕێگە ڕۆشتندا چوست و چالاک بوم و هیچ کێشەم نەبو. من شەیدای بینینی دیمەنە ناوازەکانی سروشتم بە گشتی و سروشتی پاک و دەسلێنەدراوی شاخەکانی زاگرۆسی کوردوستان بەتایبەتی، بۆیە لە گەڕان بە شاخ و دۆڵەکاندا بێزار نەدەبوم. بە وردی ناوی شاخ و شوێنەکانم لە خەڵکی ناوچەکە دەپرسی، بۆیە شارەزاییەکی باشم پەیدا کردبو، لە ساڵەکانی دوای پێشمەرگایەتیدا گەڕان بە ناو سروشتدا بوبە یەکێک لە خولیا ئازیزەکانی من. جارێک لەگەڵ وەهاب جەولەمان دەکرد، دوای چەند کاتژمێر پیادەڕەوی ویستی لە شوێنێک لابدەین بۆ پشودان، من بە گاڵتەوە بە وەهابم وت: «وەهاب من تازە وەک پێستە خۆشە بوم و پێویستم بە وچان و پشو نیە، بۆ کوێ دەڵێی با بچین»، وەهاب زۆر پێکەنی، ئێستاش کە ئەو قسەیەی منی بیردێتەوە تێر تێر پێدەکەنێ.

## هاودەم و ئاوەدانی

(پ.م) بە هەمو واتای وشەی خۆشەویست خۆشەویستی خەڵک بو، ئاوەدانی بو بۆ خەڵکی دێهاتەکان، گوندیەکان بۆ بەسەربردنی کاتی بێئیشیان زۆربەیان تەنانەت ڕادیۆشیان نەبو چجای تەلەفیزۆن. بۆیە کاتێک (پ.م) دەچونە گوندەکانیان، تەوژم و تەزویەکی ژیان دەکەوتە ناو خەڵکەکە و بە دەمارەکانیان دا دەگەڕا، گفت و گۆ و دەمەتەقیەکان، گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهاتەکان و قسەی خۆش، کۆڕ و دانیشتنەکانی گەرمتر دەکرد. هەر ئامادەیی (پ.م) وەک هێزێکی دڵسۆز و ڕێکخراو و جێی باوەڕی خەڵک، ڕێز و سامێکی دەخستە ناوگوندیەکان و دەبوە هۆی کەمبونەوەی کێشە و دوژمنایەتی و ئاژاوە لە ناویاندا، ئەگەر گرفتی قورسیش دروستبوایە، کادیرە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی (پ.م) چارەسەری دەکردن و ئاشتی و تەبایی دەپاراست لە ناویاندا. خەڵکی دێهاتەکان پردی پەیوەندی بون بۆ (پ.م) لەگەڵ ناوشار، لە ڕێی ئەوانەوە پەیوەندی دەکرا بە ڕێکخراوەکانی ناوشارەوە و (چیکلێتی پێچراوە) ی نامە کان دەهێنران و دەبران. (پ.م) کان وەک تاک پەیوەندیان دەکرد بە خێزانەکانیانەوە لە ناوشار و ئەوانیش پارە و پێویستیەکانی تریان بە گوندیەکی باوڕپێکراویان بۆ دەناردن. لای زۆرینەی جوتیاران (پ.م) ئەوەندە خۆشەویست و نازداربو، لە خۆراک و خواردنەوە چیی خۆشیان هەبوایە دەیانخستە سەر خوانە دەرویشانەکەیان کە بیخۆن و بیخۆنەوە. ئەگەر گۆشتیان هەبوایە هەمو گۆشتەکیان بۆ دادەنان، بەداخەوە هەمو (پ.م) کان لەوە تێنەدەگەیشتن یا ئەو هەستە بەرپرسیارانەیان نەبو دەست لە نیوەی گۆشتەکە هەڵبگرن بۆ ژن و منداڵی جوتیارەکە، ئەوان لە ژورەکەی تر بە حەز و تاسەوە چاوەڕێی پشکی خویان دەکرد!

## لەودیوی ئایدیالیزم و تەقدیسەوە!

مەترسیە بەردەوامەکانی دوژمنی دڕندە ڕژێمی سەدام، بێبەری بون لە هەمو خۆشیەکانی ژیانێکی ئاسایی، نەبونی شوێنێکی هەمیشەیی کە تێیدا دور لە وەی و مەترسیەکانی دوژمن بسرەویت و بمێنیتەوە، نەبونیی کار و پیشەیەکی ڕۆژانە کە هەست بکەیت بەرهەمێکی بەرچاوت هەیە، بڕێک شەرم و لەڕودامان لەوەی سێژەمە بەسەر ماڵە جوتیارەکانەوە بویت، نەبونیی ئاسۆیەکی ڕون لە کۆتایی ئەو تونێلەی تێی کەوتبوین...... هەمو ئەمانە وای کردبو زۆر جار پێشمەرگەکان لەگەڵ یەکتر و

له بەر خۆیانەوە بپرسن: «ئەمە کەی ژیانە ئێمەی تێداین ؟ «. ئەحمەد بانیخێلانی لە لاپەڕە ٤٥٣ ی چاپی دوهەمی بیرەوەریەکانیدا باسی ئەم ڕوداوەدەکات کە دیارە لە بەهاری ساڵی ١٩٨٤ لە شاخی (سورێن) لە نزیک ئەشکەوتی (هەزار ئەستون) ڕویداوە: (سەید تۆفیق) ی ئەندامی کۆمیتەی هەرێمیی (حشع) لە پڕ شانی دەکەوێتە ئێش و توانای بە تەنیا ڕۆشتن لە دەست دەدا. دوای سەعات و نیوێک لە هەوڵی دو دوکتۆر بۆ چارەسەرکردنی، (سەید تۆفیق) دەمرێ و بە دەوریدا دەبێتە گریان. دو ئەندازیاری ئەڵمانی لەو شوێنکاتەدا وەک دیلی (پ.م) کانی (حشع) لەویا دەبن، یەکێکیان دەپرسێ: ئەوە بۆچی دەگرین؟ پێی دەڵێن بۆ ئەو هاوڕێیە دەگرین کە مرد. ئەندازیارە ئەلمانیەکەش دەڵێت: «بۆچی ئێوە خۆتان بە زیندو دەزانن؟ ئەمە کەی ژیانی مرۆڤە ئێوەی تێدان؟».

## گرەووەکەی نەکرد !

هاوینێک بو لە پشتی دێی حاجی مامەند لە بن دار بەڕو ودارچوالەکاندا لەگەڵ دەستەیەک (پ.م) دانیشتبوم. لە سەر جۆرە نزا (دۆعا) یەک کە لە ناوەندە ئاینیەکانی کوردەواریدا پێی دەوترێ (گولەبەن)، لە نێوان (پ.م) کاندا بوبە وتووێژێکی گەرم وگوڕ. بڕێ لە (پ.م) کان بڕوایان بەوە نەبو کە کەسی هەڵگری (گولەبەن) ئیتر فیشەک نایبڕێ و خوا لە شەڕدا دەیپارێزێ، بڕێکی تریان دو دڵ بو، بڕەکەی تر بڕوای بە کارایی و هێزی پاراستنی گولەبەن هەبو. لە بەرەی بڕوادارەکاندا (شێخ فەتاح) کە (پ.م) یەکی خوێندەواریش بو لە هەمویان زۆرتر بڕوای بە کارایی (گولەبەن) هەبو. لە وتووێژەکەدا کار بەوە گەیشت (شێخ فەتاح) وتی: «من دڵنیام لەو کاراییە و بۆیە بەردەوام بە ئێستاشەوە (گولەبەن) م هەڵگرتوە».

تا ئەو قسەیە من هەر گوێگربوم، بەلام کە ئەوە م لێبیست لە دڵی خۆمدا وتم ئینجا نۆرەی منە ! کۆمەڵێ ڕەشە ولاخ لە نزیکمانەوە دەلەوەڕان، بە (شێخ فەتاح) م وت: چەند هەفتەیە پرزۆلەیەک گۆشتمان نەخواردوە، با من وتۆ گرەوێک بکەین: تۆ(گولەبەن) ە کەی خۆت بکە رە ملی یەکێ لەو گایانە، ئینجا لێگەڕێ با (پ.م) یەک تەنیا یەک فیشەک بنێ بە شوێنێکی ئەو گایەوە کە من بۆی دەسنیشان دەکەم، ئەگەر کوشتی ئەوە تۆ دۆڕانت، ئەگەر نەیکوشت ئەوا من دۆڕانم، بەلام لە هەردو ئەگەرەکەدا هەمو (پ.م) کانی کە لێرەن براوەن، چونکە گاکە هەر سەردەبڕین و هەمومان تێرگۆشت

دەبین. ئینجا بە شێوازێکی سادە وسانا باسی پێکهاتە و فەرمانی هەمو ئەندامەکانی جەستەی گیانلەبەرانی شیردەرم بۆ کردن کە گا و مرۆڤ لە هەمان خێزانن و لە شتە بنەڕەتیەکاندا لەیەک دەچن. من خەمی ئەوەم بو (شێخ فەتاح) یا هەر (پ.م) یەکی داماوی تر، بە ئومێد و چاوەڕوانیی بێبنەمای (گولەبەن) سەرچڵانە و بێمێشکانە بچێتە شەڕەکان و خۆی بدات بەکوشت. شەڕی براوە بە پلان و هونەری شەڕ و بە چەکی نوێ و کارا دەکرێت نەک بە بیروڕای ئاینی. هەستم کرد (شێخ فەتاح) تۆزێ دابەزی و شلی کرد، ئینجا وتم نرخی گا گرانە با گرەوەکە لە سەر گوێرەکە بێت، ئینجا دەی دەی گرەوەکەم بچوککردەوە بۆ مەڕ و بەرخ وقەل. کە بینیم هەر نایکات ئینجا وەک دوا بژاردە وتم با گرەوەکە لە سەر کەڵەشێرێک بێت، هەر بۆ تام وچێژ دەیخەینە ناو قازانێکی گەورەی شۆربا و لێرا لێی دەنێین و دەیخۆین. هەی هوو! (شێخ فەتاح) لە مێژبو لەم مەیدانی زانست و بیرکردنەوەی مەنتیقیە دۆڕاندبوی و لە بڕوابون بە (گولەبەن) کشابۆوە دواوە، بۆیە نەیوێرا گرە و تەنانەت لە سەر کەڵەشێرێکیش بکات. ئینجا (پ.م) کان دایانە تریقەی پێکەنینێک کە لە دۆڵەکانەوە دەنگیدایەوە. داوای لێبوردنم لە (شێخ فەتاح) کرد کە مەبەستم تەریقکردنەوە و شکاندنی ئەو نەبوە، بەڵکو مەبەستم پاراستنی ژیانی خۆی و ژیانی (پ.م) بوە بە گشتی، کە نابێ (پ.م) بڕوای بە خەرافیات و بیری پوچ و نازانستی و بێبنەما هەبێت.

## هەر زۆر سەیرە! کارەساتیشە !

لە ساڵی ١٩٨٩ وە تا ساڵی ٢٠٠٩ وەک دوکتۆری دەرونی لە پێنج نەخۆشخانەی گەورەی دەرونی لە ئەڵمانیا کاری بەردەوامم کردوە. لە ساڵی ٢٠٠٦ لە ئەڵمانیا دوکتۆرام وەرگرت لە دەرونناسی. لە ساڵی ٢٠٠٩ وە گەڕاومەتەوە کوردوستان. وەک پزیشکێکی پسپۆڕی دەرونی لە نەخۆشخانە دەرونیەکانی سلێمانی و لە نۆڕینگەی ڕاوێژکاریی حکومەتی و هەروەها لە نۆڕینگەی تایبەتیی خۆم کارم کردوە و بەردەوام کاردەکەم. لە ساڵی ٢٠١٠ تا ٢٠٢٠ مامۆستای دەرونناسی بوم لە کۆلیجی پزیشکی لە زانکۆی سلێمانی. ئەزمونی دە ساڵ کارکردنم لە کوردوستان وەک پزیشکی پسپۆڕی دەرونی، ئەم ڕاستیە تاڵانەی ئینسانی کورد و کۆمەڵی کوردوستانی بۆ دەرخستم: سەدان جۆر بیری پوچ و بێ بنەما، سەدان باوەڕ و بڕوای ناڕاست و نازانستی، مێشک و دەرونی بەشێکی زۆری خەڵکی کوردوستانی داگیرکردوە. ئەمانە بونەتە

کۆت و زنجیر بۆیان و ناهێڵن ئازادانە بە عەقل و لۆجیک بیربکەنەوە و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بڕیاری دروست بدەن. ئەم بیروڕایانە لە بواری تەندروستیدا بەگشتی و لە بواری تەندروستیی دەرونیدا بە تایبەتی کاری خراپ و وێرانکەری کردۆتە سەر ژیان وتەندروستیان. پەندێک هەیە دەڵێت (مرۆڤی ئاوبردو دەست بۆ کەفی ئاو دەبات خۆی پێ بگرێتەوە)، بۆیە بەتایبەتی ئەو نەخۆشانەی نەخۆشیی قورسی درێژخایەن یا نەخۆشیی دەرونیی قورس، یا نەخۆشیی بێچارەسەری ڕیشەییان هەیە وەک شێرپەنجە، خۆیان و کەس و کاریان پەنادەبەن بۆ هەر زڕدوکتۆرێک کە ڕیکلامی زۆری بۆ کراوە، بەهیوای چاککردنەوەی. چەند نمونەیەک لە باوەڕ و بڕوای ناڕاست و نازانستی: وەسوەسەی شەیتان یا جنۆکە دەچێتە ناو جەستەی مرۆڤەوە و شێتی دەکات ؛ چاوی پیسی ناحەز کەسی بەرامبەر توشی بەدبەختی و کارەسات و نەخۆشی دەکات ؛ ئەگەر پشیلەی ڕەش هاتە سەر ڕێت ئەوا توشی ڕوداوی ناخۆش دەبیت ؛ ئەوەی لە چارەت نوسراوە هەر دێتە ڕێت ؛ لە کاتی خۆشتندا کە ئاوی گەرم بەخۆتدا دەکەیت ئەگەر بیسمیللا نەکەیت ئەوا ئاوە گەرمەکە ئازاری بەچکە جنۆکەکان دەدات و دایک و باوکی ئەوانیش تۆڵەی بەچکەکان لە تۆ یا لە منداڵەکانت دەکەنەوە ؛ گوایە هەندێ ژنی زەیستان (هاڵ) یان هەیە کە بە واتای جنۆکەی زەیستان کوژ دێت ؛ هەندێ کەس دەتوانن سیحر و جادو لە خەڵک بکەن و بەمە زیانی جۆراوجۆریان پێ بگەیەنن، بۆ نمونە توشی نەخۆشیان بکەن ؛ گوایە کەڵەشاخ گرتن بۆ تەندروستی باشە ؛ ڕەشکە و هەنگوین و ئاوی زمزم و خورما و میزی وشتر وەک چارەی هەمو دەرد و بەڵاکان ؛ لەپی دەست خوێندنەوە ؛ خڵتەی قاوە خوێندنەوە ؛ بە پێی ڕۆژی لەدایکبونت کام بورجت هەیە، گوایە هەندێ ماڵ (خێو) و(ساحێب) ی غەیبیی هەیە و بۆتە مایەی بەدبەختیی ئەو خێزانەی تێیدا دەژی، کەواتە چارەسەر فرۆشتنی خانوەکەیە و گوێزانەوەی خێزانەکەیە، یا چەندینی تر.......... ئەم خەرافیاتە زیانبەخشانە لە ناو ئەم دەستە و چین و توێژانەدا زۆرتر بڵاوە: لە خەڵکی گوندەکان، لە توێژی نەخوێندەوار و کەمخوێندەوار، لەوانەی دنیا و فەرهەنگ و کولتوری دەرەوەی وڵاتە ئیسلامیەکانیان نەدیوە و تێیاندا نەژیاون یا زانیاریی لەسەر خەڵکی ئەو وڵاتانە نیە، لە ناو کچان و ژناندا بە خوێندەوار و خاوەن بڕوانامە بەرزەکانیشەوە وەک بەکالۆریوس و ماستەر و دوکتۆرا، لە ناو چینی هەژار و نەدار و بێکاراندا، لەو کەسانەدا کە نەخۆشیی کوشندە و قورس و بێ چارەسەریان هەیە وەک: سەرەتان یان نەخۆشیی دەرونیی زۆر قورس و درێژخایەن، لە ناو کۆڕ

و ناوەندەکانی دور لە زانین و زانست، لە ناو چینەکانی خواری خوارەوەی کۆمەڵ. مرۆڤە پەریشان و کەساسەکان نوقمبون لە تاریکستانی خەرافیات و ترسی جۆراوجۆر و هەست بە گوناهی ئاینیی جۆراوجۆر. ئەم کەسە داماوانە بونەتە نێچیری چەوری ئەو کەسە بێویژدانانەی چەندان جۆری چارەسەری بێبنەما و بێواتایان داهێناوە، وەک: کەڵەشاخگرتن، نوشتە و نزا (بۆ نمونە دۆعای چەور و شیرینی بۆ ئەو ژنەی مێردەکەی لەگەڵیدا باش نیە، دۆعای لە بەرچاوڕەشبون، دۆعای شەڕ و نەهامەتی، دۆعای نمرەی بەرز لە خوێندن...)، لە ڕاستیدا بوارێکی ژیان نەماوە چەندین نزا ی تایبەت بە خۆی نەبێت. سەدان جادو و سروتی ئاینی و نائاینیی جۆراوجۆر داهێنراوە بۆ نەخۆشی و کێشە کۆمەڵایەتیە ڕەنگاوڕەنگەکانی ژیانی ڕۆژانە وەک: شوکردن، کێشەی خێزانیی نێوان ژن و مێرد، کێشەی نێوان ژن و ماڵە خەزور...... شتانێکی بێواتای وەک ئەندامی زاوزێی کەمتیاری مێینە (ق.کەمتار)، ئامێری کارەبایی، موورووی ڕەنگاوڕەنگ، دراوی سعودیی کۆن... بەکاردەهێنرێن بۆ چارەسەری نەخۆشی و کێشە کۆمەڵایەتی و دەرونیەکان.

## زڕدوکتۆرەکانی کوردوستان!

ئێستا لە کوردوستان سەدان (مەلا عەلیی کەڵەک) هەن وەک پزیشکی پسپۆڕی دەرونی و پسپۆڕیەکانی تر لە ماڵەکانیان کاری پزیشکی لە سەر نەخۆش دەکەن و خەریکی دەسبڕین و خەپاندنی خەڵکن، هەندێکیشیان دور لە چاوی خەڵک و حکومەت دەچن بۆ لای نەخۆشەکان لە ماڵەکانیان. هەمو بیرێکی خەرافی و بێبنەما و ناڕاست مەرج نیە لە ئاینەوە وەرگیرابێ. بەڵام ئاینەکان بە تایبەتی لە ناو ئەم کۆمەڵگایەی ئێمەدا گەنجینەیەکی لێوانلێون لە ئەفسانە، لە بیر و خەیاڵی ناڕاست و بێبنەما، لە بڕوا و باوەڕی زیانبەخش و ڕوخێنەر، لە فەنتازیای هۆشبەر و هۆشتێکدەر. میدیاکاری NRT (ژوان قەرەداغی) ڕیپۆرتاجێک لە سەر (م. ع. کەڵەک) ئامادەدەکات. دوکتۆر سوپەر- پسپۆڕ (م. ع. کەڵەک) بە ئامێری TENS جنۆکە لە جەستەی مرۆڤدا کەشف دەکات و ئینجا بە پاڕانەوە لە خودا و بە سروت و نزای ئاینیی تایبەت و بە دارکاریی بنی پێی نەخۆش جنۆکەکە دەردەپەڕێنێ و نەخۆشەکە چاکدەکاتەوە. بەڵام لە کەتەلۆگی ئەو جیهازەدا بەکارهێنان بۆ ئامانجی وای تێدا نیە، بەڵکو بۆ چارەسەری هەندێ ئێشی دەماریی

تایبەت بەکاردێت. لە سەر ئەمە سکاڵا دژی (م. ع. کەڵەک) تۆمارکرا و بۆ ماوەیەکیش گیرا. لە بیرمە لە قۆناغی پێنجی کۆلیجی پزیشکی بوم، بیرێکی ناڕاستم بیستبو گوایە نابێ ماست وماسی پێکەوە بخۆیت دەنا تەندروستیت دەشێوێ و نەخۆش دەکەوی. منیش لە زانستی پزیشکیدا شتی وام نەبیستبو و نەخوێندبو. بۆیە بۆ ئەوەی ئەم بیرە ناڕاستە بەدرۆبخەمەوە، بە مەبەستی تاقیکردنەوە و بێترس چەند جارێک بڕێکی باش ماسی و ماستم پێکەوە خوارد و هیچیشم لێنەهات. من لەمێژە هەر لە تەمەنی چواردە ساڵیمەوە ئەم جۆرە بیر و بیرکردنەوانەم توڕداوە. من بڕوایەکی تەواوم هەیە بە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی هۆش و زیرەکی و لێکدانەوە و شیکردنەوەی لۆجیکی و زانستی. بڕوام هەیە بە ئەزمونی کرداری و تاقیکردنەوەی زیندو لە تاقیگەکاندا. بڕوام هەیە بەو پەند و زانیاریانەی لە ئەزمونی ژیانی تاکەکان و لە کۆمەڵیشدا بە گشتی دەستی مرۆڤ دەکەون. ئەڵبەتە من بڕوای تەواوم بە لایەنی ڕۆحیی مرۆڤ هەیە کە دەبێ لە ژیانی ڕۆژانەی تاکەکاندا گرنگیی پێبدرێ، ئەگەرنا دنیای مادی و دنیای چێژە مادیەکان بەتەنیا دنیایەکی بێتام و وشک و یەکلایەنە و ڕۆتینە. من هەروەها بڕوایشم بە چارەسەری ڕۆحی هەیە لە هەندێ لە نەخۆشیە دەرونیەکان، وەک بەشێک و شێوازێک لە شێوازەکانی تری چارەسەر بۆ نمونە دەرمانی دەرونی، چارەسەری هونەری و وەرزش و چارەسەری کۆمەڵایەتی و چارەسەر بە کارکردن و سەرقاڵبون بە کارێکەوە. لە ماوەی نزیکەی بیست ساڵ کردکردنم لە ئەڵمانیا وەک دوکتۆری دەرونی، بۆم ڕونبۆوە کە خەرافیاتی ئاینی و نائاینی هیچ، هەر هیچ ڕۆڵێکیان نیە لە چارەسەری هیچ جورە نەخۆشیەکی جەستەیی یا دەرونی.

بەڕاستی بەلامەوە سەیرە و کارەساتە کە هیچ یەک لە وەزارەتەکانی حکومەتی هەرێم بەرنامەی هەمیشەیی و بەردەوامی نیە بۆ بەرەنگاربونەوەی بیروباوەڕی خەرافی و نازانستی و بێبنەما. بەڕای من دەبێت لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و تەندروستی هۆبەیەکی تایبەت بەم بابەتە هەبێت کە بە تازەترین تەکنیکەکان و شێوەکانی پەروەردە و فێرکردن بەردەوام زانیاری و زانست و مەعریفە بگەیەنێ بە کۆمەڵانی خەڵک، بەتایبەتی چینە نەدار و نەخوێندەوار و ناڕۆشنبیرەکان. تەنیا ئاوا دەتوانین بەردەوام بەرەنگاری ئەم جۆرە بیروباوەڕە تاریک و زیانبەخشانە ببینەوە کە ڕۆژانە لە کەناڵەکانی تەلەفیزۆن و ڕادیۆ و سۆشیال میدیا و یوتیوب و بەکارهێنانەکانی تری ئینتەرنێت دەرخواردی ئینسانی ئێمە دەدرێن.

## دەمارگیری

دەمار وشەیەکە بە واتای جیڕ و ڕەق دێت پێچەوانەکەی نەرم و شل و بڵە. لە زانستی پزیشکیدا بەرامبەرەکەی بە ئینگلیزی (Nerve) و بە عەرەبی (عصب). دەمارگیری لە ڕوی کۆمەلایەتیەوە واتاکەی گوێڕایەڵیەکی نزیک لە کوێرانەیە بۆ کۆمەڵێ نەریت و بەها. بناغە ی دەمارگیری بیرکردنەوە ی لۆجیکی و بەڵگەهێنانەوە و ئەزمونی کرداری نیە، بەڵکو پەیوەندیی نەریتی و خێڵەکایەتی و بنەماڵەییە، هەروەها هەست و سۆز و هەڵچونە عاتیفیەکانە بۆ ئایدیۆلۆجیایەک یا بۆ ئاین و ئاینزایەک. لە کۆمەڵی کوردەواری چەندین جۆری دەمارگیری هەیە وەک: خێڵەکایەتی، سیاسی و ئایدیۆلۆجی، سەیدایەتی و شێخایەتی، ئاغا و بەگایەتی، دەمارگیریی حزبایەتی و بیروباوەڕ. یەکێک لە جورە بلاوەکانی دەمارگیری لە کوردوستانا سەیدایەتی و شێخایەتی یە. شێخی بەرماڵ ئەوانەن بە خواپەرستیی چڕ و پڕ ناسناوی (شێخ) یان بەدەستهێناوە، بەلام سەیدەکان خۆیان بە وەچە و نەوە و خزمی محمد پێغەمبەری ئیسلام و کچەکەی فاتمە و ئامۆزاکەی عەلیی کوڕی ئەبو تالیب دەزانن. بۆیە لە پلەبەندیی کۆمەلایەتیدا سەیدەکان لە کۆمەڵە ئیسلامیەکاندا خۆیان بە بەرزترین و نەجیبترین مەخلوق دەزانن. ئەمە بێ گوێدانە ئەوەی ئایا کەسی سەید لە ژیانی ڕۆژانەی خۆی و خەڵکدا، بە هیچ داهێنان و بەرهەمێک لە هەر بوارێکی ژیاندا بێت جێدەستی دیار و جوانی خۆی لە ناو خەڵکدا بەجێهێشتوە؟ ئایا هیچ تێڕوانینێکی بۆماوەیی DNA ئەم خزمایەتیەی سەلماندوە؟ ئێ باشە وا سەلما ندیشی، ئایا هەر بەوەی سەیدی ڕاستەقینەیە ئیتر کەسەکە دەبێتە پیاوچاک، داهێنەر، بەرهەمدار و بەنرختر لەو کەسانەی سەید نین و پێیان دەوترێ (مسکێن و ڕەعەت)، کە ئەسڵە عەرەبیەکەی (مسکین) و بەواتای داماو و بێدەسەلات دێ؟ مەسەلەی سەید بە تایبەتی لای شیعەکان زۆر زۆر گرنگە و بە سەیدەکان دەڵێن (اهل البیت)، دەڵێن لە ئێرانی شیعەدا پتر لە یەک ملیۆن سەید هەیە! ئایا هیچ هونەر و ئازایەتیەکی تێدایە ئەگەر تۆ فرزەندی دایک یا باوکێکی ناودار بیت؟ یا ئایا تۆ هیچ گوناە و تاوانێکت هەیە ئەگەر فرزەندی دایک یا باوکێکی خراپ و ناوزڕاو بیت؟

## مادام بە (ش) دەست پێدەکات...... !

پەیوەست بەم بابەتەوە وەهاب ئەمەی بۆ گێڕامەوە: ئەو کە دەکرێت بە سەرتیپی ناوچەی شارباژێڕ (شێخ م.) یەکێک دەبێ لە شێخانی بەرزنجە کە لە گوندێکی

شارباژێڕدا دەژیا. ناحەزانی وەهاب لە حیزبەکانی تر زانیاریی هەلەیان داوە بە (شێخ م.)، گوایە وەهاب تورەیە و لەگەڵ خەڵکدا ڕەقە. (شێخ م.) لە سلێمانی شوێن پێی وەهاب هەڵدەگری بزانێ کوڕی کێیە، بە پرسیار بۆی دەردەکەوێ وەهابیش شێخە و لە شێخانی پیرخدریی قەرەداخە. (شێخ م.) دەگەڕێتەوە دێ کەی خۆی و ڕۆژێ لە گەڵ هاوڕێیەکی دا باسی (پ.م) دەکەن، (شێخ م.) دەڵێت: «کوڕە دەزانی ئەم وەهابەیش شێخە، مادام شێخ وەهاب هەر ناوەکەی بە (ش) دەست پێدەکات تێیشم هەڵدا قەیناکا «. ئیتر ئەوە بۆ (شێخ م.) بە سە کە وەهابی خۆش بوێ و ڕێزی لێبگرێ، بێگومان کە (شێخ م.) ئاوا شێخی خۆشبوێت بە هەمان ئەندازە ڕقیشی لە (مسکێن) و (ناشێخ) ە یا بەلای کەمەوە بە چاوی سوک تەماشایان دەکات، جا وەرە سەیری ئەو دەمارگیریە بکە! بەداخەوە ئێستاش لە پرۆسەی هاوژینگیریدا لای هەندێ خێزان (ئاغا نەبون) یا (بەگ نەبون) یا (شێخ نەبون) یا (سەید نەبون) ی کچ یا کوڕ دەبێتە تەگەرە لەوەی پرۆسەکە سەربگرێ و کچ و کوڕەکە بۆیەک بن. دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی هەزاران کەسی بێکەڵک و بێبەرهەم، نەخوێنەوار و کۆلکەخوێنەواری فشەڵ و خۆپەرست و مادەپەرستی سەر بە خێڵ و بەگ و ئاغا و بنەماڵە ئاینیەکانی کوردوستانیان لە خۆیان کۆکردەوە و لە ژێر ناوی (ڕاوێژکاری ئاینی) و شتی تری هاوشێوە دیوەخانیان بۆ دانان و موچە و دیوەخانانە و دەماناچە و دیاریی تریان پێدەدان. پارتی و یەکێتی لەمەشیاندا لاسایی ڕژێمی سەدامیان کردەوە و بە شوێن پێکانی ئەودا ڕۆشتن. سەدام یشمان بینی چۆن لە بەگ و ئاغا و سەرۆک خێڵ و شێخ و..... سەدان سەرۆک جاش و موستەشار و تاوانباری تری لێ دروستکردن و بەشداریی کارا و بڕیاردەری پێکردن لە ئەنفال و لە شکستی سەربازیی شۆڕشی دوای ئاشبەتاڵ. ئەو ملیۆنەها دۆلارەی نەوتی کوردوستان کە یەکێتی و پارتی خەرجیان کرد و ئێستاش بەردەوەام خەرجیدەکەن لە م پیاوە بێکەڵک و فشەڵ و هەلپەرستانە، باشتر نەبو لە گەڕەکە هەژار و کرێکارنشینەکانی شارەکانی کوردوستان دا، خەرجیبکەن بۆ دروستکردنی دەیان بنکەی تەندروستی، باخچەی مندالان، مەلەوانگە، هۆلی وەرزش، کتێبخانە، سێنتەری منالان و لاوان بۆ چالاکیی هونەری و ڕۆشنبیری و وەرزشی و ئیشی دەست ؟ جۆرێکی تری زۆر باوی دەمارگیری لە کوردوستانا دەمارگیریی سیاسیە کە لە شێوە هەرە سادەکەیدا کەسەکە دەبێتە دەرویشی حیزب و بنەماڵەی دەسەڵاتداری ناو حیزب. دەرویشی حیزبی پشتگیریی کوێرانە لە حیزبەکەی دەکات لە هەمو ڕوداو و پێشهاتەکاندا.

دەسگا نهێنیەکانی حیزبی کوردی پیاوکوژانی حیزب لەناو ئەم دەروێشە حیزبیانەوە هەڵدەبژێرن بۆ کوشتنی دوژمنانی حیزب ودوژمنانی بنەماله دەسەلاتدارەکانی ناو حیزب. حیزبی شیوعیی عێراق حیزبێکی سەر بە یەکێتیی سۆڤێت بو، دەمارگیرانە و دەروێشئاسا پشتگیریی لێدەکرد، لە کوردوستان قسەیەکی نەستەق و ڕەخنەئامێز و گاڵتەئامێزهەبو کە گوایە ئەگەر لە مۆسکۆی پایتەختی یەکێتیی سۆڤێت باران بباریێ، با لە کوردوستان سامال و هەتاویش بێت شیوعیەکانی کوردوستان هەر چەتر هەڵدەدەن!

## سەرکەوتن یەك باوکی هەیە: سەرۆك و بنەماڵەکەی !

ئەو خەباتەی بە سەرکەوتن کۆتایی دێت بە دڵنیاییەوە سەرکەوتنەکە بە تێکۆشان و قوربانیی هەزاران سەربازی گومناو بەدەست هێنراوە. لە کوردوستانا بەری ڕەنجی شۆڕشی دوای ئاشبەتاڵ ئێستا خەلکانێک دەیخۆن کە زۆربەیان هیچ ڕۆڵێکی نەبوە لە سەرکەوتنی شۆڕش دا یا تەنانەت دژی ئەو شۆڕشەش بوە. من لێرەدا نمونەی چۆنێتیی پەیداکردنی دەرمان بۆ پێشمەرگە دەهێنمەوە کە چۆن دەیان سەربازی گومناو ڕۆڵی گرنگیان گێراوە و ئێستا کەس هەر ناویشیان ناهێنێت. سەرچاوەی بەردەوام و باوەڕپێکراوی دەرمان و کەرەسەی پزیشکی بۆ شۆڕشی چەکداری بریتیبو لە کۆمەلانی خەلکی کوردوستان. خزم و کەس و هاوڕێی (پ.م) کان زۆرجار لەگەڵ خۆراک و پێویستیەکانی تری ژیان وەک جل و بەرگ و... دەرمانیشیان بۆ دەهێنان. هەر بۆ نمونە: جارێک لە سەر داوای د.کەمال عەبدولڕەحمان، مامۆستا ڕەوفی برام تاقمێکی ئامێری دانسازی (گازی ددان هەلکێشان و...) لە بازاڕی (الاجهزة الدقیقە) ی سەر جادەی گۆران دەکڕێت و بۆی دەنێرێت، دیارە فرۆشیارەکە مامۆستا ڕەوف دەناسێ، بۆیە بە زەردەخەنەیەکی لاقرتیانەوە پێی دەڵێت: «مامۆستا ئەمەی دەیکڕیت پەیوەندیی بە پسپۆڕیەکەتەوە هەیە؟ کاتێک (پ.م) یەک بریندار دەبو یا نەخۆش دەکەوت، خزم و کەسی بە دەرمانەوە دەهاتن بۆلای. (پ.م) کان خۆیشیان لە ڕێی پەیوەندیە تایبەتیەکانیانەوە دەرمانیان پەیدا دەکرد، بۆ نمونە هونەرمەندی خۆشەویستی کوردستان (حەمە جەزای حاجی عەلی) چەند جارێک لە ڕێی پەیوەندیە زۆرەکانیەوە برە دەرمانی باش و جۆراوجۆری بۆ پەیداکردین لە سلێمانی. حەمە جەزا ماڵیان لە باراو بو، خۆی و هاوژینەکەی خزمەتێکی بەخشندانەیان دەکرد بە

(پ.م)ی بریندار و نەخۆش. ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە دەرمانیان پەیدا دەکرد و بۆیان دەناردین. لەم بارەیە وە (دوکتۆری دەرمانسازنەوزاد جەلال ئەحمەد ڕەش) کە لە سلێمانی بە نەوزادی سەیدەلی ناسراوە، ئاوا باسی ئەم بابەتەی بۆکردم: «من لێپرسراوی بەشی دەرمان و پێوستیە پزیشکیەکانی بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی سلێمانی بوم. پەیوەندیی ڕاستەوخۆم لەگەڵ (جەباری حاجی ڕەشیدی مەلابرایم)هەبو کە بە (هاوڕێ باوەڕ) ناسرابو. بە ناوی بنکە تەندروستیە حکومەتیەکانی دەوروبەری سلێمانی دەرمان و پێویستیی پزیشکیی ترمان لە گەنجینەکانی حکومەت دابین دەکرد و بە نهێنی دەمان نارده کێڵگە پەلەوریەکەی (دواجن) هاوڕێ باوەڕ کە لەسەر جادەی عەربەت بو. یا دەمان نارده دوکانەکەی (وەستا بەکری دارتاش) کە بە (هاوڕێ پۆلا) ناسرابو، لە سابونکەران، ئەو بۆی دەشاردینەوە تا دەنێردرا بۆ (پ.م). هاوڕێ باوەڕ ڕاستەوخۆ پەیوەندیی لەگەڵ (پ.م) دا هەبو و دەرمانەکانی بۆ دەناردن. لەم خەباتەماندا کارمەندانی بەشەکەمان هەمویان دڵسۆز و نیشتمانپەروەر و هاوکارم بون، بۆ نمونە (ساڵح کەریم عەللاف)، (ئازاد ئەحمەد)، (نوری عەبدولا) و هی تریش کە بەداخەوە ناوەکانیانم لە بیرچوە. لە ساڵەکانی ١٩٨٠ دا دوکتۆر (نیهاد ئەبتەر) و (دوکتۆر لەتیف ئەمین) یەک لە دوای یەک بەڕێوەبەری گشتیی تەندروستیی سلێمانی بون، ئەمانیش بە چاونوقان و خۆکەڕکردن و خۆگێلکردن لە ئاست چالاکیەکانمان کارەکەیان بۆ ئاسان دەکردین. بەداخەوە هاوڕێ باوەڕ و هاوڕێ پۆلا لە ساڵی ١٩٨٩ گیران، بەلام لەگەڵ ئەشکەنجەدانێکی دڕندانەدا توانیان هاوخەباتەکانیان بپارێزن و ناویان بۆ ڕژێم ئاشکرانەکەن، لە سزای خەباتەکیاندا لە ساڵی ١٩٩٠ لە سێدارەدران. بەشێک لە تیمارکەر و کارمەندە پزیشکیەکان و دوکتۆرەکانی سلێمانی کۆمەکی پارەیان دەدا، بەنهێنی چارەسەری (پ.م)ی نەخۆش و برینداریان دەکرد لە ناوشاردا، دەرمانیان کۆدەکردەوە، بۆ نمونە لە ڕێی (جەلالی حاجی عەلی) و (مامۆستا عومەر شیرەمەڕی) یەوە دەنێردرا بۆ (پ.م) «. دوکتۆر نەوزاد لەسەری دەڕوا و ئاوا باسی ئەم ڕوداوەش دەکات: «کە مستەفا چاوڕەش و دوکتۆر مەحمود عوسمان وهاوڕێکانیان لە گوندی (سێروان)ی نزیک (مەرگە) لە ڕۆژی ٢٤ ی ١١ ی ١٩٨٧ ژەهرخواردوکران، (پ.م) داوایان لێکردین دەرمانی دژەژەهری زەرنیخ dimercaprol (BAL) بان بۆ بنێرین. ئەوکات من لە نەخۆشخانەی سوپای عێراق لە سلێمانی سەربازبوم، هاوڕێم دەرمانساز (دوکتۆر شەماڵ محەمەد وەهبی) سەرباز و لێپرسراوی کۆگای دەرمانی سەربازی بو. دوکتۆر شەماڵ ئەو دژەژەهرەی لە

کۆگاکە دەرهێنا و ڕادەستی منی کرد، منیش ڕادەستی هاوڕێ باوەڕ م کرد و ئەویش گەیاندیە دەست (پ.م). ئەگەر ئەو دژەژەهرەیان پێ بگرتینایە تاوانبار دەکراین بە یارمەتیدانی (پ.م). ئەگەریش پیمان نەگیرایە بەڵام دواتر پشکنەر و چاودێرە باڵاکان پێیان بزانیایە کە ئەو دەرمانە دیارنەماوە، دوکتۆر شەماڵ هەر تاوانباردەکرا. د.شەمال نیازی بو بەوە خۆی ڕزگاربکات کە گوایە دەرمانەکە ماوەی بەسەرچوە و ئەمیش فرێیداوە، بەڵام ئەم بەڵگەیەی ناکارا و بێسودبو چونکە ئەم جۆرە دەرمانانە کە ماوەیان بەسەردەچو دەبوایە بنێردرێتەوە بۆ بەغداد بۆ بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری پزیشکی لە نەخۆشخانەی ڕەشیدی سەربازی نەک خۆبەخۆ فرێبدرێ". ئەو ژەهرەی دەسگای هەواڵگریی عێراق بەکاری هێنابو (ثالیوم) بو نەک زەرنیخ، بەڵام دیارە پێشمەرگە و ڕێکخستن لە سەرەتادا وایان زانیوە زەرنیخ بوە بۆیە داوای دژە ژەهری زەرنیخ یان کردوە! ئەو ڕواداوە بوبە هۆی مردنی (پ.م) ی دێرین (بێستونی مەلا عومەر) و دایکی مستەفا چاوڕەش و (سەریعە) ی کچی (مەلا موحەرەمی) ئیمام جومعەی مەرگە. دوکتۆر نەوزاد جەلال ئەم چالاکیەش دەگێڕێتەوە: "لە کاتی وتوویژی یەکێتی لەگەڵ ڕژیمی سەدام، هەمو پێویستیەکانی ژورێکی نەشتەرگەریمان ئامادەکرد و ناردمان بۆ نەخۆشخانەی سورداشی حکومەتی کە سەرکردایەتیی یەکێتی بە شیوەیەکی کاتی لەوێ دادەنیشت. لەگەڵ دەسپێکردنەوەی شەڕدا (پ.م) هەمو ئەو پێویستیانەی ژوری نەشتەرگەریان گواستۆتەوە بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش لە سەرگەڵو. کاک (خالد ڕەزا ئەمین) ی خەباتگێڕی شار و شاخ ی کۆمەڵە و یەکێتی، پشتڕاستی زانیاریکانی سەرەوەی د.نەوزاد دەکات و دەڵێت: "(د. پەیمان فەرەج ساڵح) هاوژینی د.شەمال محەمەد وەهبیە، زۆرجار د.پەیمان بە ئوتومبیلەکەی خۆی دەرمانی دەهێنا بۆماڵی وەستا بەکری دارتاش(هاوڕێ پۆلا)". واوەتر دوکتۆر نەوزاد ئەمە دەگێڕێتەوە: "کە لە بەهاری ١٩٨٨ دا ناوچەی قەرەداغ کیمیاباران کرا و ژەهرەکە بەتوندی چاوی بەرکەوتوانی بریندارکرد، لەسەر داوای (پ.م) پسپۆڕی چاو (دوکتۆر موەفەق محەمەد ڕەشید) چەند ڕێنماییەکی پزیشکیی گرنگی ئامادەکرد دەربارەی چۆنێتیی چارەسەرکردنی چاوی بەرکەوتوان، دوکتۆر موەفەق ڕێنماییە نوسراوەکەی بە (ئاکۆ موحەمەد وەهبی) دا نارد بۆ (پ.م). ڕژێمی سەدام هەمو ئەو دەرمانانەی کە بۆ چارەسەری قوربانیانی بەرکەوتوی گازە ژەهراویە کەی خۆی بەکاردەهێنرا، بۆ نمونە دەرزیی Atropine هەموی لە نەخۆشخانە مەدەنیە ئاساییەکان و لە کۆگاکانی دەرمان و لە بنکە تەندروستیەکان کۆدەکردەوە و دەیکشانەوە بۆ ئەوەی نەگەنە

دەست (پ.م) و سودی لێوەرنەگرن. ئەو جۆرە دەرمانانە هەموی دەبرانە نەخۆشخانە سەربازییەکان". (پ.م) کان ناوبەناو بە چالاکیی پێشمەرگانە دەستیان دەگرت بەسەر بنکەی تەندروستیی حکومەتدا و دەرمان و کەرەسە پزیشکیەکانی بنکەکەیان بۆ دەهێنان. دوای ئەوەی چەند جارێک لە ناو (پ.م) کاندا سکاڵای کەمیی دەرمانم کرد، شەوێک هاوڕێیان و هاوخەباتانم کاک (محەمەدی تەیب) جێگری فەرماندەی کەرت و (شەهید سەلاحی موهەندیس) کە فەرماندەی کەرت بو لەگەڵ دەستەیەک لە (پ.م) دا چونە ناو شاری سلێمانی. بە ڕێنمایی و چاوساغیی چەند ئەندامێکی نهێنیی کۆمەڵە، بە پێی نەخشەیەکی پێشتر ئامادەکراو دەچنە سەر بنکەی تەندروستیی حکومەت لە گەڕەکی چوارباخی سلیمانی. دەست و پێی پۆلیسی پاسەوانی بنکەکە دەبەستنەوە و دەیخەنە ژورێک و دەرگای لێ دادەخەن. گونیە لە ماڵە دراوسێکانی بنکەکە پەیدادەکەن، هەمو دەرمان و کەرەسە پزیشکیەکانی بنکەکە دەخەنە چەند گونیەیەکەوە و دەیخەنە سەرشان و پشتاین، تفەنگ و شانە فیشەکەکانیان ئەوەندەی تر کۆڵ و بارەکەیان قورستر دەکەن. (پ.م) کان بەرە و دەرەوەی شار بە ئاقاری شاخی گۆیژە بە کوڵان و جادەکاندا دەکەونە ڕێ، لە قەراخ شار لە گەڕەکی ئازادی لە گەڵ هێزێکی چەکداری ڕژێمدا توشی شەڕ دەبن. بە هاوکاری و بە بەهاناچونی خەڵکی دڵسۆزی گەڕەک و بە شەڕی دەستویەخە لەگەڵ هێزەکەی ڕژێم، (پ.م) کان بێ هیچ زیانێک خۆیان و دەرمانەکان قوتار دەکەن. بیهێنە پێش چاوی خۆت: خەڵکی گەڕەک لە ژێر ئاگری بێبەزەیی شەڕدا خەریکی کۆکردنەوەی ئەو دەرمان و کەل وپەلە پزیشکیەن کە بە هۆی شەڕەکەوە لە گونیەکان کەوتۆتە خوارەوە و بەو ناوەدا بڵاوبۆتەوە! هەر لەو ڕۆژانەدا کاک (شۆڕش ئیسماعیل) یش لەگەڵ دەستەیەک (پ.م) دا چالاکیەکی هاوشێوەیان لە بنکەیەکی تەندروستیی حکومەتدا لە قەراخ شاری سلێمانی بە سەرکەوتویی ئەنجامدا. ڕۆژێک دوای ئەم چالاکیانە کە دەرمانی زۆرمان بەدەست گەیشت، لە گوندی (عازەبان) ی شارباژێڕ بوم، ژنێک هاتە لام و داوای شیری قوتوی لێکردم بۆ منداڵەکەی، کە پێم وت نیمانە، بڕێک بە سەرسوڕمان و گومانەوە پێی وتم: "ئەی بۆچی دەڵێن هەمو دەرمان و شیری (نەخۆشخانەی شیرەکە) تان هێناوە بۆ ناو شۆڕش؟ ".چەند دیاریەکی پڕبەها بو بۆ من و بۆ (پ.م) و خەڵکی ناوچەکە کە ئەو هەمو دەرمان و کەرەسە پزیشکیانەیان دەخستە بەر دەستم، لە خۆشی و سوپاسگوزاریدا ئەملا ولای پێشمەرگەکانم ماچکرد. ناوبەناویش دەرمان و کەرەسەی پزیشکیمان لە بازاڕەکانی ئێرانەوە بۆ دەکڕدرا و بۆمان دەهێنرا.

## دروستبونی مەڵبەندەکان

وردە وردە باسک و بازوی یەکێتیی نیشتمانی و شوێن و پێگەکەی لە ناو خەڵکی کوردوستان بەهێزتر دەبو، لە ڕوی کرداریەوە یەکێتی حوکمی ناوچەیەکی فراوانی دەکرد. خەڵکی گوندەکانی کوردوستان بۆ چارەسەری کێشەکانیان زۆر جارهانایان بۆ بەرپرسە حیزبی و سەربازیەکانی یەکێتی دەهێنا، تەنانەت هەندێ جار کێشەی خەڵکی ناو شار و شارۆچکە کانی کوردوستانیش دەهێنرانە شاخ بۆ لای یەکێتی بۆ چارەسەرکردنیان، هەندێ کێشەی زۆر گەورەش دەبرایە لای سەرکردایەتی لە نێوزەنگ بۆ چارەسەرکردنی. کۆکردنەوەی ئەو هەموە سەرکردە و دەسگا و دەسەڵات و خەڵکە لە چوار پێنج کیلۆمەتر چوارگۆشەی سەرکردایەتی لە نێوزەنگ و توژەڵە و دەوروپشتیان، مەترسیی پەلاماری زەمینی و هەوایی فڕۆکە جەنگیەکانی عێراقی زۆرتر دەکرد. بە بڵاوەپێکردنی سەرکردە کان و دابەزینیان بۆ ناوچەکانی خوارەوە، ئیتر چاوتێبڕینی ڕژێم لە سەر نێوزەنگ برێک کەمتر دەبۆوە و دابەش دەبو بەسەر ناوچەکانی تریشدا. سودێکی تری ئەم بڵاوە پێکردنە ئەوە بو سەرکردەکانی یەکێتی نزیکتردەبونەوە لە خەڵکی لادێ و شارەکان و پەیوەندیان لەگەڵ خەڵک بەهێزتر و ڕاستەوخۆتر دەبو. ئیتر سیستمی پێشوی هەرێم و کەرت و لقەکان چاری دۆخەکەی نەدەکرد، نوێکردنەوەی تان و پۆ ی (ێنک) پێویست بو. بۆیە لە زستانی ١٩٨٢/١٩٨٣سیستمی مەڵبەندەکان دروستکرا و کوردوستان دابەشکرا بۆ چوار مەڵبەند. دەکرێ بڵێین ئەم چوار مەڵبەندە وەک حکومەتی یەکێتی بو لە ناوچەکانی دەرەوەی سەرکردایەتی. لە سەرکردایەتی لە نێوزەنگ ئەم دەسگایانە جێگیربوبون: ناوەندیی کۆمەڵە، مەکتەبی سیاسی وەک لوتکەی دەسەڵات و بڕیاردانی ناو یەکێتی، لەگەڵ مەکتەبەکانی خوار خۆی کە بریتی بون لە مەکتەبی عەسکەری، مەکتەبی ئیداری و دارایی، مەکتەبی ڕاگەیاندن، مەکتەبی پەیوەندیەکان، هەروەها بەشی تەندروستی. بارەگای مەڵبەندی یەک لە (حاجی مامەند) دامەزرا، هی مەڵبەندی دو لە (سەرگەڵو)، هی مەڵبەندی سێ لە وەرتێ، هی مەڵبەندیی چوار لە بالیسان. مەڵبەند ئەندامێکی سەرکردایەتیی یەکێتی لێپرسرای بو، پێکهاتەکانی مەڵبەند ئەمانە بون: بەشی عەسکەری وسیاسی و دارایی و کۆمەڵایەتی و ڕاگەیاندن.

## گوندی حاجی مامەند: پایتەختێکی بەرەنگاربونەوە !

دەسگاکانی مەڵبەندی یەک لە زستانی ١٩٨٢ / ١٩٨٣ وە لە حاجی مامەند دامەزرا. ئێمەش وەک نەخۆشخانە لە پارەزانـەوە گواستمانەوە بۆ حاجی مامەند. پاشان

بۆ زو بەهاناهاتنی (پ.م) ی بریندار و نەخۆش لە گوندی باراو یش دو ژورمان پەیداکرد و کردمانە نەخۆشخانە، کارمەندی پزیشکی (دوکتۆر کامیلی مەلا مەحمود) مان کردە بەرپرسیاری. مەلا بەختیار لێپرسراوی مەڵبەندی یەک بو، حاکم عومەر عەزیز لێپرسراوی سیاسی بو، بەکری حاجی سەفەر لێپرسراوی عەسکەری بو، ئاوات عەبدولغەفور لێپرسراوی کۆمەلایەتی بو، ڕەفعەتی مەلا عەبدولڕەحمان لێپرسراوی دارایی بو، ئاسۆی شێخ نوری لێپرسراوی ڕاگەیاندن بو. بەشی تەندروستیی مەڵبەند و دادگای مەڵبەند سەر بە بەشی کۆمەلایەتیی مەڵبەند بون. من کرام بە لێپرسراوی بەشی تەندروستیی مەڵبەند. دادگای مەڵبەندی یەک بارەگای لە حاجی مامەند دانا و لە لایەن ئەم کەسانەوە دەبرا بە ڕێوە: دەرچوانی کۆلیجی یاسا حاکم قادر حەمە جان و حاکم سەرداری حاجی سەعیدی گلاڵی، لەگەڵ دەرچوی کۆلیجی شەریعە مەلا عوسمان سالح کەرکوکی. مەلا عوسمان لە بنکەیەکی سەربازی بەسەر گردێکەوە لە پشتی گوندی (چنارە) ی نزیک دەربەندیخان سەرباز دەبێت، ڕۆژێک بە خۆی و ڕەشاشێکی (بی کەی سی) و فیشەکێکی زۆرە وە ڕادەکات و خۆی دەگەیەنێتە (پ.م). مەڵبەندی یەک ئەم تیپانەی دەگرتەوە: تیپی ١١ی شارەزور، تیپی ١٥هەورامان، تیپی ٣١ی بەرزنجە، تیپی ٣٣ ی سلێمانی و تیپی ٣٧ی شارباژێر و تیپی مەڵبەند. هەر لەم کاتەدا (مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوک) ی حیزبی شیوعی لە حاجی مامەند بارەگای دانا، دەستەی سەرکردایەتیان پێک هاتبو لە بەهادین نوری بەرپرسی یەکەمی سەرکردایەتیەکە، مەلا عەلی و ئەبو تارا (ئیبراهیمی سۆفی مەحمود) و ئەبو تانیا وەک ئەندام. ماڵی چەند (پ.م) یەکیش هاتبوە حاجی مام مەند. بەم جۆرە حاجی مامەند بوبوە پایتەختۆکی بەرەنگاربونەوەی رژێمی سەدام و ناوەکەی وەک پەڵە هەورێکی ترسناک بەسەر دەسگاکانی ڕژێم و پیاوەکانی دا لە سلێمانی دەگەڕا و ترسی دەخستە دڵیان. حاجی مامەند لێوان لێو بو لە ژیان و بزێوی و ڕەنگ و دەنگە جیاواز و ئازادەکان. ئیتر من لە حاجی مامەند جێگیر بوم، بەڵام زو زو دەچوم بۆ گەڕان بە گوندەکاندا.

سەرکردایەتیی سلێمانی و کەرکوک ی (حشع) کە هاتنە حاجی مامەند، ژن و مێرد د. نازم جەواهیری (دڵشاد) و دوکتۆرە ئیمان سەلام عادل (ڕوناک) یان لەگەڵ بو. (دوکتۆرە ڕوناک) کچی (سەلام عادیل) ی سکرتێری پێشینی (حشع) دوای تەواکردنی خوێندنی پزیشکی لە یەکێتیی سۆڤیەت گەڕابۆوە کوردوستان و وەک دوکتۆر لە گەڵ مێردەکەیدا (دوکتۆر دڵشاد) لە ژورێکی کۆماوە و کۆن و تاریکی بچوکدا لە حاجی مامەند کاری پزیشکیان دەکرد. ڕۆژێک بیستم دوکتۆرە ئیمان نەخۆشیی هەناسە

توندی (Asthma) ی هەیە و دەرمانی (کۆرتیزۆنی) لێبڕاوە. لە ڕۆژی لەدایکبونیدا بە بڕێکی باش دەرمانی (کۆرتیزۆن) ە وە وەک دیاریی جەژنی لەدایکبونی چوم بۆلای و زۆری پێخۆشبو. بەتایبەتی لە سنوری مەڵبەندی یەک پەیوەندیی یەکێتی و حیزبی شیوعی باش و بێ کێشە بو، بنکەکانمان لە حاجی مامەند نزیکی یەکتر بون.

## کە بیرت نەکردەوە لە کاردانەوەی بەرامبەر!

(ئەحمەد بانیخێلانی) لە چاپی دوهەمی لاپەڕە ٤٢٦ ی (یادەوەریەکانم) دەنوسێ: «شەوی ٢٨ / ٢٩ ی نیسانی ١٩٨٣ هێزەکانی (جود) پەلاماری بارەگای (ینک) یان دا وبە ئاسانی دەستیان بەسەر مەڵبەندی (بالیسان) دا گرت». لە فیزیا دا یاسایەک هەیە دەڵێت: هەر کارێک کاردانەوە یەکی بە دوادا دێت کە بە پێچەوانەی ئاراستەی کارەکەیە وبەهێندەی کارەکە توندە. لە کۆمەڵناسی و دەرونناسی و سیاسەت و جەنگدا وەک فیزیا نیە، کاردانەوە زۆر جار لە کارەکە زۆر توندتر و پڕئێشترە. لە زانستی پزیشکیدا خۆپاراستن باشترە و ئاسانترە لە چارەسەرکردن.

نازانم چی وای لەو حیزبە عێراقیە ئومەمیە دێرینە خاوەن ئەزمونی ٥٠ ساڵ خەباتە کرد، ببێتە لایەنێک لەو شەڕی براکوژیە قێزەونەی نێوان یەکێتی لە لایەک و پارتی و (حسک) و پاسۆک لە لاکەی تر؟ مەخابن لە ئەنجامی کۆتاییدا (حشع) کەوتە لای پارتی و (حسک) و پاسوک لە بەرەی (جود) دا لە دژی یەکێتی نیشتمانی. من چاوەڕێی ئەوەم لە (حشع) دەکرد ڕۆڵێکی سیاسی- دیبلۆماسی گەورە ببینێ و ببێتە ئاگرکوژێنەوەی ئەو شەڕە، نەک خۆیشی ببێتە بەشێک لێی! ئەوە بو بەداخەوە لە ١ی ئایاری ١٩٨٣ لە (پشتئاشان) لە بناری چیای قەندیل، کاردانەوە چاوەڕوانکراوەکە کەوتە گرمە و ناڵە، شەڕێکی قورس بەرپابو لە نێوان یەکێتی و بەرەی (جود). شەڕەکە بە ئاگاداری و پەسەندکردنی لە لایەن جەلال تالەبانی و بە سەرکردایەتیی مەیدانیی نەوشیروان مستەفا کرا. شەڕی کارەساتی پشتئاشان بە شکانی سەربازیی بەرەی جود تەواو بو. زۆرترین زیان بەر حیزبی شیوعی کەوت، ئەحمەد بانیخێلانی (ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی) و (کەریم ئەحمەد) ی ئەندامی مەکتەبی سیاسیی ئەو حیزبە لە لایەن یەکێتیەوە بە دیل گیران. مەخابن! دەیان (پ.م) ی بریندار و دیلی (حشع) لە ژن و پیاو گولەباران کران کە لەناویاندا زۆریان عەرب بون، یەکێ لەوانە هاوڕێیەکی کۆلیجم بو بە ناوی (د.غەسان عاکف)، زۆر زۆر خەفەتم بۆ خوارد.

## هانێ پۆستەکەتان، من نایکەم !

پێچەوانەی ئەوەی لە (پشت ئاشان) ڕویدا، لە سنوری مەڵبەندی یەکی سلێمانی لە ڕۆژی ١٩٨٣/٥/١٠ڕێکەوتنێک واژۆکرا لە نێوان (بەهادین نوری) ی بەرپرسیاری سەرکردایەتیی سلێمانی و کەرکوکی حیزبی شیوعی، و (مەلا بەختیار) ی بەرپرسی مەڵبەندی یەکی یەکێتی. بە پێی ئەو ڕێکەوتنە (پ.م) کانی حیزبی شیوعی بە بێ شەڕ و کوشتار، وە بە هاوکاریی (پ.م) کانی یەکێتی شارباژێڕیان بەجێهێشت و پەڕەینەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ. ئەم هەڵوێستی شەڕنەکردنەی مەڵبەندی یەک لەگەڵ حیزبی شیوعی بە پشتیوانیی زۆرایەتیی کادیر و (پ.م) ی کۆمەڵە و (ینک) بو لە ناوچەکە، وە بەندە خۆیشم بە گەرمی پشتیوانیم لێکرد و بەم هەڵوێستەم ویژدانم زۆر ئاسودە یە. مەلا بەختیار بێمنەتیی خۆی لە لێپرسینەوەی حیزبی و لە پۆست و پایەی ڕەسمیی ناو (ینک) دەرخست و هەڵوێستێکی ویژدانی و مرۆڤدۆستیی جوانی بۆ مێژوی گەلەکەمان تۆمارکرد، کە بوبە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی دەیان (پ.م) ی شیوعی و یەکێتی. لە دوای ڕێکەوتنەکەی نێوان (حشع – بەهادین نوری) و (ینک – مەلا بەختیار) و وەک لێکەوتەی سەرپێچیکردن لە فرمانی شەڕکردن دژی (حشع) لە ناوچەکانی مەڵبەندی یەک، لە جێی مەلا بەختیار بەکری حاجی سەفەر کرا بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەک.

لە سەر ئەم ڕوداوە بەهادین نوری، سەرکردەی دیار و ناوداری (حشع) لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنیی (ئاوێنە) لە ڕۆژی ٣١ ی ٨ ی ٢٠١٨ نوسیویە: «لە ١٩٨٣شدا هاوڕێیان عزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد و ئەحمەد بانیخێلانی کەتنێکی گەورەتریان کرد بەهەقی حیزبی شیوعی: (پ.م) شیوعیەکانیان ڕاپێچی شەڕی براکوژی کرد (شەڕی پشتئاشان)، لەو شەڕە ڕەشەدا، بەرلەوەی برینی بەرەی کلکایەتی حیزبی شیوعی و بەعس (مەبەستی بەرەی نێوان حیزبی شیوعی و حیزبی بەعسە کە لە ١٧ ی ٧ ی ١٩٧٣ واژۆکرا) سارێژبێ، جارێکیتر حیزبی شیوعی خرایە پاشکۆی حیزبێکی قەومی تر(پارتی) دژ بە حیزبێکی قەومی دیکە (یەکێتیی نیشتمانی). بۆ ئاگاداری من کەبەرپرسی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوک بووم، یاخی بووم لە جێبەجێکردنی فەرمانی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی، ڕێکەوتم لەگەڵ بەرپرسی مەڵبەندی یەکی یەکێتی و ئێمە شەڕەکەمان نەکرد ".

## کاتێك پێشبینی ناکەیت و دوژمن بە کەم دەزانیت!

شەوی ٢٨ ی ٦ ی ١٩٨٣ پۆلێ (پ.م) ی مەڵبەندی یەک لە ڕێگای (وێڵەدەر) وە دەچنە ناو شاری سلێمانی و دابەشدەبن بە دو دەستەوە، دەستەیەکیان (عەبدولڕەحمانی حەمەی فەرەج) سەرکردایەتیی دەکات ودەستەکەی تریش (شێخ حسەینە سور). هەردو دەستەکە لە یەک کاتدا پەلاماری بنکە و مۆڵگاکنی ڕژێم لە ناو شاردەدەن و دەستێکی قورسیان لێدەوەشێنن. پاشان بە سواری دو تراکتۆر بە هەمان ئەو ڕێگایەی پێیدا چوبونە ناوشار دەگەڕێنەوە، ئەی هاوار چ هەڵەیەکی کوشندە دەکەن! تراکتۆری یەکەم دەکەوێتە بۆسەی گەلەجاشێکی زۆر و لە ئەنجامدا شۆفێری تراکتۆرەکە و ١٦ (پ.م)ی گەنج کە هێشتا خۆشیان لە ژیان نەدیبو لە چەند چرکەیەکدا شەهید دەکرێن و جاشەکان جەستەی خڵتانی خوێنیان وەک کاڵایەکی گرانبەها دەبەنەوە بۆ ڕژێمەکەی ئاغایان تا پارەی پێوەربگرن.  ئەو تراکتۆرەی دەستەکەی عەبدولڕەحمان لێپرسراوی بو لە کەمینەکە دور دەبێت، ڕێگای گەڕانەوە بە دوای تراکتۆری یەکەمدا دەگۆڕێ و (پ.م) کانی ناوی بە سەلامەتی دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. بە دەسگای بێتەل لە حاجی مامەند هەواڵی کارەساتەکەمان پێگەیشت. من خێرا بە هەورازی سێیەر دا خۆم گەیاندە نەخۆشخانەکەمان لە باراو. سێ بریندراری ڕوداوەکە کە بریتیبون لە (شێخ حسەینە سور) ی فەرماندەی کەرت و دو (پ.م) ی تر بە ناوەکانی (فەرەیدون) و (ئازاد) چاوەڕێی منیان دەکرد. فەرەیدون دەم و لێوی بریندار بوبو، ئازادیش هەردو قاچی بریندداربوبون، لەگەڵ دوکتۆر کامیل برینەکانی هەردوکیانمان تیمارکرد و حەب و دەرزیی پێویستمان پێدان. شێخ حسەین گولە لە سنگی دابو و لە بنباڵی چەپیەوە دەرچوبو. سینگی خیزە خیزی دەهات، ئێش و کۆکەی هەبو، هەناسەی توند بو، بەدەم هەناسەدانەوە خوێن و کەف لە ناوسینگیەوە دەهاتە قوڕگ و دەمی و هەڵیدەهێنایەوە. برینەکەیمان پاککردەوە، دەرزیی ئێش و دژەبەکتیریا مان لێدا. ئەم دۆخەی حسەین پێی دەڵێن (Traumatic Hemopneumothorax)، ئەم حاڵەتە ئەگەر زو چارەسەر نەکرێ دەبێتە مەترسی بۆ سەر ژیانی نەخۆشەکە. چارەسەرەکەی دانانی سۆندەیەکی تایبەتە لە لای چەپی سینگی بۆ هەڵمژینی ئەو هەوا و خوێنەی سیەکانیان خستۆتە ژێر پەستان و گوشینێکی زۆرەوە و ناهێڵن حسەین پڕ بە سییەکانی هەوای پاک هەڵمژێ، ئەمە دەبێت لە ژوری عەمەلیات بکرێت. دەسگای وێنەی تیشکی مان نەبو وێنەیەکی تیشکیی سینگی بگرین کە زۆر پێویست بو، بەڵام لە کاتی کارکردنم لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی نەخۆشێکی هاوشێوەی حسەینم بینیبو و هەر لە قاوش سۆندەی

سینگم بۆ دانابو، بۆیە ترسم نەبو. خێرا لیستێکی درێژم لە دەرمان و سۆندە و بوتڵی شوشەی تایبەتی و پێویستیەکانی تر نوسی و دامە دەست کاک (ئەحمەدی برای شێخ حسین)، ئەمیش لیستەکەی دابوە دەست کاک (ئەنوەر ئەبوبەکر) ی هاوڕێی. ئەنوەر لە نەخۆشخانەی سلێمانی هەمو پێویستیەکان پەیدادەکات و دەیخاتە ناو سندوقێکی فلین و بە سەهۆڵ دایدەپۆشێت. ئەنوەر بە شێوەیەکی زیرەکانە و سەرکێشانە بە ناو بازگەکانی دوژمندا هەمو پێویستیەکانی گەیاندە لامان لە باراو. بە کۆمەکی دوکتۆر کامیل، دوای لێدانی دەرزیی ئێش و سڕکردنی شوێنی کردنەژورەوەی سۆندەکە، لە نێوان دو پەراسوەوە سۆندەی سینگەکەم بۆ شێخ حسەین دانا. ڕۆژانە دەرزیی دژە هەوکردنی بەکتریایمان لێدەدا. دوای نزیکەی دو هەفتەیەک کە سیەکانی شێخ حسەین ئیتر وردەوردە هەوایان بۆ دەچو توانیمان سۆندەکە دەربێنین. شێخ حسەین وردە وردە دوای سێ مانگێک چاکبۆوە و کەوتەوە چالاکی. من بڕوام وایە هەمو ڕوداوێک هۆیەک یا چەند هۆیەک دەبنە ڕودانی. پێشتر بینیبوم کاتێ (پ.م) دەچونە ناوشارەوە، لە پشتی خۆیانەوە دەستەیەک (پ.م) یان جێدەهێشت بۆ پاراستنی ڕێگای گەڕانەوەیان، نەوەک دوژمن پشتیان لێبگرێ و بیانخاتە کەمینەوە. دیاربو لە چالاکیە کەی ئەو شەوە دا (پ.م) لە پشتی خۆیانەوە جێ نەهێڵرابو، دەنا هەر کە جاشەکانیان دەبینی تەقەیان لێدەکردن و نەیان دەهێشت ئەو تەنورە دۆزەخیە بۆ هاوڕێکانیان دابخەن. بەداخەوە دواتر (عەبدولڕەحمانی حەمەی فەرەج) لە دوای وتوێژ لە چالاکیەکی پێشمەرگانەی ناو شاری سلێمانیدا شەهید بو. شێخ حسەینیش لە پایزی ١٩٩٧ لە شەڕی براکوژیدا لەگەڵ پارتی لە (شەڕی بەنی هەریر) بە فڕۆکەی جەنگیی تورکیا شەهید بو.

## ئایدیالیزم و گەشبینیەکی بێبنەما !

لە دوای شەڕی ڕەزڵە لە مانگی ٩ ی ١٩٨١ و شەڕی لەشکری ئیسلامیی کورد (لاک) لە مانگی ٧ ی ١٩٨٢، ئیتر یەکێتی بە تەواوی بو بە دەسەڵاتداری ناوچەی شارباژێر و جۆرە ئارامییەک ناوچەکەی گرتەوە. بە دروستبونی مەڵبەندی یەک و دانانی بنکەکەی لە گوندی (حاجی مامەند)، ئیتر کاتی ئەوە بو بیربکەینەوە چۆن باشتر و ڕێکخراوتر و کاریگەرتر لە جاران خزمەتی خەڵکی ناوچەکە بکەین.

دێی چنارە نزیکەی سەعاتە ڕێیەک بە پێ لە پاڕەزانەوە دورە، قوتابخانەی تێدا نەبو، بە هۆی دوری ومەترسیی ڕێگاکەوە ئەمە وایکردبو زۆر خێزان منداڵەکانیان

نەنێرن بۆ پـارەزان بۆ خوێندن. بە تایبەتی لە زستانی پڕ لە بەفر و سەرما و تەڕوتوشیی ناوچەکە، بەزەییم بە منداڵەکانی چنارە دەهات کە بۆ خوێندن بە پێ دەچون بۆ قوتابخانەکەی پارەزان. بە مەبەستی کردنەوەی قوتابخانەیەک، لەگەڵ خەڵکی چنارە قسە م کرد، پێشیازەکەی منیان پەسەندکرد کە بە هاوکاریی مەڵبەندی یەک هەرچی زوترە خانویەک بە بەرد وقوڕ دروستبکەین بۆ قوتابخانە. بەمە ئیتر منداڵانی دێ ڕزگاربکەین لە هاتوچۆ و لە نەخوێندەواری. لە هاوینی ۱۹۸۳ من خۆم لەگەڵ وەستایە کدا پێکەوە بە گەچ کەوتینە کێشانی نەخشەی خانوەکە لە سەرپارچە زەویەکی گونجاو. بە داخەوە پێش ئەوەی بکەوینە هەڵکەندنی بناغەی خانوەکە، هێرشێکی توندی ئێران لە پێنجوێنەوە بۆ ناوچەکە دەستیپێکرد. چنارە کەوتە نێوان ئاگری شەڕی ئێران وعێراق، خەڵکەکەی وەک خەڵکی گوندەکانی تری ناوچەکە گوندەکەیان چۆڵکرد و بە مەش گەشبینی وئایدیالیزمەکەی من هەمو ڕەوایەتی ودروستیەکی لە دەستدا.

## هاوژینگیری وەك ئەرك و هاوسۆزی !

لە ڕێکخستنەکانی شارەوە هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت چەند کچە خوێندکارێک لە کاتی خۆپیشاندانەکانی بەهاری ۱۹۸۲دا لە سلێمانی گیرابون و کەوتبونە ژێر ئەشکەنجەی دڕندانەی پیاوانی دائیرەی ئەمنی سلێمانی. (پ.م) ی هاوڕێم فەرماندەی دەستە (غەریب کونجرینی) زۆر بە تاسە و سۆزە وە باسی خوێندکارێکی کچی بۆ کردم بە ناوی (پەیمانی مستەفا کونجرینی). پەیمان و خوشکێکی بچوکتری بە ناوی (شادی) دەورێکی ئازا و کاریگەریان لە خۆپیشاندانەکانی سلێمانیدا گێڕابو، ئەمەش بوبو بە هۆی گیرانی هەردوکیان، دوای دوسێ هەفتە لە لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان ئازاددەکرێن. لە کوردوستانی عێراقدا بەشداربونی ڕاستەوخۆی ژن لە خەباتی ڕزگاریی نیشتمانیدا بەرامبەر ڕژێمێکی دڕندەی وەک ڕژێمی سەدام شتێکی نوێ و سەرنجڕاکێشبو. بەڕاستی کە چیرۆکی گرتن و ئەشکەنجەدانی ئەو کچانەم بیست، هەستم بە هاوسۆزیەکی قوڵ و پڕواتا کرد لەگەڵ ئێش و ئازار و مەینەتیەکانیانا. ئیستاش باش لەبیرمە لە وتوویژم دا لەگەڵ (پ.م) کان لەسەر ئەم بابەتە هەستیارە، وام بیردەکردەوە ئەرکی ئینسانی و نیشتمانیی پیاوی کورد ئەوەیە نەهێڵێ ئەو کچانە بە هۆی لێکەوتە دەرونی و کۆمەلایەتیەکانی کاتی زیندانیانەوە تەنیا و دابڕاو و

مات و مەلول بەجێبهێڵرێن. ئەوانە لە لایەن ڕژێمەوە بەردەوام لە بەردەم هەڕەشە و تۆقاندن و مەترسیی گرتنەوەیان بون. وام بیردەکردەوە ئەرکی پیاوی کوردە و بەتایبەتی پێشمەرگە، ئەگەر ئەو کچانە خۆیان ویستیان و ئارەزویان لێبو، لەگەڵ ئەم کچە قوربانیانەی دەستی ڕژێم هاوژینگیری بکەن و خێزان دروستبکەن. لە یەکێ لەو جۆرە وتووێژانە دا (غەریب کونجرینی) ڕاستەوخۆ پێشنیازی بۆکردم هاوژینگیری لەگەڵ (پەیمان) بکەم. پەیمان دوای ئازادبون لە زیندان دەگەڕێتەوە سەر خوێندنەکەی لە قوتابخانەی پیشەسازیی سلێمانی و تەواوی دەکات.

من ئیتر وا چوار ساڵ بەسەر ژیانی دەروێشئاسای پێشمەرگایەتیم دا تێپەڕیبو، چاوەڕێی بەئامانج گەیشتنێکی خێرای شۆڕشم نەدەکرد. جێهێشتنی مەیدانی خەبات و هەڵهاتن بەرەو ئەوروپا هەر زو ڕەتمکردبۆوە. پەنابردن بۆ ئێران و جێگیربون لەوێ یا خۆبەدەستەوەدان بە ڕژێمی سەدام هەرگیز بە بیرمدا نەهاتبون. هەمو بونی جەستەیی و ڕۆحیم لەگەڵ خەباتی ڕزگاریی کوردوستانا تێکەڵ بوبو، لە ئێش و ئازاری کۆمەڵانی خەڵکدا نوقم و قاڵ بوبوم، ڕۆژانە مەینەتیەکانیان کە بوبون بە هی منیش بە زیادەوە لەگەڵیاندا دەمچەشت. وەفا و دڵسۆزی و لەخۆبوردویی خەڵکم ڕۆژانە دەبینی، ڕۆژانە لەگەڵ وزە و توانا و حەماسەتی (پ.م) کانی شاخ دەژیام، گەلێک سەرسام بوم بە تێکۆشەرانی خەباتی نهێنی لە ناو شارەکان، پشتیوانیی کۆمەلانی خەڵک بۆ شۆڕش ڕۆژانە بە هەر پێنج هەستەکانم و بە ویژدان و بەڕۆحی بێئۆقرە و نائارامم هەستم پێدەکرد و جێژم لێدەبینی. چالاکیەکانی پێشمەرگە و خەباتی ژێرزەمینیی ناوشارەکان ورە و وزە یان پێدەبەخشیم و لە نائومێدی و ڕوخان دەیانپاراستم.

هەمو ئەوانە و زۆری تریش ئیتر منیان لە پزیشکێکی ئاساییەوە کردبوە سۆفیەکی دونیانەویستی ڕێگای کوردایەتیی پێشکەوتنخواز و دیموکراسی و سۆشیالیزم. هەم لە دیدی خۆمەوە، هەم لە دیدی (پ.م) کان و هاوڕێ نزیکەکانمەوە، تازە هاتنەدەرەوەم لە کاروانی ئەو ڕێگا سەختە، پێش گەیشتن بە ئامانجەکانی، کارێکی نەکردەنی و مەحاڵ بو. لە دۆخێکی ئاڵۆز و چەندلایەنەی ئاوادا پێشنیازەکەی (غەریب) لە دڵ و دەرونمدا وردە وردە کنە و گەشەی دەکرد. هۆکارێکی تریشی هاتەسەر ئەویش مەترسیی شەهیدبونم بو لە هەر چرکەسات و لە هەر شوێنێکدا. هەرچەندە ئەم ئەگەرە بۆ منی دوکتۆر لە چاو (پ.م) کانی تردا لاوازتربو، بەڵام چەندین هاوڕێی نزیکم شەهید بوبون، ئەی من بۆ نا؟ ئەگەری شەهیدبونم پرسیارە ئەزەلیەکەی

مرۆڤایەتیی لە ڕۆحمدا هورووژاند، پرسیاری وجودیی ژیان و مردن، لە خۆمم پرسی: «تۆی ڕەبەن، وەک دیاری و یاداوەر دوای شەهیدبونت چی بۆ دایکت بە تایبەتی و خۆشەویستانی ترت بە گشتی بەجێدێڵیت ؟ «. ئەم پێڤاژۆ و تاوتوێکردنە هزری و فیکرییەی ناومیشکم بیری خێزان دروستکردنی لەلام بەهێزترکرد. هاوژینگیری ڕاستەوخۆ گرێدراوە بە جوانترین دیاریی خودا و سروشت! ئەو دیاریە لە نرخاندن نەهاتوەی کە ناوی منداڵە. لە مانگی ٦ ی ١٩٨٣ بێ ئەوەی تەنانەت وێنەی (پەیمان) یش ببینم، پەیمانیش بێ ئاگا لە من، داوام لە برا و خوشکەکانم کرد بچن بۆ ماڵی (مستەفا کونجرینی) ی باوکی پەیمان، قسە لەگەڵ پەیمان و براوخوشکەکانی بکەن، نیاز و ویستی منیان پێ بڵێن. دوای چەند ڕۆژێک لە پرس و هەواڵ و زانیاری کۆکردنەوە لە سەر من و پرس و ڕاکردن بە (کوردە) ی برای پەیمان کە (پ.م) بو و منی باش دەناسی، پەیمان و ماڵی باوکی داواکەی ئێمەیان پەسەندکرد بۆ سازکردنی دیدارێک بۆ من و پەیمان لە دێیەکی شارباژێر. دوای چەند هەفتەیەک و لە مانگی ٧ ی ١٩٨٣ بە پێی ئەو نەخشەیەی دامان نابو، پەیمان لەگەڵ خوشکێکی خۆی و خوشکێکی من هاتنە دێی (ڕەزڵە) بو ماڵی (شێخ محەمەد). لە ژورێکی ئەو ماڵە خانەدانەدا دا نزیکەی یەک سەعات بەتەنیا قسەمان لەگەڵ یەکترکرد، دیاربو هەردوکمان بەیەکتر ڕازیبوین. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام و بەدڵم نەبو، پەیمان لەبری ئەوەی وەک من باسی ژیانی تایبەتیی من و ئەو بکات وەک ژن و مێرد لە ئایندەدا، ئەو زوزو دەیهێنایەوە سەر باسە سیاسی و فیکریەکان لەگەڵمدا. ئەو کەوتبوە ژێر کارلێکی ڕێکخراوی مارکسیی (راه کارگەر) ی ئێرانی و دەیویست بزانێ ئایا من پەیوەندیم بەو ڕێکخراوەوە هەیە یان نا. دوهەم دیدارم لەگەڵ پەیمان لە دێی (چنگیان) بو لە مانگی ٩ ی ١٩٨٣. لە ڕۆژی ٢٤ ی ١٠ ی ١٩٨٣ دوای مارەکردن پەیمانم گوازتەوە و چوینە ماڵێک لە دێی (حاجی مامەند). ماڵەکە بریتیبو لە خانویەکی قوڕی پشتکۆماوە ی دو ژوری. لە کاتی گواستنەوەی پەیمان و ڕۆژانی پیش و دوای ئەوە، هێرشی ئێران بۆ سەر پێنجوێن و ناڵپارێز و شارباژێڕی سروچک لەگەرمەی دابو. شەو و ڕۆژەکانی مانگی هەنگوینیی ئێمە بە توپباران و گرمە و ناڵەی فڕۆکە جەنگیەکانی ئێران وعێراق پێشوازیان لێکرا. لەو دۆزەخە بچوکەی بۆمان داخرابو ئەوەی سەرسامی کردم و زۆرسەرنجی ڕاکێشام ئەوە بو پەیمان وەک ژنێکی شاری هیچ ترسێکی وای لە و بارە ترسناک و نادیارە پیشان نەدەدا! بەڵام پەیمان پێشتریش لە زینداندا ئازایەتیی خۆی نواندبو و لەژێر ئەشکەنجەی دڕندانەی جەللادەکانی ئەمنی سلێمانی دا یەک

وشەی نەدرکاندبو، یەک زانیاریی نە دۆڕانبو! بەڵام مەخابن! دۆخی ترس و زیندان و شەڕ، کەی و لە کوێی ئەم دونیایە لەگەڵ ژیانێکی شاد و ڕەنگاوڕەنگ و لەگەڵ چێژوەرگرتن دا سازاون ؟! هەر سێ ڕۆژ دوای گواستنەوەی پەیمان، ناچارکراین لە ژێر هەڕەشەی بۆمبابارانە جۆراوجۆرەکان، پەیمان لەگەڵ (شوکریە) ی هاوژینی (حاکم سەردار) ی هاوڕێی (پ.م) م و (پەروین) ی هاوژینی (شێخ فازیل) ی هاوڕێی (پ.م) م، بە پێ بنێرینەوە بۆ گوندی (چنارە) وشارۆچکەی (بەرزنجە) و لەوێشەوە بە ئوتومبێل بۆ سلێمانی.

وەک بەری ناوازە و بەتامی ئەم سەرچڵییەی ناوم نا هاوژینگیری، (کێوان) و (کەنی) ی لێ شینبو، دو داربەڕو، دو سەروی هەردەم کەسک و پرشنگدار کە ڕەگ و ڕیشەیان بە خاکی پیرۆزی ئەم کوردوستانە دا توندوتۆڵ بنجیان داکوتاوە. پەیمان و کێوان و کەنی لە ئەڵمانیا جێگیربون، منیش لە کوردوستان. کێوان لە ئەڵمانیا لەگەڵ لاڤا ی کچی کاک محەمەد قادر دەباغ و ئاوازخان خێزانی دروستکرد و لە ١٨ ی ١٢ ی ٢٠١٧ لاڤا و کێوان کردیانمە باپیرەی (یارا) خان!

## د.هەژار! پێویست ناکات خۆت بە من بناسێنیت !

لە ساڵی ٢٠١١ لە سەر ئەرکی بنەماڵە ی شەهید سەلاح (نەخۆشخانەی دەرونیی شەهید سەلاحی موهەندس) لە قەراخ شاری سلێمانی لە گەڕەکی (ئبراهیم ئەحمەد) دروستکرا. لە سەر داوا و حەزی بنەماڵە منیان کرد بە بەڕێوەبەری ئەو نەخۆشخانەیە. لە مانگی ٣ ی ٢٠١٢ نەخۆشخانەکەمان بە ڕوی نەخۆش دا کردەوە. بەلای کەمەوە پێویستمان هەبو بە ئوتومبیلێکی ئەمبولانس و پاسێک بۆ گواستنەوەی کارمەندان و تویتایەکی بارهەلگر بۆ ئیشی تەکنیکی و کارگێڕی. وەزارەتی تەندروستی پارەی نەبو هیچ یەکێک لەو ئوتومبیلانەمان بۆ بکڕێت. شەوێکی هاوینی ٢٠١٢ لە چیمەنەکەی (یانەی کۆمەلایەتی) لەگەڵ چەند پزیشکێکی هاوڕێم دانیشتبوم، بە ڕێکەوت مەلا بەختیارم بینی، داوام لێکرد پشتگیریمان بکات بۆ ئەوەی لە پارەی (ینک) بۆ نمونە هی کۆمپانیای (نۆکان) یا لەو سەرمایەدارانەی بە سەر (ینک) وە بون بە فرەملیۆنێر، بەلای کەمەوە دو لەو ئوتومبیلانە بۆ نەخۆشخانەی شەهید سەلاحی موهەندس دابین بکرێت. پێم وت: ئوتومبیل بۆ من نییە بەڵکو بۆ خزمەتی نەخۆشە. مەلا بەختیار لە وەلامدا وتی: «دوکتور هەژار پێویست ناکات خۆت بە من بناسێنیت، بەسەرچاو».

## ئاورێك بۆ دواوە

پایزی ١٩٨٣ بو تازە ژنم هێنابو، ڕۆژێک مەلا بەختیار وەک زۆر هاوڕێی تری پێشمەرگەم، بۆ پیرۆزبایی هاتە ماڵمان. جگە لە پیرۆزبایی ژن هێنانەکەم، سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ دەربڕیم بۆ ئەو ڕۆڵەی لەگەڵ هاوڕێکانم دا دەیگێڕم لە پێشکەشکردنی خزمەگوزاریی تەندروستی بۆ پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکە. پێش ماڵاوایی کردن، سویچی ئوتومبیلێکی لاندکرۆزەری دایە دەستم وەک دیاریەک بە بۆنەی ژنهێنانم و وەک پێویستیەکی کاری ڕۆژانەم بۆ گواستنەوەی دەرمان و بریندار و نەخۆش لە نێوان گوندەکان دا، سوپاسم کرد و ئوتومبیلەکەم وەرگرت. ئوتومبیلەکە هی حکومەت بو و لە چالاکیەکی پێشمەرگانەدا بەدەست هاتبو.

من لە پێشمەرگایەتیدا نە ڕاستەوخۆ نە ناڕاستەوخۆ داوای ئوتومبیلم نە لە مەلا بەختیار نە لە هیچ لێپرسراوێکی تری (ینک) نەکردبو. سەیرکە خوێنەری هێژا ! ئێستا هاوینی ٢٠١٢ یە و ٢٩ ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژە تێپەڕیوە کە مەلا بەختیار بێ ئەوەی داوام لێکردبێت ئوتومبیلێکی شۆڕش ی پێدام بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی تەندروستی بە پێشمەرگە و خەڵک، بە ڕێکەوت بابەتەکە هەمان شتە و بۆ هەمان مەبەستە: ئوتومبیل بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی تەندروستی بۆ خەڵک. بەڵام ئێستا سەردەمی پارەڕژانە و دەبێت بەدەستهێنانی ئوتومبیل بۆ نەخۆشخانەیەکی حکومەتی زۆر ئاسانتر بێت و پێویست نەکات ژیانی پێشمەرگەی بۆ بخەیتە مەترسیەوە. بەڵام لە دیدارەکەی (یانەی کۆمەڵایەتی) یەوە تا ئێستا، نە هیچ هەواڵێکم لە مەلا بەختیار بیست، نە هیچ ئوتومبیلێکی ئەوم بینی لە بەردەم نەخۆشخانەی شەهید سەلاح ! هەر «بەسەرچاو «کەی مایەوە !

بۆ هەمان مەبەستی پەیداکردنی ئوتومبیل بۆ نەخۆشخانەی شەهید سەلاح، لە ساڵی ٢٠١٢ دا دیدارێکی تایبەتیم لەگەڵ (هێرۆ خان) کرد لە مەڵبەندی سلێمانی، ئەنجامی کۆتایی دیدارەکە هەر «بەسەرچاو «کەی مەلا بەختیار بو. سەیرەکە لەوەدا بو (هێرۆ خان) خۆی نەخۆشخانەکەی کردەوە، لەو کاتەدا من خۆم ئەرک و گرنگیی نەخۆشخانەکەم بە وردی بۆ باس کرد و بەشەکانیم پیشاندا. (هێرۆ خان) نەخۆشخانەکەی زۆر بە دڵ بو و پەیمانی پێداین بە شەخسی هاوکاریمان بکات! هەوڵەکانم لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی (ینک) بۆ هەمان مەبەست (بەسەرچاو) یشی لێ سەوز نەبو!

## ئەلزهایمەری سەرکردەکان ؟

دوای ۳۲ ساڵ کاتێک لە ساڵی ۲۰۱٤ سەردانێکی حاجی مامەند م کرد، بینیم تەنیا سێ چوار ماڵی هەژاری تێدابو، چەند بەرزاییەکی دەوروپشتی هێشتا لە مین پاک نەکرابونەوە، جادەکەی هەر رێگا خاکییە کەی جاران بو. کاتی خۆی لە سەردەمی شۆڕش دا بنکەیەکی تەندروستیی ئێمە و یەکێکی حیزبی شیوعی و سێ پزیشکی تێدابو: د.دڵشاد و هاوژینەکەی (د.ڕوناک) و من، هەروەها قوتابخانەیەکیش، بەڵام ئێستا هیچیانی تیا نیە، بە کورتی دەتوت تازە لەشکری داعش پێیدا تێپەڕیوە. بە ڕاستی ئەم دیمەنە توشی شۆک (خوریە) و غەمی کردم. هاتەوە پێش چاوم تازە مەڵبەند ی یەک لە حاجی مامەند بارەگای دانابو، (ئاسۆی شێخ نوری) ئەندامی مەڵبەند بو، ئاسۆ کچێکی خەڵکی ئەم گوندەی خواست و بوبە هاوژینی. ئاسۆ ئێستاش هەر یەکێتیە و لەگەڵ هەمان ژندا دەژی و دایکی چەند منداڵێکێتی. دوای ڕاپەڕین و ڕوخانی ڕژێم ئاسۆ چەندین پۆستی گرنگی لە یەکێتی و لە دەسەڵاتی خۆجێی سلێمانی وەرگرتوە. ئاسۆ نەی دەتوانی ئاوڕێکی وەفا لە حاجی مامەند بداتەوە؟ ئەی مەلا بەختیار ؟ مەگەر لە ساڵانی پارەڕژانی دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام دەسەڵاتی ئەوەیان نەبو بە هانای حاجی مامەندە وە بچن؟ تۆ بڵێی دەسەڵاتداران توشی نەخۆشیی بیرچونەوە (ئەلزهایمەر) بوبن ؟ بەدەم ئاژوتنی ئوتۆمبیلەکەمەوە بە ناو حاجی مامەند دا، لە بەرخۆمەوە لە مەلا بەختیار کە حاجی مامەند ی کردبوە پایتەختی مەڵبەندەکەی و هەروەها لە ئاسۆی شێخ نوری کە زاوای خێزانێکی بەڕێزی حاجی مامەندیە، لێمپرسین: مەسەلە نیشتمانیەکەی لێدەرکەن، ئێ باشە هیچ نەبێ وەک وەفا بۆ حاجی مامەندیەکانی هاوڕێ و ناسیاو و خزمتان، نەتان دەتوانی باندۆر و پلە و پۆستەکانتان لە ناو یەکێتی و حکومەتی هەرێم، بەکار بهێنن بۆ ئاوادانکردنەوەی ئەم دێیە ؟ ئاوادانکردنەوەیەک کە لانی کەم هانی بەشێک لە خەڵکەکەی بدات بگەڕێنەوە بۆی و ئاوا چۆڵ و هۆڵ نەبێت؟

## خولانەوە و گەڕان بە ناوچەکاندا:

زۆرجار گەڕان و جم و جوڵەکانی (پ.م) لەسەر بناغەی نەخشەی کۆنکرێتی نەبو بۆ شەڕی ڕژێم، هاوسەنگیی هێز لە سودی ڕژێم بو. ئێمە هیچ شوێنێکی ستراتیجیمان پێنەدگیرا، ئەگەر بیشگیرایە پێمان نەدەپارێزرا. لەکاتی گەڕاندا بە لادێکان کۆبونەوە

بە خەڵک دەکرا، کاری ڕێکخراوەیی ورۆشنبیری و پڕۆپەگەندە دەکرا، کێشەی کۆمەڵایەتیی خەڵک دەهێنرایە لای (پ.م) و بۆیان چارەسەردەکرا، (پ.م) دوکتۆر و کارمەندە پزیشکیەکانیش بە خۆڕایی و بە ڕوی خۆش و گەشەوە چارەسەری نەخۆش و برینداری لادێکانی دەکرد. هەر بونی (پ.م) لە ناوچەکە ورەی خەڵکی بەرزدەکردەوە، ورەی جاش و بەکرێگیراوە خۆماڵیەکانی دادەبەزاند و دەیترساندن لەوەی بکەونە گیانی خەڵک و بە شێوازی جۆراوجۆر ئازاریان بدەن. جگە لەوانە هەزاران سەربازی کوردی هەڵاتو لە بەرەکانی شەڕی ئێران-عێراق بە پشتیوانیی (پ.م) لە ناوچەکاندا ژیانیان بەسەردەبرد و کاری خۆیان دەکرد، ئەگەر (پ.م) نەبوایە زۆربەی ئەوانە لەو شەڕە بێهودەیەدا دەکوژران و بریندار دەبون و بەدیل دەگیران. بێگومان ناوبەناو شەڕی ڕژێم دەکرا، بۆنمونە ئەگەر لە پڕ بەرێکەوت یا بە پێی زانیاریی ورد دەرفەتی باش بهاتایەتە پێشەوە، بۆسە لە سەر ڕێگاکان بۆ دوژمن دادەنرا، یا هەڵمەت دەکرایە سەر هەندێ شوێنی بچوک و لاوزی ڕژێم و دەستی بەسەردا دەگیرا.

## باری تەندروستیی (پ.م)

(پ.م) کانی کوردوستان لەبەرئەم هۆیانە تەندروستیان مکوم و باش بو: زۆربەیان لاو بون، باری خۆراکیان باشبو، بەردەوام جموجوڵیان دەکرد لەکاتی پیادە گەشتەکانیان بە دێهاتەکانی کوردوستان. هەڵدەگەڕان بە چیاکاندا و لە شوێنە بەرزەکان سەنگەریان لێدەدا، هەوای پاکی پڕ لە ئۆکسجینی کەژ و کێوەکان و دێهاتەکانی کوردوستانیان هەڵدەمژی. هیچ کارخانە یەک نەبو بە دوکەڵکێشەکانی هەوا پاکەکە ژەهراوی بکات. ئاوی سازگاری کانی و کارێزی چیاکانیان دەخواردەوە. بەرهەمی سروشتیی دەسکاری نەکراوی کشت و کاڵ و گۆشتی پەز و پەلەوەری بە شێوەی سروشتی بەخێوکراوی خۆماڵیان دەخوارد. لە ماڵە جوتیارەکان ساوەر و قەرەخەرمان، سەوزە و میوە، بەرهەمی شیر لە ماست و پەنیر و سیرێژ و کەشک ودۆینە یان دەخوارد. وەک ئەو هۆیانەی سەرەوە گرنگ ئەوەش بو کە ویژدانیان ئاسودە بو، بڕوای تەواویان بە و خەباتە ڕەوایە هەبو کە دەیانکرد. (پ.م) بە حەز و ویستی خۆی و بە ئیمان بە کێشەی ڕەوای نەتەوەکەی، بێ هیچ موچە و خەڵاتێک خەباتی دەکرد. هەستێکی سروشتیی قوڵی شانازی و لە خۆڕازیبونی تێدا ڕوابو.

پیانان و خستنەسەری تێدانیە ئەگەر بڵێم (پ.م) ی یەکێتی و بەتایبەتی هی کۆمەلە بوبوە مایەی شانازی نەک هەر بۆ خێزان و بنەماڵە و هاوڕێکانی، بەڵکو بۆ دراوسێ و ناسیاوە دورەکانیشی ! بۆیە بە گشتی لە شۆڕشی لە ئاشبەتاڵ هەستاوەی یەکێتیی نیشتمانی، پەستان و گوشین (ستریس) ی دەرونی نەبو یا زۆرکەم و کاتی و تێپەڕبو. لە شۆڕش دا بە گشتی ترسی شکاندن و سوکایەتی پێکردن و سزای ناڕەوا و خۆسەپاندنی فەرماندە سەربازی و سەرکردە سیاسیەکانی تیا نەبو یا زۆر کەم و ڕیزپەڕ بو نەوەک سیستماتیک و ڕێسائاسا. لە ڕاستیدا (پ.م) و سەرکردە بە جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا یشەوە وەک هاوڕێ بە هەمو خۆشی و ناخۆشیەکانەوە خەباتی هاوبەشیان دەکرد و لە پەیوەندیەکی کراوە و هاوڕێیانەدا بون، زۆر جار گاڵتە و گەپ و قسەی خۆش لە نێوان پێشمەرگە سادەکان و سەرکردەکان دەکرا. بەلام جارناجاریش، وەک لە ژیانی ئاسایی دەرەوەی شۆڕش دا، ئەم یا ئەو سەرکردە لە بەر هۆی جیاوازی ڕەوا یا ناڕەوا بەرامبەر (پ.م) هەڵدەچو و توڕەدەبو و ناحەقیشی دەکرد. (پ.م) سادەکان و سەرکردەکانیان پێکەوە لە خانوە بچوک و کۆماوە و بەقوڕ دروستکراوەکان ژیانی ڕۆژانەیان بەسەردەبرد. شەهید ئارام و نەوشیروان مستەفا و ئازاد هەورامی و عومەری سەید عەلی و سالار عەزیز و مولازم عومەر و مەلا بەختیار و بەکری حاجی سەفەر و ئەبو شەهاب و....نمونەی باڵا و زیندو و ڕاستگۆی ئەو جۆرە سەرکردانەبون. نەوشیروان بۆ دروستکردنی بنکەکەی لە نێوزەنگ خۆی لەگەڵ (پ.م) کانی خەریکی بەرد گواستنەوە و بەرد دانان و قوڕەکاری بو.

## کێشەی فیشەك لەدەست دەرچون

زستانی١٩٧٩ /١٩٨٠ بو، (پ.م) یەک لە بنکەکەی (پاسۆک) وە لە دێی (شێنێ) هات بۆ بنکەکەمان لە (زەڵێ)، داوای دوکتۆرێکی کرد بچێت لەگەڵی بۆ بنکەکەیان چونکە بریندارێکیان هەیە. کۆڵەپشتەکەم پێچایەوە و لەگەڵ (پ.م) کەدا بە پێ چوم بۆ بنکەکەی پاسۆک. (پ.م) کان هەمو زۆر مات و غەمبار بە دەوری جەستەیەکی بێگیاندا بە کزوڵەیی دانیشتبون، ئەمە شەهید (مامۆستا فەرهاد) بو. ئەو لە ناو بنکەکەدا ویستبوی چۆنێتیی بەکارهێنانی چەکی (بازۆکا) بۆ (پ.م) کان ڕونبکاتەوە. (بازۆکا) چەکێکی گەورەیە و وەک (ئار بی جی) وایە، لە دەسکاریکردنی (بازۆکا) کەدا گولەکەی ناوی بە خۆیدا تەقیبۆوە و دەمودەس شەهیدی کردبو، ڕوداوێکی زۆر ناخۆش و

غەمهێن بو. ساڵانی دواتر (پ.م) یەک لە بنکەکەی بلەکێ و یەکێکی تر(کەماڵ) لە کەرتی شەهید سەلاحی موهەندیس لە شاربازێڕ و (تانیا) کچی پێنجساڵەی بەکری حاجی سەفەر، هەمویان بە روداوی فیشەک لەدەست دەرچون شەهیدبون. من ئەم ڕوداوانە زۆر غەمبار و بێزار و تورەیان دەکردم. دەمزانی ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین لەو وڵاتانەی لە ڕوی زانستی و تەکنیکیەوە زۆر پێشکەوتون، مردن و زیانەکانی تر بە هۆی ڕوداوە سروشتیەکانی وەک هەورەتریشقە و گڕکان و لافاو و بومەلەرزە وە زۆر کەمکراونەتەوە. لە یابان کە وڵاتی بومەلەرزەی بەردەوامە، تەلارە هەرە بەرزەکانیان وا تۆکمە دروستکردوە بومەلەرزە ناتوانێ بە ئاسانی بیانڕوخێنێ. لەو وڵاتانە مردن بە هۆی ڕوداوی مرۆڤکردی وەک ڕوداوی ئوتۆمبیل و.. ئەوە هەر زۆر کەمکراونەتەوە. کاتێک لە ئەڵمانیا جێگیربوم و بوم بە دوکتۆری دەرونی، زانیاریم دەستکەوت کە ئەندازیار و تەکنیککارە ئەڵمانیەکان هێڵەکانی کارەبای ماڵان و دەسگا کارەباییەکانیان وا دروستکردوە کە ئەگەر کەسێک ویستی بە کارەبا خۆی بکوژێ، زۆر زۆر سەختە یا هەر ناتوانێ چونکە یەکسەر کارەباکە فیوز دەکات و دەکوژێتەوە.

نیوەڕۆیەک لەگەڵ وەهاب لە ماڵێکدا لە گوندی گەرەدێ ی شاربازێڕ نانمان دەخوارد، لەپڕ دەنگی گرمەیەکی بەرز ڕاپچڵەکاندین، یەکسەر هەستاین و بەرەو شوێنی گرمەکە ڕۆیشتین کە لە بەر مزگەوتی دێ ڕویدابو. تومەز (ک.ماخۆلان) (ئاڕ بی جی) ی لەدەست دەرچوە، بەڵام باشبو کەس بەرنەکەوتبو. وەهاب سەرزەنشتی کرد و لێی تورەبو، ئەویش ئاوا بەرگریی لە خۆی کرد: «ئێ چی بوە کاک وەهاب خۆ پێش هەفتەیەک (پ.م) یەکی تریش لە حاجی مامەند (ئار بی جی) ی لەدەست دەرچوبو». من دوای ئەو ڕوداوە دڵتەزێنانە ی بە چاوی خۆم بینیمن و هاتنە بەردەستم، ئیتر وام لێهاتبو توشی حەساسیەت دەبوم و تورەدەبوم کاتێک وشەکانی پاساوهێنانم دەبیست، وەک ئەجەلی هاتبو، موقەدەر بو، خوا ڕۆژی تەواوکردبو، کەس گوناهی نیە لە ڕوداوەکەدا، خوا خراپتر نەدا..... ئیتر وام لێهاتبو، کاتێک کەسێک لە نزیکمەوە تفەنگەکەی پاک بکردایەوە یا هەر دەسکاریی تفەنگەکەی بکردایە، من یان شوێنەکەم جێدەهێلا یا تکام لێدەکرد لە دەرەوە لە چۆڵاییەک خەریکی تفەنگەکەی بێت. بەڕاستی مردن و زامداربون و کەمئەندامبون بە ڕوداوە مرۆڤکردە کانی وەک فیشەک لە دەست دەرچون، مردنێکی بێهودە و بێواتایە. لە بەر ئەوەی هەرگیز سەربازیم نەکردوە، نازانم ئایا لە سوپای عێراقیشدا فیشەک لەدەست دەرچون هەبو؟ یا بۆ پاککردنەوە و دەسکاریکردنی چەک ڕێنمایی تایبەت هەبو؟

## کۆماری ترس

هەیهوو! ژیان و خەباتی ئازادانه ی (پ.م) له کویّ و بەزۆرەملیّ بون به سەربازێکی گومناو له سوپای داگیرکەری لیوانلێو له ترس و تۆقانی ڕژێمی سەدام له کویّ ؟ کتێبی Republic of Fear (کۆماری ترس) که (کەنعان مەکیه) پێش داگیرکردنی کوێت، له سەر ڕژێمی سەدام نوسی و بڵاویکردەوه، زۆرترین دەنگی دایەوه له دنیادا!

سەیره ! من چەندین ساڵ دواتر که له ئەڵمانیا گیرسامەوه، لەو هەل و مەرجه خۆش و جوان و ئارامەی ژیانی ئەوێدا هەر دوسیّ مانگ جاریّ خەوێکی ترسناکم به دەسگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێمەوه دەبینی. بۆ نمونه دەمبینی له پاسێک دام که له بازگەیەک وەستاوه، سەربازێکی مڕومۆچی عەرەب ئاگر له ڕوی دەباریّ، له ناو هەمو سواربوانی پاسەکەدا به قامک و نیگایەکی ژەهراوی هێمایەکی گوماناوی و تورانه بۆ من دەکات که ناسنامەکەمی بۆ دەربێنم تا بیبینیّ. من له ژیانمدا سەربازیم نەکردوه و بەمه زۆر خۆشحاڵ و ئاسودەم، کەچی ناو بەناو خەونی ترسناکم به سەربازییەوه دەبینی، بۆ نمونه: له خەوما سەربازم و له گەڵ چەندین سەربازی تر له کاتی ڕاهێناندا له ڕیزێکدا وەستاوم، کابرای ئەفسەری عەرەب له ناو هەمویاندا به زمانی جەستە هێمایەکی تورەم بۆدەکات و له ڕیزەکه دەمهێنێته دەرەوه، بیّ ئەوەی هیچ هه لَه و تاوانێکم کردبێت دەکەوێته سوکایەتی پێکردن و ئازاردانم. سەیرتر ئه وەبو کاتێک ڕژێمی سەدام ڕوخا و من هێشتا هەر له ئەڵمانیا دەژیام، خەونه ترسناکەکانی که به و ڕژێمەوه دەمبینی ئیتر له جیهانی خەونەکانی مندا بۆ هەتا هەتایه بزربون و هەرگیز نەمبینینەوه. منیش وەک زۆربەی عێراقییەکان ترس له گرتن و ئەشکەنجەدان و کوشتن بەدەستی ئەو ڕژێمه تاوانباره چوبوه ناو پێچ وپەنا تاریک و دورەکانی دنیای ناخۆئاگاییمەوه (دنیای لاشعور)، به پێی تیوریی (شیکاری دەرونی)ی (فرۆید) ئەو ترس و دڵەڕاوکانه لەخەونەکاندا دەردەکەونەوه. ڕاستییەکی بەڵگەنەویستی دەرونناسی ئەوەیه ئەگەر نیگەرانی و ترسی بەردەوام که له ڕوی چەندایەتی و چۆنایەتیەوه له ئاستی ئاسیی و سروشتی زۆرتربێت، دەرونی مرۆڤ دەکرۆژێت و دەخوات و توشی نەخۆشیی دەکات. لەگەڵ ئەو هەموه ڕوداوه ناخۆشانەی له کاتی شۆڕشدا ڕویدەدا له شەهید بون و بریندار بون و کەمئەندامبونی (پ.م)، له گەڵ ترسی ناوبەناو له شەهیدبون و زامداربون و بەدیلگیران، کەچی هێشتا ڕۆحی گاڵته و گەپ و قسەی خۆش له ناو (پ.م) دا بەهێز بو. بێگومان شادی وخەنده و پێکەنین و ڕوخۆشی یەکێکن له بنەما هەره گرنگەکانی تەندروستیی

دەرونی و جەستەیی مرۆڤ، ئەمە ڕاستییەکە سەدان کۆڵینەوەی دەرونی لە دونیادا سەلماندویانە. هەمو ئەم هۆکار و فاکتەرە بایۆلۆجی و دەرونی و کۆمەڵایەتیە باشانە بوبونە هۆی ئەوەی (پ.م) زۆر پێویستیان بە دوکتۆر و دەرمان نەبێت. ئەو ڕوداو و نەخۆشیانەی پێویستیان بە پزیشک بو ئەمانەبون: لە کاتی بریندار بون بە هۆی شەڕەکانەوە، توشبون بە هەوکردنی بەکتریایی و ڤایرۆسی توند، پێوەدانی مار و دوپشک، ڕوداوی جۆراوجۆری وەک کەوتنە خوارەوە لە شاخ و لە پشتی وڵاخ، کێشەکانی دوگیانی و منداڵبون و دوای منداڵبون، نەخۆشیەکانی منداڵان.... منیش وەک یەکێک لەو پێشمەرگانە بە درێژایی ئەو پێنج ساڵ و نیوەی پێشمەرگایەتیم بۆ یەکجار وا نەخۆش نەکەوتم کە بۆ ڕۆژێک لە ناوجێدا بکەوم و پێویستم بە دەرزی لێدان بێت.

## چالاکیەکی بێهودە و وێرانکەر

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگی پایزی ١٩٨٢ لەگەڵ وەهاب و (شۆڕش ئیسماعیل) و (بێستونی مەلا عومەر)،هەروەها لەگەڵ نزیکەی سی پشمەرگەیەکدا کەوتینەڕێ بۆ گوندە چۆڵکراوەکانی ناوچەی سیوەیلی بناری سورکێو کە سەر بە ناحیەی (باسنێ) ن. دوای چەند سەعاتێک پێڕەو شەو گەیشتینە سەر کانیەکی خوار گوندی (بارێی گەورە)، ئێرە شوێنی مەبەست بو، بۆیە پێڕەویەکەمان تەواوبو و لاماندا. کاک (سەرداری حەمەئەمین ئاغا) ی بارێ ی فەرماندەی کەرت بو، لە گوندی (گەرماو) ی دیوی ئێرانی سورکێو دەژیا، بە پێی ئەو پەیمانەی ڕۆژێ پێشتر پێدابوین، خۆی و چەند (پ.م) یەک خواردنی ئامادەکراویان لە (گەرماو) وە وە بۆ هێنابن و نانی ئێوارەمان خوارد. ئەو شەوەم لە بیرناچی چونکە هەرچەندە زۆر زۆر ماندوبوین بەڵام بەهۆی زیکەزیک و گازی پەڵە مێشولەوە نەمانتوانی بخەوین، مێشولە بێبەزەییەکان زەویە ڕەقەکەی ژێرمان و ئاسمانە ساردەکەی سەرمانیان لە بیربردینەوە! وادیار بو ئەوانیش لە تەنیایی ئەو کەژوکێوە بێزار بوبون و ئێستا دلیان بە ئێمەدەکرایەوە، لە دید و خەیاڵی خۆیانەوە ماچ و موچیان لەگەڵ دەکردین نەک گاز و چڕنوکمان لێبگرن! بەیانی زو تاریک و ڕون، لە سەر ئەو ڕێگا سەرەکییەی کەمپی سەربازیی ڕژێم لە ناحیەی (باسنێ) دەبەستێتەوە بە بنکەی سەربازیی ڕژێم لە گوندی (شیوەکەڵ) و دەورروبەری، (پ.م) کان لە پشت بەرد و پەنا و درەختەکان بە متی و بێدەنگی و بێ جوڵە و خۆدەرخستن دامەزرێنران و خۆیان مەڵاس دا، ئەمە پێی دەڵێن (بۆسە). واچاوەڕێ دەکرا کاروانێکی سەربازیی

چەک و فیشەک و تفاقی جەنگیی تر بە لۆریی زیل ی سەربازی لە باسنێ وە بەڕێ بکەوێت بۆ گوندی چۆڵکراوی (شیوەکەڵ) کە دوابنکەی سەربازیی عێراقی لێبو، ئێمە بۆ ئەم کاراونە خۆمان مەڵاس دابو. منیش بە خۆم و کلاشینکۆف و کۆڵەپشتی پزیشکیەوە لە شوێنێکی بەرزی برێک دورتر لە خودی کەمینەکە لەگەڵ فەرماندەی دەستە (مام ئەنوەر) دایان نام. پەنجە لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانمان چاوەڕێی کاروانی سەربازی (قافڵە) مان دەکرد. دوسەربازی پیادە بە دەسگای (دۆزەرەوەی مین) وە وردە وردە بە سەر ڕێگا سەرەکیە کەدا هاتن، (پ.م) هەردوکیانی کوشت و چەکەکانیشیان لێکردنەوە. دیاربو ئەفسەرەکان ئەم دو سەربازەیان ناردبو بۆ دڵنیابون لەوەی بۆسە و مینی ئوتومبیل و هی کەسی یان بۆ دانەنراوە، ئەوان کە گوێیان لە تەقەکانی ئێمە دەبێت، ئیتر کاروانەکە ناخەنە جوڵە چونکە دەزانن بۆسەیان بۆ دانراوە. دوای برێک چاوەڕێکردن، بۆسە کە هەڵگیرا و هەمومان بە خێرایی شوێنەکەمان بەجێهێشت نەوەک هێلیکۆپتەری جەنگی بێتە سەرمان. من بەم چالاکیە هیچ دڵخۆش نەبوم، بەڵکو برێکیش دڵتەنگی کردم و بەدەم ڕێگا ڕۆشتنەوە کەوتمە بیرکردنەوە. خۆ من ئەو دو سەربازەم هەر نە دەناسی و بەکوژراویش نەم بینین، بەڵام ناخۆئاگا بۆ چەند چرکەیەک بوم بەوان و دەیان پرسیاری (بۆ؟) هات بە مێشکمدا: ئێمەی سەرباز گوناهمان چیبو؟ وەک ئێوە ڕقمان لە ڕژێمی سەدامە، بەڵام چیبکەین؟ بە کوشتنی ئێمە چیتان دەسکەوت؟ سەدامتان ڕوخان؟ بۆ ئێمەتان کوشت...؟

لە پێشمەرگایەتیدا من زۆر شانسم هەبو، چونکە نە لەم ڕوداوە نە لە هیچ ڕوداوێکی تری دەستەویەخە دا کوشتنی ئینسانم لە نزیکەوە بە چاوی خۆم نەبینی. من هەر لە بنەڕەتدا وەک زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤەکان دژی شەڕ و ئینسان کوشتن بوم، بۆیە ئەگەر شتی وام لە نزیکەوە ببینیایە دڵنیام زۆر زۆر کاری خراپی تێدەکردم، بەتایبەتی کە دەمزانی بەم جۆرە چالاکیانە ڕژێمی سەدام ناڕوخێ. بە پێی لۆجیکی شەڕ ئێمە لەو چالاکیە پڕ لە ماندوبونەدا سەرکەوتو نەبوین چونکە سەرباز (مرۆڤ) ی بێتاوانمان زۆر نەکوشت و هیچ سەربازێکمان بریندارنەکرد و بە دیل نەگرت! خوایە گیان ئاخرئەمە چ خۆشی و چ سەرکەوتنێکە کاتێک مرۆڤ مرۆڤی برای خۆی بە ژمارەیەکی زۆر بکوژێ و بریندارابکا و بەدیل بگرێ؟ ئایا ئێمەی مرۆڤی ئێستا(Homo Sapiens) هەر بە ڕاستی مرۆڤین؟ یا قۆناغێکین لە پرۆسەی گەشەسەندن بۆ دروستبونی مرۆڤی ڕاستەقینە، لە ئایندەیەکدا کە وادیارە هێشتا زۆر زۆر دورە؟

## ڕوخساری سەردەم

ئەم سەردەمەی ئێستا مرۆڤایەتی پیا تێدەپەڕێ بریتیە لە سەردەمی شتپەرستی و خۆپەرستیی تاک کە بە نائارامی و هەڵپەیەکی زۆرەوە دەگەڕێ و وێڵە بەدوای چێژە هەستیەکانیدا. سەردەمی سەرمایەداریەکی بێبەزەیی و ڕوتوقوتە لە هەمو بەها و باشی و جوانیە ئینسانیەکان. ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی عەرەبی و ئیسلامی نوقوم بوە لە تاریکستانی ئاینی و مەزهەبیی ئەلقاعیدە و داعش و حەماس و تالیبان و (حیزب الله) و حەشدی شەعبی و پاسداران. ئێستا سەردەمی ئەمریکای پۆلیسی جیهانی و (پوتین) ی ئەفسەری کۆنە جاسوسی (کەی جی بی) ی سۆڤێتی کۆنە. هەروەها سەردەمی گەرمتربونی گۆی زەوی و وشکەساڵی و ژەهراندنی ئاو و خاک و هەوایە.

لەسەر ژەهراندنی ژینگەی ئەمریکا، پیرێکی دانا و پڕئەزمونی هیندیە سورەکان کە دەبینێ چۆن ئەوروپیە تازەهاتوە تێرنەخۆرەکان بۆ بە دەستهێنانی زێڕ و پارە بێبەزەییانە بەربونەتە وڵاتەکەیان و دەیڕوتێننەوە، پێیان دەڵێ: (کە دوا ماسیتان گرت، کە دوا ڕوبارتان ژەهراوی کرد، کە دوا درەخت تان لە ڕەگ وڕیشەوە هەڵکەند، ئینجا بۆتان دەردەکەوێ کە پارە و زێڕ ناخورێن).

گەرمەی پێشڕەویەکانی داعش بو لە ساڵی ٢٠١٤، دڕەندەکانیان حەویجەیان داگیرکرد و ویستیان کەرکوکیش بگرن، لەو لایشەوە نزیکی بەغداد بونەوە. لەگەڵ (دالیا) ی هاوژینم سەیری پێشڕەویی خێرای داعشیەکانمان دەکرد لە تەلەفیزۆن دا. پێم وت: دالیا دەزانی ئەگەر داعش کەرکوکیان گرت و بەرەو سلێمانی کەوتنە جوڵە، ئیتر من تەواو ؟ وتی مەبەستت چیە؟ وتم: ناچار دەبم جارێکی تر دەبمەوە بە پێشمەرگە و زوش دەکوژرێم ! دالیا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتی: 'هەژار دە توخوا شتی وا ناخۆش مەڵێ '. درێژەم پێدا و گوتم: ئەمجارەیان دەبێت بە ورە و وزەیەکی زۆرتر لە جاران بەرامبەر داعشیەکان و هاوشێوە ڕەنگاوڕەنگەکانیان بچینە سەنگەر، دەزانی بۆ؟ چونکە ئەگەر داعش بە سەر تۆدا سەرکەوت و کەوتیتە بەردەستی، بە پێی چەند فتوایەکی پڕ و پوچی بێواتا: کوڕی گەنج بێت دەتکوژن، ژنی گەنج و جوان بێت بە فتوای (جیهادی نیکاح) دەسدرێژیی جنسی دەکەنە سەرت، ئینجا وڵاتەکەشت وێران دەکەن. لە شەڕی بەرەنگاربونەوەی داعش و هاوبیرەکانیان دا دروشمەکەمان نابێت (کوردوستان یا نەمان) بێت، بەڵکو دەبێت (شکۆ وشەرەفمان یا نەمان) بێت.

ئایا نەتەوەی کورد دەبێت

بۆ چەند ساڵی تر هەر چەکی بەدەستەوەبێ و ئامادەی شەڕی بەرگری و شەڕی ڕزگاریی یەکجاری بێت؟ ئایا بۆ چەند ساڵی تریش هەر پێویستمان بە چیا سەختەکان وئەشکەوت و شیو ودۆڵە پێچاوپێچەکانی کوردوستان دەبێت ؟

بە ڕای من ئێستاش هەروایە. چیا سەختەکانی کوردوستان دۆستی ڕاستەقینە و هەمیشەیی و بەوەفای نەتەوەی کوردن. لە کاتی تەنگانە دا، لەو کاتانەی هەبون و مانەوە ڕوت ورەجاڵەکەمان دەکەوێتە بەر مەترسیی نەمان و سڕینەوە، دەتوانین دڵنیا و ئەرخەیان پاڵیان پێوەبدەین و پەنایان بۆ بەرین، ئەوان هەمیشە ئامێزیان ئاوەڵایە بۆ فرزەندەکانیان.

## پرسیارە مێژوییەکەی (عومەر) ی شوان

لە پەیوەندی بە چالاکیی پێشمەرگانە دا با بگەڕێینەوە بۆ بەهاری ساڵی ١٩٧٨ کاتێک بەشێک لە (پ.م) کانی یەکێتی لە کارەساتی هەکاریدا ناچاردەبن خۆبەدەستەوەبدەن بە ڕژێمی سەدام. دەسگا تایبەتەکانی ڕژێمی سەدام وەک جەنگی دەرونی و بۆ ترساندنی خۆبەدەستەوەدەرەکان هەر لە زاخۆ وە هەتا سلێمانی ئەوانی بەناو سەربازگەی گەورە و مۆدێرن و پڕلەچەکی نوێ و تانک وزرێپۆش و تۆپی گەورە تێپەڕاندبون. ئەوانیش دیارە بە سەرسوڕمانەوە هەمویان بینیبو. یەکێک لەو پێشمەرگانە شوانێکی نەخوێندەواری خەڵکی گوندی بزەینان ی شارباژێڕ دەبێ بە ناوی (عومەر). دواتر عومەر ئازاد دەکەن و دەگاتەوە ماڵی خۆی لە بزەینان. ڕۆژێک مستەفا چاورەش میوانیان دەبێت، (عومەر) لێی دەپرسێ: «ئەرێ کاک مستەفا ! پێش کارەساتی هەکاری ئەو کاتەی ئێمە بوین بە (پ.م) ڕژێمی سەدام ئەو هەموە چەکەی هەر هەبو؟ «. (عومەر) ی نەخوێندەوار مەبەستی ئەوە بوە بڵێت: ئەگەر بمزانیبا ڕژێمی سەدام ئەوەندە بەهێزە و ئەو هەموە چەک و تفاقی جەنگییەی هەیە نەدەبوم بە (پ.م)، چونکە ڕون و زەلال بو بەو چەکە سوک و کەمەی هەمان بو نەماندەتوانی شکستی سەربازی بە ڕژێم بێنین. دواتر بینیمان ڕژێمی سەدام بە دو شەڕی خلیج و بە ڕاپەڕینی کورد و شیعە لە ناوشارەکان لە مانگی شوبات و ئازاری ١٩٩١ نەڕوخا. بینیمان شۆڕشی چەکداریی کورد بە هەمو حیزبەکانیەوە شکستی سەربازیی گەورەی هێنا و ئەنفالەکانی ١٩٨٨ ی لێکەوتەوە. هەتا ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بە زۆری نوێترین چەک سەدامیان نە ڕوخان، سەدام بە گەلی عێراق

نه ڕوخا. دەرکەوت ئەنجامگیریە ناڕاستەوخۆکەی کەی (عومەر) ی نەخوێندەوار ڕاست و دروست بو. بەڕاستی خەباتی چەکداری لە کوردوستانی عێراق کە ١٩٦١ لە شۆڕشی ئەیلولەوە دەستی پێکرد شێوازێکی خەبات بو، لە ڕێی دەربەگە کوردە زیانلێکەوتوەکانی یاسای ئیسلاحی زەراعیی عەبدولکەریم قاسم، ئەوروپای ڕۆژاوا و ئەمریکا و(شا) ی ئێرانی نۆکەریان، بە سەر کورد و حکومەتی عێراقدا سەپاندیان و بۆ سودی خۆیان ئاگرەکەیان خۆش کرد. بەڵام ئایا ئەی هەڵەی گەورەی سەرکردە و ڕابەرەکانی خۆیشمانی تیانەبو کە بە هەردو دەست باوەشیان بۆ ئەم جۆرە خەباتە کردەوە ؟ ئایا خەباتی چەکداری بێ هەبونی پێویستیەکانی ئەو خەباتە لە پارەی زۆر، لە کارگەی دروستکردنی چەک و تفاقی جەنگی، لە ڕاهاێنان و لە خاوەندارییی زانستی سەربازی، لە بونی دۆستی ڕاستەقینە و ستراتیجی، خەباتێک هەمو ئەو پێویستیانەی نەبێت هیچ واتایەکی هەیە ؟ ئایا ئێمە ی کورد هیچ یەکێ لەو مەرجانەی خەباتی چەکداریمان تیابو؟هەمان بو؟ نەدەکرا ئێمە پەنامان بۆ خەباتی چەکدار نەبردایە و لە شوێنی خۆمان لە گوند و شارەکان بماینایەتەوە ؟ ئایا نەدەکرا بە دەیان شێوازی سیاسی ومەدەنیی ناتوندوتیژ لە ڕێی زانین و زانست، کولتور و هونەر و... درێژەمان بە خەباتی ڕەوای گەلەکەمان بدایە و نەمانهێشتایە شەڕئاوا وڵاتەکەمان دوابخات و لە کاروانی پێشکەوتن جێبمێنێ ؟

## چەمی گەلاڵ

ناوچەی چەمی گەلاڵ دەکەوێتە سێگۆشەی نێوان بەرزنجە و سەیدسادق و ناڵپارێز، لە نزیک قەڵای سروچک. بە پێچەوانەی ناوەکەیەوە، چەمی گەلاڵ دەڤەرێکی زۆر دێم و کەمئاو و بەردەلان و سەختە، ئەگەر ڕێگەوبان هەبوایە هەر سەعاتێک لە شاری سلێمانیەوە دورە. خێڵەکانی دانیشتوی ناوچەکە وەک چوچان و زەردۆیی و.. زۆربەیان نەخوێندەواربون و بێبەشبون لە هەمو دەسکەوتەکانی مەدەنیەت وەک ئاو و کارەباو ڕێگاوبان و بنکەی تەندروستی و...، ئەوان بە بەخێوکردنی پەز و گاوگۆتاڵ دەژیـان، بەسەر چەند دێیەکدا دابەشبوبون وەک پەرخ، بیوک، قەویلە، سڵەیمانە، زلزلە، هۆزخواجە و.. ناوبەناو لەگەڵ بەکری حاجی سەفەر بەم دێیانەدا دەگەڕاین. مەڕوماڵات بەخێوکردن بەتایبەتی بەو شێوە دواکەوتوەی لای ئێمە، لە هەر جێیەک بێت پیس و پۆخڵیی زۆر لەگەڵ خۆی دێنێ، بەڵام بەتایبەتی لە گوندەکانی

(چەمی گەلاڵ) زۆر بە کەمی پەیڕەوی لە پاکوتەمیزی دەکرا. لە زۆربەی ماڵەکاندا دەمبینی گەوڕی پەزەکان لەسەرەوە بون، ژوری دانیشتنیش لە پێین و خوارەوە، تۆ نانت دەخوارد و مەڕ و بزن بە (مەعە مەع و باعەباع) سڵاویان لێدەکردیت و بە لاتا تێدەپەڕین بۆ گەورەکەیان. لە (بیوک) دا نەخۆشیی سیلی سییەکان زۆر بو، بۆیە زۆر جار بە تایبەتی دەچوم بو (بیوک) بۆ جۆرێک لە ڕوماڵکردنی تەندروستیی خەڵکەکەی. لە کاتی تێروانینی پزیشکیی نەخۆشەکان چاو و گوێ و هۆشم چڕدەکردەوە و لە کەمترین و لاوازترین نیشانەکانی سیل دەگەڕام. ئەگەر لە هەر نەخۆشێکدا گومانم لە سیل بکردایە، بە دورودرێژی زانیاریم لە سەر نەخۆشیەکە بە نەخۆشە کە و کەس وکارەکەی دەدا و پێم دەوتن هەرچی زوتر و بێ وەستان و دودڵی یەکسەر بچن بۆ نەخۆشخانەی سنگ لە سلێمانی. دەیان نەخۆشم نارد بۆ سلێمانی و زۆربەیان بە دەرمانێکی زۆری دژە سیل دەگەڕانەوە.

## من تیماری چیی بکەم؟

لە یەکێک لەو جەولانەدا لە گوندی (بیوک) لاماندا کە چل ماڵێکی چڕ و پڕ لە دانیشتوان دەبو. من لە ماڵێک دامەزرام، دایکێک کچە ساوا کەی بۆ هێنام کە چەند ڕۆژێک تەمەنی بو، ئەوە دوهەم کچی بو، کوڕی نەبو، بۆیە خۆی و مێردەکەی و هەمو بنەماڵەکەیان ئاواتەخوازبون دوهەم منداڵ کوڕ بێت، بۆ کچ و دایکی داماو شانس و ڕێکەوت نەیهێنا. تێروانینم بۆ منداڵەکە کرد و بینیم مشک یا نازانم هەر گیانلەبەرێکی ماڵیی تر لوتی منداڵەکەی کرۆژتبو، خواردبو. بەڕاستی کە برینی جێ لوتی داوەشاو و پیس و پۆخڵی ساواکەم بینی چۆن مێش و مەگەز تێیدابو، توشی خورپە و تاسان بوم، دیمەنی ئەو منداڵە داماوە خەم و بەزەیی، نائومێدی وئێش و ئازاری زۆری پێگەیاندم. بەسەر باوک و دایکی منداڵەکەدا توشی هەڵچون و توڕەییەک بوم و پێم وتن: ئێ باشە ئێستا من تیماری چیی بکەم؟ دیارە ئەگەر منداڵەکە کوڕ بوایە، لە کۆمەڵی خێڵەکی و باوکسالاریدا نەریت و باوە کە حەوت شەو کێشکیان بۆ کوڕەکە دەگرت و هەرگیز بە تەنیا بەجێ نەدهێڵرا و وێڵ نەدەکرا کە ئاوا پشیلە یا مشک لوتی بخوات. تیماری برینەکەیم کرد و ڕێنماییم کردن هەرچی زوترە بیبەن بۆ بۆ لای دوکتۆری نە شتەرگەری لە سلێمانی.

## ده قەیناکا ئینشائەلا....... !

دواتر کە لە ئەڵمانیا گیرسامەوە، لە ماوەی ئەو ٢٤ ساڵەی لەوێ ژیام، لە بەیەک گەیشتنەکانم لەگەڵ ئەڵمانیەکان، سەدان جار ئەم پرسیارەم لێدەکرا «چەند منداڵت هەیە؟ «، هەرگیز پرسیاری ئەوەم لێ نەدەکرا کە چەندیان کورە و چەندیان کچە؟ ئیمرۆ کە ئەم دێڕانە دەنوسم ڕێکەوتی ١١ ی ٦ ی ٢٠٢٠، تەمەنی کچەکەم (کەتان) بوە بە هەفتەیەک، خانمێکی هاوڕێی (دالیا) ی هاوژینم بە تەلەفون پیرۆزبایی هاتنەدنیای (کەتان) ی لێکرد و پێی وت: «دە قەیناکا ئینشائەلا منداڵی داهاتوتان کوڕ دەبێت!! «، وەک ئەوەی لەدایکبونی (کەتان) ی کچ ڕوداوێکی ناخۆش بێت و خوابکات ڕوداوی خۆشی هاتنی (کوڕێک) ی بەداوادابێت!. ئەگەر دایک و باوک لە دیدگای سود و پەرژەوەندیی خۆیان سەنگاندن بۆ کوڕ و کچ بکەن، ئەوا دەبێت زۆر خۆشحاڵ بن کە کچیان دەبێت یا بەلای کەمەوە بە هەمان ئەندازە ی شادبونیان بە کوڕ بۆ کچیش شاد و خۆشحاڵبن. من ئەزمونی پتر لە چل ساڵ کارکردنم وەک پزیشک چ لە کوردوستان چ لە ئەڵمانیا ئەوەی پیشانداوم کە لە کاتی پیری و نەخۆشی و پەککەوتەیی دایک و باوک دا زۆرتر کچ فریایان دەکەوێت و بە هانایانەوە دەچێت و ڕاستەوخۆ خزمەتتیان دەکات و لێپرسراوەتیان هەڵدەگرێت، کەمتر کوڕ. ئەگەر لە دیدگای مرۆڤناسی (Anthropology) یەوە سەنگاندن بۆ بەهای ژن و پیاو بکەین، ئەوا بێ هیچ دودڵیەک ژن هیچی کەمتر نیە لە پیاو. بێگومان هەم ژن هەم پیاو هەندێ تایبەتمەندی و جیاوازیی جەستەیی و کۆمەڵایەتی و دەرونیی یان هەیە. ڕاستیەکی ڕون و جیهانیە کە ژن لە هەندێ بواری ژیاندا لە پیاو بەهێزتر و شارەزاترە، پیاویش لە هەندێ بواری تری ژیاندا لە ژن بەهێزتر و شارەزاترە. لە ژیانی ئەم سەردەمەدا ئەوە سەلمێنراوە کە هیچ بوارێکی ژیان نیە ژن نەتوانێ تێیدا کاربکات و ئەسپی خۆی تێدا تاوبدات و سەرکەوتن بەدەست بێنێ!

## خەباتیان نابینرێ و باسیان ناکرێت !

پێشمەرگەی جەنگاوەری ژن وەک ئەوەی لە کۆمەڵەی ئێران و پەکەکە و پەیەدە دەیبینین، لە ناو(ینک) دا نەبو. بەلام ژنی هاوژین و دایک و خوشکی پێشمەرگەکان و هەروەها ژن بەگشتی لە ناو شار و لە گوندەکانی کوردوستان لە هەمو بوارەکانی تری خەباتی (ینک) و بەتایبەتی خەباتی کۆمەڵە دا شان بەشانی پیاو زۆر ئازایانە و

دڵسۆزانە خەباتیان کردوە و قوربانیی گەورەیان داوە، بۆ نمونە لە خەباتی ژێرزەمینیی ناوشار، لە خۆپیشاندانەکانی دژی ڕژێم، لە گەیاندنی نامە و هەواڵی گرنگ لە نێوان شار و شاخ دا، لە گواستنەوەی دەمانچە و فیشەک و دەرمان و.... بۆ پێشمەرگە. شێخ تاهیری ئامۆزام کە ئەفسەر بو بە عائیشەی خوشکمدا دەمانچەیەکی (مەکاریۆف) ی وەک دیاری بۆ ناردم، عائیشەی نەترس تورەکەیەکی گەورەی برنجی کڕیبو و دەمانچەکەی لە ناویدا شاردبۆوە و بێ گوێدانە ئەگەری پشکنین گەیاندیە دەستم.

پەیمان ی هاوژینم بە ناو بازگەکانی ڕژێمدا بێ ترس دوربینێکی سەربازیی بۆ هێنام. بەڕای من لە مێژبو دەبوایە چەند پەیکەرێکی ناوازەی جوان و مەزن کە دەربڕی خەباتی کچان و ژنانی کوردوستان بێت، دروستبکرایە و لە شوێنی شایستە و لە ناوەڕاستی شارە گەورەکانی کوردوستان دابنرایە، مەخابن! تا ئێستا ئەمە نەکراوە.

## ئا ئا! خۆ خەریکە منداڵی دەبێت!

کچان و ژنانی ناوماڵی گوندەکانی کوردوستان لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریدا بە پێشمەرگە درێغیان نەدەکرد و وەک کەسی نزیکی خۆیان ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردین. ئەوان جلیان بۆ دەشتین، هەرکاتێک بچوینایە ماڵەکانیان، بە ڕویەکی خۆشەوە خۆراک و خواردنەوەیان پێشکەش دەکردین، پێخەوی پاک و باشیان پێدەداین، هەواڵ و نامەی ئێمەیان دەبرد بۆ خزم و کەسمان لە ناو شار. بێگومان هەمو ئەم کارانەیان بۆ دەکردین بێ بەرامبەر و بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ بەرامبەرێکی ماددیمان لێبکەن.

پێشمەرگەی دێرین و کادیری پێشکەوتوی (ینک) و (کۆمەڵە) ڕۆحشاد (سەلاح چاوشین) ئەمەی بۆ گێڕامەوە: ساڵی ١٩٧٨ لە یەکێ لە هەوارەکانی قەندیل سەلاح لە ماڵە ڕەوەندێکی پەز بەخێوەکەر دادەمەزرێ، ماڵەکە بریتی دەبێت لە ڕەشماڵێکی هەژارانەی بچوک، ژنی ماڵ بەتەنیا دەبێت. سەلاح پیاوێکی هێور و وردبین و بیرکەرەوە بو، ئەو لەوە سەری سوڕدەمێنێ کە ژنەکە جگە لە بەخێرهاتنێکی کورت قسەی تری لەگەڵ ناکات و هەر بە دانیشتنەوە دەمێنێتەوە و هیچیشی پێشکەش ناکات بۆ خواردن و خواردنەوە. سەلاح کە تۆزێک چڕتر و وردتر تەماشای ژنەکە دەکات، دەبینێ تنۆکی ئارەقی زۆر بە دەم و چاویدا دێتە خوار و بڕێک نرکە و نقەشی لێوە دێت و جارجار ماسولکەکانی دەموچاویشی گرژدەبێت وەک ئەوەی ئێشی توندی هەبێت. سەلاح بۆی دەردەکەوێ کە ژنەکە لە منداڵبوندایە و شەرم دەکات بە سەلاح بڵێت. سەلاح داوای

لێبوردن دەکات و خێرا لە ڕەشماڵەکە دێتە دەرەوە و لە ڕەشماڵێکی ترەوە ژنێک دەنێرێ بۆ لای و خۆیشی لەدەرەوە چاوەڕێ دەکات هەتا دەنگی گریانی ساوایەک لە ڕەشماڵەکەوە بەرزدەبێتەوە.

## چالاکی لەگەڵ وەهاب

ماوەیەکی زۆر لەگەڵ کەرتەکەی وەهاب بە دێهاتەکانی شارباژێڕی تەخت دا کەوتمە گەڕان. کاک سورکێوی کادیری کۆمەڵە (بەداخەوە دوای ڕاپەڕین خۆی کوشت)، بەختیاری حاجی فارس (لە ١٩٨٥ شەهیدبو)، کاک شۆڕش ئیسماعیل، مامۆستا سەرداری وێڵەیی کە کادیر بو(دواتر لە سورین بە دیلی لای حسک شەهیدکرا)، (نامیقی حەمە چەتا کە دواتر شەهید بو)، سەرکەوتی کوبە، شێخ مەحمود نۆدێی، زیرەک، وەستا قادر (بەرهەم)، محەمەدی جەیران و... ئەوانە و زۆری تریش لە گەڕانەکاندا لەگەڵمان بون. بەڕاستی پەیوەندیەکی خۆش و باش، بەوەفا و دڵسۆزانە لە نێوانماندا هەبو. وەهابیش فەرماندەیەکی خاکی و بێفیز، دڵسۆز و وریا و ئازابو، ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکیی هەبو لەم تەبایی و گونجانەی ناو پێشمەرگەکان، ئەو هاوڕێی نزیکی پێشمەرگەکان بو. هەندێ (پ.م) هەست بە کەمی دەکات ئەگەر خۆی ڕاستەوخۆ لە چالاکیی پێشمەرگانەدا بەشدار نەبێت. هەرچەندە کەس لە ناو شۆڕشدا چاوەڕیی ئەوەی لە هیچ دوکتۆر و کارمەندی پزیشکیەک نەدەکرد ڕاستەوخۆ بچێتە ناو شەڕەوە، بەڵام من وردە وردە ئەم هەست بە کەمیەم تێدا ڕوا چونکە ڕاستەوخۆ لە شەڕی دەستەویەخەی دوژمندا بەشداریم نەکردبو. بەڵام وادیارە جگە لەو هەستەش، لەقوڵاییە تاریک و پێچ وپەناکانی دەرون و کەسێتیی مندا بەشێکی نائارم هەیە کەمێک حەزی لە سەرچڵی و چەتونی و موغامەرە یە. سلێمانیش (شارە حەیاتەکە) شوێنی لەدایکبون و گەورەبون و مەکۆی بیرەوەریەکانم، بەو هەموە بزێوی و سەرچڵییەوە لەو دیوی شاخی گۆیژەوە وەک موگناتیس ڕایدەکێشام. ئەو هۆکارانە وایان لێکردم چەند جارێک داوا لە وەهاب بکەم لە چالاکیەکی ناو سلێمانیدا بەشداریم پێ بکات، وا دیاربو ئەو ئیتر نەیدەتوانی داواکەم پشتگوێ بخات. پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ لە نێوان دێی سیتەک و ئاڵەسیاوی بناری شاخی گۆیژە کە دێیەکی بچوکیی لەبیرکراو بو، لەگەڵ وەهاب و (پ.م) کانی کەرتەکەیدا بە ئەسپایی وردە وردە بە دامێنی چیای ئەزمڕدا هەڵگەڕاین و بەرەو لوتکە ملمان نا، کە گەیشتینە ترۆپکی ئەزمڕ ئیتر دنیا تاریکبو، لە چاوی بز و لە سیرەی تفەنگی

دوربینداری سەربازانی ڕەبیەکانی سەر ئەزمڕ بەدوربوین، تاریکایی پەردەی سۆز و خۆشەویستیی بەسەردا دابوین و نەدەبینراین. ڕێک لە ئاستی دارستانەکەی ئەزمڕ بە دیوی سلێمانی دا داگەڕاینە خوارەوە. وەهاب نەیهێشت من لەگەڵ خۆی و (پ.م) کانی ترا دابەزمە ناوشار بۆ بەشداریی ڕاستەوخۆ لە چالاکیەکەدا، هەوڵەکانم بۆ ئەمە بێسود مانەوە. بۆ ئاگاداری و چاودێریکردنی پشتی بەرەی شەڕی ئەوان لە قەراخ شار و گەڕەکی توی مەلیک و جادە ی ئیبرهیم پاشا، لە گەڵ دو (پ.م) ی تردا لە دامێنی دارستانەکە داینام و وشەی نهێنیی پێداین. دوای نزیکەی سەعاتێک لە جیابونەوەمان قرمژنی گولە و هاڕەی دەسرێژ و گرمەی ئاڕ بی جی لە ناوشارەوە بەرزبۆوە. (پ.م) کان بە سەرپەرشتی وەهاب چوبونە سەر چەند بنکەیەکی ڕژێم و دابویانە بەر ئاڕ بی جی و دەسرێژ. کە تەقەکە کزبو، پاش ماوەیەک لە بەردەممانەوە دەنگی خەڵک دەهات کە لە تاریکیدا بەرەوڕومان دەهاتن، هاوارمان لێکردن تا وشەی نهێنی نەڵێن نەیەنە پێشی، دەنگی وەهابم ناسیەوە کە وشەی نهێنیی وت. (پ.م) (زیرەک) لە چالاکییەکەدا بریندار بوبو و لە ناوشار شاردرابۆوە، دو ڕۆژ دواتر گەیشتەوە لامان و برینە کانیم چارەسەرکرد. دوای چالاکیە سەرکەوتوەکە لەگەڵ (پ.م) کانا گەڕامەوە. هێشتا دنیا تاریک بو کە ئێمە بە ئەزمڕا سەرکەوتین و بە دیوی شارباژێڕا شۆڕ بوینەوە. بێگومان سەربازانی سەنگەرەکانی سەر ئەزمڕ گوێیان لە تەقەکانی ناوشاربو یا بە دەسگای بێتەل لە ناوشارەوە دەتوانرا لە چالاکیەکە ئاگاداربکرێن. بەڵام دیاربو ئەوان هەمو دەوروبەری خۆیان لیبوبو بە (پ.م)، بۆیە خواخوایان بو ئێمە نەچینە سەر خۆیشیان، یان لەوانەیە فەرماندە کەیان کەسێکی بەویژدان و بیوەی بوبێت، یا شیعە یا شیوعیی بوبێت و لە دڵە وە دژی ڕژێمی سەدام بوبێت و نەی ویستبێت زیانمان پێ بگەیەنێت، کێ دەزانێ؟ دەنا ئەو سەربازانە لەسەر ئەزمڕ دەیانتوانی ڕێی گەڕانەوە لە ئێمەی ماندو و شەکەت بگرن و زیانی گەورەمان لێبدەن!

## دۆستەکانت لە ناو دڵی دوژمندا!

وەهاب ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە: «فەرماندەی خاڵە سەربازیەکانی سوپای عێراق بە سەر شاخی (کەتو) ی بەرامبەر چوارتا، کابرایەک بو ناوی (داود) بو، ئەم پیاوە چەند جارێک بە دەمی بە (حاجی محەمەد) ی دەمڕاستی گوندی گورگەیەر جوابی نارد بۆمان کە با ئاوا بە ئاشکرا بە ڕۆژدا بە بەردەم خاڵەکانی پاسەوانیی ئەواندا تێنەپەڕین بۆ

ئەوەی ناچارمان نەکەن تەقەیان لێبکەین ! «. یەکێ لە قورسترین هەڵەکانی بیرکردنەوە و ڕەفتاری مرۆڤ ئەوەیە کە بەیەک چاو سەیری کەس و لایەن و دەسگا و شتەکان بکات و وەک کورد دەڵێت تەڕو و وشک پێکەوە بسوتێنێت. من جیاوزم لە تۆ و ئەو، ئەمەیە دۆخی ئاسایی و نۆرماڵ. هەمو کاربەدەستانی ڕژێمی سەدام سەدامی نەبون! دەبێت لە دەسگاکانی ڕژێمی سەدام دا چەند کەس لە ئاستی بەرپرسیارێتیی جیاوازدا وەک (داود) ی ناو ئەم چیرۆکە بو بێت و ئێمە پێمان نەزانیبێت؟ بڕواناکەم لە ناو شۆڕشی کورد دا هیچ کەسێک بیری لەوە کردبێتەوە بگەڕێت بە دوای کەسەکانی لە جۆری (داود). ئەمە کەم و کورتییەکی گەورەیە و دەبێت ئێمە وخوشک و براکانمان لە بەشەکانی تری کوردوستان لە خەباتیاندا بەهەندی وەربگرن و دەسگای تایبەتی بۆ دروستبکەن!

## دڕندەکانی ئاسمان یا حەیاتەکە

بڕوانە ! لە کاتی تەنگانە وترسناکدا کە مەرگ هەڕەشە لە مرۆڤ دەکات، مرۆڤیش بۆ کەمکردنەوەی ترس و نیگەرانیەکانی و بۆ خۆئارامکردنەوە چیی بە بیردادێ؟ هەندێ مرۆڤ لەو دۆخانەدا بێ بیرکردنەوەی قوڵ ومەبەستدار پەنا بۆ گاڵتە وحەنک و قسەی خۆش دەبەن. (پ.م) ی دێرین (مام سالحی گوڕئەسپ) ی گەرمیانی کە چەندین جار لە تەختاییەکانی گەرمیان لەگەڵ هێلیکۆپتەری جەنگیی سەدامدا توشی شەڕی دەستەویەخە بۆتەوە، بۆ گاڵتە و لاقرتی هێلیکۆپتەری ناونابو (حەیاتەکە)، بێگومان هێلیکۆپتەرە جەنگیەکان ڕێک بە پێچەوانەوە دوژمنی حەیات (ژیان) بون، (پ.م) هیچی پێنەدەکرا لەگەڵیان، مەگەر لە دورەوە ئاربیجیەکی پێوەنێ بەڵکو تۆزێ کابرای فڕۆکەوان بترسێنێ. بەڵام ئاربیجی و گولەکانی زۆر زۆر کەمبون و ئەویش هەر کارێکی وای تێنەدەکرد، بۆیە هەر ڕاکردن و خۆشاردنەوەت بۆ دەمایەوە بەرامبەری.

## دوکتۆر هەژار ماویت؟

جارێکیان لە هاوینی ساڵی ١٩٨١ دا لەگەڵ (شۆڕش ئیسماعیل) و (مامۆستا سەردار وێڵەیی) کە دو کایری پێشکەوتوی کۆمەڵە بون، لە سەر تەختاییەکەی نێوان دێی گورگەدەر و گەڕەدێ بە پیکابێکی تۆیۆتا بەرەو چنگیان دەڕۆیشتین. گوێمان لە دەنگی فڕینی هێلیکۆپتەر بو بەسەرمانەوە، هەر سێکمان خێرا دابەز ین. من

کۆڵەپشت و دەمەگونیەیەک دەرمان و دەبەیەکی پێنج لیتری گیراوەی (ستاڤیلۆن) کە بۆ پاککردنەوەی برین بەکاردێت، لە دوای تویتاکە دامنابون. بە پەلە هەر فریای ئەوە کەوتم کۆڵەپشت و کلاشینکۆفەکەم و دەمەگونیە دەرمانەکە هەڵگرم وخۆم لە تویتاکە دوربخەمەوە، بریک پێم ناخۆش و پێم خەوش بو کە نەمتوانی دەبە ستاڤیلۆنەکەش هەڵگرم. خۆمان لەناو دار و دەونە کاندا شاردەوە، من هەڵەی گەورەی ئەوەم کرد پاش چەند خولەکی لە بۆمباران هەستامە سەرپێ و سەیری ئاسمانم کرد، چاوم بەدوای هێلیکۆپتەرێکەوە بو کە زۆر بەرزبو، وە لە ئێمە تێپەڕیبو وگەیشتبوە ئاستی چوارتا. تومەز من ئاگام لە هێلیکوپتەری ترنیە کە نزیک بەسەرمانەوە دەفرێت، هەرئەوەندەم زانی گرمەونالە لە دەوروپشتمان هەستا، ساروخێک بە دوریی چەند مەترێک ئاگر و دوکەڵی لە بنەدەوەنێکی پێشەوەی من هەستاند، برێک گڵ و وردەبەردی شوێنی ساروخەکە دای بە سەروگوێلاکمدا. شۆڕش ئیسماعیل هەستی کرد ساروخەکە لە نزیک من داویە بە زەویدا، بە پەرۆش و نیگەرانیەوە هاواری کرد: (دوکتۆرهەژار ماویت؟). پێشتر بە مناڵی بیستبوم برینی گولە و پارچە بۆمبا گەرم بەگەرم ئێشی نیە، بۆیە دڵنیا نەبوم لەوەی بە پارچە ساروخ بریندار بوم یا نەبوم، بەڵام یەکسەر بێدودڵی بەدەنگی بەرز و ڕون وتم من باشم و نەپێکراوم، ئەی ئێوە؟ ئەویش وتی ئێمەش سەلامەتین.

کە هێلیکوپەرەکان بە تەواوی ئاسمانی شوێنەکەمانیان جێهێشت، لە دەوەنەکان هاتینەدەرەوە، بینیمان ئاگر و دوکەڵ لە تویتاکەمان بەرزدەبۆوە، لە کونێکی دەبە ستاڤیلۆنەکەوە قوڕەقوڕ ستاڤیلۆن دەهاتەدەرێ، دیارە پارچەیەکی ساروخ بەر دەبەکە کەوتبو و کونی کردبو، بەڕاستی دیمەنێکی سەیر و سەرنجڕاکێش و پێکەنیناوی بو!

### «بیسرپیت دەتکوژم !»

دانی پێدادەنیم کاتێک چومە شاخ بۆ پێشمەرگایەتی بەوردی و بەرجەستەیی نەمدەزانی خزمە نزیکەکانی (پ.م) توشی لێپرسینە وە و پەستان وگوشین و زیندانیکردن دەبن. نازیەکانی ئەڵمانیا و فاشیەکانی ئیتالیا کە پارتیزانەکانی وڵاتانی داگیرکراوی وەک (یۆگۆسلاڤیا،...) دەستی باشیان لێدەوەشاندن لە تۆڵەدا سزای توندی خەڵکە مەدەنیە بێگوناهەکەیان دەدا و بەکۆمەڵ دەیانکوشتن. دواتر کە بوم بە (پ.م) بینیم ڕژێمی سەدام هەمان کاری نازیەکان دەکات بەرامبەر خزم

وکەسی (پ.م) بە تایبەتی لەسەرەتای هەڵگیرسانەوەی شۆرش. گۆڕینی ناوم لە پێشمەرگایەتیدا لە (عەبدولڕەحمان) وە بۆ (هـەژار)، دوریی شوێنی خەباتم لە سلێمانیەوە (کە لە سەرکردایەتی و لە ناوچەی مەریوان و بانە بوم)، بەشدارنەبونی ڕاستەوخۆم لە چالاکیە سەربازیەکاندا، هەمو ئەمانە لە سەرەتادا ماوەیەکی باش خێزانەکەمانی لە چاوی دەسگا سیخوڕیەکانی ڕژێم پاراست. دواتر کاتێک دابەزیمە ناوچەی شارباژێڕی نزیک سلێمانی و بە هۆی چالاکیە جۆراوجۆرەکانم، وردە وردە خەڵک ناسیمی و ناوی منیش کەوتە نێو ناوانەوە. جارێک لە کاتی دەنگداندا بۆ هەڵبژاردنی یەکێتیی مامۆستایانی سەر بە بەعس (شێخ جەعفەر بەرزنجی) ی پارێزگاری سلێمانی خۆی دەکات بە ژوری دەنگدان دا، کە مامۆستا ڕەوف عوسمانی برام دەبینێ یەکسەر کاغەزی دەنگدانەکەی لێدەسەنێ، کە سەیری دەکات سپیە و دەنگی بە هیچ پاڵێوراوێک نەداوە، جامی تورەیی بەسەر دا دەڕژێنێ و لە بەرچاو مامۆستاکانی تر جنێوی پێدەدات و سوکایەتیی پێدەکات. لە ساڵی ١٩٨٨ مامۆستا ڕەوفی برام لە قوتابخانەی فریشتەی ئامادەیی کچان وەک وانەبێژ وانە دەڵێتەوە. خوێندن لەو قوتابخانەیەدا بە زمانی عەرەبی دەبێت، بۆیە منداڵی کارمەندانی ئاسایش و ئیستیخبارات و پلەباڵاکانی سوپا و حیزبی بەعس لەو قوتابخانەیە دەخوێنن. ڕۆژێک لە ناکاو بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بە شڵەژاوی خۆی دەکات بە پۆلەکەدا و وانەکەی پێدەبڕێ، پێی دەڵێت هەر ئێستا بچۆ بۆ ژورەکەی خۆم، (ابو دنیا) ی لێپرسراوی لقی (حطین) ی حیزبی بەعس لە سلێمانی هاتووە و چاوەڕێت دەکات، دەیەوێ بە تەنیا قسەت لەگەڵ بکات. (ئەبو دنیا) سەرپەرشتیاری بایۆلۆجی بو، عەرەب بو، سوکایەتیی زۆربە کاک ڕەوف دەکات و پێی دەڵێ، یەکەم: خۆت بەعسی نیت و لە هەمو بنەماڵەکەتان بەعسییەکی تێدا نیە، بەمەشەوە ناوەستیت لە ناو مامۆستاکانا، لە ناو خەڵکا و لە پۆلی وانەوتنەوەدا بەڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دژی بەعس و حکومەت قسە دەکەیت.دوهەم: برا دوکتۆرەکەشت چەکی خیانەتی هەڵگرتوە و داویتە شاخ دژمان، واوەتر پێیدەڵێت: ئەوەی تا ئێستا پاراستویتی ئەوەیە کە مامۆستایەکی عەرەبیی زۆر باش و سەرکەوتویت، منداڵەکانمان کە تۆ وانەیان پێ دەڵێیت زۆر باسی دڵسۆزی و زیرەکی وبەتوانایی تۆ دەکەن لە وانەوتنەوەدا ؛ بەڵام تەواو، ئیتر ئەمەش دادت نادات و گەیشتۆتە سەر لوتمان. (ئەبو دنیا) جنێوی زۆر بە مامۆستا ڕەوف دەدات و هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکات. کاتێک مامۆستا ڕەوف دەیەوێ وەڵامی بداتەوە وبەرگری لە خۆی بکات، (ئەبو دنیا) ڕێگەی قسەکردنی پێ نادا و

بەدەم جنێو و سوکایەتی پێکردنەوە تفێک دەکاتە دەمو چاوی کاک ڕەوف. کاتێک کاک ڕەوف دەسەسرەکەی دەردێنێ تفەکەی سەر دەموچاوی بسرێ، ئەو جانەوەرە دەمانچەکەی دەردێنێ، لولەکەی دەخاتە سەر لاجانگی و پێی دەڵێت بیسرێت هەر ئێستا دەتکوژم، سوکایەتیی پێدەکاتەوە و دەیکاتە دەرەوە. مامۆستا ڕەوف لەدەرەوە تفەکەی ڕوی دەسرێ. دواتر ئەو درندە بەعسیە لە ڕۆژی ڕاپەڕین لە ٧ ی ئازاری ١٩٩١ لە کاتی بەرگریکردن لە بنکەکەیان لە ناو شاری سلێمانی دەکوژرێ.

## بە قسەی خۆش مار لە کون دێنیتە دەر!

لە هەمان ساڵدا دەنێرن بەدوای کاک حسەینی براگەورەم دا بۆ (استخبارات ی کەرکوک). ئەفسەرێکی پلە بەرز داوای لێدەکات بچێت بەدوای مندا و تەسلیمی ڕژێم بکاتەوە. کاک حوسەین عەرەبی بە نوسین وقسەکردن زۆر باش دەزانێ، ئینسوکلۆبیدیای ڕۆشنبیریی عەربی و ئیسلامیە، وەرگێڕی چەند کتێبێکە، سەدان شیعری کوردی و فارسی و عەرەبیی لەبەرە، هەروەها چەپێکی کراوە و مرۆڤدۆستی دیموکراتی بیرئازادە. کاک حوسەین بە بەکارهێنانی ئەزمونە زۆروزەوەندەکانی ژیانی و هەمو ئەم پاشخان و ژێرخانە ڕۆشنبیری و ئەدەبیەوە قەناعەت بە ئەفسەرەکە دەکات کە: یەکەم: دەسەلاتی بە سەر مندا نیە وناتوانێ من تەسلیم بکاتەوە، دوهەم: دوکتۆرهەژار بەشداریی شەڕناکات و وەک دوکتۆرێک بە یەکسانی خزمەتی پزیشکیی سەربازی دیل و نەخۆش وبریندارى سوپای عێراقیش دەکات، وەک ئەوەی ناڕاستەوخۆ پێی بڵێ ئەگەر لە ناو (پ.م) دا بمێنێتەوە بۆ ئێوەش باشە یا هیچ نەبێ زیانی نیە ! حسەین لە سەر مێزی بەردەم کابرای ئەفسەر چەند گۆڤارێکی ئەدەبی دەبینێ. ئەم سەرنجە و لە ڕەوتی لێکۆڵینەوەدا و لە شێوەی ئاخاوتنی ئەفسەرەکە بۆی دەردەکەوێ کە کابرای ئەفسەری عەرەب لایەنێکی ڕۆشنبیری و ئەدەبیی تێدایە. حسەین زیرەکانە ئیش لە سەر ئەم لایەنەی کەسێتیی ئەفسەرەکە دەکات. خوێندنەوەکەی ڕاست دەردەچێت، لە شانسی کاک حسەین ئەفسەرەکە ڕۆشنبیر و شیعردۆست دەبێت، حسەین وردە وردە دانیشتنەکە لە لێکۆڵینەوەیەکی هەواڵگریی ترسناکەوە دەگۆڕێت بۆ دانیشتنێکی ڕۆشنبیری و ئەدەبی. لە ئەنجامدا ئەفسەرەکە واز لە کاک حسەین دێنێ و ماڵاواییەکی گەرمی لێدەکات و بێ هیچ لێکەوتەیەکی تر دەینێرێتەوە ماڵەوە. بەڵام دەسگاکانی ئاسایش و هەواڵگریی ڕژێم

هەر وازیان لێنەهێنایین و دواتر لە ژێر پەستان و گوشینی پیاوەکانیان و لەترسی ئەوەی ئەمانیش نەگیرێن، باوک و دایکە پیرەکەم ناچارکران خانوەکەمان لە جادەی ئیبراهیم پاشا جێبێڵن و ماڵێک لە گەڕەکی بەختیاری بەکرێ بگرن. بەڕاستی منیش شانسم هەبو خزم وکەسەکانم بەهۆی منەوە لەوە زیاتر توشی کێشە نەبون. لەسەرئەوەی مێرد یا کوڕ یا باوکیان یا برایان (پ.م) بو، سەدان خێزانی (پ.م) بە ژن و منداڵەوە زیندانی کران و بە زیندانی دورخرانەوە بۆ زیندانەکانی خوارووی عێراق. دەیان ژنی دوگیان گیران و هەر لە زیندان دا منداڵەکانیان بو، ئاوابو ڕق وکینەی ڕژێمی سەدام !

## باوك: بەخۆڕایی، کوڕ بێئاگا!

دەسگا سیخوڕیەکانی ڕژێم شێوازی جۆراوجۆریان بەکاردەهێنا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر(پ.م) و شۆڕش و ناوچە ئازادکراوەکان. دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ کە بەشێک لە فایلەکانی دەسگا جاسوسیەکانی ڕژێم کەوتە دەست یەکێتیی نیشتمانی، دەرکەوت ڕژێم ئەم شێوازە ڕێوییانەی بەکارهێناوە بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری: باوکی سادە و نەخوێندەواری سەردەستە یەکی (پ.م) زوزو دەچێت بۆ لای کوڕەکەی. بێگومان خزم و کەسی (پ.م) کە دەهاتن بۆ لای کوڕەکانیان، لە دانیشتنەکانینادا (پ.م) و کادیر و لێپرسراوی تریش لەگەڵیاندا دادەنیشتن، پێکەوە نانیان دەخوارد و دەربارەی بارودۆخی ناوەوەی شۆڕش و کێشەکان و کەموکورتیەکان دەدوان و وتوویژیان دەکرد. باوکی (پ.م) کەش کە دەگەڕایەوە شار دەبو هەمو ئەو بابەتە قسەلێکراوانە بو فەرمانبەرێکی سیخوڕی کورد بگێڕێتەوە و ئەمیش دەیکردە ڕاپۆرتی نوسراو و بەرزیدەکردەوە بۆ سەروی خۆی. سەیرەکە لەوەدا بو ئەم باوکە بە دزیی کوڕە کەیەوە ئەمەی دەکرد و سیخوڕی ڕەسمیی ڕژێمیش نەبو کە پارە و موچە لە بەرامبەریدا وەربگرێ. دوای ڕاپەڕین کاتێک کوڕەکە ی باسی فایلەکە بۆ باوکی دەکات و ڕەخنەی توندی لێدەگرێ، ئەم دەڵێت لە ژێر هەڕەشەی ڕاستەوخۆی ئاسایش ئەوەی کردوە. دیارە باوکەیان ترساندبو و پێیان وتبو ئەگەر ئەوەیان بۆ نەکات ئەوا خۆی و ژن و منداڵەکانی وەک سەدان خێزانی تری (پ.م) دەگرن و لە زیندانێکی دوردەستی باشوری عێراق توندیان دەکەن.

## فریایان نەکەوتن، فریای ئێوەش ناکەون!

دوای ئەوەی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی سەر بە ئۆردوگای سۆشیالیستی لە ڕۆژی ٣ ی ١٠ ی ١٩٩٠ یەکیگرتەوە لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژاوای سەر بە ئۆردوگای سەرمایەداریی ناتۆ، فایلە نهێنیەکانی دەسگای جاسوسیی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات (STASI) کرانەوە. لە ڕێی بەڕێوەبەرایەتیەکی ڕەسمی کە تایبەت بۆ ڕێکخستنی ئەم فایلانە دامەزرا، فایلە نهێنیەکان خرانە بەردەم خەڵک و ڕاگەیانکاران. لە بەڵگەکان دەرکەوت (STASI) لە سەر کەسانی نارازی و ڕەخنەگرانی ڕژێم، بە دەیان شێوازی تایبەتی و نهێنی و ئاسایی، بە خەڵکانێک زانیاریان کۆکردبۆوە کە جاسوسی ڕەسمیی حکومەت نەبون، بەڵام بە پاڵنەر و هۆی جۆراوجۆر، بۆ نمونە ئەندامانی حیزبی دەسەڵاتدار بە گەیاندنی زانیاری لە سەر کەسەکانی دەوروپشتیان هاوکاریی حکومەتیان کردبو. ئەو کەسانەی زانیاریەکانیان کۆدەکردەوە و دەیانگەیاند بە دەسگا جاسوسیە ڕەسمیەکان، وەک ئەونێکی فراوان سەرتاسەری ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتیان گرتبۆوە، هەمو پیشە و تەمەن و گەڕەک و شوێنکار و دەسگا حکومەتیەکانی گرتبۆوە، ژمارەیان گەیشتبوە ١٨٩٠٠٠ کەس، بەم کەسانەیان دەوت هاوکاری نارەسمی (IM، Inoffizieller Mitarbeiter).

ئەڵمانیای ڕۆژهەلات دۆستێکی نزیکی ڕژێمی سەدام بو، وادیارە شێوازی کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێی هاوکارە نارەسمیەکانەوە وەک باوکی ئەو (پ.م) یە، ڕژێمی سەدام لە وانی وەرگرتبێ. بەڵام مێژوی دنیا سەلماندویەتی دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکان لە کۆتاییدا بەهێزترین دەسگا جاسوسیەکانیش ناتوانن لە ڕوخان و دارمان بیانپارێزن: KGB ی سۆڤێت، ساواکی شای ئێران، موخابەرات و ئەمن و ئیستیخباراتی سەدام، Gestapo ی هیتلەر و.... ئایا پیرە دەسگای (پاراستن) ی پارتی و دەسگای (زانیاری) ی یەکێتی بۆ سیخوری بەسەر گەلەکەمانەوە دروست نەبون؟ بۆ پاراستنی دەسەڵاتی بنەماڵەکان ملیۆنەها دۆلاریان تیا خەرج ناکرێت لە سەر حسابی شیری زاری منداڵی کورد؟ ئایا (پاراستن) و (زانیاری) تا ئێستا یەک چالاکیان کردوە دژی چەوسێنەرانی گەلەکەمان لە عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا ؟

## دوکتۆرەکانی ناو یەکێتیی نیشتمانی تا کۆتایی ١٩٨٤

بە تایبەتی بەهۆی شەڕە دەستەویەخەکان لەگەڵ هێزە جۆرواجۆرەکانی ڕژێمی سەدام، شۆڕش هەر لە سەرەتاوە زۆر پێویستی بە کادیری پزیشکی هەبو. جگە لە

تیمارکردنی برینداره‌کان و ده‌رزیلێدان و پێدانی ده‌رمان، هه‌ر بون و ئاماده‌یی کادیری پزیشکی له‌ هه‌ر ده‌سته‌ و هێزێکی (پ.م) دا وره‌یه‌کی ده‌رونیی به‌رز و ئه‌رخه‌یانی و ئارامیی ده‌به‌خشیه‌ (پ.م)کان. جگه‌ له‌مه‌، کادیره‌ پزیشکیه‌کان پردێکی په‌ڕینه‌وه‌ی به‌هێز و بته‌وبون بۆ چونه‌ ناو دڵ و ده‌رونی خه‌ڵکی چه‌وساوه‌ و بێخزمه‌تگوزاریی لادێکان. به‌تایبه‌تی کاتێک حکومه‌ت ئه‌و بنکه‌ ته‌دروستیه‌ که‌مانه‌ی لادێکانی کشانه‌وه‌، ئیتر کادیره‌ پزیشکیه‌کانی (پ.م) ته‌نیا هیوا و ئومێدی خه‌ڵکی گونده‌کان بون له‌ کاتی نه‌خۆشی و برینداری و کێشه‌ی ته‌ندروستیی منداڵان و ژنانی دوگیان و دوای منداڵبون.

**(د.خدر مه‌عسوم)**

خوێندنی پزیشکیی له‌ میسر- قاهیره‌ ته‌واوکردبو و له‌ هاوینی ١٩٧٧ له‌گه‌ڵ جه‌لال تاڵه‌بانی گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ کوردوستان و بوبه‌ یه‌که‌م پزیشکی ناو هێزی پێشمه‌رگه‌ی یه‌کێتی وشۆڕشه‌ نوێکه‌ی. د.خدر هه‌م وه‌ک دوکتۆر هه‌م وه‌ک کادیرێکی سیاسیی کاریده‌کرد.

**(د.به‌ختیار خالید)**

له‌ ساڵی ١٩٧٨ وه‌ک یه‌که‌م دوکتۆر له‌ ناوه‌وه‌ی کوردستان له‌ ناو شاره‌وه‌ بوبه‌ (پ.م) له‌ ناوچه‌ی قه‌ره‌داغ، دواتر له‌ ٣١ ی ١ ی ١٩٧٩ له‌ چالاکیه‌کی پیشمه‌رگانه‌دا به‌ بۆنه‌ی ساڵڕۆژی شه‌هیدبونی ئارام (شاسوار جه‌لال)ی سه‌رکرده‌ی خۆشه‌یستی کۆمه‌ڵه‌ له‌ ناو شاری سلیمانی شه‌هید بو.

**(د.هه‌ژار) (نوسه‌ری ئه‌م کتێبه‌)**

له‌ ناوه‌ڕاستی مانگی ٨ ی ١٩٧٩ من بوم به‌ (پ.م) و به‌ دوهه‌م دوکتۆری شۆڕشی نوێی دوای ئاشبه‌تاڵ که‌ له‌ ناوه‌وه‌ی کوردوستان له‌ شاره‌وه‌ چومه‌ شاخ.

**(نازه‌نین عوسمان) و (به‌یان محه‌مه‌د) و (نه‌ریمان حه‌وێز)**

له‌ ڕۆژی ١٦ ی ٣ ی ١٩٨٠ ئه‌م سێ خوێندکاره‌ی کۆلیجی ڤێتیرنه‌ریی زانکۆی موسڵ که‌ ئه‌ندامی کۆمه‌ڵه‌ بون هاتنه‌ سه‌رکردایه‌تی و بونه‌ (پ.م)، ئه‌مان له‌ سه‌رکردایه‌تی مانه‌وه‌، زۆرتر خه‌ریکی کاری ڕێکخراوه‌یی بون به‌ڵام کاری پزیشکیشیان هه‌ر ده‌کرد. نازه‌نین و به‌یان توشی گرتن و لێکۆڵینه‌وه‌ی ئاسایش بوبون، دوای یه‌ک دو جار لێکۆڵینه‌ و ئازادکردن و بنچاوکردنیان، ڕێکخراوی کۆمه‌ڵه‌ فریایان ده‌که‌وێت و له‌ ڕێی ڕانیه‌وه‌ ده‌یان نێرێت بۆ نیوزه‌نگ.

**(دوکتۆر شادمان فوئاد مەستی)**

لە گەڵ (میرانی) برای لە زستانی ١٩٧٩ / ١٩٨٠ دا گەیشتنە نێوزەنگ، ئەوان لە یۆگۆسلاڤیاوە گەڕابونەوە و بوبون بە (پ.م). د.شادمان کۆلیجی پزیشکیی لە یۆگۆسلاڤیا تەواو کردبو، دوای دو ساڵ گەڕانەوە بۆ یۆگۆسلاڤیا.

**(د.مجید هەولێر)ی**

ئەندامێکی جوامێر و زۆر دڵسۆزی کۆمەڵە بو، لە ناوەڕاستی ١٩٨٠ بو بە (پ.م) و دواتر لە شەڕی (حسک) لە ناوچەی خۆشناوەتی سەری بە سەختی برینداربو و لە سوید بە کەمئەندامی جێگیربو. لە دوای هەڵگیرسان و درێژەکێشانی شەڕی ئێران - عێراق، ئیتر سوپای عێراق دوکتۆرەکانیشی دەنارده مەیدانی گەرمی شەڕەکان، ئەمە زیاتر هانی دوکتۆرە کوردەکانی دا لە شەڕ هەڵبێن و ژیانی خۆیان ڕزگاربکەن، هەندێکیان بە یارمەتیی پێشمەرگە کوردوستانیان جێهێڵا و لە ئەوروپا و وڵاتانی تر گیرسانەوە، وەک د.شەمس و د.بەهرە ؛ هەندێکیان بون بە (پ.م). هەندێک لە دوکتۆرەکان وەک (د.سیروان محەمەد شەریف) و (د.ئیسماعیل حەمەئەمین) هەر وەک سەربازی هەڵاتو لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردوستان دەژیان و کاری دوکتۆریان لە گوندەکاندا دەکرد، ئەم دوکتۆرە هێژایانەش هیوا و ئاوادانیەک بون بۆ خەڵک و پێشمەرگە، ئەمانە چاوەڕیی دۆخەکەیان دەکرد، دواتر کە لێبوردنی گشتی ڕاگەیەنرا، گەڕانەوە ناو شارەکان بۆ ژیانی ئاسایی خۆیان.

**د.کەمال عبدالرحمن ساڵح (حەسان)**

لە زستان مانگی ٢ی ١٩٨١بوبە (پ.م) و پێکەوە تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ لە ڕیزەکانی شۆڕشدا داماینەوە.

**د.زریان (عبدالرحمن عثمان)**

لە ساڵی ١٩٨١ بوبە (پ.م) و چوە ناوچەی سەرکردایەتی لە نێوزەنگ. دوای چەند مانگێک سەرکردایەتیی جێهێشت و چوە ناوچەکانی سەر بە مەڵبەندی سێی هەولێر. د.زریان دڵسۆزانە و خۆنەویستانە هەتا دوای شاڵاوی ئەنفالەکان بە پێشمەرگایەتی مایەوە. دواتر لە ساڵی ١٩٩٠ لە ڕێی ئێرانەوە خۆی گەیاندە بەریتانیا و لە لەندەن جێگیر بو و خوێندنی پسپۆڕیی هەناوی تەواوکرد. د.زریان دواترلە یەکەم کابینەی حکومەتی یەکگرتوی هەرێمی کوردوستان بە سەرۆکایەتیی نێچیروان بارزانی لە ٢٠٠٧ تا ٢٠٠٩ دو ساڵ وەزیری تەندروستی بو. دوای دوساڵەکە د.زریان خۆی

نەیویست دوساڵی تر کە دوکتور بەرهەم ساڵح بوبە سەرۆک وەزیران، لە پۆستی وەزیریەکەیدا بمێنێتەوە. هۆی وازهێنانی دەستێوەردانی بەردەوامی پارتی و یەکێتی بو لە سیاسەتی تەندروستی و لە کاروباری وەزارەتەکەیدا. د.زریان لە ساڵی ٢٠١٠ وە وازی لە حیزبایەتی هێنا.

**دوکتۆر شاڵاو کۆیی (بەهمەن)**

لە ساڵی ١٩٨١بوبە (پ.م) و زۆرتر لە سەرکردایەتی کاریدەکرد، لە دوای شاڵاوی ئەنفالەکان کوردوستانی بەجێهێشت و لە سوید گیرسایەوە و بوبە دوکتۆری پسپۆڕی دڵ.

**د. شوان بادینی (محەمەد یوسف)**

لە ساڵی ١٩٨٢ بوبە (پ.م) و زۆرتر لە سەرکردایەتێ مایەوە و کاریدەکرد.

**دوکتۆر فائق گوڵپی**

لە ٤ ی ٤ ی ١٩٨٢ بوبە (پ.م) و هەتا ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ مایە وە و دواتر بوبە ئەندامی پەرلەمانی کوردوستان.

**دوکتۆر فەرەیدون عەبدوڵا سەعید هەڵەبجەیی**

لە مانگی شوباتی ١٩٨١ بوبە (پ.م)، دەرچوی کۆلیجی دەرمانسازیی زانکۆی بەغداد بو، یەکێ بو لە کادیرە پێشکەوتوەکانی کۆمەڵە لە ناوشاردا، دواتر لە هۆڵەندا جێگیر بو.

**دوکتۆر سەروار یەحیا ڕەشید تاڵەبانی**

د. سـەروار لە سە رە تای مانگی ٥ ی سالی ١٩٨٢، پاش بە شداریکردنێکی کاریگەرانە لە خوپیشاندانی شاری رانیە، دو کارمە ندی نە خوشخانە ئیوارە دەچنە ماڵە وە بۆلای و پێی دەڵێن دەبێت هەر ئە مشە و تۆ و هاورێکەت (د. لطیف) بڕۆن دەنا بە دڵنیاییەوە دەتان گرن. هە مان شە و هەردوکیان دە رباز دەبن و لە ڕێی گوندی سەرکەپکانەوە خۆیان دەگەیەننە نێوزەنگ. د.سەروار یەکەم دوکتۆری ددان بو کە چوە شاخ و بوبە (پ.م) ی یەکێتیی نیشتمانی. د. سەروار وەک دوکتۆری ددان لە ناو پێشمەرگە و خەڵکی لادێکاندا خزمەتی خۆی دەکرد. ئەو بە شێوەیەکی زانستی من و د.کەمالیشی فیری ددانهەڵکێشان کرد، کە زۆر جار پێشمەرگە و خەڵک پێویستیان دەبو. بە تایبەتی بو من و د.کەمال هاتنی د.سەروار بۆ شاخ زۆر خۆش بو چونکە ئێمە لە زانکۆی بەغداد هاورێی نزیک بون.

## فیلم نیه، ڕوداوه ڕوداو!

دوکتۆر زریان ئاوا بۆی گێڕامەوە: پاییزی ١٩٨١ لە خڕی ناوزەنگ بوم، مام جەلال ناردی بەدوامدا، پیاوێکی باریکەلەی تەمەن سی ساڵی لەگەڵ دانیشتبو، مام وتی: ئەمە «دوکتۆر فوئاد تاڵەبانی «یە، با بۆ خۆی قسە بکا. دوکتۆر فوئاد وتی: «من دکتۆرام هەیە لە نەخۆشیە هەناویەکان، لە ئەڵمانیا لەسەر کوشتنی ژنە ئەڵمانیەکەم ١٢ ساڵ حوکم درابوم و لە بەندیخانە بوم. ڕۆژێک پیاوێکی عەرەبی سەر بە موخابەراتی عیراقی هاتە لام بۆ بەندیخانە، بە دەنگێکی نزم وتی هاتوم دەربازت بکەم بە مەرجێک کارمان بۆ بکە یت. منیش بێ هیوا و خەمناک بوم، یەکسەر قبوڵم کرد. بە پێی ئەو نەخشەیەی بۆی دانام، خۆم کرد بە نەخۆشی دەرونی و گوازتمیانەوە بۆ نەخۆشخانەیەکی دەرونی، لەوێشەوە فڕاندمیان بۆ سەفارەتی عیراق. لە سەفارەت بە ناوێکی ترەوە پەساپۆرتی دیبلۆماسیان بۆ کردم و بە فڕۆکە ڕاستەوخۆ بردیانمەوە بۆ بەغدا. پاش چەند ڕۆژێک پشودان لە ماڵی باوکم لە بەغداد، موخابەرات بردیانم بۆ لای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیی عێراق (فاضل البراک)، فاضل پێی وتم: لە بەرامبەر کارێکی گرنگ کە بۆمان دەکەیت یەک ملیۆن دینارت دەدەینێ و نەخۆشخانەیەکی تایبەتیشت بۆ دادەنیین لە بەغدا. ئەگەر کارەکەیان بۆ نەکەم یان ناپاکیان لەگەڵدا بکەم ئەوا دایک و باوکم وەک بارمتە لە بەغدا لەبەر دەستی ئەوان دان، بە هۆی خزمایەتیمەوە لەگەڵ مام جەلال بە ئاسانی بڕوام پێدەکرێت، بۆیە دەبێت وەک دکتۆرێک پەیوەندی بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بکەم. هەشت کەبسولی سپی لەناو شوشەیەکی بچوکی دەرمان دایانە دەستم و وتیان: ئەمانە (ساینایدی پۆتاسیۆم) یان تێدایە و هەردانەیەکی دەتوانێت فیلێک بکوژێت. کە مام جەلال نەخۆش کەوت، تۆ وەک دوکتۆرێک ئەم دەرمانە ی بدەرێ یان بیکە ناو خواردن بۆی. ئێوارەیەک بردیانمە لای خودی سەدام، ئەو بەڵێنانەی پێیان دابوم ئەمیش دووپاتی کردنەوەو وتی: زۆر زیاتریشت بۆ دەکەین. گەڕامەوە ماڵەوە، لەترسا هەموو گیانم ئەلەرزی و زۆر پەشۆکابوم، هەموو دۆخەکەم بۆ باوکم باسکرد. باوکم ئامۆژگاریی کردم کە ئەو کارە نەکەم و گوێ نەدەمە ژیانی ئەو و دایکم، چونکە مام جەلال هەم خزمەو هەم سەرکردە و هیوای گەلە کەمانە. پاش چەند ڕۆژێک پیاوەکانی موخابەرات لەگەڵم هاتن هەتا قەلازێ و لەوێ تەسلیمی قاچاخچیەکانیان کردم کە بمبەن بۆ نێوزەنگ. باری دو وڵاخ لە هەموو پێداویستیەکان، تەنانەت دەرمانی کێچ و ئەسپێش، ناردیان لەگەڵمدا». (دوکتۆر فوئاد تاڵەبانی) ئیتر لە ژێر چاودێریدا کاری پزیشکیی خۆی

دەکات هەتا وتوویژی یەکێتی و ڕژێمی سەدام لە ساڵی ١٩٨٤، لەو ساڵە دا تەسلیمی حکومەت دەبێتەوە. دواتر (دوکتۆر فوئاد تاڵەبانی) لە هەل و مەرجێکی نادیار و تەم ومژاوی دا لە ناو عێراق دا لەناودەبرێت.

## تیمارکەر (موزەمید) و کارمەندە پزیشکیەکانی ناو یەکێتی تا کۆتایی ١٩٨٤

هەر لە سەرەتای خەباتی چەکداریی (ینک) چەندین تیمارکەر و کارمەندی پزیشکیی دڵسۆز و ئازا چونە شاخ و بون بە (پ.م) ی یەکێتی و لە لایەن (پ.م) و خەڵکی گوندەکان ناسناوی (دوکتور) یان پێبەخشرا، ئەمانە زۆربەیان لە ناوشاردا ئەندام و چالاکوانی کۆمەلە بون، لە شاخیشدا کە بونە (پ.م)، جگە لە ئیشکردن وەک تیمارکەر ڕۆلی کادیر و لێپرسراوی سیاسیان دەبینی لە کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی دا. ئێمەی دوکتورەکانی شۆڕش ناوبەناو خولی سێ چوار هەفتەییمان بۆ کادیر و (پ.م) ە خوێندەوار و زرنگ و زیرەکەکان دەکردەوە و ئەمانیش خزمەتی زۆری (پ.م) و خەڵکی گوندەکانیان دەکرد، بۆیە بەمانەشیان هەر دەوت دوکتۆر. لە تیمارکەرە سەرەتاییەکانی ناو (ینک) (سەعیدە سور) کە بە (دوکتور ڕەزا) ناسرابو و لەگەڵ یەکەم دەستەی (پ.م) لە ناوچەی شارەزور و هەڵەبجە لە مانگی ٦ ی ١٩٧٦بوبە (پ.م) و لە مانگی ٩ ی ١٩٧٨ لە شاخی سورین لەلایەن چەکدارەکانی پارتی یەوە بە دیلی شەهیدکرا. یەکێکی تر لە تیمارکەرە دێرینەکانی ناوچەی شارەزور و هەورامان کە وەک تیمارکەر و کادیری کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی و دواتر وەک فەرماندەی سەربازی خەباتی دەکرد (دوکتۆر کەمالی شاکیرە فەندیی هەڵەبجەیی) بو. دوکتۆر کەمال شاکر پێش یەکێتیی نیشتمانی لە حیزبی شیوعیی عێراقدا بو، کەسێکی ئازا و ڕوخۆش و قسەخۆش و دڵسۆزی کۆمەڵانی خەڵک بو.(محەمەد ئاوات سدیق عەبابەیلێی) کە کارمەندی پزیشکیی تیشک بو لە ساڵی ١٩٧٨هاتە ناو ڕیزەکانی (پ.م) و دواتر لە هاوینی ١٩٧٩ لە شەڕی براکوژی لەگەڵ پارتی لە ڕوداوی (کانی ژەنان) دا بە سەختی بریندار بو، دوای چارەسەرکردنی برینەکانی گەڕایەوە ناو شۆڕش و بە قاچێکی شەلەوە درێژەی بە خەباتی خۆی دا. (دوکتور قادر حەمە شەریف) گێڵدەرەیی کارمەندی پزیشکیی دەرمانسازی بو، لە ناوچەی هەڵەبجە و هەورامان لە ١٩٧٨ بوبە (پ.م، (د.عەلی ڕانیەیی) ش کە لەگەڵ هاوژینەکەی (مریەم خان) پێکەوە

لە سەرکردایەتی پێشمەرگە بون، یەکێ بو لە تیمارکەرە دێرینەکانی (ینک). یەکێکی تر لە تیمارکەرە دێرینەکانی یەکێتیی نیشتمانی (دوکتۆر وشیار) بو کە لە دۆڵەڕوت (پ.م) بو. لە ساڵی ١٩٧٩ (دوکتۆر عەلی) یاریدەدەری پزیشک بو لە هەرێمی پێنج ی قەرەداغ، (دوکتۆر ڕێبوار) یاریدەدەری پزیشک بو لە کەرتی گەرمیانی هەرێمی پێنجی قەرەداغ، دواتر هەردوکیان شەهید بون. کارمەندی پزیشکی (دوکتۆر ساجید) لە ناوچەی قەراخ بوبە (پ.م). دوکتۆر چیا (عەبدولڕەحمانی مەلا حەسەنی گردەزبێری) و دوکتۆر یاسین (یاسین عەلی سەعید) پێکەوە لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە لە سلێمانی خەبات دەکەن، هاوینی ١٩٧٩ یەکسەر دوای تەواوکردنی پەیمانگەی تەندروستی دەبنە (پ.م) لە هەرێمی پێنجی قەرەداغ. هەردوکیان لە ناوچەی قەرەداخ و لە گوندەکانی بناری زنجیرەچیای قەرەداغ، کاری پزیشکی و کاری ڕێکخراوەیی بۆ کۆمەڵە دەکەن. خائینێک دزەدەکاتە ناو شانەیەکی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە ئۆردوگای زەڕایەن و دوکتۆر چیا دەخاتە ناو تەنوری ئاگری بۆسەیەکی جاش و سەربازی عێراقی لەناو زەڕایەن، بەداخەوە دەمودەس د.چیا و هاوڕێیەکی پێشمەرگەی لە بۆسەکەدا شەهید دەبن. مەلا حەسەنی باوکیشی یەکێ بوە لە مامۆستا ئاینیە نیشتمانپەروەر و پێشکەوتنخوازە کانی سلێمانی. دوکتۆر یاسین دواتر لە ئەڵمانیا جێگیربو. کارمەندی پزیشکی (سیروان کەرکوکی) لە بەهارێکی درەنگی ١٩٨٠ لەگەڵ ئەبو شەهاب (ئیحسان کەرکوکی) هاتە ناوچەی شارباژێر و بە نهێنی ڕۆشتە ناو کەرکوک بۆ کوشتنی پیاوی ژمارە یەکی ڕژێم (قادر فەرەج)، لە نیازەکەی سەرکەوتو نەبو، گیرا و لە ژێر ئەشکەنجەدا شەهید بو. جیهانگیر (ستار کەرکوکی) سێ ساڵ پەیمانگەی تەندروستیی خوێندبو و بوبو بە تیمارکەر، لە شارەزور پەیوەندی بە (پ.م) دەکات. دواتر هاتە لای ئێمە لە نەخۆشخانەی گوندەکانی (پاڕەزان) و (حاجی مامەند) و(کانی دڕکە) لە شارباژێر، جیهانگیر کەسێکی ڕوحسوک و ڕوخۆش و گورجوگۆڵ بو، لە کار و چالاکیەکانیدا دڵسۆز و جێگای متمانەمان بو. جیهانگیر لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ من کوردوستانی جێهێشت و لە ئەڵمانیا گیرسایەوە. دوکتۆر شۆڕش (عاسی) خەڵکی توزخورماتوە، کارمەندی پزیشکی بو لە ناوچەی گەرمیان، هەمو ئەندامانی خێزانەکەیان لە ئەنفالدا لەناوچون، دوای ڕوخانی سەدام کرا بە ئەندام پەرلەمانی عێراق. دوکتۆر شاخەوان (غەفور چەمچەماڵی) کارمەندی پزیشکی بو، لەسەرەتاکانی شۆڕشدا کە لە بنکەی تەندروستیی حکومەت لە گوندی (چنگیان) لە شارباژێر کارمەند دەبێ، بە نهێنی هاوکاریەکی زۆری (پ.م) دەکات، دواتر بوبە (پ.م) لە شارباژێر و هاوکاریەکی زۆری

کردین لە ئیشەکانمان لە نەخۆشخانەی پارەزان و کانی درکە. کارمەندانی پزیشکی: دوکتۆر نەبەز سەراجی هەڵەبجەیی و دوکتۆرعومەر مەحمود مارف (شەماڵ) و دوکتۆر شازاد (ئاراس ئیبراهیم)، دوکتۆر کامل مەلا مەحمود، ئەمانە هەمویان کاریان لەگەڵ کردوم و خزمەتی گەورەیان بە (پ.م) و گوندیەکان دەکرد. لە ساڵی ١٩٨٤ دا لە کاتی وتووێژی یەکێتیی نیشتمانی لە گەڵ ڕژێمی سەدام، کارمەندی پزیشکی دوکتۆر نەجمەدینی خانەقینی هاتە لامان و بوبە (پ.م) لە شارباژێر. کارمەندی پزیشکی (خالد کۆیی) لە زستانی ١٩٨٠ لە بنکەکەی د.خدر بینم و ناسیم، کوڕێکی دڵگەرم و چالاک بو، بەداخەوە دواتر کە چوە خوارێ لە دەڤەری کۆیە شەهید بو.

## نەخۆشخانەی قولەهەرمێ

بە سەرپەرشتیی (عەبدولڕەحمانی عەبەلالەی پێنجوێنی) بە نزیکەی سێ هەزار دۆلار نەخۆشخانەیەک لە قوڕ وبەرد و دارچنار دروستکرا. نەخۆشخانەکە پێکهاتبو لە چەند ژورێک، لە شوێنێکی پەنا و داپۆشرا و بە دارودرەخت دروستکرا، ناوی شوێنەکە (قوڵە هەرمێ) بو، دەکەوتە نێوان گوندەکانی شێنێ و سونێ وە لە خوار ڕێگاکەی نێوانیان. لە مانگی ٩ ی ١٩٨١ خەستەخانەکە بە ڕوی (پ.م) و خەڵکدا کرایەوە. لە سەرەتادا دوکتۆر زریان و دوکتۆر کەمال عەبدولڕەحمان و چەند کارمەندێکی پزیشکی کاریان تێدا دەکرد، لە ساڵی ١٩٨٢ دوکتۆر فوئاد تالەبانی و دوکتۆر شوان و دوکتۆر فائق گوڵپیش کاریان تێداکرد. لە سەرەتای ١٩٨٢ د.زریان چوە تاران و دەسگایەکی سوکەڵەی وێنەی تیشکیی کڕی و گەیاندیە نەخۆشخانەکە. کارمەندانی پزیشکیی تیشک محەمەد ئاوات سدیق و بەیان قەرەداخی دەسگاکەیان خستە گەڕ و کەوتنە بەکارهێنانی. لەم نەخۆشخانەیە ئەسمەرخان و حەمە عەلی خزمەتێکی مرۆڤدۆستانەی زوری (پ.م) بریندارەکانیان دەکرد و نابێت ڕۆڵی جوامێرانەیان لە یادبکرێت.

## لە پێناوی ئێستا و ئایندەی گەلەکەمان !

شۆڕش ئەو دەفرە پاک وبێگەردە نیە کۆمەڵێک لە کەسانی شۆڕشگێڕی تەواو و پاک و بێخەوشی گرتبێتە خۆی، ئێمەی مرۆڤیش هیچمان فریشتەی پاک و بێگەرد نین. ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتمانی بەتایبەتی ئەوانەی سەر بە کۆمەڵە بون بە بەراورد

لەگەڵ ئەوانەی پارتی و (حسک) زۆر پاکتربون. بون بە پێشمەرگە لە دوای ئاشبەتاڵی شۆڕشی ئەیلول جگە لە بیروباوەڕێکی پاک و بەهێز، سەرچڵی و بوێری و چەتونیەکی بەهێزی دەویست. هەندێ جار ڕژێم پیاوەکانی خۆی دەنارد بین بە (پ.م) بۆ ئەوەی لە شوێنکاتی گونجاودا دەستی قورسی خۆیان لە بەرپرسانی یەکێتی بوەشێنن و بگەڕێنەوە لای ڕژێم. بۆیە یەکێتی لە سەرەتای دروستکردنی هێزی (پ.م) دا بۆ دڵنیایی لە پاکیی ئەوانەی دەبونە (پ.م) ئەم مەرجانەی دانابو: ئەندامبون لە ڕێکخستنی نهێنیی یەکێتی، پاڵاوتن و نامەی پشتگیری لە لایەن کەسانی بڕواپێکراوەوە، یا بە ئەزمونکردن و تاقیکردنەوە، بۆ نمونە کەسەکە بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکی پێشمەرگانە بە دەمانچەیەکەوە یا بە نارنجۆکێکەوە دەنێردرایەوە ناوشار. دەسگا جاسوسیەکانی ڕژێمیش کۆیان لە هیچ شێوازێکی بێڕەوشتانە نەدەکردەوە بۆ لاوازکردنی یەکێتی: شەڕی دەرونی لە ڕێی بەکارهێنانی هێزی ترس و تۆقاندن، بڵاوکردنەوەی نائومێدی بە شۆڕش، گرتن و ئەشکەنجە و زیندان، ئاوارەکردن وگرتنی خزم وکەسی (پ.م)، دەمچەورکردن بە پارەی زۆر کە لە بەردەستیاندابو، کردنی بەنزین بەسەر ئاگری ناکۆکیەکانی ناو حیزبە کوردیەکانی شاخ، بەکارهێنان و سودوەرگرتن لە ناکۆکی و دوژمنایەتیە جۆراوجۆرەکانی ناو کۆمەڵی کوردوستان بە تایبەتی دوژمنایەتیی نێوان بنەماڵە و خێڵەکان، بۆ نمونە ئەم چیرۆکە: جارێک لە ناوچەی پشدەر کەسێک سەرۆک جاشێک دەکوژێت و خۆی دەگەیەنێتە ناو (پ.م)، وەک بەڵگەی نیازپاکی و نیشتمانپەروەریی خۆی باسی ڕوداوەکەیان بۆ دەکات، باشبو ڕێکخراوە نهێنیەکانی یەکێتی زو ئاگاداری (پ.م) دەکەن کە ئەو کەسە جاسوسی ڕژێمە و دوژمنایەتیی لەگەڵ سەرۆک جاشە کەدا هەبوە بۆیە کوشتویەتی نەک لەبەر ئەوەی سەرۆک جاشە، هاتنەدەرەوەکەشی بۆ ئەوەیە دەستێکی قورس لە (پ.م) بوەشێنێ و بگەڕێتەوە لای ڕژێم. بۆ ڕژێمی بەعسی نەتەوەپەرست خوێنی هەردو جاسوسە کە هیچ بەهایەکی نەبو چونکە کوردبون، چ (با) بێ و چ باران هەر لە بەفر کەمدەکاتەوە! دواتر بە تایبەتی دوای هەڵگیرسانی شەڕی ئێران - عێراق و زۆربونی ئەو کەسانەی لە دەست شەڕ و لە دەست ڕژێم شارەکانیان بەجێدەهێشت، هەروەها دوای فراوانبونی ناوچە ڕزگارکراوەکان، ئیتر وردە وردە گرنگیدان بەو مەرجانەی سەرەوە کاڵبونەوە و پیادەکردنیان ئاسان و کردەنی نەبون. بۆیە وردە وردە چۆنێتی وکوالیتیی (پ.م) و کادیر و سەرکردەکانی یەکێتی ڕوی لە دابەزین کرد، ئەمە بوبە هۆی ئەوەی لەناو یەکێتیش دا خەڵکی هەلپەرست و نادڵسۆز و کەمبڕوا دەرکەون و لەسەر حسابی

خەڵکی دڵسۆز وقوربانیدەر خۆیان بگەیەننە پۆستە باڵاکانی حیزب و هێزی پێشمەرگە.

دەبێت بەنەرم و نیانی و دور لە ڕۆحی ڕق و کینە، پەنجە بخەینە سەر برینەکانی ناو ڕۆح و جەستەی کوردایەتی، بە ئامانجی تیمارکردنیان نەک ئێشپێگەیاندن و کولانەوەیان. قوربانیەکانی کوردایەتی بە گشتی و یەکێتی بە تایبەتی، هەم ئەوانەی شەهیدبون هەم ئەوانەی بە ساغی یا بە کەمئەندامی و برینداری ماونەتەوە، یا دەیان هەزاری تر لە ئەندامان و لایەنگران و دۆستانی زیندوی نائومێدکراوی (ینک) ئەوەندە زۆرن و زۆر لەوە زۆرترن من بیرینگێمەوە یا بترسم لەوەی هەڵوێستی نەباش و نادروستی هەندێ لە کە سایەتیەکانی یەکێتیی بۆ مێژو باس نەکەم، لە ڕاستیدا ئەگەر باسیان نەکەم هەست بە نائارامی وبێئۆقرەیی و بگرە هەست بە گوناه دەکەم بەرامبەر نەتەوەکەمان و بە تایبەتی بەرامبەر نەوەکانی داهاتو. من بە هیچ جۆرێ مەبەستەکەم ئەوە نیە ناوی ئەو کەسایەتیانە بزڕێنم یا سوکایەتیان پێبکەم یا حوکمی ناڕەوا بدەم بە سەر هەمو کەسێتی و هەمو خەباتیاندا. من گومانم نیە لەوەی لە خەباتی سەختی یەکێتیدا بەشداریان کردوە، لەوانەیە بریندار و کەمئەندام بوبن، یا کەوتبنە مەترسیی مەرگەوە، هەندێکیان هەڵوێستی پرشنگدار و جوانیشیان هەبوە. بەڵام لە کۆتاییدا ئەوە گرنگ و بڕیاردەرە تێکڕا ئەنجامی خەباتەکە و کەسی خاوەن خەباتەکە بە چی و بە کوێ گەیشت !

کێ ژیان خۆش و باش دەکات؟ کێ ژیان ناخۆش و خراپ دەکات؟ بێ دودڵی: مرۆڤ. دە کەواتە لە پەیوەند بە ژیانی گشتیی خەڵک دەبێت هەم کەسە باشەکان، هەم کەسە نەباشەکان بناسرێن.

## نمونەی یەکەم: دوکتۆر فوئاد مەعسوم

ماوەیەک (دوکتۆر فوئاد مەعسوم) لە تاران کاری بۆ یەکێتی دەکرد، پێشتر نەمدەناسی. من لە شارباژێڕەوە بریندار و نەخۆشە قورسەکانم دەنارده لای لە تاران بۆ چارەسەرکردنیان و هاوکاریان. ماوەیەک سەرنجم دابو بریندار و نەخۆشەکانمان کە دەگەڕانەوە لە ئێران گلەیی و ڕەخنەی زۆریان لە دوکتۆر فوئاد مەعسوم دەگرت بەوەی کە (پ.م) کان پشتگوێ دەخات و وەک پێویست یارمەتیان نادات. جارێک کار بەوە گەیشتبو کە (پ.م) ی گەنج و ئازا و چاونەترسی ناوچەی شارباژێڕ (عەبدوڵا یەکدەست - دواتر شەهید بو) کە بۆ چارەسەری برینەکانی ناردبوم بۆ

تاران، لە نارەزاییدا لە وەی دوکتۆر فوئاد هیچ کۆمەکی پێنەکردبو شەڕی لەگەڵ کردبو و بێڕێزی پێکردبو. جارێک لە سەرکردایەتی بوم ئەم ڕەخنەیەی (پ.م) کانم گەیاندە نەوشیروان مستەفا. ئەو یەکسەر بڕوای کرد و لە وەڵامدا پێی وتم: د. هەژار نەک هەر ئەوە بەلکو دوکتۆر فوئاد لە تاران لە مەسەلەی گۆڕینەوەی پارەی شۆڕش لە نێوان دۆلار و دراوەکانی تر بۆ تمەنی ئێرانی سود و قازانجی خۆی دەبات بەزیانی پارەی شۆڕش، لە سەر ئەم قسەیەی نەوشیروان مستەفا، فەرمو ئەم چیرۆکە: کادیری دێرینی کۆمەڵە (ئیبراهیم جەلال) لە کتێبی (چەپکێک لە مێژوی کۆمەڵە) لە لاپەڕە ٣٢٢ دەنوسێ: «مانگی ٥ ی ١٩٨٠ کاک شازاد هاتبوە تاران و پارەی هێنابو، من چوم بو تاران. ئەو کاتە (دوکتۆر فوئاد مەعسوم) لە تاران بو، دوکتۆر فوئاد پاش ئەوەی دۆلارەکانی کرد بە تمەن دای بە من. (کاک شازاد) بە منی وت چەند دۆلاری هێناوە و بە چەندیش گۆڕدراوەتەوە، بەڵام ئەو پارەیە دەرنەچو کە دوکتۆر دابوی بە من، کە گەڕامەوە بە جەلال تاڵەبانیم وت، لە باتی ئەوەی لەو کاتە بێتوانایی دارایی و بێ سەرچاوەییەدا لەو پارە دیارنەبوە بکۆڵێتەوە، بە پێچەوانەوە ڕوی خۆی لە من گرژکرد و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە «. بە ڕاستی ئەو زانیاریەی نەوشیروان مستەفا لەو کاتە هەستیارەدا خورپەی لە دڵمدا. (پ.م) کانی یەکێتی لە مەیدانەکانی شەڕی دەستەویەخە، خەباتگێرانی خەباتی ژێرزەمینی لە ژێر شمشێری ڕژێمی سەدام لە شارەکان، خۆڕاگری و نەبەزینی پاڵەوانەکانی ژێر ئەشکەنجەی ناوزیندانەکانی ڕژێمی سەدام، هەمو ئەوانە و خێزان وخزم و هاوڕێکانیان خەریکی چین و ڕوبەڕوی چی دەبنەوە، دوکتۆر فوئاد و هاوشێوەکانی خەریکی چی بون و لە خەمی چیدا بون! وادیارە ئەم جۆرە کەسانە هیچ هەست و سۆز و ویژدان و بیریان لای هاوخەباتەکانیان نەبوە، یا حەز و خۆشەویستیان بۆ پارە بەرچاوی گرتون و بوە بە یەکەم خولیای ژیانیان. دەنا دڵیان نەدەهات و نە یاندەتوانی کاری ئاوا بکەن ! لە بەر ئەوەی دوکتۆر فوئاد پیاوی گوێڕایەڵ و هاوڕێی دەستەبژێری جەلال تاڵەبانی بو کەس نەیدەتوانی لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات، جەلال تاڵەبانی خۆیشی لێپرسینەوەی لەگەڵ نەدەکرد. دوای ڕوخانی ڕژێم، جەلال تاڵەبانی دوکتۆر فوئاد ی کرد بە سەروکی فراکسیۆنی کوردوستانی لە پەرلەمانی عێراق، لەم پۆستەیشیدا فەرمون نمونەیەک لە هەڵوێستەکانی: کاتێک ئەندام پەرلەمانێکی کورد لە پەرلەمانی عێراقدا زو زو لە وتووێژەکانی پەرلەماندا هەڵدەسێ و بەرامبەر هەڵوێستی نەتەوەپەرستانەی هەندێ لە ئەندام پەرلەمانە عەرەبەکان ڕەخنە دەگرێ و بەرگریی

دڵسۆزانە و شێلگیرانە لە مافی کورد دەکات، دوکتۆر فوئاد وەک سەرۆکی فراکسیۆن لە وتوویژێکی دوقۆڵیدا بەو ئەندام پەرلەمانە دەڵێت: (کاک.... بۆچی سەرئێشە بۆخۆت دروست دەکەیت، بێدەنگ بیت بۆ خۆت باشترە). دوکتۆر فوئاد دواتر بەسەر پلیکانەی پۆستەکاندا خۆی گەیاندە سەری سەرەوە و بوبە سەرۆک کۆماری عێراق. بەڵام بە هۆی هەمان ئەم ڕەفتارە خۆپەرستییەی، بۆ نمونە دامەزراندنی کچەکانی و خزمەکانی لە پۆستی بەرزی دەسگاکانی سەرۆکایەتیی کۆماری دا، هەروەها بە هۆی ناچالاکی و ئیشنەکردنی لە پۆستەکەیدا ڕەخنەی زۆر قورسی لێگیرا و لە ڕاگەیاندنەکان ولە سۆشیال میدیاکاندا بوبە بابەتی سەدان نوکتە و لاقرتی و گاڵتەپێکردن.

بەداخەوە ئەم جۆرە کەسێتیانە کە شوێن و پێگەی خۆیان، بە خۆنزیک کردنەوە و ملکەچی و گوێڕایەڵیی تەواو بۆ کەسانی دەسەڵاتدار مسۆگەر دەکەن، هەندێ خەڵک و ڕۆژنامەنوس بە کەسێتیی میانەڕەو و هاوسەنگ و دانا و (حەکیم) ناویاندەبەن. ئەوکەسێتیانەشی لە دڵسۆزی و پەژارە و نیگەرانی بۆ کیشەی ڕەوای گەلەکەیان، لە خەباتدا ڕاستگۆ، حەقگۆ، ڕاشکاو، نائارام، بێئۆقرە و گەرم و گوڕن، هەندێ خەڵک بە نارەوا پێیان دەڵێن توندڕەو و هەرزە یان تەنانەت بێعەقڵ و هەڵەشە.

## نمونەی دوهەم: هەڤاڵ (توشبو)

ئەم کەسەی من ناوم ناوە (توشبو) یەکێ لە لێپرسراوە گەورەکانی (پ.م) ی یەکێتی بو لە ناوچەی هەولێر لە سەر پشکی یەکێتیی شۆڕشگێڕان. هەڤاڵ (توشبو) پاشخانێکی خێڵەکیی هەبو، هیچ چالاکی و دەسپێشخەریەکی پێشمەرگانەی نەبو، لە شوێنی (توشبو) ئەگەر کەسێکی سەر بە کۆمەڵە دابنرایە ئەوا دەبو کەسەکە ئەوەندە چالاکیی پێشمەرگانەی بکردایە کە چەندین جار بریندار بوایە یان بکەوتایەتە سەر لێواری مردن! جەلال تاڵەبانی لە پڕێ کردی بە کوڕێ! پاش ماوەیەک کە شەڕی یەکێتی و ڕژێم لە مانگی یەکی ١٩٨٥ دەستپێدەکاتەوە، (توشبو) خۆی واز لە پۆستەکەی و واز لە پێشمەرگایەتی دەهێنێ و لە ڕێی ئێرانە وە خۆی و ژن و منداڵەکانی دەگەیەنێتە ئەڵمانیاو دەبێتە پەنابەر. لە کەمپی پەنابەران لە ئەڵمانیا یەکترمان ناسی و بوینە دروا‌سێ. بێئیش بوین و کاتی زۆرمان هەبو بۆ باس و لێدوان. من بە ویژدانی ئاسودەوە باسی خۆمم بۆکرد کە چۆن لە لێکۆڵینەوە لەگەڵم لە لایەن کەسێکی عەرەبی زانەوە بە ناوی (عەبدوڵا) لە ئێران لە شاری (وارامین)،

ئەم وتوە (پ.م) ی یەکێتیی نیشتمانی بوم، بەڵکو وتبوم سەربازی هەڵاتوبوم و وەک پزیشک لە ناوچە ڕزگارکراوەکان بە پارە کارم کردوە و خۆم و ژن و منداڵم ژیاندوە. بەو جورە توانیبوم لەسەر یەکێتی و لەسەرشۆڕش بە گشتی یەک زانیاری لای دەسگا جاسوسیەکانی ئێران نەدرکێنم. هەڤاڵ (توشبو) کە جەلال تاڵەبانی ئاوا بە ناڕەوا فوی تێکردبو و گەورەی کردبو و ئەو پۆستەی پێدابو، بە قاقای پێکەنین و گاڵتە و لاقەرتیەوە پێی وتم: "دوکتۆر جا وەڵلا من ڕاستیی خۆم و هەرچیان لێپرسیم لەسەر یەکێتیی بە ئێرانیەکانم وت، کە من کوردوستانم جێهێشت و بوم بە پەنابەر ئیتر هەمو شتێک بڕایەوە و تەوابو تەواو".

## نمونەی سێهەم: هاوڕێ (جۆکەر)

ئەم کەسەی من ناوم ناوە جۆکەر، یەکێکی تر بو لە فرزەندە سیاسیە بەخێوکراو و گەورەکراوەکانی جەلال تاڵەبانی لە ناو یەکێتیی نیشتمانی. ڕۆژێک لە ساڵەکانی دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ هاوڕێ (جۆکەر) دەچێتە لای جەلال تاڵەبانی و دوای نیو سەعاتێک وتوێژی دوقۆڵی، (جۆکەر) دێتە دەرەوە و پسوڵەیەک بە واژوی جەلال تاڵەبانی دەداتە دەست یەکێ لە قاسەدارەکانی جەلال تاڵەبانی. پسوڵەکە تەنیا بە ژمارە لەسەری نوسراوە کە بڕی ١٥٠٠٠ دۆلار بدات بە هەڤاڵ (جۆکەر)، ئەمیش ١٥٠٠٠ دۆلارە کەی دەداتێ. بەڵام قاسەدار دوای چەند خولەکێک کە ورد دەبێتەوە لە ١٥٠٠٠ کە گومانێکی زۆر دەکات (٥) کە لە سفرەوە (٠) کرابێت بە ٥، واتا لە ئەسڵدا دەهەزار دۆلار بێت و جۆکەر کردبێتی بە پازدەهەزار دۆلار. کاکی قاسەدار بە شڵەژاویەوە خۆی دەکات بە ژورەکەی جەلال تاڵەبانی دا و لێی دەپرسێ: مامە تۆ نوسیبوت ١٥٠٠٠ دۆلار بدەم بە (جۆکەر) یا ١٠٠٠٠ دۆلار؟ ئەویش دەڵێت نەخێر تەنیا دە هەزار دۆلارم نوسیبو، ئەمیش پسوڵەکەی دەخاتە بەردەمی و (٥) گوماناویەکەی پیشاندەدات کە دیارە (جۆکەر) زۆر بە ئاسانی لە خاڵیکەوە (٠) کردویەتی بە بازنەیەک (٥). جەلال تاڵەبانی برێک هەڵدەچێ و توڕەدەبێ، هەر لە دورەوە چەند جنێوێکی تەڕ و گەرم بۆ (جۆکەر) دەنێرێ، بەڵام بانگی ناکات و ڕوبەڕوی ناکاتەوە بەم ناپاکی و دزییە ی لێیکردوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکات، بەم جۆرە (جۆکەر) بێ لێپرسینەوە پاریەکە دەباتەوە! ئینجا خوێنەری هێژا خۆت وەڵامی ئەم پرسیارەی من بدەرەوە: ئەگەر کەسێکی ئاوا بچێتە سەر قاسەی پارە و سامانی ئەم گەلە برسیکراوە دەبێت

چی بکات ؟ خوێنەری هێژا خۆت وەڵام بدەرەوە، جەلال تاڵەبانی بۆ لێپرسینەوەی نە لەگەڵ هەڤاڵ (جۆکەر) کرد، نە لەگەڵ (دوکتۆر فوئادوئاد مەعسوم) ؟ دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام، (جۆکەر) لە هەڵگەران بەرەوژور بەردەوام بو، جەلال تاڵەبانی بە پەمپ فوی کرد بەناویدا و (جۆکەر) ی وەک باڵۆنێکی بەتاڵ یا فرۆکەیەکی بێ فرۆکەوان بەرزکردەوە و باڵەفڕەی پێکرد تا داینیشاند لە سەر کورسیی پۆستی بەرزی وا کە پیشتر لە خەونیشا نەیدیبو، گەیاندیە شوێنێکی نزیک، هەر زۆر نزیک لە تەختی پاشایەتیی نەوت و غازی هەرێمی کوردوستان!

ئەم سێ لێپرسراوە و سەدانی هاوشێوەیان لە ئاستی بەپرسیارێتیی جیاجیا، لە دەسکە گوڵە بژاردەکانی جەلال تاڵەبانی بون بۆ یەکێتیی نیشتمانی و بۆ گەلەکەمان! پەندێکی کوردی دەڵێت (ئاو لە سەرچاوە وە لێڵ دەبێت)،هەر بۆیە جوتیاران کە بەهاران جۆماڵ دەکەن، لە سەری سەرەوەی سەرچاوەی ئاوەکەوە بە پاککردنەوەی جۆگە و ڕاڕەوی ئاوەکە دەسپێدەکەن و بەرەوخوار دەبنەوە، بە هەمان واتا پەندێکی تر دەڵێت: پاککردنەوەی ماڵ دەبێت لە نهۆمەکانی سەرەوەی خانوەکەوە دەسپێبکات.

## نمونەی چوارەم: هەڤاڵ (دەمامك)

ئەم کەسەی من ناوم لێناوە (دەمامک)، لێپرسراوێکی ناوچەیی یەکێتی بو کە بە دەمامکێکی جوان دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆی دادەپۆشی، کام دەمامک؟ دەمامکی کۆمەڵە کە خۆشەویسترین و پاکترین ڕێکخراوی کوردوستانی ئەوسەردەمە بو. هاوڕێ (دەمامک) کۆمەڵەبون وهاوڕێیەتیی خۆی لەگەڵ هاوڕێ (بێوەی) کە سەرکردەیەکی پاک و جێبڕوای هەمولایەک بو، دەکاتە پەیژە و بەکاریان دێنێ بۆ وەرگرتنی پلە و پایە و بەدەستهێنانی سودە کەسیەکان. هاوڕێ (دەمامک) دوای دو ساڵێک پێشمەرگایەتی وەک کادیر و وەک بەرپرسیار، بە چەند بەهانەیەکی بێبنەما و ساختە خۆی ڕادەستی ڕژێم دەکاتەوە. خوێنەری بەڕێز ڕاوەستە لەکوێتە، ئەمە کێشەکە نیە، سەدان (پ.م) تەسلیم بونەوە! هاوڕێ (دەمامک) لە ناوشارەوە بە نامە هەر پەیوەندیی دەمێنێ لەگەڵ (بێوەی) ی ڕەفیقی زۆر نزیک و گیانی بەگیانیی. دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ کە هەندێ لە فایلەکانی دەسگا جاسوسیەکانی ڕژێم کەوتە دەست یەکێتیی، دەرکەوت (دەمامک) پیاوی ڕژێم بوە و نامە شەخسیەکانی (بێوەی) ی هاوڕێی بێئاگا و بێگوناهی ڕادەستی دەسگای هەواڵگریی ڕژێمی سەدامی

کردوه. بێگومان نامەکانی هاوڕێ (بێوەی) بێ هیچ مەبەستێکی خراپ دە نگ وباسی شۆڕشیشی تێدابوە. دواتر (بێوەی) کە ئەمە دەبیسێ، بە سەرسوڕمان و تاسان و باوڕنەکردەنیەوە، لە دانیشتنێکی دوقۆڵیدا هاوڕێ (دەمامک) ڕوبەڕوی ئەم تۆمەتە دەکاتەوە. ئەو لە وەلامدا بە پشتبەستن بە سوێندی شەرە ف نکولیی تەواو لە تۆمەتەکە دەکات و بە چیرۆکێکی هەڵبەستروای ناحەزەکانی دادەنێ. (بێوەی) کە پیاوێکی پاک و بەڕێز و ویژدان زیندوە، دەیەوێ ڕاستبون یا درۆبونی تۆمەتەکەی بۆ دەرکەوێ چونکە بۆ ناو و پێگەی ئەمیش زۆر ناخۆشە تۆمەتەیێکی ئاوا قورس بخرێتە سەر یەکێ لە نزیکترین هاوڕێکانی. بۆ ڕونکردنەوەی ئەم مژارە دانیشتنێکی دوکەسی لە گەڵ یەکێ لە سەرکردەکانی کۆمەڵە سازدەکرێت، ئەو سەرکردەیە نامەیەکی ناو فایلەکانی دەسگای جاسوسیی ڕژێم پێشانی (بێوەی) دەدات و لێی دەپرسێ: ئایا ئەمە نامەی تۆیە کە لە شاخەوە بۆ شار بۆهاوڕێ (دەمامک) ت ناردوە؟ دوای خوێندنەوەی وردی نامەکە، (بێوەی) دوای چەند چرکەیەک لە سەرسامبون و واقوڕمان، بە هەناسە هەڵکێشانێکی قوڵەوە دەڵێت: بەڵێ بێدودڵی ئەوە خەت و ئیمزای منە، پاشان سەرکردەکەی کۆمەڵە پێی دەڵێ دە سەیری ئەو دیوی نامەکەت بکە. (بێوەی) کە سەیری ئەودیوی نامەکە ی خۆی دەکات، دەبینێ (دەمامک) خاڵە گرنگەکانی نامەکەی وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی، بەلام عەرەبیەکی شەق و شڕ!

## سێرکبازەکانی سیاسەت!

کەسێتیە هەلپەرست و خۆپەرستەکان کە لە سەر چەند پەت یاری و بازبازێن دەکەن، بۆ خۆیان و سود و پەرژەوەندیە کانیان هۆشیار و زیرەک و ڕێوین. ئەمانە بەچەندین شێواز خۆیان لە دەسەلاتداران نزیک دەخەنەوە. یەکێ لە شێوازە سەرکەوتو و باوەکان لە کوردوستان بازدانە بەسەر کادیر و لێپرسراوە ناوچەییەکانی خوارەوە وخۆنزیککردنەوەیە لە کەسی یەکەمی حیزب و دەسەلاتدارانی سیاسی یا سەربازی. ئەم جۆرە کەسانە جاروبار بە نهێنی و دور لە چاوی خەڵک سەردانی سەرکردەکە دەکەن و دیاری بۆدێنن، یا چەند هەواڵ و زانیاریەکی پێدەگەیەنن، یا بە نهێنی لە نێوان سەرۆک و کەسانی تر لە شارەکان نامە دێنن و دەبەن، یا خزمایەتیەکی دور یا هاوخێڵی و هاوهۆزی لە گەڵ سەرۆک دەدۆزنەوە. زۆر جار ئەمانە دەورەکان (ڕۆڵ)

و پله و پایه کان له حیزب و لایەنەکانی مەیدانی خەبات بەسەر ئەندامانی خێزان و بنەماڵە و خێڵەکانیان دابەش دەکەن و بەمە ئیتر کەس چاریان ناکات و لە وەی و تۆڵەی هەمو لایەنەکان پارێزراو دەبن.

فەرمون ئەم نمونانە کە ناوە ڕاستەکانیانم گۆڕیوە:

## هاوبیر (زرنگ)

ئەم زرنگە لە دەڤەری گەرمیان دەژیا، بەو شێوازانەی سەرەوە خۆی لە جەلال تاڵەبانی نزیککردبۆوە و لە هەمان کاتیشدا لە ڕژێمی سەدام نزیک بو و پۆستێکی ئیداریی باشی لە شارۆچکەکەی خۆی بچڕیبو. کادیر و سەرکردە خۆجێییەکانی کۆمەڵە لە گەرمیان لای جەلال تاڵەبانی ڕەخنە و گازندە لە ڕەفتاری (زرنگ) دەگرن لە بەر ئەوەی نزیکیەکی گومانلێکراوی لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا هەیە، بۆیە داوا لە جەلال تاڵەبانی دەکەن ڕێگەیان بدات بیگرن و لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەن. جەلال تاڵەبانی بەرگریی لە (زرنگ) دەکات ونایەوێ لێپرسینەوەی لەگەڵ بکەن. کە کادیرەکانی کۆمەڵە پێداگری دەکەن بۆ سزادانی (زرنگ)، جەلال تاڵەبانی بە هەڵچون و توڕەییەوە ئاوا وەلامیان دەداتەوە: (ئێوە خوتان زۆربەتان کەسی دوسەرەی گومانلێکراوی نزیک لە ڕژێم یا سەربەڕژێم یا تەنانەت جاشیشتان هەیە کە هەواڵتان بۆ دێنێ و چەک و فیشەکتان پێدەفرۆشێ وهاوکاریتان دەکات، دە لێگەڕێن با منیش لە ناوچەکەتان جاشێکم هەبێت!).

## هاوبیر(لێزان)

لێزان لە سەرێکەوە سەرکردەیەکی حیزبی شیوعی بو، لە سەرەکەی ترەوە خۆی وا لە سەدام ی لوتکەی دەسەلات نزیک کردبۆوە کە لە سەر پشکی حیزبە شیوعیەکەی پۆستێکی وەزیریی بچڕیبو، ئەمە لە کاتێکدا بو کە هاوڕێ شیوعیەکانی (لێزان) بە فرمانی سەدامی جەللادی هاوڕێی لە بەغدا لە سێدارە دەدران، ئەو کاتە بو کە حیزبی شیوعیی عێراق لە گەڵ حیزبی بەعسی سەدام لە یەک بەرەدا بون. (لێزان) لە و کاتە هەستیارە خوێناویەدا و لە بەغدای پایتەختی (کۆماری ترس) توانی وەک یاریزانێکی (سێرکی چینی) لە بەرزاییەکی زۆرەوە لەسەر هەمو پەتە زۆر باریک و

تیژ و ترسناکەکان یاریی خۆی بکات ونەهێڵی بکەوێتە خوارەوە بۆ سەر چەقۆی سەدام. بێگومان دەبێت ددان بە زیرەکیی (لێزان) بنێم، بەڵام زیرەکیەکەی بۆ خۆی و دەوروپشتەکەی بوە نەک بۆ گەڵ و نیشتمان، تەنانەت نەک بۆ حیزبەکەیشی. شورەیی و غەدرەکە لەوە دایە ئەم جۆرە کەسایەتیانە نەک هەر ددان بە کارە دزێو و هەلپەرستی و خۆپەرستیەکانیان نانێن و پەشیمانی دەرنابڕن و بەکاری باش کارە خراپەکانیان ناسڕنەوە، بەڵکو خۆیان بە نیشتمانپەروەر، ئازادیخواز، چەپ، خەباتگێر، بیرمەندی ئارام و حەکیم و هاوسەنگ دەزانن. ئەمانە بێشەرمانە ڕەفتارە خۆپەرستیەکانیان وەک کاری دیبلۆماسیی بلیمەتانە و نیشتمانپەروەرانە بە گەلەکەمان دەفرۆشنەوە، بەداخەوە زۆریش هەن لە ڕۆشنبیران سەرسامن بەم جۆرە کەسایەتیانە.

## کۆڵبەرەکانی کوردوستان

قاچاخچی وشەیەکی نەباشە و بە واتای کەسێک دێت کە یاساشکێنی دەکات، کەواتە دەبێت سزابدرێت، بۆیە من لە بری قاچاخچی وشەی کۆڵبەر بەکاردێنم. ئێمە ی کورد نیشتمانەکەمان داگیرکراوە و بە زۆر لکێنراوە بە چوار دەوڵەتی دواکەوتوی ستەمگەرەوە. ئێمە بۆ دیداری خزم وکەسەکانمان لەو دیو سنوردەبێت بۆ ڤیزای ئەو دەوڵەتانە لە کارمەندە بەرتیلخۆرەکانیان بپاڕێینە وە و بەرتیلیان پێبدە ین. ئێمە برسی و بێکار کراوین، ئێمە کە لەنیشتمانی خۆماندا داگیرکەرانی ستەمگەر ناهێڵن پرۆژەی ستراتیجیی گەورە دروستبکەین کە لە سەد کرێکار زیاتر کاری تێدا بکات، ئێمە... ئێمە.... ئا ئا ئێمە، کۆڵبەر و نان پەیداکەرانی هەر چوار پارچەی کوردوستان، چەند یاساشکێنیەکی جوان ئەکەین ئەگەر بۆ شیر و نان و دەرمان بۆ منداڵەکانمان سنورە دەستکردەکان بشکێنین. چەند یاساشکێنیەکی پێویستە ئەگەر لە مەیدانی شەڕەکانیان کە شەڕی ئێمە نین خۆمان دەربازبکەین و سنورەکانیان بشکێنین تا نەهێڵین بێهودە بکوژرێین. چەند یاساشکێنیەکی باشە سنورەکان لە مینە کوشندەکانیان پاکبکەینەوە و ناوچەکە بکەینە بازاڕی ئازادی بەشەکانی کوردوستان بۆ کڕین و فرۆشتنی کەرەسە و پێویستیەکانی ژیان.

لە ناوچەی نێوزەنگ ڕۆژێک بوکێکم بینی بە قاچاخ بە سواری ئەسپێکەوە لە گوندی (کانی زەرد) ی سەر بە سەردەشتەوە دەگوازرایەوە بۆ قەڵادزێ، بوکەکە یەک

دو بزنیشی بەدواوە بو وەک جیازیی ماڵە بوک. چی یاساشکێنیەکی ڕۆمانسی دەکەن ئەم بوک وزاوایە!

بەسەرهاتی ڕاستەقینەی ژیانی ڕۆژانـەی کوڵهەڵگرانی کوردوستان دونیایەکە کەرەسەی سەدان فیلمی تیادەبیت، بەڵام تا ئێستا لە دو فیلم دا باسیان کراوە: (ساتێ بۆ مەستیی ئەسپەکان) ی بەهمەنی قوبادی، و (نا بە بێ کچەکەم) ی ژنە ئەمریکایی Betty Mahmoody.

## عەلی لفتە

یەکێ لەو سنورشکێنە، لەو یاساشکێنە پاڵەوانانەی من لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا ناسیم (عەلی لفتە) بو.عەلی پیاوێکی بالابەرزی گەنمرەنگ، لاواز و تیژڕەو وەک کەڵەکێوی، ئازا و جوامێر و کوڕی تەنگانە بو، مەنگ و کەمدو بو بەڵام پڕکار و جێی بڕوا بو. (عەلی لفتە) خاوەنی خێزانێکی گەورە و چەند ئێسرێکی بەتوانا بو، ماڵیان لە گوندی (قەلاتێ) ی ئەوبەری دێی (پارەزان) بو. ماڵەکەی بۆ میوانداریی (پ.م) و ڕێبواران هەمیشە کراوەبو. بەشێکی زۆری تەقەمەنیی (پ.م) کانی شاربازێر و هەر پێویستیەکی تری ژیانی ڕۆژانەمان ئەو لە ئێران یا لە عێراق پەیدای دەکرد وبۆی دەکڕین و هەر خۆیشی بە ئێسرەکانی بۆی دەهێنایین، زۆرجار پارەی ئەو شتانەمان نەبو، بەڵام ئەو بێ کێشە و بێ منەت بە قەرز پێی دەفرۆشتین. جارێک دو پێشمەرگەی یەکێتی لە گوندی (کەوڵۆس) ی نزیک ناڵپارێز دەگیرێن، (ئیستیخباراتی عەسکەری) لێکۆڵینەوەی وردیان لەگەڵ دەکەن، بە تایبەتی دەیانەوێ بزانن یەکێتی فیشەک و گولە ئاربی جی لە کوێ پەیدا دەکات. دو (پ.م) کە لە وەلاما دەڵێن یەکێتی هەمو جۆرە تەقەمەنیەک لە (عەلی لفتە) دەکڕێت، لێکۆڵەرەکان تورەدەبن و بە تەوسەوە بە دو (پ.م) کە دەڵێن: عەلی لفتە بوبە چی خۆ دەوڵەتی شەرقی یا غەربی نیە! بەداخەوە عەلی لفتە لە گەڵ کوڕێکیدا لە شالاوی ئەنفالی یەک لە زستانی ١٩٨٨ لە بەفردا ڕەقبونەوە.عەلی لفتە بەو جۆرە هەر بەوەفاداری لە ناوچەی ئازادکراوی پڕلە مەترسیدا دا نزیک لە (پ.م) دا مایەوە و ژیا و شەهیدیش بو.

عەلی لفتە ئەگەر لە وڵاتێکی وەک (نیپال) بوایە، دەبـوە ڕابـەری جێ بڕوا و ڕێپیشاندەری ئەو دەستە ئەمریکی و ئەوروپیانەی بەسەر شاخی (هیمالایا) دا سەردەکەوتن بۆ گەیشتن بە (ئیڤرێست) ی بەرزترین لوتکەی شاخ لە جیهاندا.

## داوەشێن ترسنۆکینە! سێرەی تفەنگەکانتان لە کێ دەگرن؟

خوایە گیان، چ کارەساتێکە لەم کوردوستانە ! ئێستاش کە لە ساڵی ٢٠٢٠ داین هەزاران کۆڵبەری سنورشکێنی کوردی هەر چوار پارچەکەی کوردوستان لە پێناوی دابینکردنی سادەترین پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان ومنداڵەکانیان، ڕۆژانە ژیانی خۆیان دەخەنە سەر لەپی دەستیان. ناچارن بەرتیل بدەن بە پاسەوانی سنورەکان، کەل و پەلەکانیان بە کۆڵەوە، بەسەر شاخەکاندا هەڵدەزنێن و دەیانگوازنەوە بۆ بازاڕی نزیک سنورەکان. زوزویش پاسدارانی ئێران وجاندارمی تورک ئاردەکەی بە شان و پشت و مل هەڵیدەگرن خلتانی خوێنی خۆیانی دەکەن و منداڵە برسیەکانیان بە برسێتی دەهێڵنەوە و ناهێڵن هەرگیز باوکیان ببیننەوە. بۆ نمونە ساڵی ٢٠١٨ پاسدارانی ئێران لە سەر سنورەکانی ئێران و تورکیا پتر لە دوسەد کۆڵهەڵگریان شەهید کرد. لە روداوی (ڕۆبۆسکی) لە شوێنێکی سەربە پارێزگای شرناق لە ڕۆژی ٢٨ ی ١٢ ی ٢٠١١ دا فڕۆکە جەنگیەکانی تورکیا پتر لە ٣٨ کاروانچیی نان پەیداکەری گەنجی کوردی باکوریان لە نزیک سنوری باشوری کوردوستان لە چەند خولەکێکدا شەهید کرد. بەڕای من حەقیەتی بە قاچاخچیانی کوردوستان بڵێین سنورشکێنان یا سنوربەزێنان یا کۆڵبەر و وکاروانچیان، یا نانپەیداکەران، وە ئیتر هەتا کوردوستان ئاوا بە داگیرکراوی بمێنێتەوە وشەی قاچاخچی بۆ ئەم کەسانە بەکارنەهێنین.

هێلیکۆپتەرە جەنگیەکانی ڕژێمی بەعس لە مانگی ١ ی ١٩٨١ لە نزیک دێی (چاڵەخەزێنە) ی شارباژێر بۆمبارانی کاروانێکی ولاخدارەکانیان کرد. لە ئەنجامدا خوێنی ڕژاوی چەند کوردێکی ئێران و عێراق تێکەڵ بەیەک بون و چەندین ئێستریش کوژران کە لولاقە ئەستور و درێژەکانیان دوای چەند مانگێک لە سەر ڕێگاکان دەبینران، چەند دیمەنێکی غەمبار وناخۆش بو کە بینیمن!

## پیکابە شڕەکە!

کات: هاوینی ساڵی ١٩٨٣ یە، شوێن بەردەم مزگەوتی گوندی (حاجی مامەند)ە: «هاکا گەیشت»، «نەخێر شکاوە و تازە ئیمڕۆ نایەت»، «دەڵێن لە ڕێگا فڕۆکە لێیداوە و سوتاوە»، «نا وانیە، ئیتر حوکمەت ناهێڵی بێت»، «دەبێت بە ناو چەند بنکەی سەربازی و خاڵی پشکنینا تێپەڕێت؟»، «بڵێی بە وردی پشکنرابێت؟»، «ئەوانەی لە شارەوە دێن کێن و بۆ لای کێ دێن؟»، «بڵێی بەتاوانی ئەوەی بۆ لای ئێمە دێن

نەگیرابن؟»، «دەبێت هەواڵی نوێی گرتن و ئەشکەنجە و کوشتنی کێیان پێ بێت؟» ئەمە کورتەی ئەو وتووێژە بو لە بەردەم مزگەوتی حاجی مامەند پێشمەرگە و دانیشتوان لەگەڵ یەکتریان دەکرد. باسی گەرمی ڕۆژ دەربارەی ئەو پیکابە شڕە بو هەر چەند ڕۆژ جارێ لە سلێمانیەوە دەهات، بە سەید سادق و ناڵپارێز و ڕەزڵە دا تێدەپەڕی تا دەگەیشتە حاجی مامەند. پیکابە بۆر لە پێینی دێوە بە هەناسبڕکێ و شەقەشەق و نرکە و ناڵە، هاوڕێ لەگەڵ دوکەڵ و تەپ و تۆزێکی خەستوخۆڵەوە، بە بەردەم مزگەوتدا خۆی دەکرد بە دێدا. منداڵانی لەڕ و لاسار و ژیکەڵەی دێ، بۆ خۆهەڵواسین پێیدا یا بۆ وەرگرتنی چەند نوقوڵ وچیکلێتێکی شار، بێ گوێدانە تۆز و دوکەڵ، بە چەپڵە و هەرا و پێکەنینەوە، بە دوایدا ڕایان دەکرد. پیکابێک کە پردی پەیوەندیمان بو لە گەڵ شاردا، کە هەڵگری خەونەکانمان بو. ئێمە تامەزرۆی یاپراخی پێچراوەی نامەی یار بوین، ئێمە تاسەی کەس وکار و هەواڵی شارمان دەکرد. ئێمە بێزومان بە کفتە و شفتە و کوبەی دایکمان دەکرد، ئێمە تینوی کۆلا و فەنتای سارد بوین، ئێمە هەلپەی سەوزە و میوە و شیرینی و دەرمانمان دەکرد، ئینجا ئێمە (پ. م) ی ئەو کاتە برسی و تینوی چی نەبوین؟ تاسەی چی مابو نەیکەین؟ ئێمە لەو کاتەدا ئەو تۆزە ڕێگاوبانەی هەمان بو ئەویش بە هۆی شەڕی ئێران وعێراقەوە بەرەو بڕان و نەمان دەچو. ئێمە لە حاجی مامەند بۆ دەمێک دەستمان هەڵگرتبو لە وتووێژە بێ کۆتاییەکانی سیاسەت، کورد، شەڕ، سۆشیالیزم، سەرمایەداری.....، هەمو سۆمای چاومان بڕیبوە ڕێی چارەنوسسازی پیکابە ئەفسوناویەکە و چاوەڕی بوین بەڵکو خوایە ئێمرۆ بێت. پیکابی داماو کە دەهات، لە ژێر باری ئەو هەمو کەس و شت و ناشتە مەعنەویانەی تێیدابو نرکە و ناڵەی دەهات و خەریکبو لەبەر یەک دەترازا.

### «برای عەرەبی چاوڕەشم»

ئێمە لە بەرمزگەوتی دێ ڕاوەستاوین، ئای! ئەوە چیە؟ چاوم ڕیشکە و پێشکە دەکات؟ ئای ئەوە چی دەبینم؟ لە ناکاو بە پیچەوانەی ئەوەی چاوەڕیی بوین، کە پیکابەکە بو، گرەگرو هوروژمی تەپوتۆزێکی خۆڵەمێشیی چڕ لە پێینی دێوە بەرزبۆوە. لمۆزی تۆزاویی دو تراکتۆر دەرکەوتن کە بە تەکان تەکان ڕوەو ئێمە ملیان دەنا. بەدوای هەر یەک لە تراکتۆرە کانەوە گالیسکەیەکی درێژ بەسترابو کە پازدە پیاوێکی تێ ئاخنرابو. چەند (پ.م) یەکی قیتەڵە و زیتەڵە بە خۆیان و کلاشینکۆفە کانیانەوە لەسەر چەمەلغی تراکتۆرەکان

دانیشتبون و لولەی چەکەکانیان ڕوەو پیاوەکانی ناو گالیسکەکە کردبو. (پ.م) کان چاکوچۆنیان لەگەڵ کردین، لە بەر گرمەو ناڵەی تراکتۆرەکان جموجوڵی لێویانمان باش نەبیست و بۆمان نەخوێندرایەوە، تا بزانین ئەمانە کێن و بۆچی هێناویانن بۆ ئێرە. هەر دو تراکتۆرەکە ڕێک ڕوەو بنکەی سەرەکیی مەڵبەندی یەک،کە مەلا بەختیار بەرپرسیاری بو، بە تەکان تەکان درێژەیان بە ڕەوتی خۆیان دا. ئێمەش بەدوای تراکتۆرەکان کەوتین هەتا وەستان و پیاوەکانیان دابەزاند. دیمەنێکی هەژێنەر و تاوێنەر بو. تەمەنی لاوترینیان لە پەنجاساڵ کەمتر نەبو، ڕیشی ماش وبرنج و سپیی هەندێکیان چەند سانتیمەترێک درێژبو، ڕومەت و ڕویان ڕەش داگەڕابو و وەک تەنەکەی فافۆن قوپا بو، چاڵ وچۆڵ وشێفی تەوێڵ و گۆنایان بە سرێشی چڵک و ئارەق و تۆزی ڕێ سواغدرابون. پەردەی تەمێکی تەڵخ بە سەر بۆلی تریی ڕەشی چاویان کشابو. گەرما و تونێتی و ئارەقکردنەوە، ترس لە سزا، ترس لە نادیاریی ئایندەیان، چاوە سەرسامەکانیانی هێندەی تر بردبو بە ناو قوڵایی دەفری ئێسکی چاویان. چاوەکانیان هەر زو کەوتنە دوان، نەء.. کەوتنە هاوار و ناڵەی بێدەنگ. بە زمانی جەستە کەوتنە نزا و پاڕانەوە و گریان. بێدەنگییان شکان، ڕو یان لە خاک، لە خوا، لە ئاسمان و لە ئێمەکرد و بە عەرەبی کەوتنە پاڕانەوە لێمان: کاکە بۆخاتری خوا، وەڵلا ئێمە تاوانمان نیە، ئێمە سەربازی ئیحتیاتین، ئێمە منداڵی وردمان هەیە (کاکا خاطر الله، والله مو صوچنا، احنا جنود احتیاط، عدنا اطفال صغار..). ئێمەش ئەوانەی عەرەبیمان دەزانی هێور و ئارامماں کردنەوە، دڵنەواییمان کردن، دڵخۆشیمان دانەوە و دڵنیامان کردن کە وەک دیلی شەر ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەین، هیچیان لێناکەین و پێویست ناکات بترسن. ژن و پیاوی ئاواییش بە جامە ئاو و دۆی سارد و پاروە نانەوە بەرەوڕویان هاتن. من لە هەرزەکاریمەوە زۆربەی شیعرە بەناوبانگەکانی (گۆران) م لەبەربو. ئەم دیمەنە درامیەی ئێستا شیعرێکی درێژی (گۆران) ی شاعیری هێنایەوە یادم کە لە زیندانا لەسەردەمی پاشایەتیدا وتویەتی، من ئەو شیعرەشم لەبەربو، لەبەرخۆمەوە بە دەنگێکی نزم کەوتمە وتنەوەی:

**برای عەرەبی چاوڕەشم تاڵ بو بەشت تاڵ بو بەشم**
**لە یەک کاسە تاڵی نۆشین برایی کردین بە هەنگوین......**

ئەم پیاوە دیلانە پۆلێ سەربازی ئیحتیاتی عەرەب بون لە بنکەی سەربازیی عێراق لە گوندی (شیوەکەڵ)ی بناری چیای (سورکێو)، بەرامبەر تۆپباران و هێرشی ئێرانی

شکابون و بە شەکەتی وبرسێتی بەرەو دواوە کشابونەوە، (پ.م) کانی خۆمان بۆسەیان بۆ دانابون، بێ شەڕی گەورە و کوشتار هەموویانیان بە چەکەکانیانەوە بە دیل گرتبون. پاش ئەوەی برسێتی و توینێتی و ترسیان شکا و کەمێک گیان بەبەریانا هاتەوە، لە ژێر کەپرێکدا کۆکرانەوە و مەلا بەختیار بە عەرەبی قسەی بۆکردن و دڵنیای کردن کە ژیانیان لای ئێمە پارێزراوە. پاشان خرانە خانویەک لە پەڕی دێ و پاسەوانیان بۆ دانرا.

## ئەم دەستارە کەی لە هارین دەکەوێت؟

ئێمە خەونخۆش بوین، ئێمە خەیاڵ پڵاو بوین، ئێمە وێڵ و عەوداڵی کۆمەڵێ بەها و واتای ناماددی(مەعنەوی) بوین وەک: ئازادی، سەربەخۆیی، یەکسانی، ئاشتی، جوانی، دادپەروەری، بەختەوەریی خەڵک. بەڵام ئەمانە هەمویان لە گەروی چەند ئەژدیهایەک دا بون بێ ناوونیشان، بێ ناسنامە، دوردەست، ئێمە هەر تارمایی و سێبەرەیانمان دەبینی و لێیان تێنەدەگەیشتین، ئەو ئەژدیهایانە پێیان دەوتن رژێمەکانی: سەدام، خومەینی، تورکیای میلیتاریست و شۆڤێنیست، سوریای بەعسی فاشیست، کەمپی سۆشیالیستیی وارشۆ، کەمپی سەرمایەداریی ناتۆ و....

هەمو گەمە خوێناویەکانی ئەم ناوچەیە وەک هارینی دانەوێڵە بو بە دەستار. بەردە گەورە ئەستور و بەهێز و قورسەکەی ژێرەوە دەبێت لە شوێنی خۆی بێت و نەجوڵێت: ئەوە سود و قازانج و پێگەی ستراتیجیی وڵاتانی زلهێزە. بەردە سوکەکەی سەرەوە کە بەردەوام لە خولانەوە دایە و ناوبەناو دەبێت بگۆڕدرێ ئەوە رژێمەکان و دەسەڵاتدارانی خۆجێی ناوچەکەن. دانەوێڵەکەش: ئەوە خەڵکی زۆرینەی ناوچەکەن، دەبێ بەردەوام بهاڕدرێن و ورد ورد کرێن !

کە لە بێشە و جەنگەڵی تاریک و ترسناکی ئەگەرە بەد و نەگریسەکانی خەباتی چەکداری گیرم دەکرد و رێی دەرچونم لێ دەگیرا، ئیترخۆبەخۆ و بێ بیرکردنەوە و رامان، کۆللارەی منالیی خەیاڵم بەرزدەبۆوە بۆ ئاسمان، بۆ نێو تەنکە تەمێکی سپی وەک تارای بوک، کە لە ناویدا (یار) ی ئاوات چاوبڕکێ و سەرەتاتکێی لەگەڵ دەکردم. ئاواتی برانەوەی شەڕ و جێگیربونی ئاشتی، ئاواتی سەرکەوتنی یەکجاری و گەیشتن بە ئامانجەکانی شۆڕش، ئاواتی شادبونەوە بە ئازیزان، ئاواتی پیرۆزکردنی یادی شەهیدە نەمرەکان و وەفا بۆ کەس و کاریان، ئاواتی بژاردنی زیانی مادی و نامادیی زیانلێکەوتوانی شۆڕش، ئاواتی ژیانێک شایستەبێت بە شکۆی مرۆڤەکان.

ئەگەر توانای خەیاڵ و فەنتازیا و بیرکردنەوە لە مرۆڤی ناو گەردەلول و تەنگانە بسەنرێت، ئیتر چۆن بتوانێت بەرامبەر تاڵی و سەختیەکانی ژیان بەرگەبگرێت و بمێنێتەوە؟

## (شێخ عەلی گۆچان) و ڕاسپاردە و پەیامێك!

دوای حەوانەوەیان، لە گەڵ هاوکارانم د.قادر و د. شاخەوان و د.کامیلی مەلا مەحمود و هیوای خوشکەزام، بە دەرمـان و کـەرەسـەی پزیشکیەوە چوینەلای سەربازەکان و کێشەکانی تەندروستیان مان چارەسەرکردن. دوانیان زۆر پیر و شەکەت و نەخۆشبون، گومانی (سیلی سی) م لێکردن، دەرمانی دژی سیل مان نەبو، ئەگەر سیلیان بوایە ئەوا مانەوەیان مەترسی بو بۆ ئەوانی تر و بۆ خۆشمان و بگرە بۆ خەڵکی گوندەکەش، چونکە سیلی سی بە کۆکە و هەناسە و تف دەگوێزرێتەوە بۆ دەوروبەر. لە گەڵ د.قادر چوین بۆ لای مەلا بەختیار و کێشەکەمان بۆ باسکرد، پێشنیازمان کرد ئەم دو نەخۆشە ئازاد بکەین و لێگەڕێین بۆ کوێ دەچن با بچن، ئەویش پێشنیازەکەمانی پەسەندکرد. گەڕاینەوە لای دو سەربازەکە و هەواڵی نیازی ئازادکردنیان مان پێ گوتن، زۆر سوپاسگوزار و دلشاد بـون، داوایـان لێکردین بیاننێرنەوە بۆ نزیکترین بنکەی سەربازیی عێراقی کە ئەویش (ناڵپارێز) بو. لە حاجی مامەند سێ کەس هەبون ناویان عەلی بو، ناسناوی دوانیان چەک بو(عەلی هۆڵەندی) و (عەلی سیمینۆف)، عەلیی سێهەم (شێخ عەلی گۆچان) ی موختاری گوندبو. دو سەربازەکەمان دایەدەست (شێخ عەلی گۆچان)، هەروەها نامەیەکیشم پێدا کە بە عەرەبی نوسیبوم بۆ ئەوەی لەگەڵ سەربازەکانا ڕا دەستی فەرماندەی سەربازیی عێراقی بکات لە (ناڵپارێز). وەک لایەنێکی ڕەسمی و بەرپرسیار و خاوەن ڕەوشت و بنەمای ژیاری و مەدەنیەت بە عەرەبیەکی پاراوی جوان نوسیبوم «ئێمە وەک یەکێتیی نیشتمانی کوردوستان ئەرکی مرۆڤدۆستیی خۆمان بەجێدەگەیەنین، بۆیە ئاوا ئەم دو دیلە نەخۆش و پیرەتان بۆ دەنێرینەوە. بەڵام ئێوە تەڕووشک پێکەوە دەسوتێنن و تۆپبارانی دێکانمان دەکـەن، خەڵکی بێتاوان و بێچەک و ژن ومناڵ دەکـوژن. «بە تەوسەوە پرسیبوم: «ئایا لای ئێوە پابەندبون بە یاسا و داب و نەریتە جەنگی و نێونەتەوەییەکان ئاوایە؟ «، ئینجا داوام لێکردبون تۆپباران و هێرشە ئاسمانیەکانیان بوەستێنن. (شێخ عەلی گۆچان) سپاردەکەی بە جوانی و دروستی گەیاندە شوێنی خۆی.

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ کە تازە لە نالپاریز گەڕابۆوە، تۆپبارانی حاجی مامەند دەستی پێکرد، ئەم جارە تۆپەکانیان گەورەتر و زۆرتر و چڕتر بون، هەروەها لەمالانی دێش نزیکتر لە جاران دەیاندا بە زەویدا! بەتەنیا لە سەر دەم لە ژورێکی مالە قورینەکەمدا ڕاکشابوم و کتێبێکی (لینین) م دەخوێندەوە، لە ناکاو تۆپێک لە ئاستی خانوەکەی من دای بە پشتی دێدا لە نزیک ژوری سەربازە گیراوەکان، تەپوتۆز لە خانوەکەمەوە هەستا و کەمێکیش لەریەوە. ئەم جارەشیان شانسمان هەبو، کەس نە شەهید بو و نە بریندار بو. دوای تەواوبونی تۆپبارانەکە (ئاوات عبدالغفور) لێپرسراوی کۆمەلایەتیی مەلبەندی یەک، شێخ عەلی گۆچانی بانگ کردبو و دەنگوباسی نالپاریزی لێپرسیبو (دیارە بیستبوی لەوێ گەڕاوەتەوە)، ئەویش باسی نامەکەی منی بۆ کردبو. بۆ بەیانی کە (ئاوات) م لە ناودێ بینی، ڕەخنەی توندی لێگرتم کە بێ ئاگاداریی مەلبەند نامەم نوسیوە و ئەم تۆپبارانە خەستوخۆلە وەلامی نامەکەی منە، بەلێ خەتای نامەکەی منە! بە ڕاستی کش و مات بوبوم و نەمدەزانی بلێم چی، چونکە لە ڕاستیشدا هەر وابو کە ئاوات دەیوت. ئەمە وەلامی سەدامیەکان بو بۆ هەلوێستی مرۆڤدۆستانەی ئێمە، ئەمە وەفا و پەرۆشیان بو بۆ دیلەکانی خۆیان! چونکە دیلەکانیان وەک ئێمە لە ژێرڕەحمەتی تۆپەکانیان بو، ئەمە ڕێک پێچەوانەی ئەو پەندە دەرچو کە دەلێت: بە هۆی چەند گولە گەنمێکەوە گولە مرۆرەکانیش ئاودەخۆنەوە! بۆ سەرکردەکانی سوپا کەی سەدام، ئێمەی دوژمن و سەربازە دیلەکانی خۆیان یەک بەهایان هە بو کە هیچ (سفر) بو!

## هەر حەلالمان جیایە !

دوا هەفتەی مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٨٣ یە لە ناوچەی خڕی نێوزەنگی سەرکردایەتیەوە، بە خۆم و کلاشینکۆف و کولەپشتی پڕلە دەرمان و ئامێری سادەی پزیشکی و کتێبەوە، لەگەل دەستەیەک (پ.م) ی مەلبەندی یەک بەرەو شارباژێڕ دەگەڕاینەوە. هەمومان وەک یەک کەوش و کالای لاستیک یا پەڕۆمان لەپێدابو. قۆناغ بە قۆناغ سەری هەوراز و لوتکە قوچ و لە خۆبابیەکانی کوردوستانی ئێران و عێراقمان دانەواند و بەزاند، کۆلنجی بەرزونزمیی سەر ڕێگاکانمان تێر تێر شێلا، تەنکاو و قولایی چۆماوە چاو قرژالیەکانمان بە تەپوتۆزی سەر جەستەمان لێل و وێلکرد. تۆپە ئاگرینەکەی ڕۆژ ئیتر لەوە زیاتر توانای هاوڕێیەتی کردنمانی نەمابو، لە جێیەکی

تری ئەم ئەستێرە شینەی ناوی گۆی زەویە، خەڵکی وڵاتێکی تر بە تاسەوە چاوەڕێی ڕوناکی و گەرمیەکەیان دەکرد تا پێیان ببخەشێ. ڕۆژ وردە وردە خۆرەتاوەکەی کەم دەکردەوە لێمان، ئەو وەک سەرەتاتکێی شەرمنی ڕوی گەش و ئاڵی کیژێکی گوندیی نازدار لە درزی دەرگاوە، ماڵاویی لە کوردستانەکەی ئێمە دەکرد. ڕۆژ لە نێوان لوتکەی شاخە دوردورەکانەوە و لە کاتی ئاوابوندا، پەیمانی پێدەداین بەرەبەیانیی سبەی، بە تاوە ڕوناک و گەرمەکانی لەخەو هەڵمانسێنێ. بەرایی ئەم کاروانی قاڵبوی خەبات و ڕێپێوانە کە لە سەرکردایەتیەوە دەهاتەوە، گەیشتە دێهاتە ئاوادانەکانی چاڵە خەزێنە، قەڵاتێ، پارەزان، گوێزە ڕەشە، دۆڵپەمو، چنارە و دۆسەدەرە. ڕەنجدەرانی بە ئەمەک و هەژاری گوندەکان، ژوری دانیشتن و دیوەخان، پێخەف و سفرە و خوانی خۆیان وەک برا لەگەڵمانا بەشدەکرد و بە ڕویەکی سادە و گەشەوە خوڵکی تورکییان دەکردین. جوتیارانی سادە و ساکاری گەلەکەمان پێیان دەوتین "هەر حەلاڵمان جودایە"، بە واتا هەر ژنەکانمان بە تەنیا هی خۆمانە و جودایە و پشکتان تێیدا نیە، دەنا چیی ترمان هەیە هاوبەشن لەگەڵماندا. هەندێ جار کە دەستەیەکی بچوکی (پ.م) بە ماندوبون و شەکەتیەکی زۆرەوە دەگەیشتە گوندێک و شەو دەمایەوە، خەڵکی گوندەکە خۆیان پاسەوانیی (پ.م) کانیان دەکرد و لێیان دەگەڕان تێر خەوی خۆیان بکەن.

گرمە و ناڵەی تۆپە دورهاوێژەکانی ئێران وعێراق هەواڵێکی بەد و ترسێنەری بە دانیشتوانی ناوچەکانی سەر بە پێنجوێن و چوارتا ڕادەگەیاند. لە ژێر دوکەڵ و ئاگری شەڕی نەگریسی ئێران و عێراق، ژیانی، نەء ڕاستترە بڵێم زیندومانەوە و مەمرەمەژیی جوتیاران و شوان و کاروانچیەکان هەرچۆنێک بو درێژەی هەبو. ڕۆژ بە ڕۆژ گرمە گرمی تۆپ و تەیارە نزیکتر دەبۆوە. بنکەی مەڵبەندی یەک لە دێی شەست ماڵەی حاجی مامەند بو، گوندەکانی ئەودیوی حاجی مامەند (ڕەزڵە، دۆسەدەرە، چنارە، پارەزان، گوێزە ڕەشە و دۆڵپەمو) کە (پ.م) کانی ئێمەی تێدابون ڕاستەوخۆ ڕوەو هێرشەکەی ئێران بون، بۆیە کەوتنە بەر تۆپباران و بۆمبارانی فڕۆکە جەنگیەکانی عێراق. ئەمە بو جوامێریی سوپای داگیرکەری عێراق بەرامبەر کورد. ئێرانیەکان سەنگەر بە سەنگەر و شاخ بە شاخ دەیانشکاندن و توانای شەڕکردنیان نەمابو، عێراق پێنجوێنی لە دانیشتوان چۆڵکردبو، ئێمە ئیتر کەوتبوینە نێوان ئاگری بێئامانی شەڕی ئێران و عێراق.

## برینداز و شەهیدمان هەیە!

دێی پارەزان کە ملەو هەورازێک لە حاجیمامەندی جودا دەکاتەوە خەڵکەکەی جێیان هێشتبو، تەنیا چەند (پ.م) یەکی ئێمە لە پارەزان مابونەوە. ڕۆژی ٢ ی ١١ ی ١٩٨٣ پێشمەرگەی جوامێر و ئەزمودە (جەمالی حەمەی خواکەرەم) کە فەرماندەی تیپی٣١ کی پێنجوێن بو، بە هەڵەداوان خۆیکرد بە ناو ئەو خانوە قورە پشتکۆماوەی کردبومانە نەخۆشخانەی سەرەکیی مەڵبەندی یەک لە (حاجی مامەند). ئەو پێی ڕاگەیەندام کە دێکانی چنارە و پارەزان و گوێزەڕەش و دۆڵپەمو لە لایەن فڕۆکە جەنگیەکانی عێراقە وە وهەروەها لە لایەن تۆپە دورهاوێژەکانیان لە ناڵپارێزەوە بۆمبارانێکی خەست و چڕ کراون و برینداز و شەهیدمان هەیە. لەگەڵ ستار کەرکوکی (جیهانگیر) ی تیمارکەر دەرمان و کەرەسەی پزیشکیی پێویستمان پێچایەوە، لە تەنیشت کاک جەماڵەوە سواری ئەو پیکابە شوفرلێتە سەربازیە بوین کە پێش چەند ڕۆژێک سەربازێکی کورد لە سوپای عێراق فراندبوی و بۆ کاک جەمالی هێنابو. لە نێوان داربەڕوەکانی ئەم دیوئەودیوی جادە خاکیەکەدا بە ژێر ئاسمانێکی سامالی شین و جواندا ڕێمان دەکرد. ناوبەناو فڕۆکەی میک و هێلیکۆپتەری جەنگیی عێراقی بە دوکەڵ و گرمە و ناڵە ترسێنەرەکانیان ئاسمانە سامالەکەیان لێڵ و ڕەش دەکرد.هەرچۆنێک بو لە ژێر مەترسیی بۆمباران و توپباراندا خۆمان گەیاندە دێی پارەزانی چۆڵ و بۆمباران کراو. چەند دیمەنێکی ترسناک و مەرگەسات و غەمباربو! گرمەی تۆپە قورسەکان لە دورەوە دەنگیان دەدایەوە. گیڤە و دەنگی ئەو هاوەن وتۆپانەی بەسەرماندا دەفڕین ودەدران بە دەوری دێدا، وەک دەنگی فیکە یا قروسکەی سەگ دەهاتە گوێم. کە گوێت لە دەنگی گولە تۆپ یا هاوەن یا فیشەک بو، واتای ئەوەیە تازە بەسەرتدا ڕۆشتن و تێپەڕین و ئیتر ئەو ئاسنە ئاگراویانە بەر تۆ ناکەون. نا نا وانیە! بەڵام کێ دەڵێت ئەوانی تری هاوڕێی دوای خۆیان کە وابەڕێوەن بەرت ناکەون و ناتپێکن و هەرگیز گوێشت لە دەنگیان نابێت ؟ کاتێک لە نێوان گرمە و ناڵەی تۆپەکاندا چەند چرکەیەکی خامۆشیی ترسناک باڵی دەکێشا بەسەر دۆخەکەدا، گوێم لە دەنگی جەرگبڕی گریان و لاوانەوەی یەک دو ژن بو لە ناودێوە بەرز دەبۆوە. لەم چرکەکاتەدا بەسەرهاتی پیرێژنە کوڕکوژراوەکەی ناو چیرۆکی (چاڵی جەرگی پیرژن) ی (حسەین عارف) م هاتەوە بیر!

## تەنیا لە لولەی چەکەوە ئازادی چاوی هەڵدێنێ؟

ئەی هاوار! ئەی هاوار! پێش دومانگ ئێرە دڵێکی ئاڵی پڕجۆش وخرۆش بو، دڵێک بو پڕلەخوێن و پڕ لە ترپە و پڕ لە خورپە، ئێرە گوندێک بو لێوانلێو لە ژیان. کوا دەنگە دەنگی گەمەی زارۆکانی زیت و گورج و گوڵی دێ؟ کوا بزە و نەرمە پێکەنین و نیگا و چپەچپی کچانی شەرمنی سەر ڕێگای کانی؟ کوا گاڵتە و پێکەنینی نێوان (قالە شێت) و (پ.م) کان و خەڵکی دێ؟ چەند کارەساتێکی گەورەیە کاتێک بڕیاری شەڕکردنی وڵاتێک دەکەوێتە دەست یەک تاکە کەس و بەس؟ ئا لەم چرکە مەرگەساتەدا بێواتایی و بێهودەیی ئەم شیعرەم هاتەوە یاد کە کاتی خۆی لە شاردا لەبەرم کردبو:

**تەنیا لە لولەی چەکەوە ئازادی چاوی هەڵدێنێ**

**حەق بانگ دەدات،داگیرکەر ملی کەچ دەکات**

پەسن دان و پیاهەڵدانی خەباتی چەکداری بە شیعر و چیرۆک و ڕۆمان، ئەوانە کردویانە کە خۆیان شەڕیان نەدیوە. هاندان و دنەدان بۆ جەنگەکان بە گشتی و جەنگی شۆڕشگێڕی بەتایبەتی، بە خوێندنەوەی وتاری پڕ جۆش و خرۆش، بێ بەشداریی هاندەر و دنەدەر خۆی لە و جەنگەدا، بێڕەوشتی و تاوانە. کاتێک شیعری ئاگرین لە گەروی ژێر کەرەڤاتەی سوری شاعیرێک بەرزدەبێتەوە کە خۆی هەرگیز نەچۆتە شەڕەوە و شەڕی نەدیوە، وا باشترە گوێی لێنەگریت. کاتێک سەرکردەیەکی سیاسی یا ئاینی لە بەردەم گوێگرانی دڵ جۆش و خرۆش سەندو، بە دەنگێکی پاراو و بەرز داوای چەک هەڵگرتن دەکات بۆ بەرگری لە خاک وخەڵک و ئاین، هەستە سەرپێ لێی و پێی بڵێ ئامادەیت خۆت و منداڵەکانت و کەسە نزیکەکانت بەشداربن لەو شەڕە موقەدەسەدا؟

ئەی سەرباز، ئەی پێشمەرگە، ئەی جیهادی، ئەی پاسدار! دە ئیتر گوێمەگرە لە هەمو ئەو بەیت و باڵورە سیاسی و ئاینیانەی حەماست هەڵدەسێنن، باڵت پێدەگرن و دەتفڕێنن. دڵنیابە پاش فڕینێکی کەم زرم دەکەویتە خوارەوە بۆ سەر زەویی ڕەق و تەقی ڕاستیە تاڵ و بێ بەزەییەکان، ئەوسا ئیتر درەنگە و پەشیمانی دادت نادا. بە بێهۆشی و برینداری کەوتویت وخوێنت لێ دەچۆڕێ، بەڵام مامۆستاکانی دوێنێت یان هەر نەهاتون و لەم شەڕەدا لەگەڵت نەبون یا هەرزو بەجێیان هێشتویت و بەدوای خۆشیی خۆیان و ماڵ و منداڵیانن. پاش بە ئاگاهاتنەوە و کەمبونەوەی ئێشەکانت، ئەگەر شانست هەبو و بەئاگا هاتیتەوە ! کاتێ دەکەویتە بڕێک بیرکردنەوە و ڕامان، ئینجا بۆت دەردەکەوێ: کاتێک سۆزە هەڵچوەکان بون بە ئاغا بەسەر عەقڵ و بیرکردنەوەی مەنتیقیدا، چ کارەساتێک دەخولقێنن، کە عاتیفە و هزر و خەیاڵی

پوچی بێ بنەما بون بە ئاغای بڕیاردەر لە جیهانی سیاسەت و شەڕ و بەڕێوەبردن و دەوڵەتداری، چی دۆزەخێک بەرهەم دەهێنن لە سەر زەوی! لە خوارەوە، لە سەر زەوی، شەڕ و ڕوداوە توندوتیژەکان شتێکی ترن و تام و چێژێکی تریان هەیە!

## «جەناب! سەردەشت خۆشە یا بەهەشت؟»

لە سەر ئەم بابەتە، ئەم چیرۆکەم بیستوە: لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٣، چەند ڕۆژێ پیش ئەوەی ئەمریکا بنکە سەربازیەکانی ئیسلامیەکان لە شاخەکانی هەورامان بداتە بەر ساروخ، عەلی باپیری ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی خۆی قوتاردەکات و لە شاری سەردەشت، دور دور لە ئاگر و ئاسنی بێئامانی ڕۆکێتەکانی ئەمریکا، خۆی مەلاس دەدات و چاوەڕیی دۆخەکە دەکات. چەندین (پ.م) ی داماوی کۆمەڵ لە ڕۆکێتبارانەکەدا بریندار و شەهید دەبن.

شەڕ دەوەستێت و ئەمیریش دەگەڕێتەوە بۆ لای موریدەکانی. کۆبونەوەیەک بۆ ئەمیر و خزم و کەسی برینداران و شەهیدانی کۆمەڵ سازدەکرێت. دوای ئەوەی ئەمیر وشە سواو و باوەکان و هەزارجار وتراوەکان دەئاخنێتە گوێی دڵبرینداران و کۆسکەوتوانی ساروخبارانەکە، یەکێکی کوڕکوژراو بەو ساروخانە، لە ئەمیر دەپرسێت: جەنابی مامۆستا! بۆ لەگەڵ پێشمەرگەکانت نەمایتەوە، ئەوپەڕەکەی تۆش بەر ئاگری ساروخێک دەکەوتیت و شەهید دەبویت و دەچویتە بەهەشت، بۆ چویت بۆ سەردەشت؟ سەردەشت خوشە یا بەهەشت؟

## لە کوێوە هەڵی تیزاندبو ؟

بڕوام بە چاوەکانم نەکرد و بەدەس هەردوکیانم هەڵگلۆفی، ئای خۆ ئەوە ڕاستە! ئێ خۆ ئێرە شەقامی)وەلیعەسر (ی تاران نیە؟ لە پێینی ئاواییەوە پاسدارێکی هەرزەکار تفەنگێکی ژێسێ ی (G٣) لە شاندابو ماتۆڕێکی سوکەڵەی دەئاژوت، لە ئاستماندا وەستا و بە فارسی لێی پرسین: ئەرێ (کەربەلا و نەجەف) چەند لێرەوە دورن؟ ئەم پرسیارە سەیرەی ئەم چەکدارە داگیر(کەرە) ی کە نازانم لە کوێوە هەڵیتیزاندبو بۆ پارەزان، ئەوەندەی تر تاساندمی. ئینجا دونیا غەمبارەکەی ناو ڕۆحم تورەبونیشی هاتە سەر، تیری ژەهراویی مۆرەیەکم گرتە پاسدارەکە و بێوەلام جێمهێشت، ئیتر هەرگیز نەمبینیەوە!

## غاندییەك لە پارەزان!

ئێمە بەرەو لای سەروی ئاوایی بە ئاراستەی دەنگی گریانەکە ملمان نا. ئەم لاوانەوە (جەرگ و دڵ تاوێن) ە لە گەروی (نەنە ئایش) ە وە دەهاتەدەر و وەک دوکەڵێکی خۆڵەمێشی بۆ بەرزایی ئاسمان بەرزدەبۆوە. (نەنە ئایش) دایکی (رەحمانی حاجی رەسوڵی بەرکێوی پێنجوێنی) بو، رەحمان کوری تاقانەی بو. من جگە لە مرواریی چەند فرمێسکێکی بەکوڵ کە بەسەریدا باراندم، هیچی ترم بۆ نەکرا. رەحمان پیش نزیکەی سەعاتیک مالاوایی ئەبەدیی لەم بەناوژیانە کردبو. (نەنە ئایش) پیرێژنێکی پرچ سپیی ئاغروسەنگینی کورتەبالابو، پێشتر زۆر یەکترمان بینیبو، برێک دڵنەواییمان کرد و هاوغەمیی خۆمانمان بۆ دەربری و جێمانهێشتن. رەحمان (پ.م) یەکی تەمەن بیست ودو سال بو، جامانەیەکی باریکی دەبەست، تەنکە ریشێکی کاڵی قەڵەمیی باریکی هەبو. لە لاوازی و بالای کورت و ئارامی و بێوەییدا رەحمان لە (غاندی) دەچو. (رە حمان) چەند رۆژێک پێش شەهیدبونی بوکیاُن بۆ هێنا بوە (پارەزان)، بەناکامی بوکەکەی جێهێشت، بوکێکی ناکامی ترلەم کوردوستانە زیادی کرد. ئێستا گۆرانی شاعیر لە کوێ بێنم، چامەیەکی نوێ بە ناوی (زاوایەکی ناکام) بهۆنێتەوە، لە چامەی (بوکێکی ناکام) کەی بەکوڵتر و بەجۆشتر!

«لە بەردەرگای چاوی رەشا بلەرزێ و بڵێ: دەستی زۆردار سەد سەر ئەکا، ناگاتە دڵێ»

## گەورەم دو ساروخم پێماوە، فەرمانت بە چیە ؟

لە تەنگانە و چرکە چارەنوس سازەکانا، توانا مت وشاراوەکانی مرۆڤ، وەک توانای جەستەیی و ئۆقرەگرتن و خۆراگرتن، بەرامبەر ئازارە جەستەیی و دەرونیەکان دەژیێنەوە و دەکەونە چالاکی لە دژی مردن و لە پێناوی مانەوە. ئەم توانایانە کاری سەیر و سەرسورهێن ئەنجام دەدەن، رۆح شیرینە، شیرین! (پ.م) (هیوا) لە گوندی (گوێزەرەشە) کە نزیکەی بیست خولەک لە پارەزانەوە دورە، پارچەی هاوەن دەستی چەپی پەراندبو، بەراکردن بە دەستی براو و چۆراوگەی خوێنەوە خۆی گەیاندبوە پارەزان و چاوەرێی ئێمەی دەکرد. (ئەکرەم ئیبراهیم پێنجوێنی) ی فەرماندەی کەرتیش چاوەرێی ئێمەی دەکرد، پارچەی هاوەن نیوەی لوتی پەراندبو. بە پێی توانا دەستوبرد برینەکانی هەردوکیانمان تیمارکرد و دوریەوە، دەرمانی ئازارکوژ و دژە بەکتریامان پێدان.

ئیتر کاتی نانخواردنێکی بەپەلە بو. نان و گوێز و شۆکە (دۆشاوی سەر گەلای داربەڕو) و شەکر و چامان لە ماڵێکی چۆڵکراو دۆزیەوە، هەمومان پێکەوە خۆمان تێرکرد و چاییمان خـواردەوە. پاشان بە خۆمان و دو بریندارەکەوە سـواری شۆفرلێتەکە بوین و بەرەو حاجی مامەند بەڕێکەوتین. لە سەر ئەم ڕوداوەی پارەزان، لێپرسراوی دەسگای بێتەلی (ڕاکـال) (نەریمانی حاجی عەزیز) ئەمەی گێڕایەوە: «یەکێک لە هێلیکۆپتەرە جەنگیەکانی سەدام بەسەر ئاسمانی گوێزەڕەش و پارەزانەوە بو، لە بێتەلەکەمەوە گوێم لێبو یەکێک بە ئەفسەرەکەی سەرو خۆی وت: گەورەم دو ساروخم پێماوە ولەم گوندە خەڵک دەبینم، فەرمانت بە چیە؟ ئەفسەرە باڵاکەی ئاغای پێی وت لێیان بدە «.هەر لە ناو دیدا ساروخ سەری شۆفێرێکی تراکتۆری پەڕاندبو، ئەو هاتبو کەلوپەلی ماڵێکی پارەزانی بگوازێتەوە بۆ ناڵپارێزی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم.

## نەمانزانی چیان بەسەرهات!

خوێنەری بەڕیز ڕاوەستە، هێشتا ماویەتی لە کوێتە! ئێمەی بێئاگا شتێکی سەیر و مەترسیداری تر لە مەلاسدایە بومان! نزیکەی ٥٠٠ مەترێک پارەزان مان جێهێشتبو، کاک جەمال هاواری کردە شۆفێرەکەمان کە دەسبەجێ ستۆپ بگرێت: «کوڕی خوا نایان بینی ! ئەها ئەها ئەو سەربازە پیادانە بە چەکەوە بەرەوڕومان دێن!». ئوتۆمبیل وەستا، من کە لای دەرگاکەوە لە پێشەوە سواربوبوم بە کەمێک شڵەژانەوە دەستوبرد دابەزیم، کاک جەمال و شۆفێرەکە ش بەدوای مندا دابەزین، دو (پ.م) بریندارەکان وستاریش بە پەلە دابەزین. تومەز ئەم دەستە سەربازە لەو سەربازە عێراقییانەن کە لەوبەری چەمی ناڵپارێزەوە بەرامبەر هێرشی ئێرانیەکان شکابون، بەرەودواوە کشابونەوە و لە چەمەکە بۆ بەری ئێمە پەڕیبونەوە. کاتێک بە ئوتۆمبیلی سەربازی و جلی کوردیەوە ئێمەیان بە چەکەوە بینی، زۆر ترسان و سڵەمینەوە، هەر ئەوەیان پێکرا پشتمان تێبکەن و بەرەو دواوە بۆ ئەو شوێنە بگەڕێنەوە کە لێیهاتبون. دیاربو وایـان زانیبو ئێمە جاشی کوردین وتەقە لەو سەربازانە دەکەین کە بـەرەی شەڕ جێدێڵن و لە سوپا هەڵدێن. ئەز لەو ساتە ئەستەمەدا خۆبەخۆ لەخۆڕا، بێ ئەوەی میلی کلاشینکۆفەکەم بینمەوە بۆ ئامادەیی تەقەکردن، بێ ئەوەی لولەی تفەنگەکەم بکەمە ئـەوان، کلاشینکۆفەکەم لە تەنیشتەوە بە دەستەوە گرتبو، چەند هەنگاوێک بەدوای سەربازەکانا ڕامکرد و بە عەرەبی هاوار و تکام لێکردن: ڕانەکەن، لە جێی

خۆتان ڕاوەستن و خۆتان بدەن بەدەستەوە، ئێمە (پ.م) ی یەکێتین، هیچتان لێناکەین. بە عەرەبی هاوارم کرد بە دوایاندا «نحن پیشمەرگه الاتحاد الوطني الكوردوستاني، نحن اخوانكم، لاتخافو، سلموا انفسكم». ئا لەم شوێنکاتە هەستیارەدا، کاک جەمال کە ئەزمونی سەربازیی گەلێک زۆربو، بەدوامدا ڕایکرد و لە دواوە توند پەلی گرتم و ڕایکێشام بۆ دواوە، برێک بە ڕەقی و توڕەیی فەرماندەیەکی سەربازیی پیشەیی، پێی وتم: «کوڕی خوا دوکتۆر ئەوە تۆ خەریکی چییت؟ دەڵێی لە سەر جادەی قیریت و قسە وباس لەگەڵ هاوڕێی نزیکتا ئەکەیت، مەگەر دورە هەر ئێستا سەربازەکان لێمان هەڵگەڕێنەوە و چەند ڕیزە گولەیەک بکەن بە ناوماندا، مەگەر دورە پێشتر چەند کەسێکیان لەسەر ڕێگاکە دامەزراندبێت بۆ پاراستن و چاودێریی ئەمانەی پێشەوە؟».

بەڕاستی من ئینجا هەستم کرد بە مەترسیی هەڵوێستەکە و بەئاگاهاتمەوە چی هەڵەیەکی سەربازیم کردوە! بەهەرحاڵ نە ئێمە تەقەمان لەوان کرد نە ئەوان لە ئێمە. ئێستاش نەمانزانی ئەو سەربازانە چیان بەسەرهات! لەمەشیاندا من هەر شانسم هەبو بەوەی نە تەقەم لێکرا، نەبومە بینەر یا تەنانەت بکەری شەڕ و خوێنڕێژی!

## لە بری ماسی، سەربازی برسی!

دواتر کە گەیشتینەوە حاجی مامەند، (پ.م)ی دێرین (عومەری قادر گۆڵباخی بەرزنجەیی) لەگەڵ چەند (پ.م) یەکی تر تازە لە شوێنی شەڕەکە گەڕابونەوە وچەند سەربازێکی عەرەبیان بەدیل گرتبو. کاک عومەر بە لاقرتی و گاڵتەوە پێی وتم: «د.هەژار ئەگەر لە بەری خۆمانەوە لە سەر چەمی ناڵپارێز ڕاوەستاینایە و نانمان بکردایە بە قولاپەوە و فرێماندایە ناو ئاوەکە، لەبری ماسیی برسی سەربازی عێراقیی برسیی پێوە دەبو! ئەو سەربازانەی بە دیل گرتومانن دەڵێن سێ ڕۆژە پارویەک نانمان نەخواردوە!». بە ڕاستی ئێمە کە لە (حاجی مامەند) وە بەرە و (پاڕەزان) کەوتینە ڕێ بیرمان تەنیا لەوە دەکردەوە چۆن هەرچی زوترە خۆمان بگەیەنینە بریندارەکان و ڕزگاریان بکەین، بیرمان لە خۆمان نەدەکردەوە ئەی لەم چالاکیەدا خۆمان چیمان بەسەر دێت ؟ بێئاگابوین لەوەی چی چاوەڕێی دەکردین و کام مەترسی لە مەلاسدا بو بۆمان. ئاوایە ژیان، ژیان بەستراوەتەوە بە تاڵە دەزویەکەوە، کەی بچڕا دەبچڕێ و تەواو!

## هەنگوین پەیوەندیی چیە بە گوێدرێژەوە؟

وەک هەمو حیزبەکانی تری کوردوستان، یەکێتی بنەمای وتووێژ و ڕێکەوتنیان لەگەڵ ڕژێمی سەدام بۆ بەدەستهێنانی داخوازی و مافەکانی کورد ڕەفز نەدەکرد، بەڵام بۆ یەکێتی وتووێژ برێک قورستر بو، چونکە یەکێتی هەر لە سەرەتاوە دروشمی بە عیراقیکردنی شۆڕش و ڕوخانی ڕژێمی سەدامی بەرزکردبۆوە. پێش دەسپێکردنی فەرمیی وتووێژ، لە ناوچەی قەرەداخ ئەندامێکی سەرکردایەتیی کۆمەڵە کۆبونەوەیەکی فراوان بە (پ.م) و کادیرەکانی کۆمەڵە دەکات لە ناوچەکە، بابەتی کۆبونەوەکە مەسەلەی وتووێژ دەبێت لەگەڵ ڕژێم، کە دەنگۆکەی بلاوبوبۆوە. (عەلە ڕەش) یەکێک بو لە کۆنترین و بەئەزمونترین (پ.م) کانی ناوچەی دەربەندیخان وقەرەداغ. مامە عەلە لە سەردەمی ڕژێمی مەلیکیەوە چوبوە ناو حیزبی شیوعی، دواتر کە شۆڕشی ئەیلول دەستی پێکرد ئەو بو بە (پ.م) ی حیزبی شیوعی. پاشان کە حیزبی شیوعی دەچێتە بەرەوە لەگەڵ حیزبی بەعس و لە بەهاری ١٩٧٤ دا چەکدارەکانی لە شاخی زمناکۆ و گولان شانبەشانی سوپای عێراق دەکەونە شەڕ دژی (پ.م)ی شۆڕشی ئەیلول، ئیتر ئەم وەک هەڵوێستی نارازیبونی خۆی واز لە حیزبی شیوعیی دێنێ. دوای ئاشبەتاڵ (عەلە ڕەش) دەبێتە کۆمەڵە و (پ.م) ی یەکێتی. لەو کۆبونەوەیەدا لە پایزی ١٩٨٣دەربارەی مفاوەزات لەگەڵ سەدام، (عەلە ڕەش) هەڵدەستێتە سەرپێ و ڕودەکاتە بەشداربوان و بەم جۆرە ڕای خۆی لەسەر وتووێژ لەگەڵ ڕژێمی سەدام دەردەبڕێ: «..... کوڕینە هەر کاتێ بینیتان هەنگوین لە قوونی (کۆم) ی گوێدرێژ (کەر) دەربهێنرێت، ئەوکاتە باوەڕ بە سەدام و بەعس دەکەم مافی کورد بدات!».

## گواستنەوەی مەڵبەند و نەخۆشخانە

سوپای تاوانکار و بەزیوی عێراق لە بەرەکانی شەڕ بەرامبەر هێرشی ئێران پاشەکشەی گەورەی دەکرد. بۆ تێکدانی بارودۆخی ناوچەکەمان، ناوبەناو بە شەو و بەڕۆژ، لە کاتی جیاجیادا و بە شێوەیەکی ڕەمەکی چەند تۆپ و هاوەنێکیان دەنا بە دەوروپشتی دێکانی ژێر دەسەلاتی (پ.م) وە بۆ ئەوەی و بێزارمان بکەن و بەردەوام لە نیگەرانی و ترسدا بژین. لە پایزی ١٩٨٣ورده ورده بە هۆی چڕتربونی تۆپبارانی سوپای عێراقەوە حاجی مامەند و گوندەکانی تر ناچاربون زێدی هەزاران ساڵەیان بە ئێش و حەسرەتەوە بەرەو شارەکان بەجێ بهێڵن. مەڵبەندی یەک کە بەکری حاجی سەفەر کرابو بە بەرپرسیاری، گوازرایەوە بۆ دێی شوکێ، ئێمەش نەخۆشخانەکەمان لە حاجی مامەندەوە گواستەوە بۆ دێی (کانی دڕکە) کە دوسێ

کیلۆمەتر خـوار (شوکێ) یـە. منیش لە دێی (شوکێ) شێخ ئەحمەد بە سینگێکی فراوان و بەخشندەییەوە دیوەخانەکەی خۆی پێدام تا لەگەڵ (پەیمان) تێیدا بژین. بە دراوسێیەتیی حاکم سەرداری هاوخەباتم و خێزانەکەی دوسێ مانگێک ژیانێکی سادە و ئارامیمان لە شوکێ بەسەربرد. نەدەکرا ناوچەکە بەتەواوی لە (پ.م) چۆڵ بکرێت، بۆیە سەرتیپی مەلبەندی یەک (فەرەیدون حەمە سالح) و ئەو نزیکەی بیست (پ.م) یەی لەگەڵیدابون، لەگەڵ کەرتەکەی (فەرەج وەندەرێنەیی) لە ناو دێ مانەوە. لەبەر ئەو پێشمەرگانە دەبو بەردەوام پزیشکێک یا کارمەندێکی پزیشکی لە ناودێ بمێنێتەوە، ئەم مانەوەیەمان کردە سەرە، بە تیروپشک من بوم بە یەکەم کەس لەو سەرەیەدا و چەند ڕۆژێک مامەوە، دوای من سەرەی د.کامل بو، دوای د.کامل، لە دواهەفتەی مانگی ١١ ی ١٩٨٣سەرەی هیوای خوشکەزام بو لە حاجی مامەند بمێنێتەوە.

## وەفای ئینسان

(پ.م) ی بریندار(ئاسۆ) لە نەخۆشخانەکەمان خەواندبو، ئاسۆ هەردو قاچی لە چالاکیەکی پێشمەرگانەی سەرکەوتودا بریندار و شکابون و لە گەچمان گرتبون. کە تۆپبارانی ڕژێم لە حاجی مامەند نزیک بۆوە (ئاسۆ) دەترسا ڕژێم هێرش بکاتە سەر حاجی مامەند و بیگرێ و ئەمیش بە دیلی بکەوێتە دەستیان، یا ببێت بە خۆراکی تۆپێک. ترس و نیگەرانییەکەی لە جێی خۆیدا بو، بۆیە من لەگەڵ د.شاخەوان و هاوڕێکانی ترمدا بە خاکەناز کەوتینە پاککردنەوەی گەوری ژێر ژوری نەخۆشخانەکە. دو ڕۆژ لە تاو تۆپباران بەیانیان ئاسۆمان دەهێنایە ناو گەوڕەکە بۆ پاراستنی لە ئاگری تۆپارانی ناودێ، خۆیشمان هەر لە دەوروبەری بوین ولێی دورنەدەکەوتینەوە. ئاسۆ مان دڵنیا دەکردەوە ئەگەر رژێم هێرش بۆ ناودێ بکات، کاک فەرەیدون و(پ.م) کانی، لەگەڵ من و د.شاخەوان و هیوا و دوکتور قادر(کە سەرو کلاشکۆفێک و شەش مەخزەنی سی فیشەکی مان پێبو) جێی ناهێڵین و بەرگریی تەواو دەکەین و چارەنوسی ئەویش بە هی ئێمەوە گرێدراوە. سێهەم ڕۆژی تۆپبارانە چڕەکە ئاسۆمان لەگەڵ دو (پ.م) بە سواری ئێسترێک بە ملەی سێیەردا ناردە چنگیان و لەو ئاگربارانەمان دورخستەوە. دوای ٢٢ ساڵ، ساڵی ٢٠٠٦ بو لە ئەڵمانیا وە بەسەردان گەڕابومەوە، لەماڵەکەی دایکم لەگەڵ چەند میوانێکدا دانیشتبوم. پیاوێک لەگەڵ دو کوڕە هەرزەکارەکەیدا کە هەریەکەیان سینیەکی گەورەی برمە و پاقلاوەی بەدەستەوە بو، بەگەرم و گوڕی

و ڕوی خۆشەوە خۆیان کرد بە ژورا. پیاوەکە هەمان ئەو (ئاسۆ) یە بو، (پ.م) قاچشکاوەکەی حاجیمامەند بو.هەر نازانم چۆن منیان دۆزیبۆوە لە ماڵێکی بچوکدا لە گەڕەکی (بەختیاری)، ئاوایە وەفا و پێزانینی ئینسانی کورد ! ئاسۆ و کوڕەکانی ئێستا دوکانی پاقلاوەخانەیان دانابو، وەک سوپاسگوزاری و پێناساندنی من بە کوڕەکانی و هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانیش باشتر لە بەسەرهاتی پێشمەرگایەتیی باوکیان تێبگەن، ئاوا ئێستا ئاسۆ بەم دیاریە خنجیلانەیە شەوەکەمان شیرین دەکات. بەدەم خواردنی پاقلاوە و خوارنەوەی چایی برێک یادی ئەو ڕۆژانەی حاجیمامەند مان کردەوە، پێکەوە چیرۆک و بەسەرهاتەکانمان گێڕایەوە، ئینجا ماڵاواییان لێکردین.

## خەتای خەڵکە؟

من هەتا ئێستاش، دوای چل ساڵ، زۆرجار هەڵوێستی هاوشێوەی ئاسۆم دێتە ڕێ، هەڵوێستی وەفا و جوامێریی خەڵکی لادێکان و ئەو پێشمەرگانەی لە کاتی خەباتدا یەکترمان ناسیوە و من وەک پزیشک هاوکاریم کردون. هەتا ئێستا من یەک بێوەفایی و بێڕێزیم لە یەک کوردەوە نەبینیوە کە چاکەم لەگەڵ کردبێت. بە پێچەوانەوە، بەرامبەر کارە باشەکانم هەمیشە پاداشتی شتی یا ناشتی (مەعنەوی) یان پێشکەش کردوم: چەپکێ گوڵ، تۆپێک کەرەی خۆماڵی، چەند هێلکەیەکی مریشکە ڕەشەی کوردی، جامێک ماستی کوردی، سوپاسێکی هەڵقوڵاو لە دڵ و دەرون، ماچ و موچێکی ڕاستگۆیانە، لە ئامێزگرتنێکی گەرم و گوڕ، بانگێشتنێکی شاهانە، تەلەفونێک، هەواڵپرسینێکی گەرم و گوری ڕاستگۆیانەی بێ مەبەست. هەمو ئینسانێک خاوەن شکۆ و کەرامەتە. لە زۆرینەی ئینسانەکاندا لایەنی باشە و چاکە و مرۆڤدۆستی بەهێزترە لە لایەنی خراپە و ڕق و دوژمنکاری. ئەوە سیستمی حوکم و دۆخی ژیانی تاکەکان و ڕەفتاری سەرکردەی بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵە کە بڕیاردەدات لەوەی ئایا لایەنی باشە یا خراپە زاڵ دەبێت بەسەر ڕەفتاری تاکەکانی کۆمەڵدا. دەسەڵاتداری دڵنەرم و سەنگین، فەرمانڕەوای دادپەروەر و بەویژدان و ئاشتیخواز و ڕۆشنبیر: گەل و نەتەوەی باش و پێشکەوتو بەرهەم دێنێ. سەرۆک و سەرکردەگەلی ناپاک و دز و نادادپەروە و ڕقاوی و بێبەزەیی، گەل و نەتەوەیەکت بۆ بەرهەم دێنێ تژی ولێوانلێوله توندوتیژی و ڕق و ئاژاوە و نائاسودەیی. خەڵک وەک ماسی وایە لە کەلەسەرەوە بۆگەن دەکات!

## تەنیا قازی محەمەد !

ئەو ڕاوبۆچونە چەند ناڕاستە و چەند نازانستیە، چەند ناڕەوا و چەند سوکایەتی پێکردنی گەلەکەمانە، کە هۆی سەرەکیی ئەو شکست و کارەساتانەی بە سەر کورد دا هاتوە، دەیگێڕیتەوە بۆ کۆمەلانی خەلک، نەک بۆ هەلە و بێتوانایی و نادلسۆزی و خۆپەرستیی زۆربەی سەرکردەکانی کورد جگە لە پێشەوا (قازی محەمەد). پێشەوا لە ویژدانی نەتەوەی کورد دا بۆ هەتا هەتایە وەک نمونەیەکی بالا لە ڕەوشتی بەرز ولە هاوسەنگی و لە خۆنەویستی بە نەمری دەمێنێتەوە، بۆچی؟ چونکە ئەو دەیتوانی وەک مستەفا بارزانی گەلەکە ی جێبهێلێ و ژیانی خۆی وەک بەنرخترین سەرمایەی ئینسان بە ڕاکردن و پەنابردن بۆ یەکێتیی سۆڤیت ڕزگار بکات، بەلام نەیکرد. لە لاپەرە ٢٠١ ی کتێبی (کۆماری دیموکراتی کوردوستان، ١١ مانگ و ٢٠ ڕۆژ بەختەوەری) هاتوە: « قازی محەمەد و سەدری قازی بڕوایان وابو کە بەرگری بکەن و نەهێلن ئەرتەش بگاتە ناوچەی ژێر دەسەلاتی کۆمار، بەلام زۆربەی سەرۆک عەشیرەتەکان لە لایەک و مەلا حوسێنی مەجدی و مەلا عەبدولای مودەریسی بەرگریکردنیان بە بێکەلک شیکردەوە». پێشەوا بە ئومێدێکی کەمەوە هەولیدا لە ڕێگەی وتووێژەوە خۆی و گەلەکەی بەکەمترین زیان دەربازیان بێت و لە سزای شای ستەمگەر ڕزگاریان بێت، بەلام ڕژێمی ئێرانی داگیرکەر درۆزن و پەیمانشکێن و بێبەزەیی بو. پیشەوا کە هەولەکەی شکستی هێنا و لە بری وتووێژ دەستگیریان کرد، ئەو خۆی کرد بە قوربانی خەلکەکە و لە بری ئەوان هەمو سزای دامەزراندنی (کۆماری مهاباد)ی خستە ئەستۆی خۆی و بەمە گەلەکەی لە تولە و سزای بەکۆمەلی ڕژێمی شای ئێران ڕزگارکرد.

## کلافەیەکی ئالۆزی هۆ جۆراوجۆرەکان

هۆکانی تری شکستی شۆڕشەکانی کورد زۆرن و ئالۆزن، وەک هۆ جوگرافی و مێژویی و ناوچەیی و نێونەتەوەییەکان کە زۆربەی کات نەباش و نالەبار و دژی کورد بون . ئەو نەتەوانەی لە گەل کورد دا دەژین خۆیان بەدەست دواکەوتویی خۆیان و بەدەست ڕابەر و سەرکردە نادیموکرات و چەوسێنەرەکانی خۆیان گیریان خواردوە، ئیتر دەبێت بەرامبەر کورد چۆن بن؟ ئەگەر لە بری عەرەب و فارس و تورک و ئازەر، نەتەوەی کورد لەگەل گەلی سوید ی و پۆلۆنی و چیکی و ئەلمانی دا بژیایە، ئایا ئەو هەموە نەهامەتییەی بەسەردا دەهات؟ ئایا ئاوا بێ ماف دەکرا؟

باشه خراپی و نەزانی و دواکەوتویی گەلی ئەڵمان بو هیتلەری هێنایە سەر حوکم؟ ئایا (هیتلەر) و حیزبی نازی شایستەی گەلی ئەڵمان بون؟ یا کلافەی ئاڵۆزی دەیان هۆی ئابوری و سیاسی و کۆمەلایەتی و مێژویی و نێونەتەوەیی، هەروەها کەسێتیی (هیتلەر) خۆی، ئەمانە هەموی پێکەوە (هیتلەر) یان هێنایە سەر حوکم . ئەو قسانە چەند بێتام و سواو و ڕەشبینن کە دەڵێن: «هەموی خەتای میللەتە» و گوایە «ئێمەی کورد شایستەی ئەم دۆخە خراپەین و ئەم جۆرە سەرکردە خراپانەین»، یا « کورد خۆخۆرە و نابێت بە هیچ»، یا «ئینسانی کورد مەڕی ناو مێگەلی بێ ئیرادەیە و سەرکردەکان بۆ کوێ بیانەوێ دەیبەن». ئایا گەلەکەمان لە باشوری کوردوستان، لە خۆشگوزەرانی و لە کەش و هەوایەکی دیموکراتی دا؟ لە هەڵبژاردنێکی پاک و بێگەرد و ئازاد دا ؟ ئایا بێ دەستێوەدانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی پارتی و یەکێتی و ئێران و تورکیا ؟ ئەم حیزب و سەرکردانەی ئێستای دەسەلاتی کوردیی هەڵبژاردوە؟ خاوەنی ئەم جۆرە بۆچونە خراپانە لە سەر ئینسانی تاکی کورد و لە سەر نەتەوەی کورد چوار جۆرن، جۆری یەکەم: خودی ئەو سەرکردە سیاسیە سەرنەکەوتوانەی کوردن کە ئۆباڵی شکستەکەیان دەگێڕنەوە بۆ خەڵک نەک بۆ خۆپەرستی و ناشایستەیی و ورەبەردانی خۆیان. جۆری دوهەم: ئەو کەسانەن، بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە توێژی ڕۆشنبیر و خاوەن بڕوانامەن کە خۆیان بە کردار بەشدار نەبون لە خەباتی کوردایەتیدا، ئینجا نەزانی و خراپیی خەڵک دەکەنە پاساو و هۆی بەشدارنەکردنیان لەو خەباتەدا. جۆری سێهەم: هۆی دەرونیی تایبەت بە کەسێتیی ئەو کەسانەیە، بۆ نمونە هەندێ کەس هەر لە بنەڕەتدا بڕوای بە خزمەتکردنی خەڵک و نیشتمان نیە و هەر بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی خۆی دەژی، هەندێ کەسی تر هەن ڕقیان لە خۆیشیانە ئیتر چۆن دەتوانن خەڵکیان خۆشبوێت، ئەمانیش وەک جۆرەکانی تر پێویستیان بە پاساوە بێتامەکانی سوکایەتیکردن بە کۆمەلانی خەڵکی کوردوستان هەیە. جۆری چوارەم: ئەو کەسانەن کە خۆیان یا کەسی نزیکیان خەباتی پاک و دڵسۆزانەیان کردوە و قوربانیان داوە، بەلام کە ئێستا ئەنجامەکەی دەبینن چۆن دەسەلاتێکی نادادپەروەر بە ناوی کوردایەتیەوە و بە زۆری چەک و پارە گەلەکەمانی برسی و زەلیل کردوە، ئەم دۆخە تالە وا نائومێدی کردون کە لە بری ئەوەی بڕوایان بە زۆرینەی سەرکردەکان نەمێنێ بڕوایان هەر بە ئینسانی کورد نەماوە.

## دو نمونە لە هەزاران

فەرمون من دو نمونەتان لە هەڵویستی ئینسانی کورد بۆ دەهێنمەوە، خوێنەری بەڕیز دڵنیام ئەم دو کەسە دەیان کەسی هاوشێوەیان بیری تۆ دەخاتەوە لە دڵسۆزی و پاکی و جوامێری لە خەباتیاندا، کە لەوانەیە ئەو کەسە خزمی نزیکی، هەر زۆر نزیکی تۆ بێت، یان تەنانەت خۆت بیت! کەواتە زۆرینەی ئەو سەربازە گومناوانەی خەباتیان بۆ ئازادیی کورد و بۆ ڕزگاریی کوردوستان کردوە بە پاکی و دڵسۆزی کردویانە. بێگومان وەک لە خەباتی هەمو گەلانی تردا، لە کوردیشدا کەمینەیەک هەبوە و هەیە و هەر دەشمێنێ، کە بە پلەی جیاواز لەگەڵ خەباتی گەلەکەیاندا نەبون و هەر بۆ خۆیان و کەسە نزیکەکانیان ژیاون و مردون.

## فەرەج وەندەرێنەیی

لە دۆزەخی ئەو ساڵە بەدفەرەدا و پێش ڕاگەیاندنی ڕەسمیی شەڕوەستان ی نێوان یەکێتی و ڕژێمی سەدام لە ڕۆژی ٢ ی ١٢ ی ١٩٨٣، لە کاتێکدا یەکێتی و ڕژێم بە ناوبژیوانیی سەرۆکی (حدکا) عەبدولرەحمان قاسملۆ لە وتووێژی نهێنیدابون و لە حاڵەتی شەڕوەستان دا بون، لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٨ ی ١١ی ١٩٨٣، لە تاریک و لێڵی بەیانیی ئەو ڕۆژەدا هێزێکی ڕژێم دزەیان کردە ناو دێی حاجی مامەندی چۆڵکراو و هێرشیان کردە سەر ئەو تەنیا بنکەیەی کە هێشتا لە ناو دێدا مابۆوە. فەرماندەی کەرت (پ.م) ی جوامێر و خۆنەویست (فەرەج وەندەرێنەیی) کە لێپرسراوی (پ.م) کان بو، وەک باوکێکی دڵسۆز و بە پەرۆش و میهرەبان بۆ جگەرگۆشەکانی، یەک بە یەک (پ.م) کان، کە یەکێک لەوانە هیوای خوشکەزام بو، ڕێنمایی دەکات و بۆ دەرەوی دێ دەربازیان دەکات. کاک فەرەج خۆی وەک دوا (پ.م) لە پشتی دیواری ڕوخاوی ماڵێکەوە بە کلاشکۆفەکەی بەرەنگاری هێرشی سەربازەکان دەبێتەوە، چەند جارێک ڕێژنەی گولە دەکات بەناویاندا، دەیەوێت بەرەو دواوە بکشێتەوە وخۆی دەربازبکات و ناودێ جێبهێڵێ، لە کاتێکدا بە پێوە تەقە لە سەربازەکان دەکات فیشەکێک بەر سنگی دەکەوێت و قورس و قوڵ دەیپێکێ. هیوا دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: «بەکۆڵ و شان بە برینداریی لە ناو دێ دەرمانکرد، بەدوایشمانەوە پێشمەرگەیەکی منداڵکار کە تازە ڕیش و سمێڵ ی دەرکرد بو بەپێوە شەڕی دەکرد و تەقەی دەکرد تاکو ئێمە بتوانین دەربچین، ئەویش (پ. م) ی کەرتەکە ی فەرەج بو، بەداخەوە ناوەکەیم

نایەتەوەبیر، هێندە دەزانم زۆر قارەمان بوو. ئیتر هەرچۆنێک بو کاک فەرەج م بەکۆڵ و بەپێ ی خۆی کێش کرد و لەپەنا بەردێک دامنا. کاک فەرەج وتی دوکتۆر هیوا ئیتر ناتوانم ڕێبکەم وازم لی بهێنە با بمرم. منیش ووتم نا کاک فەرەج گیان ڕزگارت دەکەم، دەتگەێنمە لای دوکتۆر هەژار. ئیتر ئەوەبو بڕی ڕێگەی نەکرد و گیان ی پیرۆز ی خۆی بە کورد و کوردستان بەخشی «. پێشمەرگەیەک لە دەوروپشتی دێ گوێدرێژێکی بۆ پەیدا دەکات و دەیخەنە سەرپشتی گوێدرێژەکە و بەرەو پشتی دێ وهەورازی (سێیەر) مل دەنێن. من لە دێی باراو بوم کە هەواڵی هێرشی سوپای ڕژێمم بیست بۆ سەر حاجی مامەند. دڵم خورپەی کرد بۆ (پ.م)کان ولە ناویاندا بەتایبەتی بۆ هیوای خوشکەزام. لەگەڵ دو (پ.م) دا بۆ چارەسەرکردنی بریندارەکان بە پەلە بەرەو حاجی مامەند بە پێ بەڕێکەوتین. بەداخەوە لە ڕێگا هیوا و دو (پ.م) ی ترمان توشبو بەدوای گوێدرێژێکەوە بون کە جەستەی بێگیان و خڵتانی خوێنی شەهید فەرەجی لەسەر پشتی هەڵگرتبو. ئێمەش چوینە ڕیزی ئەم کاروانە بچوک و کش ومات و مەلولە کە ورد ورد بەرەو وەندەرێنە ملی دەنا. وەندەرێنە شوێنی لەدایکبون و گەورەبونی شەهید فەرەج بو، ژن ومنداڵەکەی و کەس و کاری لەوێ دەژیان. گوندی وەندەرێنە لە دامێنی لوتکەچیای کوڕەکاژاو دایە. وەندەرێنە بوکێکی ڕازاوە و قەشەنگە، تەرزی پرچ و پەرچەمی ڕەزە کانی، گەڵا ی ڕەنگاوڕەنگی پایزانەیان، بە دامێنی چیاکەدا پەخش و بڵاوکردۆتەوە، لێرەولەوێ هێشتا چەند هێشوە ترێیەکیان پێوە ماوە. وائێستا وەندەرێنە ئامادەی لە ئامێزگرتنی شەهیدێکی نازداری تری خۆیەتی، وەندەرێنە جگە لە کاک فەرەج بیست و پێنج شەهیدی تری بە شۆڕشەکانی کوردوستان بەخشیوە. بەڕاستی شەهید فەرەج گیانی خۆی فیدای هاوڕێکانی و مەسەلەی ڕەوا و موقەدەسی گەلەکەی کرد. هیوا، کە پێشتر شەڕی ئاوا نزیک و دەستەویەخەی نەدیبو، بۆی گێرامەوە و وتی: «ئەگەر شەهید فەرەج نەبوایە بەدڵنیاییەوە من و چەند پێشمەرگەیەکی تر شەهید دەبوین». کاک فەرەج! ڕێز و نوازش و کوڕنوش بۆ تۆ و تۆئاساکانی ئەم نەتەوە بەخشندەیە. سەروەرم کاک فەرەج! تۆ زۆر زو جێت هێشتین. بەڵام خۆ تۆ هیچ نەبێ سوێی کیمیابارانی هەڵەبجە نەچو بە دڵە بێگەردەکەتدا. دۆزەخی ئەنفال بۆ هەتاهەتایە نەیکردیتە هاودەمی غەم. لە بەهاری ١٩٩١ دا یەکێک نەبوی لە ناو کۆڕەوی ژێر لێزمەی بارانی دو ملیۆن ئینسانی کورد. ئەژدیهای حەوت سەری شەڕی براکوژیی ساڵانی ١٩٩٤ تا ١٩٩٨ ت نەبینی کە هەزاران ئینسانی کورد بونە خۆراکی. بەڕاست ئێوەی شەهیدانی پێش ئەو

مەرگەساتانە، لە قسنی گۆڕەکانتانەوە، بە زێوانی ڕیش چەرموی هاودەمتانا پرسەی گەرموگوڕ بۆ کەس وکاری جێماوی شەهیدانی ئەو کارەساتانە نا نێرن؟ شەهید فەرەج دوا (پ.م) ی شەهیدی یەکێتی بو لە شەڕی ڕژێمدا پێش ڕاگەیاندنی وتووێژی یەکێتی لەگەڵ ڕژێمی سەدام.

## کاکەبرا بەرزنجی

ڕۆژی ٢١ ی ٣ ی ١٩٨٤ ئاهەنگی جەژنی نەورۆز لە سورداش گێڕدرا، خەڵکێکی زۆر بە تایبەتی لە دۆستان و لایەنگرانی یەکێتی لەو ئاهەنگەدا بەشداریان کرد. خەڵک لە چاوی ورد و گوێی سوکی تەونی بەربڵاوی جاسوسەکانی ڕژێمی سەدام دەترسان، بۆیە بە بیانوی سەیرانکردنی بەهاریەوە هاتبون بۆ بینینی (پ.م) ی یەکێتی و جەلال تاڵەبانیی ڕابەری مێژوییان. خەڵک تامەزرۆی بینینی پیشمەرگە بو، بەتایبەتی بینینی سەردارە سەربازیە خۆشەویست و ئەفسانەییەکانی وەک مامە ڕیشە، حەمە ڕەش، مام ڕۆستەم کەرکوکی و وەهــاب.... سەیرانکەران بەدەم گۆشتبرژاندن و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و خواردنەوەوە گوێشیان لە وتارەکەی جەلال تاڵەبانی دەگرت، جەلال تاڵەبانی لە وتارەکەیدا داوای (ئاشتبونەوەی گشتی) ی کرد لە حیزبە کانی کوردوستان، مەبەستیشی لەوەبو ئەوانیش بێن پێکەوە لەگەڵ یەکێتی بکەونە وتووێژ لە گەڵ ڕژێمی سەدام.

من لەو ڕۆژی نەورۆزەدا لە ماڵەکەم لە (شوکێ) خەریکی کتێب خوێندنەوە بوم، ئەوەندەم زانی جوتیارێکی ڕوتەڵە بە نامەیەکی (ئاسۆی شێخ نوری) یەوە خۆی کرد بە ژورەکەمدا. ئاسۆ لە نامەکەیدا داوای لێکردبوم دەسبەجێ بچم بۆ دێی چنارەی نزیک بەرزنجە بۆ لای (کاکەبرا بەرزنجی) ی فەرماندەی کەرت چونکە لە کاتی پاککردنەوەی ناوچەکە لە لوغمی سوپای عێراقی بە سەختی بە لوغمێک بریندارببوە. تفەنگ و کۆڵەپشتەکەمم دابەشانمدا و لەگەڵ هەڵگری نامەکە بە پیادەڕەوێکی خێرا دوای دو سەعاتێک خۆمان گەیاندە چنارە. بەداخەوە پێش ئەوەی من بگەم کاکەبرا شەهید بوبو. لاشەی بێگیانی لە ناوەڕاستی نوێژگەی مزگەوتەکەدا دانرابو، خەڵکێکی زۆری ناوچەکە کش ومات و غەمبار بە دەوریدا دانیشتبون. خورپە وژانێکی بەسوێ دای لە دڵم، سنگم وەک قەفەزێکی پۆلایین سییەکانمی گوشی وهەناسەکانمی قورستر و کورتترکرد. شەهیدبونی کاکەبرا بۆ من کۆستێکی گەورە بو، دەیان جار پێکەوە بە

گوندەکاندا گەڕابوین و لە ماڵە جوتیارەکان پێکەوە نانمان خواردبو.

کاکەبرا (پ.م) یەکێ باڵابەرزی چاوکاڵی سوروسپی بو، کوتومت لە گەنجێکی سکەندەناڤیی دەکرد، یەکێک بو لە چالاکترین فەرماندە سەربازیەکانی ناوچەی بەرزنجە. سوپای عێراق لە ترسی هێرشی ئێران لوغمێکی زۆری لە ناوچەکە دانابو. ڕۆژانە شوان و جوتیار و مەڕ و بزنی خەڵکی ناوچەکە بەو لوغمانە دەکوژرێن و ڕێگری لە ژیانێکی ئاساییان دەکات. زیان پێکەوتوانی گوندەکانی ناوچەکە دێن بۆ لای کاکەبرا وتکای لێدەکەن ناوچەکەیان لە لوغم بۆ پاکبکاتەوە. کاکەبرا و (پ.م) کانی گۆشکراوی بیروباوەڕی کۆمەڵە بون، خۆیان بە خزمەتکاری خەڵکی ڕەشوڕوت دەزانی، بۆیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان بەهانایانەوە دەچن. کاکە برا و (پ.م) کانی بێ بەردەستبونی هیچ دەسگایەکی تایبەت بە لوغم هەڵگرتنەوە، بێ هیچ ڕاهێنانێکی تایبەت بە زانیاریی ورد دەربارەی لوغم، پێنج ڕۆژی تەواو کاری مەترسیداری دۆزینەوە و ئینجا هەڵگرتنەوە و پوچەڵکردنەوەی چەند هەزارمینێک ئەنجام دەدەن. لە دوادوایی کارەکەیان لە کاتی مین هەڵگرتنەوەدا لە پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠ ی ٣ ی ١٩٨٤مینێک بە کاکەبرا دا دەتەقێتەوە و بە سەختی زامداری دەکات و شەهید دەبێت. کاکەبرا بە خوێنی جەستەی نازداری خۆی، کە بەرز و ڕێک بو وەک درەختی چنار و سەرو، کڵپەی ئاگری نەورۆزی ئەو ساڵەی لە بەرزاییەکانی بناری چیای کوڕەکاژاوەوە هەڵکرد. کاکەبرا دەسگیراندار بو، بڕیاربو هەر لەو بەهارەدا بچێتە مانگی هەنگوینیەوە. داخەکەم کاکەبرای فەرهادی کوردوستان، وەک فەرهادەکانی تری پێش و دوای خۆی: سەلاحی موهەندس، مستەفای سەعید زۆراب، ڕەحمان پێنجوێنی، محەمەد عەلی مەلاوەیسەیی.... نەگەیشتن بە هەنگوینی شیرینی شەیدایان. (جەمال چاوشین) ی هاوسەنگەری کاکەبرا کە (پ.م) بو لەگەڵی، لە نامەیەکیدا بۆ من ئاوا باسی ژیانی کاکەبرا دەکات:

«لەساڵی١٩٧٧ دوای تەواوکردنی پۆلی سێی ناوەندی پەیوەندی دەکات بە ڕێخستنەکانی کۆمەڵە وە، لەسەر بڕیاری ڕێکخستن دەبێتە پۆلیس. دوای کارەساتی هەکاری لەسەر داوای ڕێکخستن لە ساڵی ١٩٧٩بەخۆی و چەکەکەیەوە دەچێتە شاخ و دەبێتە پیشمەرگە. لە ساڵانی ١٩٨٠ و ١٩٨١ و ١٩٨٢دەسپێشخەری و فەرماندەیی و بەشداریی دەیان چالاکی سەرکەوتوی پێشمەرگانە دەکات لە ناو شاری سلێمانی و ناحیەی بەرزنجە و عەربەت و شارەزور. کاکەبرا لە پایز و زستانی ساڵی١٩٨٢/١٩٨٣ بە خۆی و مەفرەزەکەیەوە وەک بەشێک لە (هێزی

پشتیوان) سێ مانگ بەشداریان کرد لە شەڕەکانی بەرگری دژی شاڵاوی قورسی ئێران بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی کوردوستان لە ناوچەی سەردەشت و خانێ. ئازایەتی و جوامێریی کاکەبرا و شەهید (جەلالی حەمەی محە) لەو شەڕانەدا وەک ئەفسانە دەنگی دابۆوە. کە هێزەکەمان گەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی، مام جەلال بەرەوپیریمان هات، سڵاوێکی سەربازیی پڕ لە ڕێز و پێزانین وەک ئەوەی سەرباز بۆ ئەفسەری دەکات (تەحیە) بۆ کاکەبرا و جەلالی حەمەی محە ی کرد و پێی ووتن: «سەدەیەک زیاترە ئیستیعمارو داگیرکەران سنور لە بەینی پارچەکانی کوردستان دەکێشن ودایدەنێن، بەڵام بە ئازایەتی و جوامێریی ئێوەی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانی توانیتان ئەو سنورە دەستکردە بسڕنەوە و ببنە هێزی پشتیوان و بگەن بەهانای خەڵک و حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان. دڵنیام هەتا میلەتی کورد و یەکێتی نیشتیمانی پێشمەرگەی جوامێرو ئازای وەک ئێوەی هەبێت هەر دەبێت ڕۆژێ بە ئاوات و ئامانجەکانی خۆی بگات «. هەر ئەو ڕۆژە مام جەلال کاکەبرای لە فەرماندەی مەفرەزەوە کردە فەرماندەی کەرت. کاکەبرا هاوکاریی جوتیارانی گوندەکانی دەکرد وەک لە دروێنەی گەنم و جۆ. لە زستاندا بەتایبەتی بۆ ئەوماڵانەی کە بەساڵاچوانی تێدا دەژیان و خۆیان نەیاندەتوانی بەباشی کاربکەن، دەچو بەفری سەر بانی بۆ دەماڵین یان بە بانگردێن بانی بۆ دەگێران یا داری بۆ دەشکاندن و زۆپای بۆ گەرم دەکردن. کاکەبرا لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ بڕیار دەدات ژن بهێنێت، لە گوندێکی شاربازێر کچی جوتیارێک دەستنیشان دەکات و بە شانازیەوە دەیدە نێ».

مەکتەبی عەسکەری وەک هاوکاری شتێک پارەی دەداتێ تا بتوانێت هێلانەی هاوسەرگیریی پێ سازبکات. کاکەبرای ژیاندۆست جگە لە شەیدای کوردوستان ئێستا ئیتر شەیدای کچێکی کوردوستانیی خۆی ئاسا بوە و پێکەوە خەریکی کۆکردنەوەی پەل و پوشن بۆ دروستکردنی هێلانەیەکی خنجیلانە. کاکەبرای بەخشندە دەیەوێ منداڵیش ببەخشێ بە کوردوستانەکەی و بە شیرینەکەی. کاکەبرا پێویستی بە هێلانەیەکی سادە و گەرمە، بۆ ئەوەی کاتێک وەک هەڵۆیەکی بەرزەفڕ لە ڕاوکردن و گەڕان و گەشتەکانی بە ئاسمانی کوردوستانا شەکەت و ماندو دەبێت، بتوانێ بنیشێتەوە سەرهێلانەکەی و خەندە و شادی بخاتە دڵی دەسگیرانەکەی. دەبێت دەسگیرانەکەی چەند جار دەست و چاوی ڕو لە ئاسمان کردبێ و تکا و نزای لای خوای پەروەردگار کردبێت کە بیپارێزێت؟ کچەی داماو، بێئاگا لە پلانی چارەنوس بەردەوام چاوەڕێی

گەڕانەوەی کاکەبرا دەکات کە بەیەک شادبن و پێکەوە بحەسێنەوە و قومێک لە شیلەی ژیان بنۆشن. جەمال چاوشین درێژە بە گێڕانەوەکەی دەدات و دەڵێت:

«بەڵام کاکەبرای شەیدا ی شۆڕش و پێشمەرگایەتی، ئەو پارەیەی شۆڕش بۆ هاوژینگیریەکەی پێی دابو هەموی خەرجدەکات بۆ پێشمەرگەی کەرتەکەی و هاوڕێکانی. قەمسەڵەی ئەمەریکی، تاقمی مەخزەنی تازە، فیشەک، گولە ئارپیجی، قەناسەیەک و دوربینێک بۆ پیشمەرگەکانی کەرتەکەی دەکڕێت».

## ئێوە میوانن ! بفەرمون

جەمال چاوشین ئەم ڕوداوەش دەگێڕێتەوە: «لەسەرەتای وتووێژی یەکێتی و ڕژێم لە ساڵی ١٩٨٤، پێشمەرگە پسوڵەی ڕێگەپێدان لە ڕژێم وەردەگرن بۆ سەردانی کەسوکاریان لە شارەکان. بەلام کاکەبرا وەک پێش وتوویژ هەر پێشمەرگانە بە شەو دەچێتەوە بۆ بەرزنجە بۆ سەردانی کەسوکاری. فەرماندە عەرەبەکەی کەمپی سەربازیی (دەشتی زەڵێ) ی نزیک بەرزنجە لەمێژدەبێ لە نزیکەوە حەز بە بینینی کاکەبرا دەکات تا بزانێت کاکەبرا کێیە و چۆن کەسێکە کە ئەو هەموە ناوبانگ و خۆشەویستی و سام وهەیبەتەی هەیە لە ناوچەکەدا. بۆیە کاتێک هەواڵی هاتنی کاکەبرا بۆ بەرزنجە دەبیسێت، ئەوڕۆژە هەمو هێزە سەربازییەکەی دەخاتە ئینزارەوە و خۆیشی بە دو تانک و هێزێکی زۆرەوە دێت بۆناو شارۆچکەی بەرزنجە و دەیەوێت لەڕێگەی (مودیر ناحیە) وە چاوی بە کاکەبرا بکەوێت. جەنابی فەرماندە پەیامێکی زارەکی بۆ کاکەبرا دەنێرێ کە حەزدەکەن لای (مودیر ناحیە) ببینن وبانگێشتی نانخواردنی بۆ بکەن، هەروەها ئەگەر پێویستیی بە پسوڵەی ڕێگەپێدان هەبێت بۆ ڕۆشتن بۆ سلەیمانی وشارەکانی تر ئەوان ئامادەن پسوڵەکەی بۆبکەن. بەڵام کاکەبرای وەک کوڕەکاژاو سەرکەش و سەربڵند، ئاوا بە دەمی بە ڕاسپێراو دەڵێت پێیان بڵێ: «من نە پێویستم بە پسوڵەی ڕێگەپێدانی ئێوە هەیە، نە ئیشم بەهاتن بۆ لای ئێوە هەیە. کوردستان کە بەرزنجە بەشێکە لێی ولاتی خۆمە و بۆ هەرکوێیەک بمەوێت بچم دەچم. دەربارەی ئەو میوانداریەی دەتانەوەی لە منی بکەن، ئەگەر ئێوە لەو دیوی زنجیرە شاخی (حەمرین) بونایە دەهاتم بۆلاتان و میوانداریەکەتانم قبوڵدەکرد، بەڵام لێرە من خاوەن ماڵم و ئێوە بێگانەن لە ماڵی ئێمەدا، فەرمون ئێوە وەرن و ببنە میوانی منی خاوەن ماڵ».

بەو جۆرە دیدارەکە سازنابێت و فەرماندە عەرەبەکەش بە سەرسوڕمان و تورەییەوە بە خۆی و تانک و سەربازەکانیەوە دەگەڕێتەوە سەربازگەکەی خۆی».

ئاوابو سەربڵندی و جوامێریی کاکەبرا و کاکەبراکانی ئەو سەردەمەی پێشمەرگایەتیی ئێمە!

چەند سوپاسگوزار و دڵشاد و ئەرخەیان بوم کاتێک دوای ٢٥ ساڵ گەڕامەوە کوردوستان، ببینم شاروچکەی بەرزنجە بە پەیکەرێکی بڵندی کاکەبرا ڕازێنراوەتەوە. وەک ڕەمزی هەمو (پ.م) ئازادیخوازەکانی کوردوستان کوڕنوشێکم بۆ برد و مرواریی چەند ئەسرینێکم باراندە بەر پێی پەیکەرەکەی.

ئێتر بەرزنجە هەر بە تەنیا مەزارگەی ئاینی و شوێنی پیرۆزی ساداتەکەی نیە، بەڵکو ڕوگە (قیبلە) ی هەمو سەربازانی ڕێگای ڕزگاریی کوردوستان و ڕێگای ئازادیی ئینسانی کوردە.

## تۆ ئێرانیت!

وردە وردە (پ.م) کان بە پسوڵەی یەکێتیی نیشتمانی ڕێیان پێدەدرا بچنە ناو شارەکان. من بەهیچ جورێ بڕوام بە ڕژێم و پیاوەکانی نەبو، بۆیە زۆر بە کەمی بۆ سەردانی خزم و کەس دەچومەوە ناو شار. یەکەم جار بو بچمەوە سلێمانی، ڕیشم زۆر هاتبو، کاسکێتێکم بەسەرەوە بو، لە بازگەکەی دەباشان لە کەنار شار کە لەسەر ڕێگای چوارتا بو، سەربازە عەرەبەکان گومانی ئەوەیان خستە سەرم من ئێرانی بم بەڵام کە بە عەرەبیەکی تەواو کەوتمە دوان ئێتر گومانەکەیان ڕەویەوە و ڕێگایان دام بچمە ناوشار. لە بازگەکە پێکەنین گرتبومی چونکە من لە کۆمەڵە دا بە خاوەن فیکری (عێراقچی) ناسرابوم و ئێستا سەربازە عەرەبە عێراقیەکان لە ناو ئەم هەموە (پ.م) یەدا منیان بەگیرهێناوە و دەڵێن تۆ ئێرانیت!

## ڕەچەتەی پارە !

لە کاتی وتووێژدا لە کاری دوکتۆریم هەر بەردەوام بوم، د.قادر وهیوا چونە ناوشاری سلێمانی بۆ هاوکاریکردنی (پ.م) بریندار و نەخۆشەکانمان. دواتر لەگەڵ د.قادر و د.شاخەوان و هیوا و جیهانگیر و (عەبدول) ی شۆفێر، بە هاوکاریی

بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی سلێمانی هەڵمەتێکی کوتانی منداڵانمان ئەنجامدا لە ناوچەی شارباژێڕ. جەلال تاڵەبانی بە بەکری حاجی سەفەردا سەرو دەمانچەیەکی بە دیاری بۆ من و دوکتۆر کەمال عەبدولڕەحمان نارد. بریندار و نەخۆشە قورس و کەمئەندامەکانمان بە پسولەی تایبەتی دەناردە شارەکانی سلێمانی و کەرکوک و بەغدا. بۆ پێدانی پارە بە پێشمەرگە بریندار و نەخۆشەکان بۆ چارەسەر و خەرجیی هاتوچۆ و دەرمان، ڕاپۆرتی پشتگیریمان بۆ دەنوسین و بۆ (مامۆستا ساڵح ژاژلەیی) مان دەنارد کە لێپرسراوی دارایی مەڵبەندی یەک بو. وا دیار بو نەخۆشی زۆرم ناردبوە لای مامۆستا ساڵح بۆ پارە پێدانیان، بۆیە لە پاشەملە ڕەخنەی لەمن گرتبو و وتبوی: «زۆر سەیرە دوکتۆری عالەم ڕەچەتەی دەرمان بۆ نەخۆش دەنوسێ بەڵام د.هەژاری ئێمە ڕەچەتەی پارەیان بۆ دەنوسێ و دەیان نێرێتە سەر من». مامۆستا ساڵح ڕاستی دەکرد، من دەمزانی ڕژێم بڕێک پارەی باشی بە یەکێتی داوە، بۆیە دەمویست (پ.م) بە گشتی و نەخۆش و لاواز و بریندارەکانمان بەتایبەتی، لەو پارەیە بڕێکی باشیان بەربکەوێ، ئەوان کە سوتەمەنیی هەمو شۆڕشەکانن لە هەموان شایستەتری پارەبون. لە کاتی وتووێژدا لەگەڵ دوکتۆر کەمال و حاکم سەردار گەڕانێکی ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان مان کرد.

## ماڵ و منداڵ بە کۆڵتەوە

یەکەم جار کە هاوژینگیریم کرد و ماڵم پێکەوەنا لە (حاجی مامەند) بو، لە ماوەی نزیک یەک ساڵ دا چوار جار گواستمانەوە، لە پێشا دوای مانگێک بۆ (شوکێ)، ئینجا بۆ دێی (کانی دڕکە) و دواتر بو دێی (گورگەیەر) کە نزیکتربو لە سلێمانیەوە، لێرە ماڵمان دەست نەکەوت بۆیە چادرێکمان هەڵدا و کردمانە ماڵ، دواتر ماڵە چادرەکەمان پێچایەوە و چوینە خانوی بنکەی تەندروستیی گوندی سیتەک. ئەوە ڕاستە و گومانی تێدا نیە کە پێشمەرگەش مرۆڤە و پێویستیی بە هەمو ئەو شتە ماددی و مەعنەویانە هەیە کە هەر مرۆڤێکی تر پێویستیی پێیەتی. یەکێ لە پێویستیە بنەڕەتیەکانی ژن و پیاو خۆشەویستیە، هەروەها حەز و غەریزەی جنسی و دروستکردنی خێزان و منداڵ و هەبونی ماڵی خۆت و هەستکردنت بەوەی خاوەنی جێ و ڕێی سەربەخۆی خۆتیت و دەتوانی بە ئازادانە لە چواردیواری ماڵی خۆتدا بژیت و پێشوازی لە ئازیزانت بکەیت. بەڵام ئەوە چ ژیانێکە ژن و منداڵ بەردەوام لە ژێر ترسی شالاوی بێ بەزەییانەی دوژمن بێت، لە ئاسمان

و له زەمینەوە ؟ دەبێ دۆخی دەرونیی ئەو ژنە چۆن بێت کاتێک چەند سەد مەترێک لەولاترەوە مێردەکەی لە سەنگەری شەڕێکی ناهاوتادایە لەگەڵ دوژمن؟ دەبێت ئەو ژنە دوگیانە چی بکات کاتێک چاوەڕواننەکراو و لە ناکاو ژانی منداڵبون دەستپێدەکات و هیچ ئوتومبیلێکیش لە بەردەستدا نیە پێی بچێت بۆ شار؟ ژیانی ئەو منداڵە باوک پێشمەرگەیە چۆنە کە منداڵیەکەی لە ناو گەورانی ڕیش و سمێڵ درێژ و ئەستور، دور لە هەمو جۆرەکانی یاریی زارۆکان بەسەر دەبات ؟ بەیانیان زو لە گرمە و ناڵەی تۆپباران و فڕۆکەی جەنگی بە ترس و ڕاچڵەکینەوە لە خەو ڕادەپەڕێ؟

## پەیمان و کێوان بێ من!

لە کاتی دوگیانیی پەیمان دا، بەهۆی بارودۆخی پێشمەرگایەتیەوە، بەداخەوە من وەکو پێویست وەک هاوژین و هەروەها وەک پزیشک نەم توانی لە نزیکەوە ئاگاداری دۆخی تەندروستیی هەردوکیان بم و ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵیاندا بژیم. بۆیە پەیمان لە کاتی وتووێژدا زوزو بۆ چاودێری و تێڕوانینی پزیشکی دەڕۆشتەوە ناو شار و لە ماڵی باوکی دەمایەوە. ئەوە بو من لە گورگەیەر بوم کاتێک لە ڕۆژی ٢٩ ی ٧ ی ١٩٨٤ لە کاتی گەرمەی وتووێژدا لە نەخۆشخانەی فێرکاریی سلێمانی پەیمان منداڵێکی تەندروستی بو، کە کوڕ بو و ناومان نا (کێوان).

## پشت ئەستور بە یەکێتیی نیشتمانی!

لەکاتی وتووێژدا حکومەت سەپاندبوی بەسەر خوێندکاراندا کە ڕاهێنان لەسەر چەک بکەن و ببنە (جیش شعبی)، خوێندکارانی سلێمانی خۆپیشاندانێکیان کرد کە توندوتیژیی لێکەوتەوە و هێرشیان کردە سەر بنکەی (عوسمان محمد فائق) لە شەقامی توی مەلیک - فلکەی کاوەی ئاسنگەر. لە بنکەکەوە پیاوەکانی ڕژێم تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد، چەند (پ.م) یەکی یەکێتی لەگەڵ فەرماندەی تیپ (جەماڵی حەمەی خواکەرەم) بەرگریان لە خەڵکەکە کرد و لە ناو خۆپیشاندەرانەوە تەقەیان لە بنکەکە کردەوە. لەم ڕوداوەدا چەند کەسێک بریندداربون، من بە چەکەوە چوم بۆ نەخۆشخانەی فێرکاری بۆلایان و دڵنەواییم کردن، بڕێک هەستم بە شەرم و پرینگانەوە دەکرد، چونکە خەڵکەکە بە هۆی ئێمەوە ورە و بوێریان زیادی کردبو، وایان دەزانی

مادام شەڕوەستاوە و یەکێتیی نیشتمانی لە وتووێژدایە لەگەڵ ڕژێم ئیتر دەتوانن ئاوا بە ئازادی خۆپیشاندان بکەن. لە
زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر هەمو خوێندکاران دەبو بەشداری بکەن لە ڕاهێنانی سەربازیی ڕژێم. زۆرینەی ڕەهای خوێندکارانی کورد ئەم داوایەی ڕژێمیان ڕەتکردەوە، دەوامی کۆلیجیان وەستاند و خۆپیشاندانی نارەزایەتیان کرد. لە هەر شەش قۆناغەکەی کۆلیجی پزیشکی تەنیا نزیکەی ١٣ خوێندکار درێژەیان بە دەوام دا، یەکێک لەوانە (محەمەد قادر خۆشناو) بو کە دواتر لە حکومەتەکەی یەکێتیدا جەلال تاڵەبانی کردی بە وەزیری تەندروستی ! هەمو خوێندکارەکانی تر بۆ ساڵێک لە زانکۆ دەرکران. یەکێتیی نیشتمانی هەوڵێکی دڵسۆزانە و زۆر بە پەرۆشی دا کە خوێندکارە نارازیەکان ساڵێکی خوێندنیان نەفەوتێ، بۆ گەیشتن بەمە هەوڵەکانی لەگەڵ ڕژێمی سەدام بێ سود بو. ڕژێم فێڵبازانە و ناپاکانە دەیویست ئەم کێشەیەی خوێندکاران زۆر گەورە بکات و بیکاتە بابەتێکی گرنگی وتووێژەکان و بەمە خۆی کەڕ بکات لە کێشە گەورەکانی بابەتی وتووێژ و لە گرنگیان کەمبکاتەوە. بەڵام باش بو میانەڕەویی سەرکردایەتیی یەکێتی، خوێندکارانی برێک ئارام کردەوە و نەیهێشت نەخشەکەی ڕژێم بۆ لە بیربردنەوەی بابەتە چارەنوسسازەکانی وتووێژ، سەربگرێت.

## عێراقچیەکانی ناو کۆمەڵە

لە ڕوسیای قەیسەری لە ساڵی ١٩٠٥ شۆڕشێکی بۆرجوازی و لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧ بە ڕابەرایەتیی (فلادیمیر ئیلیتش لینین) و حیزبەکەی (بەلشەفیک) شۆڕشێکی مەزنی سۆشیالیستیی تیا بەرپاکرابو. بە هۆی نزیکیی جوگرافیەوە لە ڕوسیا، کەش و هەوای سیاسی لە ئێراندا بە بەراورد بە عێراق، زۆرتر و ڕاستەوخۆتر لە ژێر کارلێکی بیربڕوای مارکسی و بزوتنەوەی چەپ و دیموکراتخواز و سۆشیالیزمی ڕوسی دابو. وشەی (بەلشەفی) ی ڕوسی یەکەم جار لە ئێرانەوە لە ساڵەکانی ١٩٢٠ وە پەڕیەوە بۆ عێراق. ئینگلیزەکان کە تازە عێراقیان داگیرکردبو و هاتبونە باشوری کوردوستان، نیگەرانیی خۆیان بە ڕاپۆرت ناردبو بۆ لەندەن و وتبویان: بۆ بەدبەختی وشەی (بەلشەفی) هاتۆتە ناو کوردیش و بوەتە بابەتی باس و خواسی ڕۆژانەیان. ئەم بیروباوەڕ و بزوتنەوانە، بۆ نمونە (شۆڕشی مەشروتەی ئێران) لە ساڵی ١٩٠٥ و بزوتنەوەی چاکسازی و خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران بە ڕابەرایەتیی (د. محەمەد موسەدەق) لە

ساڵی ١٩٥١ - ١٩٥٣، کە بە کودەتا سەرکوتکرا، ئەمانە کارلێکی ڕاستەوخۆیان لە سەر ڕۆژهەڵاتی کوردوستان و لەوێشە وە لەسەر باشوری کوردوستان هەبو. لە ساڵەکانی ١٩٦٦ بەدواوە جەلال تاڵەبانی هاوکاریی زۆری ئەو کۆمۆنیستە ئێرانیانەی کرد کە لە ئەوروپاوە گەڕانەوە و لە ڕێی باشوری کوردوستانەوە چونەوە ئێران بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی چەکداری دژی شای ئێران. دوای ڕوخانی ڕژێمی شای ئێران لە مانگی ٢ ی ١٩٧٩، بەتایبەتی لە ساڵی یەکەمدا کە هێشتا کۆماری ئیسلامی لە سەرەتای دروستکردندا بو و ڕەگ و ریشەی دانەکوتابو، لە ڕۆژهەڵاتی کوردوستان بیر و باوەڕی چەپ بە گشتی و مارکسی - لینینی بەتایبەتی، گەشانەوەیەکی قوڵ و فراوانی بەخۆوەدی. یەکێ لە ئەنجامەکانی ئاشکرابونی (کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردوستانی ئێران) بو. لە مانگی ٩ ی ساڵی ١٩٨٣ لە ڕۆژهەڵاتی کوردوستان کۆمەڵەی زەحمەتکێشان لەگەڵ (اتحادی مبارزان کومونیست) و چەند باڵ و گروپێکی کۆمۆنیستیی تری ئێرانی (حیزبی کۆمۆنیستی ئێران) یان دروستکرد. لە کاتی وتووێژی یەکێتیی نیشتمانی لە گەڵ ڕژێمی سەدام دەرفەتی کۆبونەوە و بەیەک گەیشتن و وتووێژی فیکری و سیاسی لە نێوان کادیر و سەرکردەکانی کۆمەڵە و (حیزبی کۆمۆنیستی ئێران)، کە زۆربەی بنکەکانیان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانی دا بو، زۆرتربو. بۆیە چەپ و مارکسیەکانی کورد لە عێراقدا بەگشتی و هەندێ لە کادیر و سەرکردەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بەتایبەتی کەوتنە ژێر کارلێکی ڕاستەوخۆی (حیزبی کۆمۆنیستی ئێران) و ڕابەرەکەیان (مەنسوری حیکمەت). چەندین مارکسیی کوردی عێراق وەک تاک چونە ناو ئەو حیزبە و بون بە (پ.م) لە ریزەکانیدا و هەندێکیان شەهید و برینداربون. لە ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران یشدا کەسانێک پەیدا بون وەک کوردەکانی ناو کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران بیریان دەکردەوە، لە ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەراندا دا بە تەوس و گاڵتەئامێزانە یا تەنانەت وەک جنێو و سوکایەتی پێکردن بەم کەسانە دەوترا (عێراقچی) و بەوانی تر دەوترا (کوردوستانی). عێراقچیەکان ئەوانەن حیزبی مارکسی - لینینی تایبەت بە کوردوستان بە پێویست نازانن و دەڵێن دەبێت مارکسیەکانی کورد و عەرەب و کەمایەتیەکان حزبێکی پرۆلیتاریی سەرتاسەریی مارکسی - لینینی عێراقی دروستبکەن و بە ڕابەرایەتیی ئەم حیزبە و دیکتاتۆریەتی چینی کرێکاران (پرۆلیتاریا) سیستمێکی سۆشیالیستی دامەزرێنن کە لە ژێر سایەکەیدا هەمو چەوساوەکانی عێراق ڕزگاریان بێت و ئیتر کێشەی نەتەوایەتیش ئۆتۆماتیکی چارەسەر دەبێت.

لە ڕاستیدا من هیومانیستێکی ئاسۆڕون و ئاسۆفراونبوم، کوردوستانی و دیموکراتخوازبوم، من بڕوام بە سۆشیالیزمێکی وا هەبو کە بە شێوازی ناتوندوتیژانە (بە یاسا، باج و گومرگ، پەروەدە و کولتور...) نەهێڵی چەند سەرمایەدارێکی کەم، لە سەر حسابی ملیۆنەها ئینسان بەشی زۆری سامانە ماددیەکان بۆخۆیان ببەن و زۆرایەتیەکەی تری کۆمەڵ برسی و بێئیش بکەن. من بڕوام بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا نەبو، من بڕوام بە هیچ جۆرێکی دیکتاتۆری نەبو، ئێستاش من هەر وام و هەر ئاوا بیردەکەمەوە. بەڵام ئەوانەی لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە ناسناوی (عێراقچی) یان بە من و من ئاسا کانەوە لکاندبو، پێیان قبوڵ نەدەکرا ئێمە ڕەخنە لە هەندێ سیاسەتی چەوت و نادروستی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بگرین. ئەمە بو کرۆکی کێشەکە، دەنا خۆشیان دەیانزانی ئێمە لەوان کوردوستانی تر بوین. هەندێ لەوانەی بە (عێراقچی) ناویان زڕابو، ئەوانیش وەک کاردانەوە بە لاقرتی و گاڵتەجاڕیەوە بە هەندێ لەو (کوردوستانی) یانەیان دەوت (سۆشیال عەشایر).

## کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە

بۆ ئەوەی ببیت بە ئەندام لەم کۆنفرانسەدا، دەبو لەو ناوچەیەی خەباتی تێدادەکەیت لە هەڵبژاردنی کۆنفرانسێکی ناوچەییدا کە بە شێوەیەکی دیموکراتی و ئازاد دەبەسترا، خۆت بپاڵێوی و دەنگی پێویست بەدەست بێنی. لە هاوینی ١٩٨٣ لە نێوان داربەڕوە چڕەکانی بەرزایی (سییەر) لە پشتی گوندی باراو، کۆنفرانسی ناوچەیی کەرتی ڕێکخستنی پێنجوێن کە من سەر بەو کەرتە بوم، بەسترا. ئەم کۆنفرانسە ناوچەییە بۆ هەڵبژاردنی نوێنەران بو بۆ کۆنفرانسی گشتیی سێی کۆمەڵە. لەم کۆنفرانسەدا ئەندامانی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناوشارەکانیش بەشداربون. کۆنفرانس بە سەرپەرشتیی ئازاد هەورامی و قادری حاجی عەلی و ڕێکەوت عوسمان بە سەرکەوتویی کارەکانی تەواوکرد، کۆنفرانسێکی ئازاد و دروست و بێ فڕ و فێڵ بو. من دوای مامۆستا جەمالی حاجی محەمەد و وەهاب و جەمالی حەمەی خواکەرەم جێگەم گرت و بە ڕێژەیەکی باش ئەندامانی کۆنفرانس دەنگیان بۆ دام و هەڵیان بژاردم. لە یەکێ لە دانیشتنەکانا، لە کاتێکا موناقەشەی تیوریی وشکی ئەوە دەکرا ئایا ڕژێمی بەعس فاشیستە یا ڕەفتارفاشیستە، کادیری سەربازیی دڵسۆز(مەحمود گەرمیانی) پرسیاری کرد: «ئەرێ فاشیست چیە وا ئەوەندە لەسەری دەدوێن؟ «، کاتێک بۆی ڕونکرایەوە واتای چیە، ئەو کە خوێندەواریەکی کەمی هەبو ولە دەوروبەرێکی خێڵەکیی پڕ لە

توندوتیژی و تۆڵەسەندن گەورەبوبو، بە زەردەخەنەیەکی لاقرتی و تەوسەوە وتی: «دەی فاشیست خراویی چیە ؟ ئەی دایکم وەقورروانی فاشیست بێ». مەحمود گەرمیانی دواتر لە شەڕی تۆڵەی خێڵەکیدا لە گەرمیان کوژرا.

کۆنفراسی ٣ی کومەڵە لە کاتی گەرمەی وتوویژی یەکێتی لەگەڵ حکومەت بەڕێوەچو، لە ڕۆژی ٢٠ی تەموزی ١٩٨٤ لە هەواری (کانی سێوە) ی بناری پیرەمەگرون لە دۆڵی (مێرگەپان) بە بەشداری نزیکەی ٢٨٧ ئەندام بەسترا. لە نێوان درەختە چڕەکانی دامێنی پیرەمەگرون لە شوێنی کۆنفرانسەکە کەپری هاوینە بۆ بەشدارانی کۆنفرانس ئامادەکرابو. لایەنی خۆپاراستن و ئاسایشی شوێنەکە باش ڕێکخرابو، چونکە ئەگەری بۆمبابارانی شوێنەکە لە لایەن ڕژێمی سەدامی پەیمانشکێن ودوژمنە وە ڕەچاوکرابو. بەڵێ! دڵە گەرمە بە تین و تاوەکەی، دینەمۆ بەهێزەکەی یەکێتی ئالەم شوێنەدا خڕ کۆبوبۆوە، هەمومان بە کۆک و ناکۆکەکانەوە پارویەکی چەور بوین بۆ دڕندەکانی بەعس. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵە لە ڕێکخراوی نهێنیی ناوشارەکانەوە هاتبون و ڕوپۆش (دەمامک، ماسک) یان لە ڕویان بەستبو بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە، کۆسرەت ڕەسوڵ یەکێک بو لەو ڕوپۆشانە کە لە کۆنفرانسەکەدا خۆی ئاشکراکرد و دوای کۆنفرانس بوبە (پ.م). لە ڕۆژی یەکەمی کۆنفرانسدا جەلال تاڵەبانی و عبدالرحمن قاسملۆ و ئیبراهیمی عەلیزادە و دوکتۆر فوئادوئاد مەعسوم وەک میوان ئامادە بون. قاسملۆ وتەیەکی کورتی پێشکەشکرد، تێیدا جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە لە سیاسەتکردندا دەبێت عەقڵ و مەنتیق دەوری سەرەکیی هەبێ نەوەک سۆز و هەڵچون و عاتیفە. ڕای وابو واباشترە بۆ کوردی عێراق هەرچۆنێ بوە لەگەڵ ڕژێمی سەدام ڕێکەوێ و شەڕنەبێتەوە. بێگومان ئەگەر یەکێتیی نیشتمانی لەگەڵ عێراق ڕێکەوتایە بە سودی کوردی ئێران و شۆڕشە چەکداریەکەی تەواو دەبو. قاسملۆ پەیامەکەی بەرەوڕوی ئەوانە دەکردەوە لە ناو کۆمەڵەدا کە ڕەخنەی زۆریان دەگرت لە وتوویژی یەکێتی لەگەڵ ڕژێمی سەدام. میوانەکانی تریش قسەی خۆیانکرد. ئینجا جەلال تاڵەبانی بە وردی و دورودرێژی باسی دۆخی مفاوەزاتی کرد.

## ناوبڕێك: با تاوێك بچین بۆ ڤییەنا لە هاوینی ١٩٨٩

لە دەمی قاسملۆوە دەگێڕنەوە گوایە لەسەر پەیمانشکێنی وعەهدشکێنیی عەجەم، باوکی یا باپیرەی گوتویەتی: «کە توشی عەجەمێک بوی خۆتی لێ بەدوربگرە و

نزیکی مەکەوە، ئەگەر ئەمەت بۆ نەکرا و نزیکت بۆوە، تۆ مەهێڵە قسەت لەگەڵ بکا دەنا بە وتووێژی درۆ و فێڵاوی دەتخاپێنێ و ئینجا دەتکوژێ، پێش ئەو تۆ دەستی خۆت بوەشێنە و لەناوی بەرە!». مەبەست لە (عەجەم) لێرا نوێنەری دەسەڵاتە لە ئێران جا تورکی ئازەری بیت یا فارس. بەداخەوە قاسملۆ خۆی بەگوێی ئەو پەندەی نەکرد و ئەو ئامۆژگارییەی هی ئێمەی بەشداربوانی کۆنفرانسی کۆمەڵەی کرد خۆی پیادەی نەکرد. پێنج ساڵ دوای قسەکانی، قاسملۆ زۆر سادە و سانا، ناعەقڵی و نامەنتیقیانە، بێ بەکارخستنی ئەو هەموە زیرەکی و ئەزمونەی کە هەیبو، بێ گوێدانە ئاگاداری و ڕاوێژی هاوڕێکانی لە حیزبی دیموکرات، لە شوقەیەکدا لە شاری ڤیەنا لە ١٣ی ٧ ی ١٩٨٩، لەگەڵ (عەبدوڵڵا قادری ئازەر) ی هاوحیزبی وق(د. فازیلی مەلا مەحمود) وەک ناوبژیوان، وتووێژێک دەکات لەسەر چارەسەری ئاشتیانەی کێشەی کورد لە ئێران. لایەنی ئێرانی پێکهاتبو لە سێ سەرکردەی سەربازی و جاسوسیی ئێرانی، تومەز ئەم سێ بەرپرسە ئێرانیە پیاوکوژن و پێشتر نەخشە و پلانێکی وردیان داناوە بۆ کوشتنی قاسملۆ نەوەک بۆ وتووێژی سیاسی لەگەڵی. لە کاتێکدا ئەم شەش کەسە بەدەوری مێزی گفتوگۆدا دانیشتون و وتووێژی ئاشتی دەکەن، ئێرانیەکان ناجوامێرانە دەمانچە هەڵدەکێشن، قاسملۆ و یاریدەدەرەکەی ود. فازیل دەدەنە بەر گولە و خلتانی خوێنیان دەکەن، لەجێدا دەمودەس شەهیدیان دەکەن و دەیکەن بە دیارییەکی دڵخۆشکەر بۆ ڕژێمی ئیسلامی ئێران. ڕۆژی١٣ی ٧ ی ١٩٨٩ڕۆژی چلەی مردنی خومەینی یە، کە دیارە ڕژێمی ئێران بە مەبەست و وەک دەربڕینی ڕق و کینە ئەو ڕۆژەیان هەڵبژاردوە نەک ڕوداوەکە بە ڕێکەوت لەو ڕۆژەدا ڕویدابێت.

## با بگەڕێینەوە بۆ پیرەمەگرون و کۆنفرانس !

لە ڕۆژی دوهەمی کۆنفرانسدا کە ئیتر بێ میوانەکان بەڕێوەچو، نەوشیروان مستەفا ڕاپۆرتێکی دورودرێژی خوێندەوە لە سەر کۆمەڵە و یەکێتی و وتوویژ لەگەڵ ڕژێمی سەدام. کەش و هەوای ناو کۆنفرانس گرژ و مڕ و موچ و نادۆستانەبو، ناکۆکیە زۆرەکانی ساڵانی پێشو کەڵەکە بوبو و پەنگی خواردبۆوە، ئیتر کاتی دەربڕین و قسەکردنی بێباک و بێپەروا بو لەسەریان، ڕۆژی پاککردنەوەی حساباتەکان بو. بە تایبەتی دوای هەڵوێستی شەڕنەکردنی مەڵبەندی یەک کە مەلا بەختیار بەرپرسی بو لەگەڵ حیزبی شیوعی لە مانگی ئایاری ١٩٨٣، گرژی و ناکۆکیەکانی ناو کۆمەڵە لە کۆنفرانسی سێ

دا رونتر و زەقتر و ئاشكراتر بۆوە. ئەو باڵەی بە (عێراقچیەكان) ناسرابو و دواتر لە ساڵی ١٩٨٥ (ئاڵای شۆڕش) ی لێدروست بو، بۆ ئامادەبوانی كۆنفرانس ئاشكراتربو، مەلابەختیار لە كۆنفرانس دا بە كەسی یەكەمی عێراقچیەكان دەركەوت.

من بە گشتی لە دۆخی ناوەوەی كۆمەڵە زۆر بێزار و نارازی بوم، جگە لەمەش زانیاریی تەمومژاویم پێگەیشتبو لە سەر توندی و دلڕەقی و برینداركردنی مافی مرۆڤ لە لایەن ئەو سەركردە و كادیرانەی كۆمەڵە كە لە كێشەی وریا (عبدالرزاق وەهاب مارف) دا تێوەگلا بون. بیستبوم وریا لە خەباتی نهێنیی ناوشاری سلێمانیدا كادیرێكی سەربازیی ئازا و بەجەرگی كۆمەڵە بوە. دوای چەندین چالاكی لە ناو شاری سلێمانیدا، وریا دەچێتە شاخ و دەبێت بە (پ.م). سەركردایەتیی كۆمەڵە داوای ڕادەستكردنی هەندێ بەڵگەی گرنگ دەكەن كە كەوتۆتە لای وریا و بەڵگەكان پەیوەندیان بە كوشتنی سیاسیی چەند كەسێكەوە هەیە لە ناو شاری سلێمانیدا ، بەڵام وریا سوردەبێت لەسەر ئەوەی بەڵگە داواكراوەكان تەسلیم نەكات. لە سەر ئەم كێشەیە، بێ دادگایی كردنێك كە هیچ نەبێت چەند ئەندام و كادیرێكی تری كۆمەڵە بەشداربێت تێیدا، بە فەرمانی نەوشیروان مستەفا چەند بەرپرسێكی كۆمەڵە، لە ناوچەی سەرگەڵو بە نهێنی وریا یان كوشتبو. ئەم جۆرە ڕەفتارانە دژی بنەما فیكری و مرۆڤدۆستیەكانی كۆمەڵە بو، جگە لەوە زیانێكی گەورەی دەگەیاند بە جەستە و ڕۆحی شەكەت و ماندوی كۆمەڵە و دەبوە هۆی كەمبونی متمانە و ساردی و نائومێدی لە ناو ڕیزەكانیدا. من وریام نەدەناسی و هەرگیز نەم بینیبو، نەیشم دەزانی كارنامەی خەباتەكەی چۆنە و سەرپێچیكردنەكەی چی بوە. بەڵام ئەم ڕەفتارانە بۆ من وەك چالاكوان و لایەنگرێكی مافی مرۆڤ و وەك پزیشكێك جێی ڕەخنەی ڕیشەیی و جیددی بو،، زۆر ئازاریان دەدام و ویژدانیان دەهەژاندم و نائارامیان دەكردم، بۆیە پێشتر بڕیارم دابو قسەی دڵی خۆم بكەم !

فەرەیدون عبدالقادری ئەندامی ناوەندیی كۆمەڵە، ڕاپۆرتی ڕێكخستنی كۆمەڵەی خوێندەوە كە نزیكەی سەعاتێكی خایاند. فەرەیدون باسی شەڕی (قەرناقا و پشتئاشان) ی كرد و نكولیی كرد لە هەمو ئەو ڕەخنە و تۆمەتانە ی لە لایەن بەرەی جود (پارتی و شیوعی و حسك و پاسۆك) وە لە یەكێتی و بە تایبەتی لە كۆمەڵە گیرابون، هەموی بە ناڕاست و نارەوا و درۆ وەسف كرد. ڕەخنە و تۆمەتەكە ی بەرەی (جود) ئەوە بو كە (پ.م) كانی یەكێتی بریندار و دیلەكانی حیزبی شیوعیی عێراقییان كوشتوە و ومافی مرۆڤیان پێشێلكردوە. لە سەر بابەتەكانی تری ڕاپۆرتەكە چەند كەسێك سەرنج و ڕەخنەی خۆیان دەربڕی.

## ترپەی دڵ و پشکۆی ویژدان  چیان لێم دەوێ هەم دیسان؟

من بە جۆش و خرۆش و وزە و هەژانێکی زۆرەوە، بەکەمێک هەڵچون و باڵادەستبونی هەست و سۆزی گەنجانەمەوە، هەستامە سەرپێ و بە دەنگێکی زەلال و ڕەپ و ڕەوان کەوتمە قسەکردن. هەستم کرد ترپە توند و بەپەلەکانی دڵی هەژاوم دەیویست پاڵ بە دڵمەوە بنێ بۆ ئەوەی لە سینگم دەرپەڕێ و پشتگیری لە وتەکانم بکات. بە زمانی جەستە و بە گەروم کەوتمە دوان: «ئەگەر لە ناو ئەندامەکانی جەستەی خودی کۆمەڵە دا مافی مرۆڤ و مافی پیشمەرگە وکادیر و ئەندامی کۆمەڵە بریندارکرابێت و شێوازی نادیموکراتی و نامرۆڤانە بەرامبەری بەکارهێنرابێت، ئیتر بۆچی دورە و سەیرە لە شەڕێکی قورسی وەک (قەرناقا و پشتئاشان) دا بەرامبەر لاکەی تری شەڕ مافی مرۆڤ پێشێلکرابێت و دیلی شەڕ کوژرابێت ؟»، بە تیرێک دو نیشانەم شکاند!

دوای هاویشتنی تیری دونوکیی ڕەخنە توندەکەی من، گەواڵە هەوری خۆڵەمێشیی کش و ماتییەکی ترسناک باڵی کێشا بە سەر ئاسمانی ژێر کەپرە نزمەکەدا. فەرەیدون عبدالقادر بە لاوازی و شڵەژانەوە هەستایە سەرپێ و ئاوا وەڵامی دامەوە، وەڵامی نەدامەوە!: «دوکتۆرهەژار کاتی خۆی حیزبی سۆشیالیستی کوردوستان بوە و ئێستاش لێرە بەرگری لە بەرەی (جود) دەکات». جەلال تاڵەبانی لە کۆنفرانسی دودا پێش دوساڵ، بەرامبەر ئەو ڕەخنانەی لێم گرت، لە بری ئەوەی وەڵامم بداتەوە هێرشی شەخسیی کردە سەرم. ئێستا فەرەیدونیش وەک جەلال تاڵەبانیی مامۆستای، توتی ئاسا هەمان هێرشی شەخسی و هەمان (ناوەڵام) کەی جەلال تاڵەبانیی دوبارەکردەوە. فەرەیدون هەمان قەوانە کۆن و سواو و دەنگە ناسازەکەی لێدایەوە و نەیتوانی وەڵامی ناوەڕۆکی پرسیارەکەم بداتەوە. ڕەخنەکەی من زۆر قورستر و قوڵتر و بوێرانەتر بو لەوەی ئەو بتوانێ وەڵامی بداتەوە!

## نەوشیروان: یەکلاکەرەوە و ڕەپ و ڕەوان!

نەوشیروان مستەفا هەستایە سەرپێ و بە برێک زبری و کەمێک بێڕێزیەوە فەرەیدون عبدالقادری دانیشاند. نەوشیروان بە کەمێک هەڵچونەوە، بەڵام بێ ئەوەی هیچ هێرشێکی شەخسی بکاتە سەرمن و بێ ئەوەی هیچ بێڕێزیەکم پێ بکات،

وەڵامی دامەوە و وتی: «دوکتۆرهەژار ڕاست دەکات، لە ناو کۆمەڵەدا هەرکەسێک لە هەر ئاستێکدا بێت بیەوێت لە ناوەوەڕا ژیانمان پێبگەیەنێت و ڕێکخراوەکەمان لە ناوەوەڕا بنکۆڵ و کرمۆڵ بکات و خیانەتمان لێبکات، ئەوا بێگومان (لەم چرکەکاتەدا بە دەستی ڕاستی ئاماژەی کرد بۆ وێنەی چەند شەهیدێکی کۆمەڵە کە بە ڕاسەری سەکۆی قسەکردنەوە هەڵواسرابون) لە بەرامبەر هەر یەکێ لەو شەهیدانە و وەک وەفا بۆخۆیان و ڕێبازەکەیان ئەو کەسە بە چارەنوسی ڕەشی خۆی دەگەیەنین».
نەوشیروان وەڵامی بەشی دوهەمی ڕەخنەکەمی نەدایەوە کە لە کوشتنی دیل و بریندارى (حشع) گرتبوم لە شەڕی قەرناقا و پشتئاشان دا.

من هەستامەوە سەرپێ و ویستم وەڵامی نەوشیروان بدەمەوە و هەروەها داوای لێبکەم وەڵامی ڕەخنەکەم بداتەوە کە گرتبوم لە کوشتنی شیوعیە دیلەکان، بەڵام باش بو! هاوڕێیانم دارا نەقشبەندی و دوکتۆرقادر و دوکتۆر کەمال کە لە پشتمەوە و لەم لاولام دانیشتبون، توند گرتمیان و دایان نیشاندمەوە، نەیان هێشت قسەی زیاتر بکەم، پێیان وتم: ئیتر بەسە قسەی خۆتت کرد، ماڵیان ئاوابێت، چونکە بە وەڵام دانەوەی نەوشیروان بەو شێوە حەماسییەی من دۆخەکەی ئەوەندەی تر دادەگیرسان و ئاڵۆزتر و گرژتری دەکرد.

بە ڕاستی هەڵوێستێکی دراماتیکیی ڕو لە تەقینەوە بو. چونکە جگە لە ڕوپۆشەکان زۆربەی ئەندامانی کۆنفرانس بە خۆیشمەوە بە کڵاشینکۆفەوە دانیشتبون، زۆربەمان گرژ و وەڕس و بێزار و ناڕازی بوین، هەریەکە بە جۆرێک و لە چەند شتێک. وردە وردە گرژی و ناکۆکیەکان قوڵتر و فراوانتر بونەوە و لە ئەنجامدا لە نەوشیروان و مەلابەختیار دا چڕبونەوە و گەیشتە ئەوەی پەلاماری یەکتر بدەن. مەلا بەختیار دوای ئەوەی بەرگریەکی بویرانەی لە بیروڕاکانی کرد، لە کۆنفرانس چوە دەرەوە، بە دوای ئەودا ١٢٧ ئەندام لە کۆی ٢٨٧ ئەندامی کۆنفرانس چونە دەرەوە، من و هاوڕێکانم: دارا و د.قادر و د.کەمال و پشکۆ نەجمەدین و حەمە ئاوات سدیق و... لەوانە بوین کە بە دوایدا چوینە دەرەوە. کارەکانی کۆنفرانس وەستێنرا تا ڕۆژی دواتر و هاتنەوەی جەلال تاڵەبانی بۆ کۆنفرانس. هاتنەکەی مام وەک هاتنی ئەمبولانسی فریاکەوتن یا ئوتومبیلی ئاگرکوژێنەوە بو. مام کۆبونەوەی لەگەڵ هەردو لایەنی ناکۆک کرد و دەورێکی گرنگی گێڕا لە هێورکردنەوەی دۆخەکە و گەڕانەوە ی ئێمەی ناڕازیەکان بۆ ناو کۆنفرانس. کارەکانی کۆنفرانس درێژەی پێدرا تا ئەنجامدانی هەڵبژاردنی سەرکردایەتیی کۆمەڵە. ڕۆژی هەڵبژاردن، پشکۆ نەجمەدین و ئیبراهیم جەلال و من لە

لایەن ئەندامانی کۆنفرانسەوە هەڵبژێردراین بۆ جیاکردنەوە و ژماردنی دەنگەکان. لە ئەنجامدا ئەو باڵەی کۆمەڵە دەنگی زۆرتری هێنا کە نەوشیروان مستەفا ڕابەرایەتیی دەکرد، ئەو هەر خۆیشی بە سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێردرا. باڵی (عێراقچیەکان) دەنگی کەمتریان هێنا، جگە لە مەلا بەختیار کەسیان هەڵنەبژێردران بۆ سەرکردایەتیی کۆمەڵە. عێراقچیەکان ڕەخنەی ئەوەیان گرت گوایە بە پێی نەخشە و بە شێوەیەکی نادروست و ناڕەوا لە شارەکانەوە ئەو نوێنەرانەیان ناردوە بۆ کۆنفرانس کە سەر بە باڵەکەی نەوشیروان بون.

## شنەی شەماڵێکی فێنك!

لە چرکەکاتی تەقینەوەی جیاوازی و ناکۆکیەکاندا کاتێک ناڕازیەکان دەستە دەستە دەچونە دەرەوە، لەو شوێنکاتە درامی و هەستیار و شەڕاویەدا، کادیری دێرینی کۆمەڵە مامۆستا محەمەدی عەتی (محەمەد سابیر) بە خێرایی بەرەو دەرگای دەرەوە ڕۆیشت، بەڵام وەک چاوەڕوان دەکرا نەچوە دەرەوە، بەڵکو لەپڕ پێچێکی کردەوە و لە پێش کوپەی ئاوی بەردەم دەرگای کەپرەکە وەستا. ئینجا بە خەندەیەکی حەنک و گاڵتەوە سەیرێکی خەڵکەکەی کرد و دەستیکرد بە ئاو خواردنەوە، پاشان بە شێوەیەکی ئەکتەرانە پێچیکردەوە و گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و بە زەردەخەنەیەکەوە دانیشتەوە. شەپۆلی قاقای پێکەنین یکی بەرز هەمو هۆڵەکەی گرتەوە، بەڕاستی شنەی شەماڵێکی فێنککەربو لەو کولانە سیاسیەدا کە هەمومان تێیکەوتبوین و قولپمان دەدا.

## خۆخوێندن بۆ خۆناسین !

دوای دە ساڵێک لە ڕوداوەکانی ناو کۆنفرانسی سێ، لە ئەڵمانیا گیرسابومەوە و لە ناوەڕاست و قوڵایی خوێندنی دەرونناسیی پزیشکیدا بوم. بەشێکی گرنگی خوێندنەکەم خۆناسی و خۆهەستپێکردن و خۆئەزمونکردن بو. ئەمە جۆرێک بو لە ڕامان و بیرکردنەوە لە خۆت، خۆخوێندنەوە و خۆشیکاری و پێداچونەوە بو بە خۆتدا لە پەیوەند بە خۆت و بە دەوروبەر. لەگەڵ دەستەیەک پزیشکی ژن و پیاوی ئەڵمانیدا لە ژێر سەرپەرشتیی دەرونناسێکی بە ئەزموندا کە دەیان خولی ڕاهێنانی

بینیبو بۆ ئەم مەبەستە، هەر دو هەفتە جارێک نزیکەی سێ سەعات وت و وێژ و ڕاهێنانی زیندومان لە سەر خۆمان دەکرد. هەندێک جار لەو کەشە خۆش و ئارامەی ئەڵمانیا دا کاتێک لە و گروپەدا بوم، کە ئەو هەڵوێستەی خۆمم لە کۆنفرانسی سێ دا بیردەکەوتەوە و دەهاتەوە پێش چاوم هەستم بە ترسێکی زۆر دەکرد. بە خەیاڵ دەگەڕامەوە ژێر کەپرە گەورەکەی مێرگەپان، ئێستا زۆرتر لە جاران هەستم بە گرژی و توڕەیی وهەلچونی هاوڕێکانم دەکرد و بە ڕونی هەستم بە مەترسیی دۆخەکە دەکرد و لە خۆمم دەپرسی: "باشە بۆ دور بو ئەگەر ئەندامێکی کۆنفرانسەکە لە کاردانەوەیەکی توڕە و نائومێدیدا هەستایەتە سەرپێ و ڕیزێک فیشەکی بکردایە بەناوماندا؟ ئایا کاردانەوەی (پ.م) کانی تر کە هەمویان چەکیان پێ بو چۆن دەبو؟ ".
لە ناو گێژاو و گێژەنگی ئەم پرسیارانەدا بوم، لە ناکاو دەنگی ناسکی ڕاهێنەرەکەمان دەیهێنامەوە بۆ ناو گروپەکە لە ئەڵمانیا و دەیوت: "ئێستا ئیتر کاتی پشوی قاوە و کێکە، بفەرمون".

## ڕۆڵ بینین !

یەکێک لە شێوازەکانی چارەسەری دەرونی پێی دەوترێ ڕۆڵ بینین (role play). تۆ پێش ئەوەی بچیتە ناو شوێنکاتێکی (مەوقیف) یکی فەرمیی زۆر تایبەت و تازەوە کە داوات لێدەکات بە باشترین شێوە بەرامبەر کەسەکان ڕەفتاربکەیت و خۆت بنوێنی و خۆت دەربڕی، دەبێت لە ماڵەوە هەمو شوێنکاتە چاوەڕوانکراوەکە وەک شانۆیەک چەندین جار نمایش بکەیت. لەم شانۆ بچوکەی ماڵەوەدا یەک دو کەسی زۆر نزیکت بینەری تۆ دەبن و لە ئاوێنەی تێبینی و سەرنجەکانیان تۆ خۆت باشتر و دروستتر دەبینی، هەڵە و کەم و کورتیەکانت پێدەڵێن و هەوڵ دەدەیت بە ڕاهێنان و چەندبارە کردنەوە ڕاستیان بکەیتەوە و نمایشەکە باشتر بکەیت. کە لە خوێندنی دەرونناسیدا شێوازی (ڕۆڵ بینین) فێربوم و ڕاهێنانم لە سەر کرد، بەخۆمم دەوت: لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا دەبوایە هەفتەیەک پێشتر لە ماڵەوە لە بەردەم براکانمدا چەند جارێک (ڕۆڵ بینین) م بکردایە بۆ ئەو هەڵوێستانەی دەمویست لە کۆنفرانسدا دەریانبڕم، بێگومان هەمو ئەو شتانەی دەمویست بیڵێم هەر دەموتن بەلاّم بە شێوەیەکی ئارامتر و دور لە هەڵچون.

## تا ساڵی ٢٠٠٤!

پەیوەندیی نێوان جەلال تاڵەبانی و نەوشیروان مستەفا تا ساڵی ٢٠٠٤ بەم جۆرە بو: یەکەم: رابوردوی پەیوەندیەکەیان کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵەکانی ١٩٦٠ ڕابوردویەکی دۆستانە بو، ئەم بیستوە یەکێکیان بۆ یەک جاریش بەرامبەر ئەوی تر بێڕێزیی کردبێت. دوهـەم: زەمینەی ڕۆشنبیری و فکری و سیاسی و کۆمەڵایەتیان خاڵی هاوبەشی زۆر بو: هەردوکیان نیشتمانپەروەربون و نەتەوەخوازیش بون ؛ هەڵوێستیان بەرامبەر ئیسلام بەگشتی میانەڕەو بو، هیچیان دژی ئیسلامی سیاسیی میانەڕەو نەبون. هیچیان دوژمنی سوێندخواردوی مارکسیزم و سۆشیالیزم نەبون. بە بەراورد بە سەرۆکەکانی تری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، هیچیان دیکتاتۆری خوێن مژ نەبون. بە پێی هەل و مەرجی خەبات و باری کولتوری وکۆمەڵایەتیی کورد، دەیانویست شێوازی دیموکراتی بەکاربێنن. بەڵام هەندێ جار و لە هەندێک قۆناغ دا هەل و مەرجی ئاڵۆزی خەباتی چەکدار، کاری نادیموکراتی و توندوتیژیی بە هەردوکیان دەکرد. هەردوکیان ئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیریان هەبو. هەردوکیان دنیادیدە بون و لە دەرەوەی وڵات ژیابون. سێهەم: کەسێتیی یەکتریان تەواو دەکرد.

## کەسێتیی نەوشیروان:

نەوشیروان کەسێکی کەمدوی، بیرکەرەوەی، بیرڕونی، پراگماتیکیی، بە نەخشە و پلان بو، بە ڕاستی ڕێکخەر و پلان داڕێژ بو. بوێر و قسەلەڕو بو، ڕاست و ڕەپ و ڕەوان پێی دەوتیت-کرۆکی بابەت و کێشەکە چیە. لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیدا ڕو لە ناوەوەی خۆی بو (introvert)، برێک سارد و وشک و دورەپەرێز بو. ڕوخۆش نەبو. عاتیفی و سۆزدار نەبو، بۆیە درەنگ هەڵدەچو؛ لایەنی لۆجیک و عەقڵانی لە دەرونیدا بەهێزتر بو لە لایەنی سۆز و هەڵچونە عاتیفیەکان. لە کاتی هەبونی جیاوازی یا دژایەتی لە بیروباوەڕ وهەلوێستی سیاسی لە گەڵ هاوخەباتەکانی، نەوشیروان برێک لەدڵی دەگرت، لە بیری نەدەچۆوە و بەرامبەر هەندێ کەس کە کیمیاکەی لەگەڵیان نەدەسازا، دەبوە برێک ڕق و کینە لێیان.

## کەسێتیی جەلال تاڵەبانی

جەلال تاڵەبانی کەسێکی نەترس و بەورە و کەف و کوڵاوی و پڕوزە و توانا بو؛ زۆرگۆ بو؛ خاوەنی ئیرادەی پۆڵایین و بڕوابەخۆبون و گەشبینی بو. لە ڕوی هەست و سۆزەوە زو هەڵدەچو و بەهاری لەخۆی دەهێنایە چۆکان. ئەم گەشبینی و پڕلەهیوابونە لە کاتی نوچدان و لاوازی و شکستەکان سودێکی گەورەی هەبو، بۆ نمونە لە کاتی دوای ئاشبەتاڵ لە بەهاری ١٩٧٥ و لە کاتی دوای کارەساتی هەکاری لە بەهاری ١٩٧٨ مام ئەم گەشبینی و ئیرادە پۆڵایینەی بەکاریهێنا بۆهاندانی خەڵک بۆ نەبەزین و خۆبەدەستەوەنەدان و هەستانەوە ودرێژەپێدانی خەبات. بەڵام ئەم گەشبینیە لەو دۆخانەی پشت بەستو نەبو بە شیکردنەوەی لۆجیکیانە و سەلمێنراو نەبو بە زانیاریی ورد و ژمارە و داتاکان زیانی گەورەی لێدەکەوتەوە، بۆ نمونە ئایا هیوا و گەشبینیی بێبنەمای جەلال تاڵەبانی بەوەی کە ئەمریکا لە ڕێی دەستوەردانی ڕاستەوخۆی سەربازیەوە ناهێڵی سەدام پشتگیریی سەربازیی ڕاستەوخۆی مەسعود بارزانی بکات، یەکێ لە هۆ سەرەکیەکانی شکستی گەورە و مێژویی (ینک) لە ٣١ ی ئابی ١٩٩٦ نەبو؟

مام لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیدا (extrovert) بو، واتە ڕولە دەرەوەی خۆی بو، کراوە و گەرم و گوڕ بو. بەخشندە وگەورە و فراوانخوازبو. شادی و ڕوخۆشی و قسەخۆشیەکەی بە ئەندازەیەک بو کە وەک پەتا بڵاودەبۆوە بە دەوروبەردا، لە دەروونناسیی پزیشکیدا بەم جۆرە کەسێتیەی جەلال تاڵەبانی دەڵێن کەسێتیی(hyperthymic). بە ڕاوبۆچونی پزیشکی دەرونیی ئەمریکی (ناسر غەیمی) کە نوسەری چەندین کتێبی دەرونیە، هەردو سەرۆکی ئەمریکا (فرانکلین ڕۆزڤێلت) و (جۆن ئێف کەنەدی) کەسێتیەکی (hyperthymic) یان هەبوە، کەنەدی گەنجترین سەرۆکی ئەمریکا بو، ڕۆزڤێلت بەهۆی ئیفلیجیی لاقەکانی لە ڕۆیشتن کەوتبو و بەردەوام لە سەر کورسیی تایەداربو، ڕۆزڤێلت لەساڵی ١٩٣٢ وە تا مانگی نیسانی ١٩٤٥ سەرۆکی ئەمریکا بو، تەنیا سەرۆکێکە کە سێ جار هەڵبژێردرایەوە، ڕۆزڤێلت هەر لەسەر ئەو کورسیەوە بە هاوپەیمانی لەگەڵ ستالین و چەرچل لە ساڵی ١٩٤١ وە سەرکردایەتیی سەرکەوتوانەی شەڕی جیهانیی دوهەمی کرد لەگەڵ ئەڵمانیای نازی و یابان و ئیتالیای فاشیستی، ئەگەر ڕۆزڤێلت کەسێتیەکی زۆر بەهێز و پڕوزەی نەبوایە چۆن لەو سیازدە ساڵە زۆر سەختەی سەرۆکایەتیەکەیدا دەیتوانی ئاوا سەرکەوتوبێت؟ جەلال تاڵەبانی کەسێکی عاتیفی و سۆزدار و زۆرهەستیار بو، بە جۆرێک کە لە کاتی جیاوازیی بیروڕا و دژبون لەگەڵ بیروڕای بەرامبەر، زو

هەڵدەچو و لە کەسە ڕوخۆشەکەوە دەبو بە تۆپێک ئاگر و هێرشی زارەکی و بگرە جەستەییشی دەکردە سەر بەرامبەر. ئەو وەک نەوشیروان قسەی لە دڵ نەدەگرت و زو لەگەڵ بەرامبەر ئاشت دەبۆوە. بە ڕاستی کەسێتیی عاتیفیی (سۆزیاری) مام لەگەڵ سۆز و عاتیفەی گەلەکەیدا دەگونجا و هەروەها وزە و توانا و ئازایەتی و کۆڵنەدەریەکەشی لەگەڵ ئەو هەموە سەختی و قورسی و مەترسییەی خەباتی ڕەوای گەلەکەیدا دەگونجا، هەر ئەم مۆرک و پێکهاتانەی کەسێتیەکەشی بو کە دوای چەندین نوچدان و کەوتن و هەستانەوە کردی بەو سەرکردە مێژوییەی گەلەکەی.

## کۆکتەیلێکی کارا یا دوگیان لە یەك جەستەدا!

ئەگەر ورد بەراوردی ئەم دو کەسێتیە بکەین بۆمان ڕوندەبێتەوە، لە پەیوەند بە بەڕێوەبردنی (ینک) و شۆڕشە چەکدارەکەی، چەند لایەنێکی کەسێتیی گرنگ لە نەوشیروان دا نەبوە، بەڵام لە جەلال تاڵەبانی دا هەبوە. بەهەمان شێوە چەند ڕەفتار و مۆرکێکی کەسێتی کە بۆ بەڕێوەبردنی شۆڕش و (ینک) گرنگن لە نەوشیروان دا هەبوە، بەڵام لە جەلال تاڵەبانی دا نەبوە. یەک ئەوی تری تەواودەکرد. مامە و کاکە دو گیانی گونجاوبون لە جەستەی یەکێتیدا!

بۆیە دەبینین ئەم دو کەسێتیە، ئەم دو گیانە، لەگەڵ هەمو جیاوازی و کێشە و توران و تورەبون و ڕەخنە و گلەییان لە یەکتر، هەتا لە (ینک) دا پێکەوە بون، یەکێتی هێزێکی سەرەکی و بریاردەری خەبات بو. پارتی، لەگەڵ وەرگرتنی هەمو جۆرە کۆمەکێک لە ئیرانی شا و خومەینی، لە تورکیای شۆڤێنیی - کەمالی، لە عێراقی سەدامی، هەروەها لە گەڵ وەرگرتن و قوبوڵکردنی کەس و هێزە نەباشەکانی ناو کۆمەڵی کوردی لە ڕیزەکانیدا، بەڵام پارتی هێشتا هەر لە یەکێتی بێهێزتر بو.

بەڵام کاتێک ئەم دو گیانە وردە وردە لەیەکتر دورکەوتنەوە و جیابونەوە بینیمان و دەبینین یەکێتی چیی لیهات و پرۆژەکەی نەوشیروانیش بە کوێ گەیشت.

## ئۆکسجینی ئازادی تەواو !

پێشتریش، بەڵام بە تایبەتی لە دوای کۆنفرانسی سێ وە، ئیتر من وهاوڕێ نزیکەکانم وەک: مەحمود کەشکوڵ، د.قادر، شێخ دارا، مامۆستا پشکۆ، حاکم سەرداری حاجی

سەعیدی گلاڵی، د.کەمال (حەسان)، لەسەر باڵی عێراقچیەکان حساب دەکراین. بۆیە کە باڵەکەی نەوشیروان مستەفا دەسەلاتی تەواوی بەدەستهێنا و جەبار فرمان کرا بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەک و فەرەیدون عەبدولقادر لە لایەن نەوشیروان مستەفاوە لە کۆمەڵەدا دەسەلاتی فراوانی پێدرا، ئیتر وردە وردە پەستان و گوشینی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەسەرمان زیادی کرد. شێوازی سەربازی و نادیموکراتی و ناهاوڕێیانە وردە وردە زاڵ دەبو بە سەر پەیوەندیەکانا، ئێمە وردە وردە پەراوێز دەخراین و بەچاوی گومانەوە سەیرمان دەکرا. نوکی خەنجەری ئەم سیاسەتە نوێیەی ناو کۆمەڵە جەبار فرمان بو، نوکی پێنوسەکەشی فەرەیدون عەبدولقادر بو.

حیزبایەتیی بە ئاینکراو، وشک و داخراو، لەقاڵبدراو و یەک ئاراستە، ئاسۆی بیرکردنەوە و هەمو توانایەکی داهێنانی کەسە حیزبیەکە تەنگ و تاریک دەکات و دەیمرێنێ و، لە کۆتاییدا دەیکاتە مرۆڤێکی ڕقاوی و توندوتیژ و گوێڕایەڵ و دەسدرێژیکەر. من زۆر دڵشادم بەوەی لە ژیانی سیاسیمدا ئێستاشی لەگەڵ بێت هەرگیز حیزبیەکی وشک و لەقاڵبدراو نەبوم، کەسپەرست وسەرکردە پەرست نەبوم، بۆ نمونە لەو پەڕی چەپیمدا نەم دەوت من مارکسی - لینینیم بەڵکو دەموت من سۆشیالیستم، هەر لەبەر ئەمەش زۆر بەڕاست وبە پێویستم زانی کاتێک ناوی (کۆمەڵەی مارکسی - لینینی کوردوستان) گۆڕدرا بۆ کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردوستان. منی هەردەم کراوە بە ڕوی ژیان و دنیا و جیهانی فیکر و ئەدەب و هونەر و زانست، لەمێژبو لە ژیانی سیاسیم دا بۆم دەرکەوتبو کە هەرگیز جێم نابێتەوە لە هیچ خانە و دۆلاب و قاڵب و قەپیلکێکی وشک و برینگ و بێگیانی حیزبایەتی دا. بەڵێ ! ئەم جۆرە حیزبایەتیە کۆن - تازە یەی ناو کۆمەڵە ی دوای کۆنفرانسی سێ، وردە وردە ئاسۆکانی تاریکتر و تەنگتر دەکردەوە لیم و لە کۆتاییدا بوبە هۆی ئەوەی ئیتر کوردوستان ئەو جێیە نەبێت پڕ بە سینگی خۆم ئۆکسجینی ئازادیی تێدا هەڵمژم! من بە هۆی هەڵوێستەکانم بەتایبەتی لە کۆنفرانسی دو و سێ دا، ئیتر لەناو کۆمەڵە و یەکێتیدا برێک زیاتر وەک سیاسیەکیش نەک هەر وەک پزیشکێک دەرکەوتم. لەو دۆخە پڕ لە گرژی و ڕق و کینەیەی هاوینی ١٩٨٤ ی دوای کۆنفرانسی سێ، ڕۆژێک دوکتۆرقادر باسی دەسپێکی دروستکردنی ڕێکخراوێکی نوێی مارکسیی بۆکردم بە ناوی (ئاڵای شۆڕش)، داوای لێکردم لە ڕێی خۆیەوە منیش بێمە ناو ئەو ڕێکخراوەوە. هەمو ئەوانەی خەریکی دروستکردنی (ئاڵای شۆڕش) بون (عێراقچیەکان) ی ناو کۆمەڵە بون، ئەوان هاوڕێی

نزیکی من بون، بەڵام ئەو هاوڕێتیە نەبو بەهۆی ئەوەی من داواکەی دوکتۆر قادر پەسەند بکەم. ئەوە بو دەمودەس و بێ بیرکردنەوەیەکی زۆر پێم وت: واباشە شتی وا نەکرێت چونکە کەرتکردنی کۆمەڵە کێشەکان ئاڵۆزتر دەکات و سەریش ناگرێت، چونکە نەوشیروان مستەفا، جەلال تاڵەبانی پشتگیریی تەواوی دەکات و ئەم دو سەرکردەیە زۆر لە ئێوە بەئەزمونترن و ناهێڵن جیابونەوەکەتان سەربگرێت.

## ڕاوکردن بە شەوارە !

بیر و باوەڕ و ئایدیۆلۆجیاکان کە حیزبی سیاسیان لەسەر دروستدەکرێ (مارکسی، نەتەوەیی،...)، هەروەها ئاین و ئۆلی وئاینزاکان، لە دوائامانجیاندا کە ڕایدەگەیەنن لە یەک نزیکن، ئەویش چاکە و دادپەروەری و خۆشی و شادیی ئینسانەکانە. هیچیان نەیان وتوە ئامانجەکەمان داخستنی دۆزەخە بۆ خەڵک! بەڵام کاتێک هەر یەکێ لەوبیروڕایانە خۆی بە تاکە ڕێگای ڕاست زانی و ئەوانی تری بە خائین و کافر و هەڵگەڕاوە و لادەر و....، ئیتر هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕە وەک ئەو زیندەوەرانەیان لێدێ کە بە ڕوناکیی بەهێز لە شەودا بەر شەوارە دەکەون و بە ئاسانی ڕاودەکرێن، ئەوان ئیتر هەر بریقە و بریسک و پرشنگە زلەکە دەبینن، دەورووبەرەکەی نابینن.

## مێشك و دەمار و دەروونناسی، ڕاهاتن بەرامبەر گۆڕین و نوێبونەوە

کاتێک دەرزیەکی تیژ دەکەیت بە شوێنێکی مرۆڤ دا، ئەو هەست بە ئێشێکی زۆری شوێن دەرزیەکە دەکات، ئەگەر دەرزیەکە بەچەقاوی لە سەر شوێنەکە مایەوە، پاش ماوەیەک ئێشی دەرزیەکە کەمتر دەبێتەوە لە یەکەم جار. ئەم ڕاهاتنە هەر بۆ (وروژێنەرە) ناخۆشەکانی وەک ئێش، برسێتی، ترس... ڕونادات، بەڵکو بۆ (وروژێنەرە) خۆشەکانیش ڕودەدات، بۆ نمونە: بۆنخۆشترین عەتر، خۆشترین خواردن، کە چەندبارە بونەوە و بەردەوام بون، پاش ماوەیەک ئەو خۆشییەیان کەمتر دەبێتەوە، ئەم ڕاستیە فزیۆلۆجیە لە زانستی پزیشکیدا لە بەشی (مێشک و دەنمار) پێی دەڵێن (Sensory Adaptation واتە) ڕاهاتنی هەستەوەرەکان). ئەم ڕاهاتن و کەمبونەوەی هەستکردنە، جگە لە بەرکەوتنی پێست، لە هەمو هەستەکانی تری مرڤ (بینین، بیستن، بۆنکردن، چەشتن) بەهەمان شێوە هەیە و ڕودەدات.

ڕاهاتنی هەستەوەرەکان هەم لە تاقیگە زانستیەکاندا سەلمێنراوە هەم ئەزمونی ژیانیش سەلماندویەتی، بۆ نمونە کەسێک لە ژێر ئەشکەنجەدا ئەگەر دوسێ ڕۆژی یەکەم بەرگەی گرت و نهێنیەکانی نەدرکان، ئیتر کەسەکە خۆشە دەبێت و ڕایەت و ئێشی ئەشکەنجە کە کەمتر دەبێت و ئەگەری ددانپێنان وئاشکراکردنی ڕاستیەکان کەمتر و لاوازتر دەبێت. باوکێک لە منداڵەکەی زۆر دەدات تا وای لێدێت ئیتر لە لێدان ناترسێت، بە منداڵەکە دەڵێن سیوایی بۆتەوە. ڕاستەکەی لە بری سیوا (سوا) ی عەرەبیە کە بە واتای وەک یەک دێت واتا منداڵەکە لێدان کاری تێناکات و وەک لێنەدانی لێدێت. (ڕاهاتن) لە پەیوەند بە زانستە مرۆڤایەتیەکانیش وەک کۆمەڵناسی، سیاسەت، ئاین.... ڕودەدات، بۆیە گەشەکردن و گۆڕان و گۆڕین و نوێبونەوە هەم لە ژیانی تاکەکاندا هەم لە ژیانی کۆمەڵ و دەسگا و حیزب و دامەزراوەکاندا زۆر گرنگە و پرۆسەیەکی سروشتیی بەردەوامە و هەرگیز کۆتایی نایەت مەگەر بە مردنی کەسەکە و نەمانی دەسگاکە. بۆ ئەوەی لە ژیانی ڕۆژانەماندا توشی ڕاهاتن و بێزاری و ڕۆتینی بێچێژ و دوبارەبونەوەی بەردەوامی شتەکان نەبین، دەبێت ژیانی ڕۆژانەمان فرەلایەن و فرەئاراستە و ڕەنگا وڕەنگ بکەین، نوێی بکەینەوە و لەگەڵ گۆڕانە بەردەوامەکانی دەوروبەر بیسازێنین و بیگونجێنین، دەنا لە کاروانی گەشەسەندن و داهێنانە بەردەوامەکانی سەردەم دوادەکەوین و جێدەمێنین. بە چێژوەرگرتن لە شتە بچوکەکان، ژیانی ڕوژانەمان تەڕ و بڕ و گەرم و گوڕتر، هەروەها نەرم و نیان و خۆشتر و پرچێژ تر دەکەین.

بەڵام بیروڕا سیاسیە توندڕەوە یەکئاراستە و یەکلایەنەکان، هەروەها ئاین و ئاینزا نەگۆڕ و توندڕەوەکان، هەمویان ڕەش و سپین، خۆڵەمێشین، وشکن، وەڕسکەرن، لوتبەرز و فیزدارن، فوتێکراون، ناسروشتی و دەسکردن، دوبارە و نەگۆڕن، ناهێڵن مرۆڤ چێژ لە ژیان ببینێت. بۆیە ژیان و ژیاندۆستی، دنیا و دنیادۆستی لە ئاین و ئاینزا توندڕەوەکان و لە بیروڕا سیاسیە توندڕەوە نەگۆڕەکان دا نین و بەدەست ناکەون و بۆیان مەگەڕێ.

بەڵام بێگومان ژیانی ڕۆژانە دەبێت تەنگی و بچوکی و کورتیی جیهانی مادی و تام و چێژە کاتیەکان تێپەڕێنێ و بچێتە ناو نیشتمانی بەرین و بێکۆتایی بەها باڵا و جوان و چاک و نامادیەکانی گیان و ڕۆح. ژیان دەبێت واتادار و قوڵ بێت، ژیان دەبێت لە سەر چەندین بنەما و پرینسیپ و ئایدیا و بیروڕای ڕند و باش دروستکرابێت، وەک: دادپەروەری، یەکسانی، خۆشەویستی و لێبوردەیی و مرۆڤدۆستی، بوێری و ئازایی

له وتن و ڕوبەڕوبونەوەی ڕاستیەکان، ئازادی، زانین و زانست و دانایی. لای زۆرینە ژیان بە خۆشیی مرۆڤەکانی ترەوە خۆشە، نەک بە هەرمنی و خۆپەرستی.

جیاوازیی ئەم لایەنە نامادی و ڕۆحییەی مرۆڤ لە ئاین و ئاینزاکان ئەوەیە کە سروشتکرد و خواکرد و خۆبەخۆیە، لە ناخ و هەناوی مرۆڤدا جێگیرە. بەڵام ئاین و ئاینزاکان لە دەرەوەی مرۆڤەوە، هەر لە منالیەوە لە ڕێگای پەروەدە و فێرکردن و هەڕەشە و ترساندن و سزا و نەریتەوە خزێنراوەتە ناو مێشک و دڵ و دەرون و هەستی و نەستیی مرۆڤەوە. زورینەی مرۆڤە ئاینیەکان لایەنی ڕۆحی بچودەکەنەوە و دەیخەنە قالبی کۆمەڵێ سروت و عیبادەتی ڕۆژانەی ئاین و ئاینزاکەیان، بەڵام لایەنی ڕۆحیی مرۆڤ زۆر قوڵتر و بەرینتر و باڵاترە لە ئاینەکان و سروتە ڕواڵەتی و زۆرەملیەکانیان.

ئەم لایەنە ڕۆحیە بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدایە، بەڵام بە هۆی کێشە مادیەکانی ژیانی ڕۆژانەوە لە زۆر کەسدا لاوازبوە و یا تەنانەت پوکاوەتەوە و لەبیرکراوە.

## وتوویژێک لە ناو چڕە دوکەڵی هەرسێکمان!

هەر لەم کاتە گرژ و ناهەموارەدا بو لە مانگی ١١ ی ١٩٨٤ من و دوکتۆرکەمال پێکەوە چوینە لای نەوشیروان مستەفا لەماڵەکەی کە لە نزیک دێی (ئاوژێ)ی سەر بە ناحیەی (مەرگە) بو. لەسەر حەوزە ئاوەکەی نزیک ماڵیان دانیشتبوین، من و دوکتور کەمال برێک گرژ و نائارام و بێزار و نائومێد بوین. ڕەخنە و گلەییەکانمان دەربڕی لەسەر ئەوەی چۆن لێپرسراوانی سەربازیی کۆمەڵە ڕەفتاری ناهاوڕێیانە و توند و زبر دەنوێنن بەرامبەر بەوانەی وەک ئێمە بە (عێراقچی) دادەنران، بێگومان ئەوە لێکەوتە و ئەنجامی کێشەکانی ناو کۆنفرانسی سێ بو. من لە کاتی وتوویژی سیاسیی گرژدا حەزم دەچێتە سەرکێشان یا ڕاستتر بەبادانی جگەرەیەک، بەڵام جگەرەکێش نیم و دوکەڵەکەشی هەڵنامژم. ئێستا برێک گرژ و نائارام بوم، داوای جگەرەیەکم لە نەوشیروان مستەفا کرد، د. کەمالیش بەهەمان شێوە، نەوشیروان مستەفا کە خۆی جگەرەکێشیکی توندبو سەرو جگەرەیەکی پێداین. نەوشیروان مستەفا ڕێزی زۆری لێگرتین، پەسن و پێزانینی خۆی بۆ خەباتی من و دوکتۆرکەمال کە لە دێرینترین دوکتۆرە کانی ناو یەکێتیی نیشتمانی بوین، بەڕونی دەربڕی، دڵنەوایی کردین و دڵخۆشیی داینەوە، ئینجا وتی: نامە دەنێرم بۆ لێپرسراوە خۆجێییەکانی گەرمیان

و شارباژێڕ کە لە جاران زیاتر بەڕێز و پێزانینەوە هەڵسوکەوتتان لەگەڵ بکەن. نەوشیروان مستەفا نەیویست ڕاشکاوانە و ڕاستەوخۆ باس و خواسی سیاسیمان لەگەڵ بکات، بۆیە ڕەخنەکانی ئێمەی زۆرتر وەک کێشەیەکی شەخسی و نەگونجان و لەیەک تێنەگەیشتن تەفسیرکرد نەک وەک ڕەخنەیەکی سیاسیی گرنگ، بەلام ئێمە لەگەڵ لێپرسراوە سیاسی و ئیداریە خۆجێییەکان هیچ کێشەیەکی شەخسیمان نەبو. بۆیە دانیشتنەکە ئاوا کەوتەوە کە نە نەشیروان مستەفا و نە ئێمە هیچ باسی ڕوداوەکانی ناو کۆنفرانسی سێ و کێشە و ناکۆکیە سیاسیەکانی ناو کۆمەڵە مان نەکرد، وە ئەو لە ڕوی سیاسی و ڕێکخراوەییەوە داوای هیچی لە ئێمە نەکرد کە بیکەین یا نەیکەین. دیاربو نەوشیروان مستەفا دەیزانی شەڕ لە گەڵ ڕژێم دەست پێدەکاتەوە و شۆڕشیش زۆر پێویستیی بە دوکتۆر و کادیری پزیشکیە، بۆیە پەیامی ناڕاستەوخو و نەوتراوی نەوشیروان مستەفا ئەوە بو دەیویست من و دوکتۆرکەمال هەر کاری پزیشکیی خۆمان بکەین و حەقمان بەسەر سیاسەتەوە نەبێت. ئەو نەیتوانی لە ڕوی سیاسی و ڕێکخراوەییەوە دڵمان خۆشبکات و ئاسۆیەکی ڕونتر و گەشترمان بۆ ئایندە پیشان بدات. بەلام من و دوکتۆرکەمال و هاوبیرە ڕەخنەگرەکانمان لە ناو کۆمەڵە تینو و برسیی سیاسەتێکی دانا و حەکیم و هاوسەنگ بوین کە برینە جۆراوجۆرەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی سارێژبکات و هەمو هێزوتواناکان کۆبکاتەوە بۆ درێژەپێدانی خەبات. سیاسەتێکی ئاوا لەو ڕۆژانەدا زۆر پێویست بو چونکە دەرکەوتبو مفاوەزات هیچی لێ سەوزنابێ و ڕژێمی سەدام دەسی بە یەکێتیی نیشتمانیی دەکات و نایەوێ هیچ بە کورد بدات.

بە نائومێدی و نیگەرانیەوە مالاواییمان لە نەوشیروان مستەفا کرد و گەڕاینەوە بۆ شارباژێڕ.

## بۆ وا نائومێدیان کردن؟

کەسێتیی من وەک هی هەر کەسێکی تر، جگە لە لایەنی بیرکردنەوەی لۆجیکی و شیکاریی خاڵ بە خاڵ و حیساب بۆکراو، لایەنەکەی تری لایەنی هەست و سۆز و عاتیفە یە، ئەم لایەنەم ئەگەر لە لایەنە عەقلانیەکەم بەهێزتر نەبێت، لاوازتر نیە، پەندێکی ئەلمانی دەڵێت هەست و سۆزەکان دەمانبەن بەڕێوە، عەقل و بیرکردنەوە شێوەمان دەدەنێ. من لەگەڵ هەمو ڕەخنە لۆجیکی و عەقلانیەکانم لە کۆمەڵە و

یەکێتی و سەرکردە دەسەلاتدارەکانی ناویان، هەروەها لەگەڵ بەرچاوڕونیی تەواوم دەربارەی مەترسیەکانی مانەوە لە شۆڕشدا، بەڵام هەست و سۆزە ڕاستەقینەکانی ناخی دەرونم پێیان دەوتم لە ناو شۆڕشدا بمێنەرەوە. هەر هەمان ئەم هەستە قوڵانە بو پێشتریش بڕیاریان پێدام هاوژینگیری بکەم و هە تا کۆتایی لە شۆڕشدا بمێنمەوە، ئەمە لە کاتێکدا بو پێشبینی نەدەکرا کۆتایی چی وچۆن دەبێت: کوژران، زامداربون و کەمئەندامی، بەدیلگیران یا تەنانەت سەرکەوتنیش، بۆ نا؟ مەگەر لایەنێکی بەهێزی کەسێتیی من گەشبینی و هیوابون بە سەرکەوتن نیە؟

بەڵام بیروڕاکانی دوکتۆرکەمال و حاکم سەردار و مەلا عوسمان کاریگەریەکی زۆریان لەسەر دانام، ئەوان بێ دودڵی ڕایان وابو پێکەوە وازبهێنین و کوردوستان جێبهێڵین، بەڵام بۆ ئەم بڕیارە من هێشتا بڕێک دودڵیم تێدا مابو. لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا و دوای چەندین سەعات بیرکردنەوە لەگەڵ خۆم دا و وتوویژ لەگەڵ براکانم و هاوڕیکانم ئەنجامەکەی بەوە گەیشت کە منیش چومە سەر ڕای هاوڕێکانم و پێکەوە بڕیارمان دا واز لە کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی بهێنین و پێکەوە بەزوترین کات کوردوستان جێ بهێڵین. پیشتر لەگەڵ پەیمان دا باسی ئەم بابەتەمان کردبو، ئەویش ڕەخنەی زۆری لە سەرکردایەتیی (ینک) و کۆمەڵە هەبو، دواتر کە باسی نیازی خۆمم بۆ کرد، ئەویش پێی پەسەند بو و پشتگیریی کردم بە مەرجێ بەتەنیا نەڕۆم. لەو بڕیارەم دا لایەنی ئاوەز و هزر و بیرکردنەوەی لۆژیکی بەسەر لایەنی هەست و سۆز و هەڵچون سەرکەوت، هەردەبو و هەردەبێ ئاوا بێت، لە دۆخ و چرکە چارەنوس سازەکانی ژیانماندا دەبێت لە دەرونێکی ئارام و هاوسەنگەوە بڕیاری کۆتایی هەرعەقڵ و هزر و مەنتیق بیدات نەوەک عاتیفە و هەست و سۆزە شڵەژاو و نائارام و هەژاوەکان. بڕیاری جێهێشتنی کوردوستان و سەرهەڵگرتن ڕووە و ئایندەیەکی نادیار، بڕیارێکی پڕئازار و گەلێک سەخت بو، نەک هەر بۆ من بەڵکو بۆ خێزانەکەشمان. لە گەڵ دوکتۆر کەمال و حاکم سەردار بڕیارەکەمان بۆ کاک حسەینی برام باسکرد. کاک حسەین بە مەخابن و غەمێکی قوڵەوە، بە نیگەرانیەکی هەڵقوڵاو لە دەریای دڵ ودەرونێکەوە شەپۆلی دەدا لە مرۆڤدۆستی و دڵسۆزی بۆ کورد و کوردوستان، ڕوی تێکردین و چاوی بە سەر هەرسێکماندا گێڕا و پێی وتین: «ئاخر بۆ؟ خۆ ئێوە لە هەرە دڵسۆزەکانی ناو یەکێتی و کۆمەڵەن! بۆ وا نائومێدیان کردن؟ بۆ وا هیوابڕاوبون ؟ ئەی ئەمەی ئێوە دەیکەن باشە ؟ زیان بە شۆڕش ناگەیەنی؟ بۆشاییەک جێ ناهێڵی؟»، کاک حسەینی ڕاستگۆ لەگەڵ بیروباوەڕەکانی، خەم و نیگەرانیی بۆ شۆڕش بەهۆی ئەوەی دو دوکتۆر و دو یاساناس

ڕیزەکانی جیدێڵن، زۆرتر بو لە ترس و نیگەرانیی ئەوەی براکەی لەدەست بدات لە حاڵەتی مانەوەیدا لە شۆڕشێکی چەکداری ئاینده نادیاری درێژخایەنی پڕمەترسی دا!

بە نوسراوێکی چەند لاپەڕەیی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانی و مەکتەبی عەسکەریی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە م ئاگادارکردەوە لە دەس لەکارکێشانەوەم و هۆکانی وازهێنانم لە کۆمەڵە ویەکێتی. براکانم دوای گەیشتنمان بۆ ئێران دەست لەکارکێشانەوەکەمیان ڕادەستی مولازم عومەری لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری کردبو لە سورداشت.

## ڕێکەوتەکان لەگەڵمان بون!

ئێمە کە زۆر باش شارەزای جوگرافیای خاک و جوگرافیای سەربازیی ناوچەکە بوین، دەمانتوانی لە ڕێی شارباژێڕ و پێنجوێنەوە زۆر بە ئاسانی بچینە ناو ئێران، بەڵام ئەمەمان نەکرد چونکە لێپرسراوانی ئەو ناوچانە: بەکری حاجی سەفەر، وەهاب و جەمالی حەمەی خواکەرەم هاوڕێی نزیک و خۆشەویستمان بون، نیگەرانی ئەوەبوین ڕەخنەی توندیان بێتەسەر کە چۆن بە بەرچاوی ئەوانەوە ئێمە توانیومانە لە ناوچەکانی ژێر لێپرسراوێتیی ئەوانەوە بچینە ناو ئێران.

دوای ماڵاوایی لە باوکم و دایکم و خوشک و براکانم، پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠ ی ١٢ ی ١٩٨٤ من و هیوا ی خوشکەزام لەگەڵ دوکتۆرکەمال و هەرسێ براکەی (جەلال و ئاری و مستەفا) و ستار کەرکوکی بە دو تاکسی خۆمان گەیاندە پردی زەڵم لە سەر جادەی نێوان سلێمانی و هەڵەبجە. لە نزیک پردەکە دابەزین و بە پێ بە ناو شەخەڵ و درەخت و ئاوی زەڵمدا خۆمان گەیاندە دێی (شیرەمەڕ). ئەم گوندە ناوچەی شەڕی ئێران و عێراق و (پ.م) کانی پارتی و شیوعی و (حسک) بو، هەروەها ناوچەی پەڕینەوەی خەڵکی جۆراوجۆر بو بۆ ئێران، بەراستی ڕێیەکی پڕ مەترسی بو. ئێمە بە پێی نەخشەکەمان چوینە ماڵی هاوڕێیەکی (شێخ هادی) خاڵم، دوای نیو سەعاتێک خاڵم و پەیمانی هاوژینم و (کێوان) ی کوڕم کە چوارمانگ و نیو تەمەنی بو، بە ئۆتۆمبیل گەیشتنە شیرە مەڕ و هاتنە ئەو ماڵەی ئێمەی لێبوین. خاڵم و هاوڕێکەی چونە دەرەوە، بە پشکنین و کۆڵینەوە و پرسیار بۆیان دەرکەوتبو جاش و سەرباز لە ناو دێ و لەدەرەوەی دێ نین و دۆخەکە ئارامە، بەڵام دڵنیا نەبون لەوەی داخۆ لە دەوروبەری ئەو ڕێگایانەی بەرەو شاخی سورێن دەچن کەمینی جاش و سوپای عێرقی لێیە یان نا ؟ بڕیارماندا بە وریاییەوە لە پێشا ئێمە پیاوەکان بڕۆین. دوای حەسانەوە و چاوەڕێکردن، کاتێک ڕۆژ بەرەوئاوابون دەچو ئێمەش ماڵاواییمان لە

پەیمان و خاڵم و کێوان کرد، لە ماڵەکە جێمان هێشتن و ڕووە و ئەو ڕێگایەی پشتی دێ ڕۆشتین کە بەرەو شاخی سورین دەیبردین. هەر لە قەراخ دێ دابەش بوین بە دو دەستە، بەرودوا زۆر بە وریایی و دوربینی ملی ڕێگامان گرت.

هێشتا کەمێک مان مابو دەستمان بگات بە دامێنی سەختی شاخەکە، دوایین تاوە لاوزەکانی خۆر جێی نەدەهێشتین تا تاریکی دابێت و بە ڕەحم و بەزەیی خۆی دامانپۆشێت و بمان شارێتەوە لە دوربینی پیاوکوژەکانی ڕژێمی سەدام. دەنگی هێلیکۆپتەرێک بەئاگای هێنایەنەوە کە بەرز دەفڕی، لە شانسی ئێمە گاگەلی شیرەمەڕ بەرەو ئاوایی ملیان دەنا و لە نزیکمانەوە بون، بە کورە کوڕ خۆمانکرد بە ناو گاگەلەکەدا هەتا کۆپتەرەکە لە چاومان ونبو. ئەم تولە ڕێگا ستراتیجیە لە ژێر بنچاوی بەردەوامی بنکە سەربازیەکانی سەر ئەو سێ گردەی ناوچەکە بو کە ناویان (سێتەپان) بو، لەو بنکانەوە ڕێگاکە ناوبەناو دەدرایە بەر هاوەن، ئێمە لەمەشیان شانسمان هەبو کە هیچ تۆپ و هاوەنێکیان تێنەگرتین. کە گەیشتینە دامێنی شاخە سەختەکەی سورێن، وردە وردە تاریکی باڵی کێشا بەسەرماندا و ئیتر مەترسی لە سەرمان نەما. وا بڕیار بو کە تاریکی داهات، خاڵم پەیمان و کێوان بگەیەنێتە لامان، بەڵام دوای سەعاتێک چاوەڕوانی هەر نەهاتن. ئیتر من ئۆقرەم لێبڕا و بەتەنیا گەڕامەوە ناودێ بەشوێنیاندا. ئینجا پێکەوە لەگەڵ خاڵم بە هەمان ڕێدا بەرە و شاخەکە ملمان ناو خۆمان گەیاندەوە هاوڕێکانم. سوپاس و ماڵاواییمان لە خاڵم کرد. دوای چەند سەعات ڕێگا بڕین و هەڵگەڕان بە سەر ئەو شاخە سەختەی سورێندا، بە لای بنکەیەکی پارتیدا تێپەڕین و خۆمان گەیاندە شوێنێک بە ناوی (وشکە ناو) کە (پ.م) کانی (حشع) چادرێکی گەورەیان لێهەڵدابو و کردبویانە بنکەی خۆیان. ڕێزی زۆریان لێگرتین، ئیتر شەو درەنگ بو، ژێر چادرەکە زۆر ساردبو، چەند بەتانیەکیان پێداین، هەستم کرد لەو سەرمایەدا خەوم لێناکەوێت، بۆیە بەتانیەکەی خۆمم دا بە پەیمان وکێوان، خۆیشم بە هاتوچۆ بە ناو چادرەکەدا بڕێک گەرمم بۆوە و شەوەکەم بێخەو بەسەربرد. بۆ بەیانی لە گەڵ (پ.م) کان نان و پەنیر و چامان خوارد، پێیان وتین دەبێت پسوڵەی پارتیتان پێبێت دەنا پاسدارەکان ناهێڵێن بچنە ناو ئێران. دوای دو سەعاتێک پێڕە و خۆمان گەیاندە شوێنێکی سەخت پێیان دەوت (کەڕە جاڵ) کە دەکەوێتە پشتی تاڤگە بەخورەکەی (ئەحمەداوا). لەم شوێنە پەنا و تەنگە دا و لە ژێر سایەی چەند تاشەبەرد و تلە بەردی گەورە و درەختی داربەڕودا چادرێکی بچوک هەڵدرابو کە بنکەی (پ.م) کانی پارتی بو. (مەلا عومەر) ی لێپرسراوی بنکەکە دوای چەند پرسیارێک پسوڵەی ڕێگەپێدانی بۆکردین.

## کاروانێکی ژیاندۆست بە سەر لێواری مەرگ دا

لە کەرەجاڵ ئێستریکمان بۆ پەیمان و کێوان بەکرێ گرت، ئینجا لەگەڵ دەستە کەماندا ڕاست بەرە و ژور ملی بزنە ڕێگاکەمان گرتە بەر. دەبێت سەرکەوین بۆ دوندی (ملەخورد) کە لوتکەیەکی بەرزی زنجیرە چیای سورێنە، ئەودیوی ملەخورد ئێرانە. مەترسیی گەورە هەیە تۆپە دورهاوێژەکانی سوپای عیراق تۆپبارانی ئەم تولەڕێیە بکات، یا فڕۆکە جەنگیەکانی بۆمبابارانی بکات. پڕوشەبەفر ورد ورد دەباری، لەو شوێنەی پێی دەڵێن (پلەی مەلا مستەفا) بەفرەکە تا ئەژنۆ هاتبو. من وهیوای خوشکەزام بەفر سەروریشی داپۆشیبوین، لە پێینی ڕێگاکەوە توند شانمان دابوە بەر ئێسترەکە کە پەیمان و کێوان بەسەر پشتیەوە بون، خلیسکانێکی بچوکی ئێسترەکە لەو لوتکە بەرزەوە واتای هەڵدێران و مردنی هەرپێنج مان بو! لەم تەنگانە گەورەیەشدا ئێستر کە لە هەندێ ناوچەی کوردوستان پێی دەڵێن (بارگین یا قاتر) جارێکی تر بە فریامان هات. بەلاّم کە گەیاندینیە لوتکە و لە مەترسیی ڕەقبونەوە و هەڵدێرانی دەربازکردین، ئەم جارەیان وەک ئێسترەکەی سورەبانی پێش سێ ساڵ، تەوێڵی ئەم ئێسترەم ماچ نەکرد، بەڵکو چاوی خەیاڵم ئەم دیمەنەی بینی: «لە چوار ڕێیانێکی گەورە و شایستەی شاری سلێمانیدا، پەیکەرێکی برۆنزیی جوان و ناوازە ی ئێسترێک دانرابو، ئەم پەیکەرە نوێنەری هەمو ئێسترە پاڵەوانەکانی کوردوستان بو. باشترین و دەست ڕەنگینترین هونەرمەندی پەیکارسازی کوردوستان خولقاندبوی. ئەم پەیکەرە وەفایەک بو بۆ لەبیرنەچونەوەی هەمو ئێسترە کۆڵبەرە کۆڵنەدەرەکانی کوردوستانی گەورە، کە هاوکاریی خەڵکەکەی دەکەن بۆ پەیداکردنی بژیو و درێژەپێدانی ژیانی کولەمەرگیان. ئێستا لە ئاهەنگێکی بچوکدا پەردەی لەسەر لادرا و چەپڵە لە ئاپورای خەڵکەکەوە بەرزبۆوە.»

لەم شوێن و کاتە ئەستەمەدا کە ژیان ومردن زۆر نزیکن لە یەکتر و لە پاڵ یەکدان، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئارامی و نەگریانی کێوان بو، هەروەها بێدەنگیی ئەم کاروانە بچوکە بو. ئەم کاروانۆکە بێ کاروانچیە، بە کاوە خۆ، هێدی هێدی، کش و مات، بێ دەربڕینی هیچ سکالاّ و گلەییەک، بێ وتنی هیچ نزا و پاڕانەوەیەک، بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەک، دەیویست خۆی ڕزگارو قوتاربکات، لە بەفری سارد و سەرما ی شاخی سورێن و، لە ئاگری دۆزەخی شەڕە بێکۆتایی وجۆراوجۆرەکان کە پشتی

تێیان کردبو. چوار ساڵ دواتر لە بەهاری ساڵی ١٩٨٨ سوپای ئێران ئا لێراوە جادەی سەربازیی ڕاکێشا و بە دەیان جێبی سەربازی و زرێپۆشەوە خۆی گەیاندە هەڵەبجە و لە تۆڵەی ئەمەدا ڕژێمی سەدام شارەکەی بە گازی کیمیاوی بۆمباران کرد و کارەساتی هەڵەبجەی لێکەوتەوە.

## هەموی بە بایەك!

تەواو تەواو! لە مەترسیی لە سەرما ڕەقبونەوە، لە هەڵدێران و ملشکان، لە لوغم و تۆپ و تەیارە، ڕزگارمان بو، بزانین چ مەترسیەکی تر خۆی بۆ مەڵاس داوین و پێی نازانین، چەند باش و خۆشە کە پێی نازانین! ڕومان کردە ئەو بنکە سەربازیە ئێرانییەی لە دامێنی لوتکەی شاخەکە لە نێوان تاشەبەردەکان و لە پشتی گونیە پڕلە خۆڵەکاندا خۆی دامەزراندبو و مەڵاسدابو. دیاربو پاسەوانانی ئەو بنکەیە بە دوربین ئێمەیان بینیبو، چاودێریان کردبوین و چاوەڕێیان دەکردین. پاش بە خێرهاتن، نان و شلەی گەرم لەگەڵ یەک دو باڵی مریشکیان بۆ دانایین، کە باش تێری نەکردین. پاسدارەکان لە میانەی وتووێژ لەگەڵمان زۆر بە جیدی لێیان پرسین کەربەلا و نەجەف چەند لێرەوە دورە؟ ئا لەم چرکە کاتەدا پرسیارەکە ئەو نوکتەیەی هینایەوە بیرم کە تازە لە عێراقدا بڵاوبوبۆوە: پاسدار و سەربازە ئێرانیەکان سەدان کیلۆمەتر بە ناو لوغم و لە ژێر ئاگری تۆپ و تەیارەدا دەڕۆن و هەوڵدەدەن خۆیان بگەیەننە کەربەلا کە ڕوباری فورات بە ناویا دەڕوات. ئامانجی ئەم گەشتە پڕمەترسیە بۆ ئەوەیە دەسنوێژێک لە ئاوە پیرۆزەکەی فورات بگرن ولەسەر گۆڕی ئیمام حسەین نوێژێک بکەن، بەڵام هەمو ئەو ماندوبونە یان بە بایەک بەتاڵ دەبێتەوە و دەسنوێژەکەیان دەشکێ! دوای حەسانەوە پاسدارەکان پسوڵەی ڕێپێدانی چونە ناو ئێرانیان بۆکردین.

## قاقای پێکەنین!

ئەم کاروانە شانسدارە دوای نانخواردن و پشویەکی کورت لای پاسدارەکان، بە پێ کەوتەوە ڕێ، ئیتر پێویستمان بە ئێسترەکە نەبو بۆ پەیمان و کێوان چونکە ڕێگاکە بەرەوخوار بو و بە بەفر گیرابو. هەر بە پێ بە شاخەکەدا بە دیوی ئێران بە نشێوەکەدا داگەڕاین، شوێنەکە هەموی بەفرێکی زۆر داپۆشیبو. جەلال لە هەمومان قەڵەوتر و جەستەی شل و ناجێگیتربو. جەلال لە پڕ خلیسکا، کۆنترۆلی بەسەر خۆیدا نەما، گرمۆڵەبو و وەک تۆپێکی قورس بە خێراییەکی زۆر بە لای پەیمان دا تێپەڕی

و بەرەوخوار تل بۆوە. پەیمان کە جەلالی بەم شیوەیە بینی دایە قاقای پێکەنین، دوکتۆرکەمال زۆر تورەبو و وتی براکەم خەریکە ملی دەشکێ و تۆش پێدەکەنی!

لە خوارەوە پیکابێکی سەربازی چاوەڕێی دەکردین، دیاربو پاسدارەکانی سەر شاخ بە بێتەل داوای ئوتومبیلیان بۆ کردبوین. سواری پیکاب بوین و بە ناو گوندی (دزلی) دا بەرەو شاری مەریوان بەڕێکەوتین.

## ترسێکی باش!

پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتینە مەریوان، لێرە من و پەیمان وکێوانیان لە ڕەبەنەکانی هاوڕێمان جیاکردەوە و لە ژورێکدا دایان ناین. لەو لێکۆڵینەوە کورتەی لەگەڵیان کردم من زۆرکەم دەدوام و وەڵامی پرسیارەکانیانم زۆر بە کورتی دەدایەوە. خۆم وەک کەسێکی ناسیاسی و دوکتۆرێکی ڕاکردو لە شەڕی ئێران وعێراق ناساند. من دەترسام شتێکی زیادە بڵێم، قسەیەک قسەیەکی تر بێنێت و ببێتە هۆی دەرکەوتنی نهێنیی کەسێتیم. هەموی چوار ساڵ تێپەڕیبو بەسەر ڕۆژانی چالاکیەکانی من وەک پێشمەرگەیەک لەم شارەدا کە ئێستا وەک پەنابەر تێیدام، ئەو ڕۆژە شەڕانیانەی شان بە شانی پێشمەرگە ی کۆمەڵەی ئێران و خەڵکی مەریوان خەباتم دەکرد. باش بو کەس منی نەناسیەوە و لەم تاقیکردنەوەیەش بە پلەی باش دەرچوم. بۆ بەیانی وەک خێزانێک ئێمەیان نارد بۆ شارێکی بچوکی ٥٢ کیلۆمەتریی باشوری تاران بەناوی (وارامین). ئیتر بەتەواوی لە هاورێیانی ڕەبەنیان جیاکردینەوە و هەواڵمان لە یەکتری برا. لە پشکنین و لێکۆڵینەوەدا هەندێک یاداشتی پێشمەرگایەتی بە دەستی د.کەمال دەگرن و ئاشکرا دەبێت کە (پ.م) ی یەکێتی بوە.

## سەر کز و دڵ وریا !

سەیرە زۆر سەیرە! دەسەلاتداران لە هەمو ولاتانی دنیا، تەنانەت لە ولاتانی دیموکراتیشدا وەک ئەوروپا، حەزناکەن خەڵکی ولاتەکەیان سیاسی بێت و زانیاریی باشی لە سەر ولات و چۆنێتیی بەڕێوەبردنی ولات هەبێت. بۆ درێژەپێدانی دەسەلاتەکەیان بە سەر خەڵکدا، دەیانەوێ خەڵک سەری خۆی کزبکات و بە ژیانێکی کەم و نەگۆری خێزانی ڕازی بێت. فەرمانڕەوایان حەزناکەن خەڵک سەر بەرزبکاتەوە

و به دەوری خۆیدا بروانێ تا بزانێ لە دنیا چ باسە ! منیش هەر ئەوەم وت کە دەسەڵاتدارانی ئێران حەزیان دەکرد بیبیسن: من سیاسی نیم و نەبوم. لە وارامین لە لێکۆڵینەوەیەکی ورد کە (عەبدوڵا) ناوێک بە زمانی عەرەبی لەگەڵی کردم، وتم من سەربازی هەڵاتو بوم، وەک دوکتۆر لە ناوچە ئازادکراوەکان بە پارە کارم کردوە و خۆم و خێزانەکەمم پێ ژیاندوە. ئەگەر بموتایە (پ.م) ی یەکێتی بوم توشی کێشەی زۆردەبوم، چونکە بە هۆی وتووێژی یەکێتیەوە لەگەڵ ڕژێمی سەدام ئێران زۆر لە یەکێتی تورە بو. دەبوایە لە سەر یەکێتی زۆرترین زانیاریم بدایە پێیان ئینجا وازیان لێدەهێنام و دەیانهێشت لە ئێراندا وەک پەنابەرێکی ئاسایی ڕەفتارم لەگەڵ بکرێ. جگە لەوە، لە هەستی نیشتمانیمەوە من هەر نەم دەویست لە سەر یەکێتی و کۆمەڵە و شۆڕشی کوردوستان بە گشتی هیچ جۆرە زانیاریەک بدەم بە ئێرانیەکان. ئەوەندە بە دڵنیایی و بڕوابەخۆبونەوە وەڵامم دایەوە کە (عەبدوڵا) ی لێکۆڵەر بڕوای پێکردم، خواهەڵناگرێ ئەمیش هیچ زۆر و هەڕەشەیەکی لەگەڵم بەکارنەهێنا!

سەیر بو! باشیش بو! نە لە مەریوان نە لە وارامین هیچ لێکۆڵینەوەیەکی وردیان لەگەڵ پەیمان نەکرد، ئەمە وادیاربو پەیوەندیی بە دیدی پاشکەوتوانەی ڕژێمی ئیسلامیی ئێرانەوە هەبو بەرامبەر بە ژن. باش بو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ پەیمان نەکرد، چونکە ئەگەری ئەوە بەهێز بو قسەکانمان یەک نەگرنەوە و دژبەیەکبون یان تیا دەربکەوێ و، لێکۆڵەر بە پرسیاری ورد ڕیسی چیرۆکەکەمان لێ بکاتەوە بە خوری ودەستمان بکەوێتە ڕو، ئینجا خوا ئەزانێ چییان پێ دەکردین! بە ویژدانێکی ئاسودەوە و بە سەربەرزی، لە وارامین قۆناغی لێکۆڵینەوەمان تێپەڕاند.

## پێشوازیەکی نا دۆستانە !

دوای چەند ڕۆژێک بە پاس لەگەڵ چەند خێزانێکی تر ئێمەیان لە وارامینەوە گواستەوە بۆ کەمپی پەنابەران لە شاری (جەهروم) کە بە دوریی (١١٢٠ کم) دەکەوێتە باشوری تاران، لە نێوان شیراز و بەندەر عەباس، بە نزیکەی بیست سەعات،ماندو و شەکەت گەیشتینە کەمپەکە. ژورێکیان پێدایین، شوێنەکە زور گەرم و بێئاو و ناخۆش بو، هەر شەوی یەکەم دوپشکێک پیشوازیەکی نامەردانەی لێکردین و لە خەودا زریکەی لە پەیمان هەستاند. من هەوڵی زۆرم دا بە خۆبەخشیش بێت لە بنکەی تەندروستیی کەمپەکە وەک دوکتۆر کاربکەم، بڕوانامەکەمم پیشاندان، بەڵام نەیانهێشت.

باشە جگە لە گومانی بێبنەما و ڕق و سەپاندنی دەسەڵات بە سەر پەنابەردا، هۆیەکی تر هەبو کە نەیان هێشت وەک پزیشک کاربکەم؟ لە کەمپەکە چەندین خێزانی ناسیاو و نەناسی کوردی خۆمانی لێبو کە هاتوچۆی یەکترمان دەکرد. بە دەم چاخواردنەوە دەکەوتینە گێڕانەوەی بەسەرهات و چیرۆکە جۆراوجۆرە تاڵ و شیرینەکان. باسی ڕوداوەکانی ژیانمان دەکرد لە سایەی ڕژێمی سەدام و شەڕە بێکۆتاییەکانی، ژیانی پێشمەرگایەتی و ژیانی هەندێکی ترمان وەک سەربازی هەڵاتو لە شەڕی ئێران-عێراق، ئینجا ڕاکردن لە عیراق و ئاوارەبونی ناو ئێران.

## کونتە کینتە

بێئیش بوین و کاتمان زۆر هەبو، بۆیە من دەستم دایەوە دەستە میهرەبانەکەی کتێب، ئەو هاوڕێ هەتاهەتایە بەوەفایەم کە هەمیشە بەهانامەوە هاتوە. ڕۆمانی (ڕەگ و ڕیشەکان) ی نوسەری ڕەشپێستی ئەمریکی (Alex Haley ) م بە عەرەبی خوێندەوە، چێژێکی زۆرم لێبینی. (ئەلیکس هیلی) بەسەرهاتی ڕاستەقینەی کوێرەوەیی ڕەشپێستە کانی ئەمریکا دەگێڕێتەوە. باسی دەکات چۆن ئەوروپیە سپی پێستەکان لە ئەفریقاوە فڕاندویانن و لە ئەمریکا کردویانن بە کۆیلەی خۆیان. ئەم ڕۆمانە وەرگێڕدراوەتە سەر ٣٧ زمان و لەساڵی ١٩٧٧کراوە بە زنجیرەی تەلەفیزۆنی کە زۆرترین بینەری هەبوە و دەیان خەڵاتی گەورەی وەرگرتوە. (ئەلیکس هیلی) خۆی بۆ دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی بنەماڵەکەیان دەیان جار ڕۆشتبو بۆ وڵاتی گامبیا. ئەو دوای کنە و گەڕان و کۆڵینەوەیەکی زۆر توانیبوی ئەو گوندە بدۆزێتەوە کە کاتی خۆی حەوتەم باپیرە گەورەی کە ناوی (کونتە کینتە) بوە، وەک هەرزەکارێک لە لایەن سپی پێستەکانەوە فڕێنرابو. (کونتە کینتە) لەگەڵ سەدان ڕەشپێستی فڕێنراوی تری ئەفریقی بە کەشتی هێنرابون بۆ ئەمریکا. (کونتە کینتە) کە دەگاتە ئەمریکا، لە مرۆڤێکی ئازادەوە دەیەکەن بە کۆیلە و وەک کۆیلەیەک دەیفرۆشن. ئەم تازە کۆیلەیە، سەرکەش و ئازادە و بە چارەنوسی خۆی ڕازی نابێت و دەیان جار هەوڵی ڕاکردن دەدات. (کونتە کینتە) لە کۆتاییدا خاوەنەکەی بۆ ئەوەی ئیتر واز لە هەوڵی ڕاکردن بهێنێ، نیوەی پێشەوەی پێی ڕاستی دەبڕێتەوە، ئیتر بە ناچاری ژیانی کۆیلایەتی دەپەژرێنێ. (کونتە کینتە) ژن دەهێنێ، لە ژنەکە کچێکی دەبێت و ئەمیش کە شو دەکات و نەوە دەخاتەوە یەکێک لە نەوەکانی دەبێتە (ئەلیکس هیلی) ی نوسەری ڕۆمانەکە.

بەسەرهاتە ڕاستەقینەکانی ئەو کوێرەوەری و چەوساندنەوەیەی بەسەر ئینسانی کوردا هاتون، تازەترین نمونە دەسدرێژیکردنی جنسی بۆ سەر سەدان کچ و ژنی کوردی ئێزدی لە لایەن جەنگاوەرانی ئیسلامیی داعشەوە لە مانگی ئابی ٢٠١٤ بەدواوە، سەدان ڕۆمانی وەک (ڕەگ و ڕیشەکان) ی تیادەبێت. هیوادارم دڵسۆزان و دڵگەرمانێک هەبن بتوانن بە ڕۆمان و شیعر و مۆسیقا و فیلم و جۆرەکانی تری هونەر، ئەو کارەساتانە دەربڕن و حەقی خۆیانی بدەنێ، بەڵکو لە ئایندەدا ڕۆمان نوسی کوردی وا دەرکەون کە ڕۆمانەکانی (بەختیار عەلی) تێپەڕێنن، هەروەها هونەرمەندانێک بگەشێنەوە پیکاسۆ و ڤان کۆخ و... پێشبەنەوە.

## دوکتۆر هەژار پاس !

لە جەهروم وردە وردە کەوتمە قوڵبونەوە لە زمانی فارسی. ئینجا خۆم فێری ماتۆر لێخوڕینیش کرد. کاتی فتبۆڵێن یشم هەبو. پاشنیوەڕۆیەک لەگەڵ چەند کوردێکی خۆمان فتبۆڵێنم دەکرد، لە پڕ یەکێکیان هاواری کرد (دوکتۆر هەژار پاس)، تۆزێک ترسام، چونکە من بە ناوی ڕەسمیی خۆم (عەبدولڕەحمان) وەک سەربازێکی هەڵاتو خۆم لای ئێرانیەکان ناساندبو. کوڕەکەم بانگ کردە لاوە و وتم کاکە من (عەبدولڕەحمان) م، بە زەردەخەنەیەکی دۆستانەوە وتی: «کاک دوکتۆر هەموی باش دەتناسێ کێیت !». ئەم کوڕە ناوی (کەمال دڕەیی) بو، دواتر لە لەندەن گیرسایەوە.

## ترسێکی باشی تر!

لە ڕوی دەرونیەوە دو جۆر ترس هەیە، یەکەم:ترسی باش و بەسود، ترسەکە ئەوەندەیە کە ڕێک بەهێندەی مەترسیەکەیە، کەسەکە نیگەرانە بەڵام نەشڵەژاوە و نائارام نیە، ترسەکە پاڵێکی باش بە کەسەکەوە دەنێ کە هەمو هزر و زیرەکیی خۆی چڕبکاتەوە بۆ خۆلادان لەو مەترسییەی لەسەریەتی و بۆ چارەسەری کێشەکەی. بۆ نمونە ئەگەر ترسی دەرنەچون و نمرەی کەم نەبێت خوێندکار سەعی ناکات و دەرناچیت یا نمرەی کەم دەهێنێت.

دوهەم: ترسی خراپ و زیانبەخش، ترسەکە لە مەترسیەکە زۆر گەورەترە، بۆیە کەسەکە دەشڵەژێنێ و نائارامی دەکات و توانای زیرەکی و هزریی ئەوەندە

کەمدەکاتەوە کە نەتوانێ کێشەکەی چارەسەربکات، بۆ نمونە: خوێندکارێکی دوازدەی ئامادەیی، ئەوەندە دەترسێ کە دەرنەچێ یا نمرەی کەم بێنێت، ئارامی لە دەست دەدات و سەعیی بۆ ناکرێت و دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت. بەڕاستی ترسم لێنیشت لەوەی کە لە کەمپەکە چەند کەسێک دەمناسێ، بەتایبەتی چەند کەسێکی عێراقی بوبونە پیاوی بەڕیوەبەری کەمپەکە و هەواڵ و زانیاریان لەسەر خەڵک بۆ دەبرد. ئەم ترس و مەترسیە پاڵیان پێوەنام بکەومە خۆم و هەرچی زوترە لەم دۆزەخە و لە مەترسیی زیندانیکردنم خۆمان ڕزگاربکەین. مۆڵەتیان پێدام بۆ معامەلەی سەفەر بتوانم بچم بۆ تاران. بەتەنیا بە پاس خۆم گەیاندە شیراز و لێرە بۆ یەکەم جار لە ژیانم دا سواری فڕۆکە بوم بۆ تاران. من تا ئەو کاتە پەساپۆرتی عێراقیم نەبو، بۆیە ڕوم لە ڕاستە بازاڕی (کوچەی ئەرە بها) کرد لە تاران.  (کوچەی ئەرە بها) واتە کوڵانی عەرەبەکان، شوێنی کڕین و فرۆشتن و تەزویری پەساپۆرت و ڤیزا و هەرچیەک بو پەیوەندیی هەبێ بە دەربازبون لە ئێران و سەفەری نایاسایی بۆ ئەوروپا. لە (کوچەی ئەرە بها) هیچی باوەڕپێکراوم دەسنەکەوت بیکڕم، نە پەساپۆەرت نە ڤیزا. بۆیە لە وەزارەتی ناوخۆی ئێران منیش وەک هەمو ئەو عێراقییانەی کە پەساپۆرتی عێراقیان نەبو، کەوتمە هەوڵدان بۆ وەرگرتنی پسوڵەیەکی ڕەسمی بە ناوی (لیزەپاس) کە وەک پەساپۆرتێکی کاتی بو، دەتتوانی یەک سەفەری پێبکەیت. بە نزیکەی سێ هەفتە و دوای ژوراوژور پێکردن و بێنەوبەردەیەکی زۆری ڕۆتینی بێتام و لێکۆڵینەوەی ورد، لیزەپاسێکیان پێدام بۆ هەر سێکمان، بە وێنەی خۆم و پەیمان و کیوانەوە. ئینجا دەبو ڤیزای وڵاتێک وەربگرم و مۆرەکەی لە سەر لیزەپاسەکە بدەن بۆ دەرچونمان لە ئێران بەرەوە وڵاتی ڤیزاکە.

## کەمپی ڕەبەنەکان لە کەرەج

دوکتۆر کەمال لەگەڵ سێ براکەی و هیوای خوشکەزام و ستارلە مەریوانەوە بردبویانن بۆ کەمپی پەنابەرانی ڕەبەن لە شارۆچکەی کەرەج ی نزیک تاران. کاتێک دەردەکـەوێ کە د.کەمال یەکێتی بوە، ئێتر لێپرسراوی سیاسیی کەمپەکە (ئاغای شەهیدی) بۆ ماوەیەک چونەدەرەوەی لێ قەدەغە دەکات و چاودێر دادەنێ بەسەریەوە و دەکەوێتە شەڕی دەرونی لەگەڵی. زۆربەی زۆری پەنابەرانی ئەو کەمپە گەنجی خاوەن بڕوانامە بون کە لە سەربازی بۆ ڕژێم لە بەرەکانی شەڕی ئێران - عێراق

ڕایانکردبو، ئەمانە زۆربەیان دەیانویست وەک پەنابەر خۆیان بگەیەننە ئەوروپا. هیوای خوشکەزام نزیکەی سێ ساڵ و نیو لەو کەمپەدا ژیا، ئەو دەیگێڕێتەوە:

«بەڕێوەبەری کارگێڕیی کەمپەکە پیاوێکی عەرەبی شیعەی سەر بە (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی) بوە بە ناوی (ئاغای سالاری). سالاری خۆی ئاوارە یەکی خەڵکی باشوری عێراق بو، بەڵام ئەوەندە خراپ بو لەگەڵ پەنابەرانی ناو کەمپەکە تا ڕۆژێک سەدان پەنابەر دەکەونە خۆپیشاندان دژی و دروشمی (مرگ بر سالاری) بە واتای (مردن بۆ سالاری) بەدەنگی بەرز دەڵێنەوە. وەک بەری ئەم خەباتە مەدەنیە ئاغای سالاری لە بەرپرسیارێتیەکەی دەرکرا و جارێکی تر نەهاتەوە بە کەمپەکەدا. پەنابەرانی شیعەی لایەنگری (ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی) لە کەمپەکەدا دەوری جاسوسیان دەبینی بەسەر پەنابەراندا».

دەبێت ئێستا (ئاغای سالاری) و هاوشێوەکانی لە حیزبی دەعوە و لایەنگرانی ئال حەکیم و ئال سەدر لە دەوڵەتی عێراقی دوای سەدام دا چ پلە و پۆستێکی باڵایان هەبێ: وەزیر و..؟ (ئاغای شەهیدی) پیاوێکی مەنگی ترسناک بو، بکوژ و ببڕی کەمپەکە بو، پەنابەران لە ترسی سزای قورس زۆر لێی دەترسان و خۆیان لێ دەپاراست. هاوڵاتیی ناسراوی سلێمانی (عەزیزی تەنکە) لە کەمپی کەرەج دەبێت، عەزیز زانیاریەکانی هیوا پشتڕاست دەکاتەوە و ئەم ڕوداوە دەگێڕێتەوە: لە شەوی ٢٧ ی ٤ ی ١٩٨٥ ئەو و نزیکەی ٧٠ پەنابەری کورد، بێ هیچ تاوان و گوناهێک، دوردەخەنەوە بۆ شوێنێکی وێرانە بە ناوی (کاروانسەرای شا عەباس) لە نزیک شاری (سەمنان) کە نزیکەی ٢٢٠ کم لە تارانەوە دورە. دوای نزیکەی ٩ مانگ ئینجا ڕێگایان پێ دەدەن بگەڕێنەوە بۆ کەمپی کەرەج.

## مەلا بەختیار سالار عەزیز فازل کەریم لە تاران

لە بەهاری ١٩٨٥ کە (سالار عەزیز) لە سویدە وە و (فازل کەریم) لە ئەڵمانیا وە گەڕابونەوە بۆ ئێران، دەنگۆی ئەوە هەبو پێشتر لە سوریا بە زمانی عەرەبی ڕەخنەنامەی (لم یعد الصمت ممکنا – بێدەنگبون ئیتر شیاو نیە) یان لە ژێر ناوی چەند کادیرێکی کۆمەڵە چاپ کردوە و بڵاویان کردۆتەوە. ئەو کتێبۆکە هەموی ڕەخنەی توند بو لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی. ئا لەم کاتەدا لە تاران سالار و فازل لە ئوتێلی (بەحر خەزەر) منیان دۆزیەوە وهاتنە لام، کەوتنە وتووێژ لەگەڵم و باسی

دروستبونی (ئالآی شۆڕش) یان بۆ کردم. دوای یەک دو ڕۆژ لەگەڵ دوکتۆرکەمال بردیانین بۆ (ئوتێل ئەتڵەس) بۆ لای مەلا بەختیار. ئەمیش لە کوردوستانەوە بە ئاگاداری و یارمەتیی یەکێتیی نیشتمانی هاتبو بۆ وتوویژ لەگەڵ سالار و فازل، گوایە بۆ ئەوە هاتبو کە نەهیڵێت ئەمان لە ئێرانەوە دروستبونی (ئالآی شۆڕش) ڕابگەیەنن و بچنە پاڵ بەرەی (جود) کە پارتی هێزی سەرەکی بو تێدا. لەو وتوویژە دا کە (ئومێدی سەعید گەوهەر) یشی تێدا بو، هەرسێکیان زۆر لەگەڵ من و دوکتۆرکەمال هەوڵیاندا ببین بە ئالآی شۆڕش. دوکتۆرکەمال بێ دودڵی داواکەیانی دایەدواوە و پەسەندی نەکرد، پێی وتن ئەو هەر وازی لە سیاسەت هێناوە، دەیەوێت بچێت ببێتە پەنابەر لە وڵاتێکی ئەوروپی و درێژە بە کار و خوێندنی پزیشکیی خۆی بدات. مەلا بەختیار برێک باسی هەڵوێستی باش و بەهێزی منی کرد لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە و بەرز نرخاندی، پێی وتم "تۆ بەهۆی هەڵوێستەکانی پێشتریشتەوە تازە هەر لەگەڵ ئێمەدایت و ئالآی شۆڕشیت". بە هەمان شێوە و بۆ هەمان ئامانج سالار و فازیل یش کەوتنە قسەکردن لەگەڵم و پێیان وتم کە تۆ هەر بەتەنیا پزیشک نیت، بەڵکو تازە وەک سیاسیەکیش دەرکەوتویت. من کە شێوازە سەربازی و نادیموکراتیەکانی ناو کۆمەڵە، بە تایبەتی لە دوای کۆنفرانسی سێ وە، لە کوردوستان دەریانپەڕاندبوم، بە دڵ و ڕۆح هێشتا هەر لەگەڵ شۆڕشی ڕەوای گەلەکەم بوم، بگرە هەندێ جار هەستم بە شەرم و گوناە دەکرد کە هاوخەباتەکانم و دانیشتوانی ناوچە ئازادکراوەکانم بەجێهێشتوە. ئینجا ئێستا هەوڵی قەناعەت پێکردنی ئەم سێ هاوڕییەشی چوەسەر، بە جۆرێک کە بەراستی کەوتمە هەڵوێستێکی واوە من نەتوانم پێیان بڵێم نەخێر.

ئینجا کە زانیان شل بوم، هەر سێکیان بە کۆنکرێتی داوایان لێکردم نوێنەرایەتیی (ئالآی شۆڕش) بکەم لە ئێران، ئەمەم بەلاوە زۆر سەخت و پڕمەترسی بو، بۆیە بێ دودڵی نەم پەژراند وپەسەندم نەکرد، ئینجا داوایانکرد لە دیمشق (شام) نوێنەرایەتیان بکەم. لەو سەردەمەدا هەمو لایەنە فەلەستینیەکان و پە کەکە و هەمو ئۆپۆزیسیۆن ی عێراقی بنکە و نوێنەریان لە (دیمشق) هەبو. شام بۆ من وەک دڵی بە گوڕ و تینی خەباتی سیاسی و دبلۆماسی و ڕۆشنبیری بو لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست. من وەک عەرەبی زانێکی باش چەشەی ئەدەب و مۆسیقا و هونەری عەرەبی بوم، دەمزانی لە (دیمشق) بزوتنەوەی ڕۆشنبیری و هونەریی عەرەبی زۆر بەهێزە. شام لەو دورەوە چاوبرکێی لەگەڵ دەکردم و بەڵێنی پێدەدام ژیانێکی ڕەنگاوڕەنگ و پڕچالاکی بەسەربەرم تێیدا. دیمشق وەک جەمسەری گەرمی موگناتیسێک لەو

دورەوە ڕایدەکێشام، تارانیش وەک جەمسەرە ساردەکەی پاڵی پێوەدەنام و لەخۆی دوردەخستمەوە. پێشنیازی ئەو سێ هاوڕێیە لەگەڵ بیروڕا و کەسێتیی من دەگونجا، بۆیە دوای بیرکردنەوەیەکی کەم داواکەیانم پەژراند و کردیانم بە نوێنەری (ئاڵای شۆڕش) لە سوریا، سەیرەکە لەوەدابو هێشتا ئاڵای شۆڕش بە ڕەسمی و بە تەواوی دروستنەکرابو و ڕانەگەیەنرابو!

لە ئوتێل ئەتڵەس بە ئامادەیی من و دوکتۆرکەمال وتووێژێکی سیاسیی توند و تاوسەندو لە نێوان مەلا بەختیار لە لایەک و و فازیل و سالار لە لاکەی تر ڕویدا. مەلا بەختیار دەیویست (ئاڵای شۆڕش) وەک سەکۆیەکی فیکریی ئازاد لە ناو یەکێتیدا دروستبکرێ و جارێ لیی جیانەبێتەوە، هەروەها دژی هەر هەنگاوێک بو کە ببێتە هۆی دروستبونی شەڕ لە ناو (پ.م) کانی کۆمەڵە و هەروەها لە ناو یەکێتیی نیشتمانی.

بەڵام سالار و فازیل دەیان ویست (ئاڵای شۆڕش) هەر لە ئێستاوە وەک ڕێکخراوێکی سیاسیی سەربەخۆ و لە دەرەوەی یەکێتی دروستبکرێ و بە ئاشکرا ڕابگەیەنرێ و بێتە ناو مەیدانی خەباتەوە. دیاربو ئەم سیانە پێشتریش کۆبونەوەی سێقۆڵیی خۆیان کردبو.

## کاریزمای پێوە دەلکێنن !

مەلا بەختیار گەڕایەوە کوردوستان، دوای چەند ڕۆژێک سالار و فازیل داوایان لە من و ئومێد کرد لەگەڵیان بچین بۆ لای مەسعود بارزانی، ئاوایە سیاسەت، ئاوابو حیزبایەتیی کوردیی ئەو سەردەمە!! هێشتا بەهاربو، چوارقۆڵی چوینە شاری ورمێ، لێرە ڕەسول مامەند لە ماڵەکەی خۆی میوانداریی کردین. (حەمە ڕەحیم) ناسراو بە هەڤاڵ جوجەڵە لێرە بە (خاڵە حاجی) ناسرابو، بە خۆی و جیبێکی سەربازیی ئێرانیەوە هات بەدواماندا و بردینی بۆ گوندی (ڕاژان) کە دەکەوێتە ٣٦ کم ی باشوری ڕۆژاوای شاری ورمێ. مەسعود بارزانی لە ژێر چادرێکی نزمی بچکۆلەدا لە سەر کومبارێک چوارمشقی دانیشتبو، بەخێرهاتنێکی ئاسایی کردین. یەکەم جارم بو مەسعود بارزانی ببینم. بە گشتی کەسێکی کەمدو و دەنگ نزم بو، بڕێک مڕوموچ و سارد و وشک هاتە بەرچاوم. کەسێتیی مەسعود بارزانی ڕێک بە پێچەوانەی کەسێتیی جەلال تاڵەبانی بو کاتی یەکەم دیدارم لەگەڵی لە ڕەشماڵە

گەورە دڵگیرەکەیدا لە بن دارگوێزەکەی توژەڵە ، جەلال تاڵەبانی زۆر بە گەرم و گوڕی و ڕوخۆشی و خاکیتی بەخێرهاتنی کردم! لە هەمو کاتی دانیشتنەکەمان کە نزیکی یەک سەعاتی خایاند، یەکجار زەردەخەنەیەک یا ڕویەکی خۆش و کراوەم لە مەسعود بەرزانی نەبینی. ئەو نە بە گشتی لە سەر ژیان، مرۆڤ، کۆمەڵ، نە لەسەر فکر، فەلسەفە، مێژو، نە قسەیەکی نەستەق و خۆش، هەر هیچ پەیڤێکمان لێ نەبیست. ئەو بە تایبەتی دەربارەی بیروڕا سیاسیەکانی هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی وای نەوت کە ئەوەندە سەرنجی ڕاکێشابم، لە هزرمدا نەخشابێ و بیرمبێتەوە و ئێستا بتوانم بۆتانی بگێڕمەوە. لە دڵی خۆمدا وتم کامەیە کاریزمای ئەم سەرکردەیە کە دەروێشەکانی بۆی هەڵدەبەستن؟ سالار و فازیلیش جگە لە ڕەخنەکانیان لە وتوویژی یەکێتیی نیشتمانی لەگەڵ ڕژێمی سەدام هیچی وایان نەوت.

دوای دانیشتنەکە جیبێکی لاندرۆڤەر چاەڕێی دەکردین،هەر چوارمان سواربوین و بەرەو بنکەی ڕاگەیاندنی پارتی کەوتینە ڕێ. شۆفێرەکەمان بە جامانە سورەکەیدا پیاوێکی بارزانی بو. بە ڕێگایەکی خاکیی چۆڵدا چەند جارێک ئەملاولای پێکردین، من کەمێک کەوتمە گومان ونیگەرانی چونکە شوێنەکە ناوچەی شەڕی نێوان حیزبەکانی کوردوستانی ئێران و ڕژێمی ئێران بو، بە بادینیەکی لاواز لێم پرسی: ئەزبەنی تۆ شارەزای ڕێگاکەی؟ لە وەڵامدا دڵنیای کردم کە بە هۆی ئەوەی شانبەشانی پاسداران بەشداریکردوە لە شەڕی دژی حیزبی دیموکرات، ناوچەکە باش شارەزایە و خەمم نەبێت. زور سەیر بو! کابرای شۆفێر کە ئەمەی دەوت هیچ،هەر هیچ شەرمی نەدەکرد کە لە پێشەوەی هێزە چەکدارەکانی ڕژێمی ئیسلامیی ئێران دژی خوشک وبرا کوردەکانی ئێران شەڕی کردوە!! گەیشتینە شوێنێکی چۆڵی، دوری، سەختی پڕ لە داربەڕو کە سەربە شاری شنۆ بو. کاک (فەلەکەدین کاکەیی) وەک بەرپرسیاری ڕاگەیاندنی پارتی بەخێرهاتنێک و میوانداریەکی شایستەی لێکردین.

پاش وتوویژێک کە زۆرتر ڕۆشنبیری بو هەتا سیاسی، ماڵاواییمان لێکرد و ڕاستەوخۆ گەڕاینەوە ورمێ و لەوێشەوە بۆ تاران. نازانم سالار و فازیل بەتەمای چی هاتبون بۆ لای مەسعود بارزانی، لە دانیشتنەکەدا داوای هیچی دیاریکراویان لێنەکرد، بەڵام وام هەستکرد مەسعود بارزانی گرنگیی وای پێنەدان و لێگەڕا بە دەستی بەتاڵ بگەڕێنەوە بۆ تاران.

## ناسر بەرواری !

هەوڵەکانی سالار عەزیز بۆ وەرگرتنی ڤیزای سوریا بۆ من سەری نەگرت. (ناسر بەرواری) ئەندامی (ئەنجومەنی نیشتمانیی عێراق) بو، لەدەست ڕژێم ڕایکردبو و لە ئوتێلێک دا لە تاران نیشتەجی بو. ئێران گرنگیی تایبەتیی پێدەدا ودەنگۆی ئەوە هەبو ئێران بۆ لاوازکردنی بارزانی پشتگیریی (ناسر بەرواری) دەکات. بیستبومان (ناسر بەرواری) پەیوەندیی باشی بە سەفارەتی سوریاوە هەیە، پێشتر نەمان دەناسی. وەک زۆر کەسی تر پێکەوە لەگەڵ د.کەمال چوین بۆلای لە ئوتێلەکەی، خۆمان پێناساند، هەر کە زانیی پزیشکین و (پ.م) یش بوین، میوانداریەکی شایستەی لێکردین و ڕێزی زۆری گرتین. داوای یارمەتیمان لێکرد بۆ وەگرتنی ڤیزای سوریا، پێی وتین ئەو زۆر حەزدەکات هاوکاریی خەڵکی ڕۆشنبیروخاوەن بڕوانامە بکات، چونکە ئەوروپا بۆ ئەم جۆرە کەسانە باشە. بێ هیچ بەرامبەرێک لەگەڵ من و دوکتۆرکەمال هات بۆ سەفارەتی سوریا و بێ هیچ کێشەیەک ڤیزای بۆ هەردوکمان و پەیمان و کێوانیش وەرگرت. بەراستی کارێکی جوامێرانەی کرد چونکە دەرچون لە ئێران گرنگترین هەنگاوی گەیشتن بو بە ئەوروپا. دواتر کە ئەویش لە ئەڵمانیا لە شاری ماینز گیرسایەوە، وەک وەفایەک چوم سەردانێکم کرد، زۆری پێخۆش بو، بەس سەیر بو! پێی وتم بەڵکو لەگەڵ خۆی و چەند کەسێکی خاوەن بڕوانامە دا حیزبێکی تازە دروستبکەین، بێگومان داواکەیم نەپەژراند.

## ترس تەواو

ئەرخەیان و دڵشاد و سەرکەوتو، بە لیزە پاس و ڤیزای سوریا وە گەڕامەوە بۆ جەهروم بۆ لای پەیمان و کیوان. پەیمانم ئاگادارکردەوە لەوەی کە بوم بە نوێنەری ئاڵای شۆڕش لە سوریا و دەچین بۆ دیمشق و لەوێ نیشتەجێ دەبین. ئەو هیچ دڵشاد نەبو بەم هەواڵە چونکە دەیویست بچین بۆ ئەوروپا. جانتای سەفەرمان پێچایەوە و ماڵاواییمان لە هاوڕێان و دۆستان کرد و بە پاس چوین بۆ تاران و لە (ئوتێل لالەزار) دابەزین. چەند کۆبونەوەیەکم لەگەڵ سالار عەزیزکرد دەربارەی کار و ئەرکەکانم لە سوریا، سالار ژمارەی تەلەفونی دو کەسی عەرەبی ناسیاوی خۆی پێدام کە لە دیمشق دەژیان و سەر بە و باڵەی حیزبی بەعس بون کە موعارەزەی سەدامی دەکرد و خۆی بەچەپ و دیموکرات دەزانی. سالار پێی وتم هەر بە گەیشتنم بۆ دیمشق یەکسەر پەیوەندی بەودوکەسە وە

بكه و خۆتیان پی بناسێنه، ئیتر هەر شتێکت پێویست بو داوایان لێبکه هاوکاریت دەکەن. ئاگری بێبەزەیی شەڕی ئێران و عێراق تا دەهات گەرمتر دەبو، تەنانەت پریشکەکەی گەیشته کەناری شاری تاران: له تاکسیەکدا بوم دەچوم بۆ کەرەج، لەپڕ له دوریی دو سی کیلۆمەتر له پێشی تاکسیەکەمانەوه لەو دەشته ئاگر و دوکەڵێکی زۆر له شوێنێک هەستا، کابرای شۆفێر چەند جنێوێکی به ئەمریکا دا که به یارمەتیی ئەو تەیارەکانی ڕژێمی سەدام ئاوا دەگەنه تاران. من ترسی زۆرم له دەسگای ئاسایشی (اطلاعات) ی ئێران هەبو، یەکەم: چونکه ڕاستیی پێشمەرگایەتیی خۆمم لێشاردبونەوه و وتبوم من سەربازی هەڵاوتوی عێراقی بوم. بەڵای کەمەوه له تاران سەدان کوردی سەربازی هەڵاوتو و کۆنه (پ.م) ی یەکێتی و حیزبه کوردیەکانی تر هەبون که منیان باش دەناسی، ئەگەری گەیشتنەوەی ڕاستیی ناسنامەی من به اطلاعات بەهێز بو. دوهەم: ئەگەر ئەو ڕاستییەیان بۆ دەرکەوتایه و بیانگرتمایه، ئینجا له لێکۆڵینەوەدا ڕاستیه شاراوەکەی تریشیان بۆ دەردەکەوت که بەشداریکردنم بو له خەباتی کوردی ئێراندا. جگه لەو دو مەترسیه پارەش وردە وردە کەم دەبۆوه و هیچی نەدەهاته سەر. له دۆخێکی ئاوا پڕمەترسی و نادڵنیاییدا، ئێمه وەک سەدان کوردی عێراق له چاوەڕوانی و هەوڵ و کۆششێکی زۆردابوین هەرچی زوتره له ئێران دەربازبین. له فڕۆکەخانەی میهراباد هونەرمەندی شێوەکار (محەمەد ناشاد) م ناسی که ئەویش له هەوڵدابو بۆ دەبازبون له ئێران. محەمەد ناشاد تابلۆیەکی ڕەنگیی زۆر جوان و سەرنجڕاکێشی دروستکردبو، له تابلۆکەدا چەند پەنابەرێکی کورد به تاسه و حەسرەتەوه له بەردەم جامخانەی فڕۆکەخانەیەک ڕاوەستاون، لەو دیو جامخانەکەوه فڕۆکەیەکی مەدەنیی گەورەی جوان ڕاوەستاوه، پەنابەرەکان به تاسەوه چاوەڕیی ئەوه دەکەن کەی سواری فڕۆکەکه دەبن! دوای چەند هەوڵێکی سەرنەکەوتو دواجار له ڕۆژی ٢٠ی ٧ ی ١٩٨٥ له فڕۆکەخانەی میهرابادی تاران له گەڵ چەند خێزانێکی تری کوردی ناسیاومان سواری فڕۆکەبوین بەرەو دیمشق. بەیانی زو گەیشتینه فڕۆکەخانەی دیمشق، خێزانەکانی تر چونه ترانزێت و لەوێوه سواری فڕۆکەی تر بون و خۆیان گەیانده وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژاوا.

## به پێچەوانەی چاوەڕوانیەکانم !

من و پەیمان و کێوان له فڕۆکەخانه هاتینه دەرەوه، به تاکسیەک خۆمان گەیانده ناوەڕاستی شار و چوینه ئوتێلێک. پۆلیسی فڕۆکەخانه ئاگاداریان کردبوین که دوای

چەند ڕۆژێک دەبێت من بچم بۆ دەسگایەکی ئاسایشی ڕژێمی بەعسی سوری (وابزانم شوێنەکە ناوی فەلەستین ی هەلگرتبو). لە کاتی خۆیدا چوم بۆ شوێنەکە، کاتێک لە ژوری چاوەڕوانی دانیشتبوم، دەنگی هاوار لە تاو ئازار و دەنگی پاڕانەوە و لالانەوە دەگەیشتنە بەرگوێم. لەخۆمم پرسی ئەمە دەنگی تۆمارکراوە و لە کاسێتەوە دێت بۆ ئێمە لە ژوری چاوەڕێکردن؟ مەبەست لێی ترساندنی من ئاساکانە کە تۆزێکی تر لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ دەکەن و نابێت ڕاستیەکان بشارینەوە لە لێکۆڵەران؟ یان دەنگی ڕاستەقینەی ئەشکەنجەدانی ئەو کەسانەیە کە لەو شوێنەدا گیراون؟ ئێستاش نازانم کامیان بو؟ ئاوا بو ڕژێمەکەی (حافیز ئەسەد) سەرۆکی دیکتاتۆر و درێژخایەنی ئەو کاتەی سوریا و باوکی (بەشار ئەسەدی) سەرۆکی ئێستای کاولکەری سوریا ! لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ورد و دورودرێژی یەک سەعاتیان لەگەڵ کردم کە تێیدا لە خزمی دوری پلە چواریشیان دەپرسی، بۆ نمونە، پرسیان: ئایا ئەفسەرتان هەیە لە سوپای عیراقدا؟ گەڕامەوە بۆ ئوتێلەکەمان. ئینجا دوای چەند ڕۆژێک حەوانەوە و چاوکردنەوە لە ناو دیمشق، چەند جار تەلەفونم کرد بۆ ئەو دو کەسەی سالار عەزیز لە تاران ژمارە کانیانی پێدابوم. یەکێکیان یەک جار وەلامی دامەوە، خۆمم پێ ناساند و داوای دیدارم لێکرد، بەلام ئەو هیچ گەرموگوڕیەکی نەنواند و خۆی دزیەوە لە داواکەی من، هەستم کرد نایەوێ ببینم و دەستی دەستیم پێدەکات. کەسەکەی تر یەکجاریش وەلامی تەلەفونەکانمی نەدایەوە. ئیتر من هیوابڕاوبوم لەو دو کەسە. بە دەستی نامەیەکم بۆ کاک سالار نارد لە سەر هەلوێستی ئەو دو عەرەبە و لە سەر باری تەنگانە و کەم وکورتیی ژیانی خۆم و ژن و منداڵم لە دیمشق. ئێستاش نازانم ئەو نامەیەی بەدەست گەیشت یان نا؟ من کە لە دیمشق بوم هیچ نامە و شتێکم لە سالار و فازیلەوە پێنەگەیشت. ئاوا بە تەواوی لە سالار و فازیل دابڕام و بێ هیوا بوم کە بتوانن یارمەتیم بدەن.

## پێش سیاسەت مەعیشەت!

وردە وردە پارە بەرەو نەمان دەچو، ئاخر تۆ پێش ئەوەی کاری سیاسی بکەیت خۆ دەبێت سەربڵندانە لایەنی هەرە کەمی ژیانی خۆت و ژن و منداڵەکەت مسۆگەر کردبێت! دەبوایە سالار و فازیل کە ئەو هەموە ئەزمونەی کاری سیاسیان هەبو، وە لە سوریا و ئەوروپا ژیابون، ئەو هەموە چاوەڕوانیەیان لەو دو کەسە عەرەبە

نەکردایە کە گوایە هەمو شتێک بۆ من دەکەن! پێش چونم بۆ دیمشق دەبوایە هەمو ئەگەرە سەخت و چاوەڕوان نەکراوەکانی ژیان و کاری سیاسی لە دیمشق بۆمن یان باس بکردایە، بۆ منێک کە ئەزمونی کاری دیپلۆماسیم نەبو، نە لە ناوەوەی وڵات نە لە دەرەوەی. دەبوایە پێکەوە نەخشەی (B) و (C) مان داڕشتایە، بۆ ئەمەیان لەگەڵ من نەکرد؟ ئەگەر بیانکردایە دەترسان من پەشیمان ببمەوە لەوەی ببمە نوێنەریان لە سوریا ؟ یا دو کابرا عەرەبەکە دەستی بڕین و پەیمان شکێنیی لەگەڵ کردن؟ یان لە دڵی خۆیاندا پێیان وتم: "تۆ بڕۆ بۆ دیمشق، خوا گەورەیە و هەرگیز پەکی عەبدی خۆی ناخات". نازانم بۆ؟ بێگومان من ڕەخنەی توند لە خۆیشم دەگرم، ئەی من خۆم بۆ بیرم لەو ئەگەرە خراپانە نەکردەوە؟ بۆ پرسیاری ئەوەم لێنەکردن کە ئەگەر ئەو دو کەسە هەڵویستیان نادۆستانە بو من داوای یارمەتی و پشتگیری لە کێی تر بکەم؟ چاوم لەوە نوقاند ئەگەرە نەباش و خراپەکان بە چاوی هزر و ئاوەز سەیربکەم. لەوەش خراپتر ئەی بۆ چی لە بڕیارێکی ئاوا چارەنوس سازدا من پرس و ڕاوێژێکی ڕاستەقینەم بە پەیمان ی هاوژینم نەکرد؟ ئەی پەیمان بۆ یەخەی منی نەگرت و پێی نەوتم تۆ خەریکی چیت و لە سوریا چیبکەین و بەچی بژین؟

## جەلالی حاجی حسەین

ژیان لە دیمەشق زۆرگران بو، وردە وردە پەتی برسێتی خەریک بو لە گەردنمان نزیک دەبۆوە، لەبەر گرانی نەمان دەتوانی لە دەرەوە نان بخۆین. یەک دو جار نان و چێشتی سادەی وەک هێلکەوڕۆن و هێلکە ی کوڵاو و چاییمان لە ژورەکەمان سازکرد. کاتێک خاوەن ئوتێل پێی زانین یەکسەر سازکردنی هەر جۆرە خۆراکێکی لی قەدەغەکردین. وریا بە هەر بە ڕاستی پارە ڕو لە نەمانە! لە دیمشق ی ئەو سەردەمە (مقهی العابد) ئەو چاخانەیە کلاسیکیە بو عێراقیە ئاوارەکانی سوریا بە هەمو نەتەوەکانەوە زۆر بۆی دەچون. منیش بە هیوای بینینی کۆنە هاوڕێیەک یا ناسیاوێک یا خزمێک چوم بۆی. خوا لێخۆشبو (جەلالی حاجی حسەین) م بینی کە لە دڕاوی دۆلەتو لە مانگی ٨ ی ١٩٧٩ لە بنکە چادرەکەی پاسۆک ناسیبوم، ئەو لە کوردوستان فەرماندەیەکی سەربازیی پاسۆک بو. زۆر ڕێزی لێگرتم و بانگێشتنێکی شایستەی بۆ کردین لە ماڵەکەیدا لە شوقەیەک لە دیمشق. یادی بەخێر لە دانیشتنەکەمان ئەم نوکتەیەی بۆ گێڕامەوە: لە ئەڵمانیا هاوڕێیەکی کوردی جەلال،

که ژنەکەی ئەڵمانی دەبێت، دەعوەتی جەلال دەکات، هەردوکیان پێکەوە - جەلال زۆرتر- قەلێکی گەورە بە برنج و شلە و ویسکییەوە دەخۆن و دوای دەمەتەقێی زۆردەخەون. ئەڵمانیەکان بە گشتی ئێواران نان کەم دەخۆن و چێشت لێنانێن. ژنی هاورێکەی جەلال کە لە ژیانیدا زۆرخۆری ئاوای هەرگیز نەبینی بو، بە نیگەرانی و ترسەوە مێردەکەی لەخەوهەڵدەسێنێ و پێی دەڵێ برۆ سەیرێکی هاورێکەت بکە بزانە نەمردوە!

که دۆخی ژیانی نالەباری خۆمانم بۆ کاک جەلال باسکرد، دڵخۆشیی دامەوە و دوای چەند رۆژێک لە ئوتێلەکە هەڵیگرتین و بردینی بۆ ماڵێک بە ناوی (بیت مختار دمر القدیم) لە گەرەکی (دمر) ی دیمشقی کۆن. لە ژور و هەیوانێکی ماڵەکەدا بێ پارە دایمەزراندین. پێشتر (مەلا بەکر) ناوێکی (پ.م) ی پاسۆک تیایدا ژیابو و ئەو لەو کاتەدا گەرابۆوە بۆ کوردوستان. ئەم ماڵە هی هونەرمەندی شێوەکاری عەرەب (مجید العراقی) بو کە تەمەنی ٦٥ ساڵی تێپەراندبو و رەبەن بو. مجید خۆیشی لە ژورێکی تری هەمان خانودا دەژیا، دیاربو پێشتر کاک جەلال لەسەر هاتنی ئێمە لەگەڵی رێکەوتبو. بەداخەوە کاک جەلال لە سەرەتای شەری براکوژیدا لە بەهاری ١٩٩٤، لە تەلاری (حەسیب ساڵح) لە سلێمانی لە کاتی ناوبژێکردنی نێوان پارتی و یەکێتی شەهید کرا.

**«فەرمانێ ئەی کۆمەڵ فەرمانێ فەرمانێ بۆ دەردی بێکاری چارەیە دەرمانێ»**

بۆ خۆ رزگارکردن لەو دۆخە ناهەموارە و بە نیازی وەرگرتنی مافی پەنابەری و بە ئومێدی دامەزراندنم لە نەخۆشخانەیەکی حوکمەتی، چوم بۆ بنکەیەکی پۆلیس و داوای مافی پەنابەریم کرد. ئەفسەری بەرپرسیار پێی وتم لە سوریا مافی پەنابەری بۆ عێراقی نیە چونکە سوریا بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب و تۆش وەک هاوڵاتیەکی عێراقی، سوریا وڵاتی خۆتە و برۆ کارێک بدۆزەرەوە و خۆتی پێ بژێینە. بەنائومێدی گەرامە دواوە و لەگەڵ خۆم بریارم دا وەک دوکتۆرکارێک بدۆزمەوە کە پێی بژیم و لە هەمان کاتیشدا کاری نوێنەرایەتیی (ئاڵای شۆرش) یش بکەم. بەدوای ئیشدا چومە نەخۆشخانەیەکی تایبەتیی ئیتالی، وتیان ئیشمان نیە بۆ دوکتۆر. لە دیدارێکم دا لەگەڵ (دوکتۆرە پەخشان) ی خوشکی جەلال دەباغی کادیری ناسراوی (حشع)، کە

لەو کاتەدا وەک دوکتۆر لە دیمەشق کاری دەکرد، ئەویش نەیتوانی یارمەتیم بدات بۆ دۆزینەوەی ئیش. دوکتۆرە پەخشان دەباغ دواتر خۆیشی بوبە پەنابەر لە سوید و لەوێ جێگیربو.

## ڕقی نەتەوەپەرستی!

نازانم کێ پێشنیازی بۆ کردم و پێی وتم بەڵکو لە (کەمپی یەرموکی پەنابەرانی فەلەستی) لە دیمشق وەک دوکتۆرئیشێکم بدەنێ. بڕوانامە پزیشکییە کەی زانکۆی بەغداد م هەڵگرت و چوم بۆ کەمپی یەرموک لە قەراخ شاری دیمشق. پاسەوانێکی کلاشینکۆف لە شانی پیر جامانەیەکی پێچا بو لە مل و سەری، لە بەردەرگای سەرەکیی کەمپەکە ڕاوەستابو. بە دیمەنی ئەو پیاوە برێک دڵم کرایەوە چونکە کاتی پێشمەرگایەتیی خۆمم هاتەوە یاد. دوای چاکوچۆنی لەگەڵی، نیازی خۆمم لە هاتنەکەم پی وت و ئەویش ڕێنمایی کردم بچم بۆ لای لێپرسراوێکی کارگێڕی لە کەمپەکە. لێپرسراوەکەم دۆزییەوە و خۆم پێناساند، باسی ژیانی سەختی خۆمم بۆکرد و داوام لێکرد وەک دوکتۆر لە کەمپە کە دامەزرێم. ئەو بە شێوازێکی وشک و سارد و پەتی لە هەر سۆزێکی ئەرێنی پێی وتم، بەهۆی ناکۆکیی سیاسیەوە چەند مانگێکە یاسر عەرەفات پارەی لە کەمپەکە بڕیوە، بۆیە کاریان نیە بۆ من. لە وەڵاما پێم وت موچە گرنگ نیە، منیش وەک ئێوە، کە پارە بۆ ئێوە نەبو بۆ منیش نیە و منیش داوای پارەتان لێناکەم. بەڵام خۆ ئێمەش وەک ئێوە هەر ئاوارە و بێنەواین، بۆیە داواتان لێدەکەم بۆ خۆم و ژن ومنداڵەکەم ژورێکم لەم کەمپە بدەنێ. چی خۆراک و خواردنەوە وکەل و پەل دەدەن بە ئاوارەکانی خۆتان بیدەن بە ئێمەش، منیش لە بەرامبەردا وەک دوکتۆر بێپارە خزمەتی خۆم پێشکەشی دانیشتوانی کەمپەکە دەکەم. کابرا لە سەر ڕای خۆی مایەوە و وتی ئاواش هەر ئیشمان نیە بۆ تۆ لەم کەمپەدا. من دڵنیا بوم ئەو کەمپە گەورەیە کە شارێک بو بۆخۆی، جێی من و پەیمان و کێوانی یەکساڵی تێدا دەبۆوە و دانیشتوانە ئاوارەکەشی سودیان لە خزمەتی من وەک پزیشکێک وەردەگرت. بەڵام هەستم کرد ئەو دیوارێکی ئەستوری خۆڵەمێشیی لە کۆنکریتێکی سفت و ڕەق بەرامبەر من قوتکردۆتەوە، بێگومان دیوارێکی ئاوا بێگیان ڕێگا نادات ئۆکسجینی هەست و سۆز و شعورە ئینسانیە ناوازە و ڕندەکان لە نێوانماندا بکەونە هاتوچۆ و ئاڵوگۆڕ. شێوازی قسەکردن و زمانی جەستەی پێیان

دەوتم: تۆ کوردی دژی سەدامی و ئێمە تۆمان ناوێ و تەواو. دواتر پێی وتم چەند هەفتەیەکی تر سەرێکمان لێبدەرەوە بەڵکو لە دەشتی (بیقاع) ی لبنان کارێکت بۆ پەیدا بێت (نەیوت بۆت پەیدابکەین!). لەو سەردەمەدا فڕۆکە ئیسرائیلیەکان بەردەوام فەلەستینیەکانیان لە دەشتی (بیقاع) بۆردومان دەکرد. وەک کوردێک زۆر بەزەییم بەخۆمدا هاتەوە و لە دڵی خۆمدا بە کابرام وت: «هەی شۆڤێنیی سەدام دۆست ! دەمنێری بۆ بیقاع بۆ ئەوەی لەوێ بکوژرێم، بۆ ئەوەی بۆمبای ئیسرائیلی جەستەم بە جۆرێک هەلاهەلا بکات هەر کەسیش نەزانێ گۆڕەکەم لە کوێیە؟ ئینجا کە وابێت باشتر نیە بگەڕێمەوە کوردوستان و وەک جاران ببمەوە بە (پ.م) ؟ ئەگەر شەهیدیش بم، خۆ بە ڕیز و پێزانێکی تایبەتەوە دەمنێژن و خزم وکەسیش سەربەرزانە دێنە سەر گۆڕەکەم».

## «ئەی بێ ولات بۆ دەرەوە»

کەمپی یەرموکم جێهێشت بێ ئەوەی تەنانەت چوڕێک ئاو یا چایەکیشم بدەنێ. بە دڵشکاوی و نائومێدی و خەفەتێکی زۆرەوە، لەبەر خۆمەوە ئەو دێڕە شیعرەی (عبدالله پەشێو) م دەوتەوە کە چۆن بە خەیاڵ لە دەرگای بارەگای نەتەوە یەکگرتوەکان دەدا بۆ ئەوەی بچێتە ژورەوە و بەرگری لە کورد بکات، بەڵام پاسەوانەکان دەریدەکەن و ناهێڵن بچێتە ژورەوە و بە ڕەقی پێی دەڵێن: (ئەی بێوڵات بۆ دەرەوە، ئەی بێ ئاڵا بۆدەرەوە). بەڵام لە منی دەربەدەری کورد، تەنانەت فەلەستینیەکی ئاوارەی وەک خۆم دەرگای کەمپێکی پەنابەرانی فەلەستینیی لێنەکردمەوە چجای دەرگای نەتەوە یەکگرتوەکان! هاتەوە یادم چۆن هەمو حیزبە کوردیەکان لە بەرنامەکەیاندا پشتگیری لە گەلی فەلەستین دەکەن و هێرشێ خەست و خۆڵ دەکەنە سەر ئیسرائیلی دوژمن و زایۆنیستەکان. پێشمەرگە شەهیدەکانی (پەکەکە) م هاتەوەیاد کە لە شەڕی ناوخۆی لبنان شان بەشانی فەلەستینیەکان شەڕیان کرد دژی هێرش سوپای ئیسرائیل بۆ سەر باشوری لبنان لە ساڵی ١٩٧٨ و لە ئابلوقەدانی بێروت لە ساڵی ١٩٨٢. ئەوەشم هاتەوە یاد کاتێک سەرکردایەتیی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین ناچارکرا بێروت بەجێ بێڵێ و لە تونس جێگربو، (یاسرعەرەفات) لە وتارێکدا باسی شەهیدانی هەمو گەلانی تری کرد کە شان بە شانی فەلەستینیەکان لە لبنان جەنگابون، بەڵام بە وشەیەک باسی شەهیدە کوردەکانی (پەکەکە) ی نەکرد!

## دو دیوی یەك دراو!

بەم دۆخە دەرونیە پەشێو وهەژاوەمەوە گەڕامەوە لای پەیمان وکێوان. دوای چەند ڕۆژێک، نیوەڕۆیەک لە ژورەکەماندا ڕاکشا بوم خەریک بو خەو دەچوە چاوم، لە ماڵی ئەودیوی ئێمەوە لە دەنگی گۆرانیەکی غەمبار و بەسۆزی کوردی کرمانجی بە ئاگاهاتمەوە، لاواندنەوەیەکی زۆر خۆش بو، زۆر کاری تێکردم و خەوەکەی لێتاراندم. بێ بیرکردنەوەی زۆر خۆم گۆڕی و لە دەرگای ماڵەکەم دا. بە کوردی کەوتمە دووان لەگەڵیان، ئەوانیش بە ڕویەکی خۆش و بڕیک سەرسوڕمانەوە خولکیان کردم و لە سەر فەرشە کۆنێکی فەقیرانە دایان نیشاندم و چا و ئاویان بۆ هێنام. خۆم پێناساندن کە منیش وەک ئەوان کوردم، ناچاربوم عێراق جێ بێڵم، ئێستا لێرە لە پیشەکەی خۆمدا وەک پزیشک کارم دەستناکەوێت و ناچارم کرێکاریش بێت هەر بیکەم بەس بێ ئیش نەبم. ئەمانە چەند کوڕێکی گەنجی کوردی سوریا بون کە لە ناوچە کوردیەکانە وە هاتبون بۆ دیمشق بۆ کرێکاری. کزی و نەداریی ئەمان کرێکارە کوردەکانی خۆمانی هێنایەوە یادم کە دە چون بۆ بەغداد و وەک هێزی کاری هەرزان خاوەن کارەکان ئیشیان پێدەکردن و دەیان چەوساندنەوە. هاتەوە یادم کە زۆرینەی بۆیاخچیانی پێڵاو لە سەر شۆستەی جادەکانی بەغدا کرێکاری کوردبون. یەکەم جار پێش دوازدە ساڵ کاتێ لە زانکۆی بەغدا دەستم بەخوێندنی پزیشکی کرد، ئەوە دەرزیی دیمەنی کلۆڵی و کزی و بەلەنگازیی ئەو بۆیاخچیانە بو لە چاوەکانم چەقی و ڕاستەوخۆ چەوسانەوەی کوردی لە ڕوی نەتەوەیی و چینایەتیەوە پێناساندنم و پیشاندام! ئەمەی ئێستا لێرە لە دیمشق دەیبینم هەمان شتە، ڕەنگدانەوەی هەمان سیاسەتی شۆڤێنیی حکومەتەکانی هەردو حیزبی بەعسی عێراقی و سوریە. هەردو ڕژێمی نەتەوەپەرست، لە ڕوی ئابوری و ڕۆشنبیریەوە، بە مەبەست و بە پێی پلان ناوچە کوردیەکانیان وێل و پشتگوێ دەخست، هیچ کارگە و پرۆژەیەکی گەورەی ئابوریان تێدا دروست نەدەکرد، ئەم سیاسەتە شۆڤێنیە بو دەبوە هۆی بێکاریەکی زۆری کوردەکان و کۆچکردنیان بۆ شارە گەورە عەرەبنشینەکان. داوام لە کرێکارەکان کرد یارمەتیم بدەن ئیشێکم بۆ پەیدابکەن، داواکەمیان وەک دوکتۆرێک بەلاوە سەیربو، بەڵام کە زانیان من بە ڕاستمە و گاڵتە و حەنکیان لەگەڵ ناکەم، ئینجا بە هاوسۆزیەکەوە پێیان وتم جارێ خۆیشیان بێئیشن و هەر کاتێ ئیشیان دەستکەوت ئاگادارم دەکەنەوە، ماڵاوایم لێکردن و هاتمەوە ماڵەوە.

## بزێو و پڕ لە ژیان !

(مجید العراقی) ی خاوەن ماڵمان تابلۆ هونەریەکانی لە سەر زەوی دادەنا و پشتی دەدا بە دیواری حەوشە بچوکەکەوە تا چەوریی بۆیەکانی وشکبێتەوە، هەندێ جاریش هەر لە حەوشەکە دادەنیشت و وێنەی گەورەی لە سەر تابلۆیەک دەکێشا و وبۆیەی دەکرد. لەم لایشەوە (کێوان) ی بزێو و پڕلەژیان تەمەنی بەرەو یەکساڵ هەڵدەکشا و کەوتبوە دارەدارەیەکی چالاک و بوبوە هۆی هەندێ نائارامی بۆ مجید و بۆ تابلۆکەنی.

لە نەبونیی هیچ هاوڕێیەکی هاوتەمەن و هیچ یاریەک، تابلۆ هونەریە ڕەنگاوڕەنگەکانی مجید سەرنجی کێوان یان رادەکێشا و دەکەوتە دەسکاری کردنیان، مجید بەمە زۆر قەڵس و بێزاربو، داوای لێکردم هەرچی زوترە دەبێت ژورەکە چۆڵبکەم کە لە بنەڕەتدا ئەو نەیداوە بەکرێ بە من، بەڵکو داویە بە مەلا بەکر. هەوڵەکانی کاک جەلالیش بۆ ئارامکردنەوەی مجید هەر بۆ چەند ڕۆژێک سودی هەبو.

بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی لەگەڵمان بۆم دەرکەوت مەجید بڕیاری دابو دەرمانبکات.

یەکەم ساڵڕۆژی لەدایکبونی کێوان (٢٩ ی ٧ی ١٩٨٥) لەو حەوشەیەدا بە تەنیا بەسەرمان برد. بەڵام من بۆ وێنەگرتنی بۆنەکە، کە زۆر لام گرنگ وخۆش بو، کامێرایەکم لە وێنەگرێکی نزیکمان بەکرێگرت و چەند وێنەیەکی کێوانم پێگرت.

## پشت و پەنای گەلانی ژێردەستە !

نیوەڕۆیەک لە ژورەکەم ڕاکشابوم، تازە خەریکبو خەوم لێ دەکەوت. (دوکتۆر هەژار) وەک دەنگێکی دور هاتە گوێم، دەنگەکە هی کەسێک بو لە ماڵی منی دەپرسی، ڕاپەڕیم و بە شڵەژاوی بەرە و دەرگای دەرەوە ڕۆشتم، پیاوێکی تەمەن نزیکەی چل ساڵ لە بەردەم دەرگای حەوشە ڕاوەستابو، بە کوردی لێیپرسیم تۆ دوکتۆر هەژاری، وتم بەڵێ فەرمو، وتی من ناوم (عادل) ە، فریای خزمەکانت (وەستا محمد و کاک هادی) بکەوە. ئەوان لە ئیرانە وە بی ڤیزا بە ترانزێتی دیمشق دا چون بۆ مۆسکۆ و لە مۆسکۆوە گەڕانویانەوە بۆ ترانزێتی فڕۆکەخانەی دیمشق. پارەیان لێبراوە وئەگەر فریایان نەکەویت دەیاننێرنەوە بۆ فڕۆکەخانەی تاران. پێویستیان بە چوارسەد دۆلارە بۆ تەواوکردنی پارەکەیان بۆ کڕینی بلیتی تەیارە بۆ فڕین بۆ وڵاتێکی ئەوروپای ڕۆژاوا. یەکێتیی سۆڤێت کە شیوعیەکانی لای خۆمان دەیان وت پشت وپەنای گەلانی

ژێردەستەیە، پەنابەریان وەرنەدەگرت! خێرا چوارسەد دۆلارم هەڵگرت و لە بازاڕ دو مریشکی بە شیش برژاوم کڕی و لەگەڵ زەڵاتە ونان بۆیان پێچامەوە و بە پاس خۆم گەیاندە فرۆکەخانە. کە دابەزیم لە پەلە پەلدا مریشکەکانم لە پاسەکەدا لەبیرچوبو، کاتێک پێمزانی هێشتا پێنج خولەک تێنەپەڕیبو، خێرا گەڕامەوە و چومەوە سەر شوێنی دانیشتنم لە ناو پاسەکە، بەلام مریشکەکان نەمابون، لە کابرای شۆفێرم پرسی بەڵکو کەسێکی ناو پاسەکە ڕادەستی ئەوی کردبن، بەڵام ئەو هەواڵێکی لە مریشکەکەن نەبو. زۆر بێزاربوم و زۆرخەفەتم خوارد، چونکە دەمزانی ئێستا (وەستا محمد و کاک هادی) چەند برسیانە و چەند پێویستیان بە خواردن هەیە بە تایبەتی مریشکی برژاو! چومە ترانزێت، چوارسەد دۆلارەکەم دایە دەستیان و لە گێڕانەوەیان بۆ تاران ڕزگاریان بو، دواتر لە دانیمارک گیرسانەوە و جێگیر بون.

## متمانە و گەشبینی بەس نین!

ئەوە ڕاستە من متمانەی تەواوم بە سالار و فازل هەبو، ئەوەش ڕاستە ئەوانەی کاری کۆمەلایەتی و سیاسی دەکەن، دەبێت گەشبین بن و دڵگەرم بن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، بەڵام گەشبینی و متمانە بەس نین، دەبێت کۆنترۆل و چاودێری کردنیش هەبێت، دەبێت ئەگەرە چاوەڕوان نەکراو و نەباشەکانیش بخرێتە حساباتەوە. بۆ نمونە هەم سالار هەم من دەبو ئەو ئەگەرەمان بخستایە پێش چاوی خۆمان کە دو عەرەبەکەی شام پەیمانشکێنی بکەن و لە بەڵێنەکانیان پەشیمان ببنەوە. لە ڕۆژی ٢٠ ی ٧ ی ١٩٨٥ وە کە لە لە تاران دەرچوم و گەیشتمە دیمشق، ئیتر من جارێکی تر هیچ هەواڵ و پەیام و دەنگ و نامەیەکم لە سالار عەزیز و فازیل کەریمەوە پێ نەگەیشت. ئەوانیش کە لە تاران بوم هیچ ناونیشانێکیان نەدامێ نە لە دیمشق کە نامەم بۆ بنێرن و نە لە تاران یا هەر شارێکی تری ئێران کە نامەیان بۆ بنێرم، بەم جۆرە هەمو پەیوەندیەکی نێوان من و ئەوان بچڕا. بەڕاستی لە خۆمم دەپرسی و بەخەیاڵیش لەوانم دەپرسی: ئاخر حیزبایەتی و خەباتی دبلۆماسی و سیاسی لە وڵاتێکی بێگانەدا کە ژیان تێیدا زۆر گران بێت، چۆن وا دەبێت؟ یەکێک لە بنەڕەتی ترین مەرجەکانی کاری حیزبی دروستکردنی تۆڕێکی فراون و چڕە لە پەیوەندیکردنی خێرا و دەمودەست بە ڕێگا و شێوازی دڵنیا و بڕواپێکراو. پارە و توانای ماددیش یەکێکە لە پایە و کۆڵەکە هەرە گرنگەکانی کاری سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و زانستی. ئاخر خۆ بەلای کەمەوە دەبێت چالاکوانە حیزبیە پیشەییەکان ژیانێکی خاکیی

ساده و سەربەرزانەیان بۆ دابین بکەیت بۆ ئەوەی خەمی ژیانی ماددی ڕۆژانەی خۆی وخێزانەکەیان نەبێت و بتوانن هەمو هزر و بیریان بۆ ئامانجە سیاسییەکان تەرخان بکەن.

## پارە وەك هەستی شەشەم !

مرۆڤ پێنج هەستی هەیە: بینین، بیستن، چەشتن، بۆنکردن و بەرکەوتنی پێست. ئەگەر پارەت هەبو و دنیادۆستیش بویت، ئەوا دەتوانی بە تێرکردنی ئەو پێنج هەستە و چێژوەرگرتن لە خۆشیە روحیەکان، ژیانێکی خۆش بەسەربەریت. مرۆڤ بە تەنیا بە پارە وسامانە مادیەکانی تر مەرج نیە بتوانێ بەختەوەری و کامەرانی بەدەست بێنێ، دەشێ ملیاردێر بیت وبە هێندەی دوکانداریک یا کارمەندێکی ئاسایی بەختەوەر نەبیت.

بەلام مرۆڤ دەتوانێ بە پارە زۆرینەی سەرئێشە و کێشە ڕۆژانەییەکانی ژیانی چارەسەر بکات و ژیانێکی ئارامی بێ کێشە یا کەم کێشە بەسەر بەرێت. سەهۆلی ئەو برە پارەیەی لە سلێمانیەوە لەگەڵ خۆمان هێنابومان وردە وردە خەریک بو دەتوایەوە و دەبوە هەڵم ! پشتێن جەڕاندن و دوژەم خواردن و هەرزانکڕی پارەکەمانی زیاد نەدەکرد ! نە من نە پەیمان حەزمان نەدەکرد وشکۆی ئینسانیمان ڕێی پێ نەدەدا‌ین داوای پارە لە هیچ کەسیک و لە هیچ لایەنێک بکەین، دەستیشمان بە خزم و کەسمان لە کوردوستان نەدەگەیشت، ئیشیش پەیدا نەبو بیکەم هەتا پێی بژین. لەو لایشەوە دلۆپەی بەردەوامی بۆڵەبۆڵ و نوقورچی بێبەزەیی مجید ی خاوەنماڵ بۆ چۆلکردنی ژورەکە، تەنگی پێ هەڵچنیبوین و تەواو تەواو بێزار و گرژ و تورەی کردبوین. بێ پارەیی و سوربون و پێداگریی مجید بۆ هەرچی زوتر چۆلکردنی ژورەکە ناچاریان کردین هەرچی زوترە کاربکەین بۆ جێهێشتنی دیمشق بەرە و ئەوروپا. تازە ئیتر دەرکەوت، بە هۆی نەبونیی پارەوە، هەتا ژن و منداڵم لەگەڵدا بێت ناتوانم لە شام بمێنمەوە و نوێنەرایەتیی ئالای شۆڕش بکەم. بۆیە بڕیارم دا پەیمان و کێوان بگەیەنمە وڵاتێکی ئەوروپای ڕۆژاوا و جێگیریان بکەم، پاشان خۆم بگەڕێمەوە بۆ سوریا. بە تەنیا هەرچۆنێک بێت دەتوانم لە شام بژیم و پەیوەندی بکەمەوە بە بردەرانی ئالای شۆڕشە وە.

## چی دەچێنی ئەوە دەدوریتەوە !

لە کاتی پێشمەرگایەتیدا لە شارباژێر (حسەین سەکسول) ی عەرەبی عێراقی م ناسیبو کە لیپرسراوی ڕێکخراوی مارکسیی (جیش التحریرالشعبی العراقي- سوپای گەلیی ڕزگاریی عێراق) بو، ڕێزم لێگرتبو و بەیەکەوە چەند ڕۆژێک جەولەمان کردبو. ڕۆژێک لەم کاتی تەنگانەیەدا لە (مقهی العابد) بینیم و یەکترمان ناسیەوە. باسی دۆخی نالەباری ژیانم و نیازی سەفەرکردنم بۆکرد. ئەو یەکسەر ئامادەیی نیشاندا بلیتی فڕۆکەمان بە نیوەی نرخی ئاسایی بۆ بکڕێت. بۆ ڕۆژی دوایی بردمی بۆ بارەگای (الجبهه الشعبیه لتحریر فلسطین - بەرەی گەلیی ڕزگاریی فەلەستین) کە ڕێکخراوێکی چەپی پێشکەوتنخواز بو، منی وەک خەباتگێڕێکی شایستە بەوان ناساند. دیاربو (هێڵی ئاسمانی سوری) بلیتی بە نیوەی نرخی بازاڕ بەفەلەستینیەکان دەفرۆشت. ئەم فەلەستینیە یان وەک ئەوەی کەمپەکەی یەرموک نەبو! یەکسەر پشتگیریەکی بۆکردم و ناردمی بۆ نوسگەیەکی ئەو هێڵە، ئەمانیش بێ هیچ پرسیار و کێشەیەک بە نیوەنرخ بلیتەکانیان پێفرۆشتم. بەڕاستی لەو کاتەدا کۆمەکێکی گەورە بو فریامان کەوت، دەنا لە بەر بێپارەیی نەمان دەتوانی بلیتی فڕۆکە بە نرخی بازاڕ بکڕین.

## باوڕناکەیت ! لەندەن تەنیا بە ٤٠٠ دۆلار!

من لە بەر زور هۆ دەمویست بچم بۆ بەریتانیا، یەکێ لەوانە گرنگیی زمانی ئینگلیزی بو لە هەمو ولاتان و لە هەمو بوارەکانی ژیاندا. لە زانکۆ بە ئینگلیزی خوێندبوم و کاتێکی کەمی دەویست لە بەریتانیا ئینگلیزیەکەم بە تەواوی فێربم. بۆ ئەو ئەگەرەی نەتوانم بگەڕێمەوە بۆ سوریا، ئیتر دەبوایە لە و ولاتە ئەوروپیە بمێنمەوە کە دەچم بۆی. ئەو ولاتەش بەریتانیا بوایە باشتر بو، چونکە بە هۆی زانینی زمانی ئینگلیزیەوە لەوێ زو دەمتوانی وەک دوکتور کاربکەم و خوێندنی پسپۆڕیش تەواوبکەم. بچومایەتە هەر ولاتێکی تر دەبوایە زمانێکی تر فێربم و بەمە دوسێ ساڵم لە دەست دەچو. لە ڕۆژی ٢٣ ی ٨ ی ١٩٨٥ بێ ئەوەی هیچ ڤیزایەکمان پێبێت و بێ هیچ بەربەستێکی پۆلیسی فڕۆکەخانە، سواری فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانیی سوری بوین کە بۆ بەرلینی ڕۆژهەلات دەفری. فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی (لارنەکا) ی قوبرس نیشتەوە، هەندێ کەس دابەزین و هەندێکی تریش سواربون، دوای چەند سەعاتێک گەیشتینە فڕۆکەخانەی (Schoenefeld) ی بەرلینی ڕۆژهەلات. ئێمە لە لەگەڵ هاوسەفەرەکانمان نەچوینە

دەرەوەی فڕۆکەخانە، بەڵکو چوینە ترانزێت بە هیوای ئەوەی بلیتی لەندەن بکڕین. بەداخەوە بلیتەکان گرانتربو لەو پارەیەی پێمان مابو، ئەگەر ئەو چوارسەد دۆلارەمان نەدایە بە (وەستا محمد و کاک هادی) ئێستا پارەکەمان بەشی دو بلیتی لەندەنی دەکرد! شەومان لە سەر کورسیەکانی ترانزێت بەسەربرد، بەیانی زو کە پۆلیسی فڕۆکەخانە بینیان ئێمە بێکارە لە ترانزێت دا ماوینەتەوە و ناتوانین سواری فڕۆکەی تربین، هاتنە لامان و وتیان دەبێت لە فڕۆکەخانە بچنە دەرەوە بۆ ناو شار. ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات پەنابەری وەرنەدەگرت و ڤیزای ئەوێشمان پێ نەبو، بەڵام پۆلیسی فڕۆکەخانە دەیزانی پەنابەرە بێڤیزاکان لە هەرکوێوە بێن، لە کۆتاییدا هەر ڕو لە ئەڵمانیای ڕۆژاوا دەکەن چونکە لەوێ مافی پەنابەری هەیە. لە ساڵی ١٩٨٦ ئەڵمانیای ڕۆژاوا پارەیەکی زۆری دا بە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، ئەمیش لە بەرامبەردا دەرگای بەڕوی پەنابەراندا داخست، بەوەی کە بە بێ ڤیزا نەی دەهێشت کەس بێتە وڵاتەکەیان.

## هاوسۆزی و دڵڕەقی لە تەنیشت یەکدا!

بەیانی زوی ٢٤ ی ٨ ی ١٩٨٥ لە فڕۆکەخانە کردیانینە دەرەوە بۆ ناو بەرلینی ڕۆژهەڵات. ئێرە پایتەختی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتە کە وڵاتێکی گرنگی (هاوپەیمانیی وارشۆ) یە. لێرە هیچ کەسێکمان نەدەناسی و یەک وشە ئەڵمانیمان نەدەزانی، کاتی ڕۆشتنی خەڵک بو بۆ سەر کار. من دەمزانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هاوپەیمانی سۆڤێت و دۆستی نزیکی ڕژێمی سەدامە، پەنابەر بە گشتی و هی عێراقی بەتایبەتی وەرناگرێ، بۆیە دەبو بچین بۆ بەرلینی ڕۆژاوا کە پەنابەریان وەردەگرت. بە پرسیارکردن بە ئینگلیزی ئەو قیتارەمان دۆزیەوە کە دەچو بۆ بازگەی سنوریی نێوان بەرلینی ڕۆژهەڵات و بەرلینی ڕۆژاوا. بۆ یەکەم جار لە ژیانماندا سواری قیتار بوین، لە بەر ئەوەی کاتی چونە سەر ئیش بو قیتارەکە پڕ بو لە خەڵک، بۆیە جێی دانیشتنمان دەست نەکەوت. لە ناو قیتارەکە دۆلاریان لێوەرنەگرتین، پیاوێکی بەهەست و بەڕێز کە بینی ئێمە نەشارەزاین و دراو (مارک) ی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتمان پێ نیە، بە پارەی خۆی بلیتی بۆ کڕین. سەیر بو! بە پێچەوانەی هەڵوێستی مرۆڤدۆستانەی ئەم پیاوە باشە، لەولا ترەوە لە هەمان قیتاردا چوار پێنج کوڕی هەرزەکار بێ ئەوەی ئێمە هیچ کارێکی هەڵەمان کردبێ، بە زمانی جەستە و بە دەنگی بەرز و دوژمنکارانە کەوتنە گاڵتە پێکردن و جنێو پێدانمان ! گەیشتینە دوا وێستگا کە دەبو ئیتر دابەزین.

## کاك چاو!

ئەم وێستگایە لە دنیادا زۆر بەناوبانگ بو چونکە کەوتبوە سەر ئەو دیوارە درێژەی بەشی ڕۆژاوا و بەشی ڕۆژهەلاتی بەرلینی لەیەک جیادەکردەوە، دیواری بەرلین ولاتانی ئۆردوگای هاوپەیمانیی وارشۆی سۆشیالیستیی لە ولاتانی ئۆردوگای هاوپەیمانیی ناتۆی سەرمایەداریی لەیەک جیا دەکردەوە. ئەم دیوارە لە هەمو دنیادا بە دیواری ئاسنین (iron curtain) ناسرابو وناوبانگی دەرکردبو، ناوی وێستگەی قیتارەکە (Friedrichstrasse) بو. زو لە قیتارەکە دابەزین و خۆمان گەیاندە بازگەی (Checkpoint Charlie) کە شوێنی کۆنترۆلی پەساپۆرتی هەمو ئەو کەسانە بو لە بەرلینی ڕۆژهەلاتەوە دەچونە بەرلینی ڕۆژاوا. لە پشتی شوشەیەکی ڕون و ئەستورەوە پیاوێکی ئەفسەری ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات دانیشتبو، ئەم پیاوە مرۆڤێکی ئاسایی نەبو بەڵکو چاوێکی گەورەبو، هەمو جەستە و گیانی هەر چاوبو! (کاک چاو) زۆر زۆر بەوردی و کش و ماتی تیری ژەهراویی چاوێکی ترسناک و نیگایەکی پڕلە گومان و دڕدۆنگیی تێگرتم. لە تەوقی سەرمەوە تا ناوقەدەم، کە هەر ئەوەندەمی لێوە دیاربو، منی خستە ژێر گەردبینی چاوە بزە جاسوسیەکانیەوە، دەتوت لە فیلمی جاسوسی دام. بەلام نا ! فیلم نەبو بەڵکو ئەوە دۆخی دوژمنایەتی بو لە جەنگی ساردی نێوان بلۆکی وارشۆ و بلۆکی ناتۆ. ئەم بازگەیە چاودێریکراو ترین و تاوسەندو ترین سنوری نێوان هەردو بەشی بەرلین بو. ورد سەیری لیزەپاسەکەمانی کرد، ئینجا بە هێمایەکی دەستی و بە دەموچاوێکی بەردینیی هیچ دەرنەبڕ ئاگاداری کردین کە دەتوانین تێپەڕبین و بڕۆین. بەم جۆرە ڕێی پێداین بڕۆینە شاری بەرلینی ڕۆژاوا ی سەر بە دەوڵەتی ئەڵمانیای ڕۆژاوا کە لەو کاتەدا پایتەختەکەی شاری (بۆن) بو.

## چۆرێك لە ئازادی و دڵنیایی !

پۆلیسی بەرلینی ڕۆژئاوا لە شوێنەکە بو، ئێمەشیان بینی، بەلام بێ ئەوەی لێمان بپرسن کێین و کوا پەساپۆرتمان و کوا ڤیزا مان و بۆ هاتوینەتە ناو بەرلینی ڕۆژاوا، ڕێگەیان لێ نەگرتین لە بازگەکە بچینە دەرەوە. نەشارەزا و ماندو و برسی، بەلام ئازاد و بێترس، لە وێستگەکە هاتینە دەرێ و بە پێ کەوتینە ڕۆشتن بەسەر جادەکاندا هەتا بە پرسیار خۆمان گەیاندە نزیکترین پۆلیسخانەی ناو بەرلینی ڕۆژاوا. لەوێ

خۆمان دابەدەستەوە و داوای پەنابەریمان کرد. دوای چەند سەعاتێک ڕاگرتن لە بنکەکەدا، بە ئۆتۆمبیلی خۆیان بردیانین بۆ ئوتێلێکی سەر بە خاچی سوری ئەڵمانی کە تەرخان کرابو بۆ پەنابەران، لە ژورێکدا جێگیریان کردین. ئیتر ئێمە لە مەترسیە جۆراوجۆرەکان ڕزگارمان بو و کەوتینە ناو پرۆسەی پەنابەربون. ئاسۆی برام کە سێ ساڵێک بو لە ئەڵمانیا بو لە فرانکفۆرت دەژیا، هات بۆلامان و بە یەک گەیشتنێکی زۆر خۆش بو، سێ ڕۆژ لە لامان مایەوە. د.دانا سەعید کەرکوکی لە کۆلیجی پزیشکی دەیخوێند، لە گەڵ کچێکی کوردی سوریا هاوژینگیریی کردبو، بانگێشتنێکی شایستەی بۆ کردین لە ماڵە کەی خۆیدا.

## کاکی خۆم!

«کاکی خۆم فەرمو.... بەڵێ من ئەوم، فەرمو کێی جەنابت؟ ڕزگارم، لە ئێران ژمارەی تەلەفونەکەتیان پێداوم...... لە ئیستگەی قیتارەوە تەلەفون دەکەم، لە ئێرانەوە هاتوین، ئێستا بە ژن و منداڵەوە گەیشتوینەتە بەرلین، هیچ شارەزا نین، نازانین بۆ کوێ بچین، بەڵکو فریامان کەویت..... بەسەرچاو کاکی خۆم، لە شوێنی خۆتان مەجوڵێن، ئەها وا خۆم دەگۆرم..... دە توخوا زوکە منداڵەکانمان دەگرین..... باشە کاکی خۆم ئەها وا لە ماڵ دەردەچم و دەکەومە ڕێ بۆ لاتان..خواحافیز». (کاردۆخ) کوڕێکی گەنجی کەرکوکیە، لە ساڵی ١٩٧٨ بێ ترس لە سزای ڕژێمی سەدام، کاتی بەسەرچونی ناو پەساپۆرتە عێراقیەکەی بە خاڵ و هێڵێک درێژدەکاتەوە و ڤیزای ئیتالیا وەردرگرێت و دەچێت بۆ ڕۆما، دوای چوار مانگ دەچێتە بەرلینی ڕۆژاوا و دوای پەنابەری دەکات، ئێستا لە زانکۆی بەرلین کۆمەڵناسی دەخوێنێت. چەندین جار، چەندین ڕۆژ، لە کات و ناکات دا، لە لایەن چەندین کەسی نەناس و ناسیاوەوە،لە ناو بەرلین و دەوروبەریەوە تەلەفونی ئاوای بۆ دەکەن. کاردۆخ کوڕێکی ئارام و دڵباش و بەبەزەییە، هەروەها نیشتمانپەروەر و نەتەوەخوازیشە. زۆرجار لە کاتی تەلەفون و گفتوگۆی ئاساییش دا وشەی دۆستانەی (کاکی خۆم) بەکاردەهێنێ، ئەوەندە بەکاری دەهێنێ کە ئیتر کوردەکان ناوی دەنێن کاکی خۆم و ناوە ئەسڵیەکەی کە کاردۆخە خەڵک لە بیریدەچێتەوە، دواتر ناوەکە دەبێت بە ڕەسمی و ژنە ئەڵمانیەکەشی (ئوتا) هەر پێی دەڵێ کاکی خۆم. ئیتر بە پێی کات و گونجان و توانا، کاکی خۆم بە خۆی و ئۆتومبیلە کیسەڵیە کەیەوە دەچێت بە هانای پەنابەرانی کوردەوە. ئێمەش

که گەیشتینە بەرلین تەلەفونمان بۆ کرد بەڵام لە ماڵ نەبو. دواتر کە لە ئوتێلەکە جێگیربوین پەیوەندیەکی ترم پێوەکرد و هات بۆ لامان، لە ژورەکەی خۆی لە ماڵی خوێندکاران بانگێشتی خواردنی کردین و چەند جارێکیش بە سەر پشتی کیسەڵەکەی بە ناو بەرلیندا گێراینی، لەو کاتەوە تا ئێستا ئیتر بوین بە هاوڕێ و برای یەکتر. کاکی خۆم کۆمەڵناسیی تەواوکرد و وەک ڕاوێژکاری کۆمەڵایەتی دامەزرا. ئەو هەتا ئێستا بەردەوامە لە پشتگیریکردنی کێشەی کورد و پەنابەران بەگشتی و هی کورد بەتایبەتی. هەروەها لە پشتگیریکردنی جۆراوجۆری باشور و باکور و ڕۆژاوای کوردوستان بە تایبەتی لە بواری تەندروستیدا، بە هاوکاریی خەڵکی خێرخوازی ئەڵمانیا، چەندین پرۆژەی تەندروستی و خزمەتگوزاریی بەجێگەیاندوە.

## ڕێکەوت لەگەڵمان نەبو!

ئێمە زۆر حەزمان دەکرد هەر لە بەرلین بمێنینەوە، بەڵام بەداخەوە دوای چەند هەفتەیەک کە دابەشکراین، ئێمە بەر هەرێمی (Bayern) کەوتین، کە وەک بەڕێوەبردن و یاسای حکومەت خراپترین هەرێمی ئەڵمانیا بو لە ڕەفتاری دا بەرامبەر پەنابەران. بە فڕۆکە لە بەرلینەوە بردیانین بۆ (هانۆڤەر)، لەوێشەوە بە قیتار گواستیانینەوە بۆ کەمپێکی زۆر گەورەی پەنابەران لە شارۆچکەی (Zirindorf) ی نزیک شاری (Nuernberg). لەم کەمپە بنکەیەکی سەربازیی ئەمریکی هەبو کە دەوترا بنکەی هەواڵگریی سەر بە دەسگای جاسوسیی C.I.A یە. بۆ تەواوکردنی کاری ڕۆتینی پەنابەریەکەت دەبو بچیتە لایان و وەڵامی پرسیارەکانیان بدەیتەوە و لیگەڕێی وەک مانگایەکی شیردەر شیری زانیاریی جۆراوجۆرت لێ بدۆشن. من پێشتر بڕیارم دابو یەک زانیاریان پێ نەدەم، چونکە من داوای پەنابەریم لە ئەڵمانیا دەکرد نەک لە ئەمریکا و هیچ ناچار نەبوم زانیاریان بدەمێ، جگە لەوە هەر حەزیشم نەدەکرد زانیاریان لە سەر کوردوستان بدەمێ. کوڕێکی ئەمریکیی گەنج لە پشتی مێزەکەیەوە دانیشتبو، عەرەبی و فارسیی دەزانی، بەم دوزمانە و ئینجا بە ئینگلیزی کەوتە پرسیارکردن لێم. من وەک ئەکتەر بە زمانی جەستە و ئیشارەت خۆم وا نیشاندا کە جگە لە زمانی کوردی هیچ زمانێکی تر نازانم، وادیاربو وەرگێڕی کوردیش لەویادا نەبو، من هەر دەموت (کوردی کوردی). کابرا سور دەیزانی من ڕاست ناکەم، بۆیە وردە وردە ئارامیی نەما و تۆنی دەنگەکەی توندتر و زبرتر بو، بەڵام کە زانی هیچ لە من نابیسێ، کاغەزەکەی

بەردەمی واژوکرد و بە تورەییەوە فڕێیدایە بەردەمم. کوڕێکی گەنجی کوردی عێراق کە دەموچاوی بە هۆی سوتانەوە زۆر ناشیرین و شێوابو، دوای لێکۆڵینەوەی کابرای ئەمریکی، بە ئومێدی عەمەلیاتی جوانکاریی دەموچاوی زۆر لە ئەمریکیەکان نزیک بۆوە و دواتر دەوترا وەک نێچیرێک کەوتۆتە تۆڕی هەواڵگریانەوە! دوای نزیکەی سێ هەفتە ژیان لەم کەمپە، لە مانگی ۱۱ی ۱۹۸۵گواستیانینەوە بۆ یەکەیەکی نیشتەجێبون بۆ شاری (Schweinfurt)، جادەی۲٦ Breite Wiese و ئیتر لێرە جێگیبوین.

## دڵ لای هاورێکانت، جەستە لە ئەڵمانیا!

من نزیکەی چوار ساڵی یەکەمی ژیانی ئەڵمانیام (پایزی ۱۹۸٥ تا پایزی ۱۹۸۹) هەمو سەرنج و مێشک و گوێ و چاوم ڕو لە ڕوداوەکانی کوردوستان بو، تەنیا شتێکی تر کە سەرگەرمی کردبوم و بوبوە خولیام فێربونی زمانی ئەڵمانی بو. ئێمە کەئیتر لە (Schweinfurt) جێگیربوین و ژیانمان مسۆگەربو، من وەک پەیمانم دابو نوێنەرایتیی ئالاَی شۆڕش بکەم لە سوریا، ئێستا ئیتر دەمتوانی بێخەم پەیمان و کێوان لە ئەڵمانیا بەجێبهێڵم و بە تەنیا بگەڕێمەوە بۆ سوریا. وەک پیاوێکی ڕەبەن دەتوانی بەرگەی برسێتی و هەمو سەختی و ناخۆشیەکانی تری خەبات بگری. بە نیازی وەرگرتنی ڤیزای سوریا و درێژەدان بە کاری نوێنەرایەتیی ئالاَی شۆڕش لە دیمشق، لە کۆتایی ساڵی ۱۹۸٥ دا چەند جارێک چوم بۆ کونسولگەریی سوریا لە شاری بۆن. دوای دەسی دەسی پێکردن ودرۆکردن لە گەڵم، ڤیزاکەیان پێنەدام وهیچ ئومێدێکیشیان نەخستە بەردەمم لە داهاتودا بمدەنێ. لە برادەرانی (ئالاَی شۆڕش) وە هیچ هەواڵ و بەدواچون و دەنگ و دەنگدانەوەیەک نەبو، دواتر لە سەرەتای ساڵی ۱۹۸٦ دا زانیم کە (مەلا بەختیار) ی کەسی یەکەمی (ئالاَی شۆڕش) و دو سەرکردەی ڕێکخراوەکە (مەحمود کەشکوڵ) و (پشکۆ نەجمەدین) لە سەرەتای مانگی ۱۱ ی ۱۹۸٥ وە یەکێتی زیندانیی کردبون و پاککردنەوەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی (ینک) لە ئەندامان و لایەنگرانی (ئالاَی شۆڕش) بە سەرکەوتویی ئەنجام درابو و بەمە ئالاَی شۆڕش زۆر لاوازکرابو و بۆ ناو ئێران ڕاونرابون. بەم جۆرە ئیتر پەیوەندیی من بە ئالاَی شۆڕشەوە بچڕا و نەما. ئیترمنیش وەک هەر پەنابەرێکی تر لە ئەڵمانیا کەوتمە ژیانی ئاسایی تایبەتیی خۆم و ژن و منداڵەکەم.

## کۆنسێرتێکی هۆڕن لێدان !!

له (Schweinfurt) (ئاسۆ بابان) م ناسی که لاوێکی خەڵکی سلێمانی بو، چەند ساڵێک بو هاتبوه ئەڵمانیا و ژنەکەی ئەڵمانی بو. تازه مۆڵەتی شۆفێریی عێراقم گۆڕیبوه سەر ئەڵمانی، هەر ئۆتۆمبیلێکم نوقسان بو. ڕۆژێک ئاسۆ هاته لام و وتی دوکتۆر ئۆتۆمبیلێکی تازەمان کڕیوه، فەرمو ئەوه سویچی ئۆتومبیلەکەم با پێشکەشی ئێوه بێت. له کاتی خۆیدابو! سوپاسم کرد و لێم وەرگرت. ئۆتومبیلەکه فۆلکسڤاگن یێکی کیسەڵیی کون بو. ڕۆژێک خۆم گیڤکردەوه و به پەیمانم وت یاڵڵا سەرکەوین با بچین بۆ لای ئاسۆی برام له فرانکفۆرت.

له سەر ئۆتوبان (ڕێگای دو لا) به هەورازێکی درێژدا سەردەکەوتم، چەند لۆرییەک له پێشمەوه دەڕوشتن و لای چەپم چۆڵبو، گورمدایه کیسەڵه پیر بۆ ئەوەی پێشی لۆرییەکان بدەمەوه و بێمەوه سەر لای ڕاست. هاتمه هێڵی چەپ، بەڵام چی پێم نا به بەنزیندا سودی نەبو چونکه لۆرییەکانی لای ڕاستم له من خێراتر بون. که سەیرێکی ئاوێنەی دواوەم کرد بینیم ئاسکه گەنجەکان ڕیزێکی درێژ درێژیان له دوامەوه بەستوه و لایتم بۆ لێدەدەن. له هەمو دنیا تەنیا له ئەڵمانیا له سەر ئۆتوبان خێرایی ئۆتۆمبیل بێسنوره، مه گەر به هێمای هاتوچۆ خێراییەکه دەسنیشانبکرێت. ئێستا له کیسەڵەکەمدا وام هەست کرد تاشەبەردێکی گەورەم و له چەقی ڕێگکەدا کەوتوم. سەرم کزکرد و خێرا هاتمەوه هێڵی ڕاست بۆ دوای لۆرییەکان. فلانی! به پیپ و هۆرنلێدانی گاڵتەجاڕانەی جۆراوجۆر شۆفێری ناو ئۆتومبیلەکان کۆنسێرتێکی سەیریان لەو سەر ئۆتۆبانه سازکرد. له جامی پیره کیسەلەڵەوه بینیم چۆن شۆفێری ئۆتۆمبیلەکانی بەلامدا تێدەپەڕین به قاقای پێکەنینەوه تەماشای منیان دەکرد، پێکەنینەکەی ئەوان جێگای به ترس و شەرمی سەرەتایی من لێژکرد و ئێمەش کەوتینه پێکەنین له گەڵیان، خوایه گیان چ هەڵەیەکم کرد!

## سەرەتاکانی ژیانم له ئەڵمانیا!

من بێ چون بۆ کۆرسی فەرمیی زمان، هەر به هەوڵ و کۆششی بەردەوامی خۆم و دروستکردنی پەیوەندیی گەرم لەگەڵ ئەڵمانیه مرۆڤدۆست و دیموکرات و ژینگەپارێز و چەپ و کۆمۆنیستەکان، له ساڵی یەکەمدا ئەوەنده ئەڵمانی فێربوم که باش قسەی پێبکەم و ژیانی ڕۆژانـەی پێ بڕەوێنم و کتێب و ڕۆژنامـەی پێ

بخوێنمەوە و لە تەلەفیزۆنی ئەڵمانی تێبگەم. وردە وردە وام لێهات بومە وەرگێڕ و دەمڕاستی پەنابەرانی تری عەرەب و فارس و کوردی ئەو دو تەلارە گەورەیەی پێکەوە تیادا نیشتەجێ بوبوین. هەر لە دوهەم هەفتەدا کە لە بەرلین بوم فەرهەنگێکی بچوکم کڕی هی ئەڵمانی بۆ ئینگلیزی و پێچەوانەکەشی بو، بەردەوام لە گیرفانمدا بو، هەروشەیەکی ئەڵمانیم ببینیایە لە سەر جادە و لە سوپەرمارکت و لە پۆست و لە دائیرەکان و لە ئیستگەی قیتار و...یەکسەر لەو شوێنەدا لە پەنایەکدا دەوەستام، فەرهەنگە بۆرم پەڕ پەڕ دەکرد تا وا تاکەیم بە ئینگلیزی دەدۆزییەوە، ئەگەر وشەکەی تیا نەبوایە، لە سەر کاغەزێک دەم نوسی و لەماڵەوە لە فەرهەنگی گەورەی ئەلمانی-عەرەبیی (شراجله) دا واتاکەیم دەدۆزیـەوە. هەرزو وەک منداڵێک زمانم پژا، کەی و لەکوێ ژیانی رۆژانە پێویستی بکردایە، بە ئەڵمانی بێ ئەوەی بترسم یا شەرم بکەم لە هەڵەکردن قسەی خۆمم دەکرد. لەو سەرەتایانەدا کە ئەڵمانیەکەم گڕوگاڵی دەکرد و هەڵەی زۆرم دەکرد، هەرگیز یەک جار ئەڵمانیەکم نەبینی گاڵتە و لاقرتیم پێبکات، بە پێچەوانەوە هەمیشە هانیان دەدام و زۆر دۆستانە هەڵەکانیان ڕاست دەکردمەوە و سەرسامیی خۆیان دەدەبڕی بەوەی کە وا زو فێری ئەڵمانی بوم. سێ مانگ بو لە ئەڵمانیا بوم، لە کتێبخانەیەکدا لە شاری (Nuernberg) بە تێکەڵەیەک لە ئینگلیزی و گڕوگاڵێکی ئەڵمانی داوام لە ژنی خاوەن کتێبخانەکە کرد کتێبی فێربونی زمانی ئەڵمانیم پیشانبدات تا بیکڕم، کتێبەکەی بۆ دۆزیمەوە. کە زانی من پەنابەرم و تەنیا سێ مانگە لە ئەڵمانیام، بە ڕویەکی خۆشەوە پێی وتـم: "ئـەوە دیـاری و خەڵاتی منە بۆ تۆ کە ئاوا باش و زو فێری ئەڵمانی دەبیت، دەبێت دیاریەکەم قوبوڵ بکەیت ". (لەم چرکەکاتە دا لە بری خۆشی، خورپەیەک لە دڵی دام، تەمی حەسرەت وخەمێکی قوڵ دەوروبەری داپۆشیم، وردە وردە لە ناو تەمەکەوە تارمایی (بەهادین) دەرکەوت، وا لێم نزیک بۆوە کە ئیتر سیما ی جوان دیاربو لێم. ساڵی ١٩٧٢ بو لە پۆلی شەشی ئامادەیی بوم لە قوتابخانەی ئامادەیی سلێمانی، (بەهادین) کوڕێکی سپیکەلەی چاو سەوزی باڵابەرز بو، کوردی فەیلی بو، تازە لەگەڵ خێزانەکەیدا لە دەست زوڵم و تیرۆری ڕژێمی بەعس، بەهۆی هەڵوێستی کوردانەیانەوە، بە زیانێکی ماددی زۆرەوە ماڵ و حاڵ و کەسابەتیان لە بەغداد جێ هێشتبو و پەنایان هێنابو بۆ سلێمانی. (بەهادین) یەکەم ڕۆژی هاتنی بو بۆ قوتابخانەکەمان، بەر پۆلەکەی ئێمە کەوتبو، لە ناوەڕاستی ڕیزی لای ڕاستدا لە پاڵ دیوارەکە لەگەڵ خوێندکارێکی تردا

لەسەر کورسیەکی دوکەسی دانیشتبو. مامۆستا پرسیاری لێکرد ناوی چیە وخەلکی کوێیە و...بەهادین کەوتە وەلام دانەوەی پرسیارەکەی بە شیوە زاری فەیلی کە ئێمە باش لێی تێنەدەگەیشتین. لە پرقاقای پێکەنینێکی بەرز وەک ڤایرۆسی ئینفلوەنزا مامۆستا و یەک بەیەکی خوێندکارەکانی تەنیەوە، (بەهادین) ی داماو زۆر شلەژا، بەلام باشبو ڤایرۆسەکە ئەوەندە دڕ و هێرشبەربو کە پاشماوەکەی ئەویشی گرتەوە، بزە و خەندەیەکی گیرخواردن و تەریقی دەم و چاوە بێگوناهەکەی ئەویشی داپۆشی و زو ئاوابو). ژنە ئەلمانیەکە کتێبەکەی لە کاغەزێکی ڕەنگاوڕەنگەوە پێچابو، بە زەردەخەنەیەکەوە دایە دەستم، بە بڕیک شلەژانەوە سوپاسی میهرەبانیم کرد و مالاواییم لێکرد.

سلێمانی لە چاو هەولێر و کەرکوک و دهۆک شارێکی بڕێک داخراو بو، عەرەب و تورکومان و کلدوئاشور زۆر کەمبون تێیدا. جگە لە خوێندکاری زانکۆ و کرێکار و سەرباز و بازرگانی دەولەمەند کەم کەس دەچون بۆ بەغدا و شارەکانی تری عێراق. بۆیە کوردی سلێمانی لە چاو کوردی ئەو شارانەی ترعەرەبی مان کەم دەزانی، هەروەها جگە لە شێوەزاری سۆرانی کەم کەسمان بینیبو بە شێوەزارەکانی تری کوردی وەک بادینی و فەیلی قسەبکات. بەلام لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا ئێمە نەدەبو ئاوا بە (بەهادین) پێبکەنین. تەنیا تاوانی بەهادین ئەوەبو جیاوز بو لە ئێمە، جیاوزبونیش سروشتی ترین شتی ئەم دنیایەیە، مادام جیاوازی زیان بەکەسێکی تر نەگەیەنێ، ئیتر چ خەوشێکی تێدایە ئەگەر ڕەنگی پێست، زمان، ئاین، ئاینزا، بیروڕای سیاسیی و..... هی تۆ جیا بێت لە هی من؟ بەڕاستی ئێستا کە بیر لەو پێکەنینە دەکەمەوە هەست بە شەرم و گوناه دەکەم و دەپرسم دەبێت چ ئازارێکمان بە ناخی دەرونی (بەهادین) گەیاندبێت ؟

## ئەوەی کۆمەك بە فیکرت بێ لە هەرلابێ براتانە!

شاعیری گەورەی کورد (قانیع) دەلێت:

**برابن غایەتان یەک بێ برایی غایە یەکبونە**

**ئەوەی کۆمەک بە فیکرت بێ لە هەرلابێ براتانە!**

ڕۆژ بە ڕۆژ کە ئەڵمانیەکەم بەهێزتر دەبو تێکەلاویم لە گەڵ کۆمەڵی ئەڵمانی توندوتۆڵتر و چڕتر دەبو، بەم تێکەلاویە ئەڵمانیەکەم ئەوەندەی تر بەهێز دەبو. وردە وردە پەیوەندیی تێکۆشانی سیاسیم لەگەڵ مرۆڤدۆستەکان ولایەنگرانی پارتی سەوز و پارتی کۆمۆنیستی ئەڵمانی و پارتی سۆشیال دیموکراتی ئەڵمانی بەهێزتر و گەرم و گوڕتر دەبو. ئەوانە زۆر دڵسۆزانە بەشداردەبون لە گەڵمان لە چالاکیەکانماندا (خۆپیشاندان، مانگرتن، کۆڕ، سیمینار...). بۆ ناساندنی کورد و مێژوی خەباتی و چەوساندنەوەی و بەسەرهاتە غەمبار و هەژێنەرەکانی بە ئەڵمانییەکان، چالاکوانانی ئەوحیزبانە لە دەیان چالاکیی گەورە و بچوکدا لەگەڵماندابون. منیش لەگەڵ ئەواندا بەشداردەبوم لە چالاکیە سەندیکایی وکۆمەلایەتی و سیاسیەکانیان کە پەیوەندیی بە هەمو ئەڵمانیاوە هەبو: وەک ئاشتیخوازی، دژایەتیی وزەی ئەتۆمی، ژینگەپارێزی، مافی پەنابەران، مافی کرێکاران (بۆ نمونە هەفتەی ٣٥ کاژێر ئیشکردن)، مافی ژنان، نارەزایی بەرامبەر بێئیشی. Michel Elsbeth خانمێکی مرۆڤدۆست بو، کاتێک لەگەڵمان لە پێشی پێشەوە دروشم و وێنەی قوربانیانی کیمیاویی کوردوستانی هەڵدەگرت، مرواریی فرمێسکە بەکوڵەکانی بەسەر ڕومەتە ناسک و ئاڵەکەیدا دەبارانده سەروێنەکان، کاتێک ئەم دیمەنەم دەبینی موچڕک و تەزو سەرتاپای دادەگرتم. Claus Seidel پیاوێکی بالابەرزی مەنگ و سەرکەش و جوامێر بو، لە ئیشە ئیداریەکاندا خۆبەخشانە لەگەڵم دەهات بۆ دائیرەکان و وەک برایەکی دلسۆز، وەک ڕاوێژکارێک هەمیشە ئامادە ی بەرگری بو لە مافی پەنابەریمان. کە هەندێ جار کارمەندێکی بیرتەسک و ئاسۆتەنگی ئەڵمانی بە برێک وشکی و ساردی لەگەڵمان دەجولایەوە، Claus ی سەنگین و ڕۆشنبیر، بە ئارامی وهاوسەنگی، بە هێنانەوەی بەڵگە و پیشاندانی یاساکان بەرەنگاری کابرا دەبۆوە. کە ئیشەکەم تەواو دەبو، پێکەوە دەچوینە کافیتیریایەک، بەدەم قاوە خواردنەوە و جگەرە کێشانەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵدەکێشا و پێی دەوتم: "ئەبدول، هەڵوێستی زبر و ناجوامێرانەی ئەم جۆرە پیاوانە وام لێدەکات لە بەردەم تۆدا شەرم بکەم کە ئەڵمانیم! ". Claus لەم جۆرە هەڵوێستانەدا دڵخۆشیی منی دەدایەوە. جارێک پێی وتم: "دڵگران مەبە ئەبدول، دەزانی من لەبەر ئەوەی کۆمۆنیستم لە پیشەی مامۆستایی دەریانکردم، لەبەر ئەوەیە ئێستا وەک کرێکار لە کارگەیەکدا کاردەکەم".

## دیدارێکی خۆش!

هاورێیەکی کرێکاری کۆمۆنیستی ئەڵمانیم هەبو ناوی: Juergen Willike بو، باڵا و کێشی ناوەند بو، ریشێکی سوری جوانی هەبو، لەو کارگەیەی ئیشی تێدا دەکرد باوەرپێکراوی یەکەمی سەندیکای کرێکارانی ئەڵمانیا بو، ئەم پیاوە ماندونەناسە هەمو ژیانی خۆی تەرخان کردەبو بۆ خەباتی سیاسی لە پێناوی چەوساوەکاندا. زوزو دەهات بۆ لامان بۆ کەمپەکە، زانیاریی دەداینێ لە سەر ئەرک و مافەکانمان وەک پەنابەر، وەڵامی پرسیارکانمانی دەدایەوە. دەڤەری Bayern کە شارەکەی ئێمە (Schweinfurt) ی تێدابو حیزبی (یەکێتیی مەسیحیی جڤاتی - CSU) حوکمی دەکرد کە بە گشتی حیزبێکی کۆنەپارێز و برێک راسترەوە. سیاسەتی ئەم حیزبە بەرامبەر پەنابەران زۆر بێبەزەیی و دەست نوقاو بو، موچەی ژیانی رۆژانە لە بری پارە بە خۆراک پێیان دەداین لە پاکەتی داخراودا کە هەفتانە بۆیان دەهێناین، پارەی گیرفان مانگی پەنجا مارکیان پێدەداین. سێ خێزانیان لە یەکەیەکی نیشتەجێبونی ١٠٠ مەتر چوارگۆشەیی ترنجاندبو، چێشتخانە و ئاودەست و گەرماو بە هاوبەشی بەکارمان دەهێنا، زۆر نائازاد بوین لەو ماڵەدا، بۆ بەجێهێشتنی شارەکە دەبوایە مۆڵەتی فەرمیمان وەربگرتایە.حکومەت پۆلی زمان فێربونی ئەڵمانیان بۆ نەدەکردینەوە، نەیان دەهێشت منداڵەکانمان بچنە باخچەی منداڵان. بە هاوکاریی Juergen و Claus و Elsbeth توانیمان خۆپیشاندانێکی یاسایی کەمپەکە لە ناوشاردا رێکبخەین. لە تابلۆی جۆراوجۆردا داواکاریەکانمان بە ئەڵمانی نوسیبو، لە رۆژنامەی سەرەکیی شارەکەدا خۆپیشاندانەکەمان وەک روداوێکی سیاسیی گرنگ لەسەری نوسرا و گرنگی پێدرا، پێشتر لە رۆژنامەکەدا زۆرتر باسی ئەو سەرپێچییە نایاساییانە دەکرا کە هەندێ پەنابەر دەیانکرد وەک دزی و شەڕ و سواربونی پاس و قیتار بە بێ تکت.

بۆ گەیاندنی کێشەکانی پەنابەران بە پەرلەمانی ئەڵمانیا، ئەم سێ کەسە دیدارێکیان سازکرد لەگەڵ ژنێکی ئەندامی پەرلەمانی ئەڵمانیا کە نوێنەری شارەکە بو، منیشیان بۆ دیدارەکە باگهێشتکردبو. بۆ منی پەنابەرێکی گومناوی بێیانی، هەستێکی زۆر خۆش بو لەگەڵ ئەم هاورێ مرۆڤدۆستانە و لەگەڵ ئەندامێکی پەرلەمانی ئەڵمانیا بەدەوری مێزێکدا دابنیشیت و باسی کێشەکانی پەنابەر و کورد بکەیت لەگەڵیان، ئینجا نانێکی خۆشیشیان لەگەڵ بخۆیت!

## منداڵێکی پڕوزه و وریا !

کاتێک له کەمپەکەی (Schweinfurt) بوین ناو به ناو ئاسۆی برام و دیاری و هاوڕێیانی تر دەهاتن بۆ لامان. جارێک (کاکی خۆم) میوانمان بو، به دەوری خوانه بچوکەکەمان نانی بەیانیمان دەخوارد. کێوان تەمەنی سێ ساڵێک دەبو، لێی پرسیم ئەو پیاوه کێیه ؟ منیش وتم کێوان گیان هاوڕێمانه و ناوی کاکی خۆمه، وتی «کاکی کێ؟»، بوبه پێکەنینێکی خۆش. جارێک (ئاسۆی سەڵته) ی هاوڕێم به خۆی و کەمانەکەیەوه هات بۆ لامان، کێوان هەر دەستی له کەمانەکەی دەدا. ئاسۆ کەوته لێدانی کەمان، ئاوازی مۆسیقاکەی زۆر غەمبار بو، دەربڕی ئەو دۆخه ناخۆشه بو که تێیدا دەژیاین. له گەرمەی مۆسیقاکەدا هەر ئەوەندەمان زانی کێوان لێوی شۆڕکرد و کەوته گریانێکی به کوڵ. جارێک Juergen له چێشتخانەیەک بانگێشتی نانی نیوەڕۆی کردین، جگه له ئێمه کوڕێکی ڕەش پێستی ئەفریقیشی بانگکردبو. کوڕەکه ڕێک بەرامبەر کێوان دانیشتبو، کێوان یەکەم جار بو ئاوا له نزیکەوه کەسێکی ڕەشپێست ببینێ. زۆر وردبوەوه لێی، له پڕ لێی پرسیم: "هـەژار ئەو کوڕه دەم و چاوی نەشتوه؟ "، من و پەیمان زۆر پێکەنین، که بۆ Juergen و کوڕه ئەفریقیەکم کرد به ئەڵمانی ئەوانیش زۆر پێکەنین. کێوان دوای ئەوەی بەکالۆریۆسی له بەشی کۆمەڵناسی و کارگێڕیی تەواو کرد، ئێستا له شارێکی گەورەی ئەڵمانیا بەڕێوەبەری شوێنێکه که مێردمناڵ و هەرزەکاری پەنابەری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست تێیدا دەژین، ئەم له ژیانی ڕۆژانەیاندا ڕینماییان دەکات و یارمەتیان دەدات بخوێنن و ژیانێکی دروست و بەرهەمدار له ئەڵمانیا فێربن و بژین.

## «مامه ڕیشه گیان !»

نیگارکێش (محەمەد ناشاد) له شارۆچکەیەکی نزیک ئێمه به ناوی Bad Neustadt دەژیا، باسی ناشاد م بۆ هاورێ ئەڵمانیەکانم کرد و پێشنیازم کرد له (Schweinfurt) پێشانگایەکی بۆ بکەینەوه. پێشتر ناشاد م ئاگادارکردەوه که دەچین بۆلای، ئامانجی چونەکەمان م بۆ ڕونکردەوه. ڕۆژێک بۆ ناسینی و بینینی تابلۆکانی له گەڵ Juergen چوین بۆلای. تومەز(محەمەد ناشاد) فول سەرخۆشه، هەر له دورەوه که Juergen ی بینی به خۆی و ڕیشه سورەکەیەوه (محەمەد ناشاد) به پیرمانەوه هات و هاواری کرد (مامه ڕیشەگیان بەخێربێیت) و شڵپ و هوڕ کەوته ئەملاولا ماچکردنی Juergen.

هەڵوێستێکی ترش و شیرین بو، لە ئەڵمانیا پیاو یەکتری ماچ ناکەن و کەسێک کە پێشتر نەت بینیبێت و باش نەیناسی ئاوا بەم گەرمیە چاکوچۆنیی لەگەڵ ناکرێت. دواتر پێشانگاکەمان بە سەرکەوتویی بۆ محەمەد ناشاد کردەوە.

## لە بنەڕەتدا یەکشتن!

من بەردەوام لە ڕێی تەلەفیزۆنی ئەڵمانیەوە ئاگاداری ڕەوتی سیاسەت و ڕوداوە گرنگەکانی ئەڵمانیا بوم. Wackersdorf گوندێک بو لە باشوری ڕۆژهەلاتی Bayern، لە ساڵی ١٩٨٥ وە لەو گوندە دا دەستکرابو بە دروستکردنی کارگەیەکی وزەی ئەتۆمی. هەر لە سەرەتاوە دانیشتوانی گوندەکە و دەوروبەری دژی کارگەکەبون چونکە بە مەترسیەکی گەورەیان دەزانی لەسەر تەندروستیان. کاتێک لە ڕۆژی ٢٦ ی ٤ ی ١٩٨٦ کارەساتی تەقینەوەی (چێرنۆبیل) لە ئۆکرانیای یەکێتیی سۆڤێت ڕویدا، ئیتر ترسی خەڵکی ناوچەکە لە و کارگەیەی Wackersdorf دەهێندەی تری چوەسەر. بزوتنەوەیەکی مەدەنیی فراون دژی کارگەکە دروست بو. لە بەهاری ١٩٨٦ چەندین خۆپیشاندانی گەورە لەو گوندە دا ڕویدا کە سەدان هەزار خەڵک لە هەمو ئەڵمانیاوە بەشداریان تێدا کرد. چەند جارێک شەڕ و پێکادانی گەورە ڕویدا لە نێوان خۆپیشاندەران و هێزەکانی پۆلیس، لەو بەیەک هەڵپژانەدا پتر لە هەشت سەد کەس بریندداربون. پۆلیس بە چەندین هێلیکۆپتەرغازی تون و تیژی برینداركەر و فیشەکی لاستیکیان بەکارهێنا، هەندێ لە خۆپیشاندەرانیش خڕەبەرد و ئاسنیان بەکارهێنا. من کە لە دورەوە لە تەلەفیزۆنا دیمەنی هێرشی هێلیکۆپتەرەکانی پۆلیسی ئەڵمانیم دەبینی بۆ سەرخەڵک، هەستم بە هاوسۆزی و هاوچارەنوسیەکی مرۆڤانە دەکرد لەگەڵ خۆپیشاندەران، دیمەنی هێلیکوپتەرە جەنگیەکانی ڕژێمی سەدامم دەهاتەوە بەرچاو لە کاتی هێرشیان بۆ سەر پێشمەرگە و خەڵکی گوندەکانی کوردوستان، لە بەرخۆمەوە دەمـوت: "لە بنەڕەتدا هەر دوکیان یەک شتن، دەسەلات دەیەوێت ملهوڕانە ویستی خۆی بە زۆر بەسەر خەڵکدا بسەپێنێت، لە ئەڵمانیا ئاستی دیموکراتی و ئازادیی سیاسی و پێشکەوتنی وڵاتەکە و کۆمەڵەکە و تاکەکانی، ڕێگە بە دەسەڵاتی سیاسی نادات ئاگر و ئاسن بەسەر خەلکەکەدا ببارێنی، بەڵام لە عێراق ئاستی گشتیی خەڵکەکە و سیستمی حوکم ڕێگە دەدات. بەرگری و بەرەنگاربونەوەی ناتوندوتیژانەی خەڵکی ئەڵمانیا درێژەی کێشا، هەتا لە ساڵی ١٩٨٩ ڕەنجی خەباتی خەڵکەکە بەری گرت و کارگەکە داخرا.

## کلیسا و پارێزگای نورنبێرگ

لە ڕۆژی ١٦ ی ٤ ی ١٩٨٧ گوندەکانی (شێخ وەسان، بالیسان، کانی بەرد) کیمیاباران کران و سەدان کەس لە دانیشتوان مردن و برینداربون، ئەوە یەکەم کیمیاباران بو لە کوردوستاندا. ئەم هەواڵە جەرگبڕەم لە چەند سەرچاوەیەکەوە پێگەیشت. بە نیازی چالاکیەک بە بۆنەی ئەو تاوانە گەورەیەوە، کەوتمە پەیوەندیکردن بە کوردە ناسیاو و هاوڕێکانم، بەتایبەتی ئەوانەی لە نزیک منەوە دەژیان وەک ئاسۆ بابان و فریادی هاوڕێی. پێکەوە بڕیارمان دا بچینە ناو گەورەترین کلیسای نورنبێرگ و مان بگرین تێیدا. کێوان و پەیمانم سواری فۆلکس ڤاگنەم کرد و خۆمان گەیاندە ناو شاری نورنبێرگ. نزیکەی بیست کەسێک دەبوین لە پیاو و ژن و منداڵ کە لەبەردەم کلیساکە گردبوبوینەوە. بێ ئەوەی پێشتر ئاگاداریان بکەین خۆمان کرد بە ناو کلیساکەدا، دروشم و بەیانەکانمان بڵاوکردەوە کە لەسەر تاوانی کیمیاباران کردنی ئەو گوندانە ئامادەمان کردبو، دەستمان کرد بە مانگرتن لە کلێساکەدا. ئێمە نەمان دەویست بچینە دەرێ بۆ ئەوەی نوێژکەرانی کلێساکە کە وردە وردە ژمارەیان زۆرتردەبون، لەو تاوانەی ڕژێمی سەدام ئاگاداربکەینەوە و بە گشتی کێشەی کوردیان پێ بناسێنین. دوای نزیکەی دو سەعاتێک، بە چەکی نەرمی بەڵێنی درۆ و فڕوفێڵ ئێمەیان لە کلیساکە کردەدەرەوە. ئێمەش یەکسەر چوین بۆ تەلاری پارێزگای نورنبێرگ و لە ناو هۆڵ و ڕاڕەوەکانیدا دەستمان کرد بە مانگرتن. باش بو نوێنەری پارتی سەوزەکان لە ئەنجومەنی شارهات بەدەم مانەوە، هەواڵنێرێکی ڕادوێی نورنبێرگ ی بۆ بانگ کردین، ئەو کەوتە پرسیار و وتووێژ لە گەڵمان لە سەر چالاکییەکەمان. جگە لە (ئاسۆ بابان) و (فریاد) کە ئەڵمانیەکەی ئەوان لە هی من باشتر بو، منیش بەو نیوە ئەڵمانیەی دەمزانی کەوتمە وتووێژ لەگەڵیان، ئەوە یەکەم جارم بو بە ئەڵمانی قسە بۆ میدیا بەکەم. چالاکیەکە بە شێوەیەکی زیندو و ڕاستەوخۆ لە ڕادیۆی نورنبێرگ بڵاوکرایەوە. لەم چالاکیەدا هێژایان ئاسۆ بابان و فریاد ڕۆڵێکی گرنگیان بینی چونکە ئەمان چەند ساڵێ پێش من هاتبونە ئەڵمانیا و شارەزای ناوشاری نورنبەرگ بون.

## وەهمێکی سەیر!

ئێستا گەیشتوینەتە پایزی ١٩٨٧، لە ڕێی ڕادوێی ڕەسمیی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە ڕۆژانە هەواڵە ناخۆشەکانی کوردوستان و جەنگی ئێران – عێراق م دەبیست.

ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنوسم، چەند بەزەییم بە خۆم و گەلەکەمدا دێتەوە ! چونکە لەو کاتەدا دڵم بە هەواڵەکانی (قەرارگای رەمـەزان) ی ڕادوێی ئێران خۆشدەکرد کاتێک باسی سەرکەوتنەکانی ئێرانی دەکرد بە سەر سوپای عێراقدا. منیش وەک زۆر کوردی تر وام دەزانی ئیتر ڕژێمی سەدام دەڕوخێت و کوردوستان ڕزگاری دەبێت و گەلی کوردیش ئازاد دەبێت و ئێمەش دەگەڕێینەوە نیشتمان، ئای لە چ وەهمێکدا بوین!!

## چەند زمان بزانیت، ئەوەندە دەرگات لێدەکرێتەوە!

بەڕێوەبەر(شێف) ی کەمپەکەمان کابرایەکی ڕۆمانیی رەچەڵەک ئەڵمانی بو، کەسێکی دڵڕەق و سارد و بێبەزەیی بو، دوای جەنگی جیهانیی دوهەم لە گەڵ خێزانەکەیدا لە ڕۆمانیا دەرکرابو و وەک ئاوارە خۆیان گەیاندبوە ئەڵمانیا. بێ ئیشی و چاوەڕوانیی وەڵامی پەنابەریەکەمان درێژەی دەکێشا، خەم و گرژی و نائومێدی و نائارامی داگیریان کردبوم. لەم دۆخە ناخۆشەدا ژورێکی گەورەتر و شوێن ئارامتر لە کەمپەکەمان چۆڵکرا، منیش بێ پرس بە بەڕێوەبەرەکەمان، شەو ماڵۆچکەکەمانم گواستەوە ئەو ژورە. بۆ بەیانی کە شێف پێی زانیم زۆری پێناخۆش بو، پۆلیسی هێنایە سەرم بۆ ژورەکەمان. منیش هیچ نەشڵەژام، بە ئارامی بە ئەڵمانی تێمگەیاندن کە لە بەر کوڕە بچوکەکەم (کێوان) هاتومەتە ئەو ژورە. کوڕەکەم بە هۆی دەنگی بەرزی سەیارە و بچوکیی ژورەکەی ترخەوی لێ ناکەوێت. ئاوایە ژیان ! زمان و بەڵگەی لۆجیکی و ئارامی فریات دەکەون لە هەرجێیەک بیت و هەر کێشەیەک یەخەت بگرێت. پۆلیسەکان دەمیان بوبە تەڵەی تەقیو، بێ هیچ لێپرسینەوەیەک خواحافیزیان لێکردین. لە مانگی ١١ ی ١٩٨٧ دوای دوساڵ و دو مانگ، وەڵامی پەنابەریەکەمان بەدەست گەیشت کە ڕەفز بو، هۆی ڕەفزەکە ئەوەبو من یەک مانگ لە سوریا ماومەتەوە و دەمتوانی هەر لەوێ بژیم و کاربکەم. بەڵام پێم وایە هۆی ڕاستەقینە ئەوە بو کە من هاوخەباتیەکی توندم دروستکردبو لەگەڵ حیزبی سۆشیال دیموکرات و حیزبی سەوز و حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا، بۆیە لای دەسگای هەواڵگریی ئەڵمانی من کەسێکی نەخوازراو و سەرئێشە دروستکەربوم بۆ حکومەتەکەیان. بەم ڕەفزە تەواو دلگران و نائومێد بوم، لە ژیانی ناو کەمپ، لە Schweinfurt بێزاربوم، بە هەر نرخێک بێت بڕیارم دا جێی بهێڵم. زۆر پەنابەری کوردی ناسیاوم بە سەرسوڕمانەوە لە یەکتریان دەپرسی چۆن د.هەژار ڕەفز کراوە؟

## هاوڕێی دڵسۆز و پارێزەری زیرەك!

شاری گۆتنگن شارێکی زۆر گەورە نیە، لە ناوەڕستی ئەڵمانیا دایە، شارێکی خۆش و لیبراڵە، زانکۆیەکی گەورەی ناوداری تێدایە. ژمارەیەکی زۆر کوردی لێبو، لەوانە (ئومێدی سەعید گەوهەر) ، (فازل کەریم)، (دلێر چاوشین) و (سەلام عەبدوڵا خانەقینی) ئەمانە هەمویان هاوڕێی نزیکی پێشمەرگایەتیم بون. لە ڕێی ئەمانەوە لەگەڵ (پۆڵا خانەقا) ناسیاویم پەیداکرد، ئەمیش هەر لە گۆتنگن دەژیا. بەتایبەتی کاک پۆڵا هەوڵێکی دڵسۆزانەی بۆدام و ئەنجامەکەی گواستنەوە م بو بۆ ئوتێلێکی پەنابەران لە گۆتنگن بەناوی (Astoria). لێرە ئازادیی زۆرترمان هەبو و لە بری خۆراک مانگانە پارەیان دەداینێ. من تەواو بێزاربوبوم لە ژیانی ناو کەمپ و ئوتێل، دەمانویست هەرچۆنێ بوە ژیانێکی ئاسایی لە شوقەدا بەسەربەرین. پاش سێ چوارمانگ لە ڕێی پارێزەرەکەمەوە و لەسەر داوای خۆم توانیمان لە و ئوتێلە بێینە دەرەوە و شوقەیەکی ئاسایی سەربەخۆ و خۆش و موچەی مانگانە وەربگرین. بەڵام ئەم دۆخە باشترەیان بەرامبەر بەوە بۆکردین کە من و پەیمان تەنازولمان کرد لە تێهەڵچونەوەی ڕەفزەکە و بەوەش داوای پەنابەریی سیاسیمان بە ڕەفز کۆتایی پێهات، ڕەفزەکەمان قوبوڵکرد و دۆسیەی پەنابەریی سیاسیمان داخرا. ئیتر من و پەیمان بوینە (پەنابەری ئینسانی) کە مەترسیی ئەوەی هەبو لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران -عیراق بمانێرنەوە بۆ عێراق. بەڵام پارێزەرەکەمان داوای تێهەڵچونەوەی کرد لە بڕیاری ڕەفزی پەنابەریی سیاسیی کێوانی کوڕمان. کەواتە تا داواکەی کێوان بڕیاری لەسەر نەدرێ مەترسیی ناردنەوە لە سەر من و پەیمان نیە، چونکە خۆ نابێت کێوانی چوار ساڵە جیابکەنەوە لە دایک و باوکی و بەتەنیا لە ئەڵمانیا جێ بهێڵرێ! ئاوایە پارێزەری زیرەک! دواتر دادگای تێهەڵچونەوە یەکسەر بڕیاری قبوڵکردنی کێوان ی دەرکرد وەک پەنابەری سیاسی، کە بێگومان ئەوە ناڕاستەوخۆ هەر قبوڵکردنی من بو چونکە کێوانێکی چوار ساڵە چیی لە سیاسەت و پەنابەری دەزانی؟ دواتر لە مانگی ٢ ی ١٩٩٥ دوای نزیکەی دە ساڵ جنسییەی ئەڵمانی مان وەگرت و بۆ یەکەم جار هەستمان بە ئەرخەیانی و دڵنیایی تەواوکرد کە ئیتر مەترسیی بەزۆرگەڕانەوەمان بۆ عێراق لەسەر نیە.

## گۆتنگن و دارمشتاد وەك دو كوانوی خەبات

لە ساڵەكانی ١٩٨٧ تا ١٩٩٤ كوردانی گۆتنگن و دارمشتاد لە ڕوی ڕێكخراوەیی و چالاكیی ڕۆشنبیری و سیاسیەوە چالاكترین بون لە هەمو ئەڵمانیا . لە زۆرچالاكەكان ئەمانە بون: سەلام عەبدولا خانەقینی، پۆلا خانەقا، پەیمان مستەفا كونجرینی، خۆم، شێخ باهیر كەركوكی، ئومێد سەعید گەوهەر، فازل كەریم، شەهاب و وەلید خانەقینی، وەهاب فەیلیی بەغداد، جەلالی لالە گەشەی پێنجوێنی، فایق ، زەردەشت غەفور داراغا، فەتاحی كەریم پیكەلۆ و خوشك و براكانی ، مەردان زەندی، ژن و مێرد بەساز و شێركۆ ماربین كویی، فاخیر كەركوكی، گۆران ڕەواندزی، بڵند، نەبەز یاسین، نەبەز شمیدت . لە كوردە زۆر چالاكەكانی تری ئەڵمانیا لە شارەكانی تر ئەمانەم بیرماوە: نەوزاد قەفتان، كاكی خۆم كەركوكی ، سالار باسیرە و براكانی (د. ئەحمەد و خەسرەو) د.دانا سەعید كەركوكی، دلێر ئەسعەد كەركوكی، دیاری نیزامەدین، ئاسۆی برام، مەحمود حەمە چاوەش، هاوڕێ زەنگەنە، ، دوبرا كامەران و ئاراس فەتاح . زۆرجار ئێمە كوردانی گۆتنگن لەگەڵ كوردانی دارمشتاد و شارەكانی تر چالاكیی هاوبەشمان دەكرد. لە ساڵەكانی ١٩٨٧ بۆ ١٩٩٤ لە شاری گۆتنگن ئەم ڕێكخراوانە دروستكران: Bundnis unabhängige ، (كوردان لە تاراوگە) – Kurden in Exil) (Kurdische Kinder in Not ( (یەكیتیی كوردانی سەربەخۆ) – Kurden Darmstaedter Solidaritaetskomitee) . (منداڵانی كورد لە تەنگانەدا) – Kurdistanكۆمیتەی دارمشتادی پشتیوانیی كوردوستان) ڕۆڵێكی گەورەی گێڕا لە پارەكۆكردنەوە و ناساندنی ئەڵمانیەكان بە كارەساتەكانی كوردوستان، من خۆم كە لە مانگی ١٩٩٢/١ بۆ مانگێك گەڕامەوە كوردوستان بڕی پێنج هەزار مارك ی ئەم ڕێكخراوەم بەدەستی گەیاندە (ئەنجومەنی باڵای ئاوادانكردنەوەی هەڵەبجەی شەهید)

## لافاوی دوكتۆر

لە پایزی ١٩٨٩ گوازتمەوە بۆ شاری كاسل (Kassel) كە دەكەوێتە ٤٥ كم ی باشوری گۆتنگن. بڕوانامە پزیشكیەكەم وەرگێڕایە سەر زمانی ئەڵمانی و بۆ هاوتاكردنی لەگەل بڕوانامەی پزیشكیی ئەڵمانی ناردەم بۆ وەزارەتی فیدرالیی (پەروەردە و زانست و كۆڵینەوە)، بێ هیچ كێشەیەك بڕوانامەكەمیان بە فەرمی

ناساند. بەمە ڕێگەم پێدرا بە پێی مۆڵەتێکی کاتی وەک پزیشک لە ئەڵمانیا کاربکەم. هەر دو ساڵ جارێک دەبو مۆڵەتەکە تازەبیکەمەوە. لە کاسل لای (د.ئەحمەد جلوسی) ی کوردی سوریا لە نۆڕینگە کەیدا کەوتمە ڕاهێنانی پزیشکی لە بواری هەناویدا. دوای ساڵێک کارکردن لەو نوڕینگەیەدا توانیم ئیشێک بدۆزمەوە لە نەخۆشخانەی دەرونی لە شاری کاسل. ئەوە تاکە دەرفەتێک بو بتوانم وەک پزیشک کاربکەم. پسپۆڕیەکانی تری وەک مندالان و نەشتەرگەری و هەناوی و.... بەرمن نەدەکوتن، کێبەرکێیەکی توندیان لەسەر بو، ئەو کاتە پزیشکی تازەدەرچوی ئەڵمانی ئەوەندە زۆربون پێیان دەوتن (لافاوی دوکتۆران).

## ڕێکەوتێکی زۆر خۆش !

ئیتر دوای دو ساڵ کارکردنم لەو نەخۆشخانەیە، من بەردەوام وەک پزیشکی نیشتەجێی پێشکەوتو لە چەندین نەخۆشخانەی دەرونیی تر کارم دەکرد و لە هەمان کاتیشدا بە تیوری و پراکتیکی دەمخوێند هەتا بە پێنج ساڵ خوێندن و دوای چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتو بوم بە پزیشکی پسپۆڕی دەرونی و چارەسەری دەرونی، بە ئەڵمانی (Facharzt für Psychiatrie und Psychotherapie). ئەم بڕوانامەیەی ئەڵمانیام لە کوردوستان بە دوکتۆرا یەکی سی ساڵی هاوتاکرا هەرچەندە خوێندنەکەم پێنج ساڵی خایاندبو، وادیارە خوێندنی کوردوستان لە هی ئەڵمانیا پێشکەوتوترە! دوا شار کە وەک پزیشکی پسپۆڕی دەرونی لە نەخۆشخانەیەکی فێرکاری کارم تێدا کرد (Essen) ی نزیک دوسولدۆرف بو. لە مانگی ١٠ ی ٢٠٠٩ ئەڵمانیام جێهێشت و گەڕامەوە کوردوستان.

من لە کاتی خوێندنی پزیشکیم دا لە بەغداد هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتبو ببم بە پسپۆڕی دەرونی، چونکە لە بەرنامەی خوێندن دا و لە سیستمی تەندروستیدا لە عێراق هیچ گرنگیەکی ئەوتۆ بە دەروننناسی نەدەدرا. ئێستا دوای ئەو هەموە ساڵەی کارکردنم وەک پزیشکی دەرونی، یەکێک لە خۆشترین ڕێکەوتەکانی ژیانم ئەوە بو کە بوم بە پسپۆڕی دەرونی، چونکە دوکتۆری دەرونی دەتوانێ خزمەتی زۆر زۆر گەورە بە مرۆڤی تاک و بە خێزانەکان و بە کۆمەڵ بکات، منیش هەر بونم بە دوکتۆر لە پێش هەمو پاڵنەرەکانی ترەوە لە پێناوی خزمەتی مرۆڤی کۆمەڵە دواخراو و زوڵملێکراوەکەمە وە بو. دوکتۆری دەرونی دەتوانێ لە پێش هەمو کەسێکەوە زۆر یارمەتیی خۆی بدات بە خۆناسین و ڕۆچون بۆ ناو ناخی دەرونی خۆی و

بەخۆداچونەوە و ڕەخنە لەخۆگرتن . بە پیادەکردنی ڕاستگۆیانە و بوێرانەی ئەو زانیاریە دەرونیەی کە هەیەتی بە سەرخۆیدا، دوکتۆری دەرونی دەتوانێ کەموکورتی وکێشە دەرونـی و گرێ دەرونییەکانی خۆی چارەسەر بکات و ببێتە کەسێکی هاوسەنگ و جێگیر و بەختەوەر، هەروەها دەتوانی یارمەتیی خێزان و هاوڕێ و کەس و کاری بدات.

## لەو دیوی لەمپەر و تخوبەکان !

دوای کیمیابارانی هەڵەبجە و ئاوارەبونی خەڵکەکەی لە کەمپەکانی پەنابەری لە ئێران، نامەی زۆرم لە ناسیاو و نەناسەوە بۆ دەهات بۆ ناردنی یارمەتی بۆیان. ڕۆژێـک لە ڕۆژنامەیەکی بـەربـڵاوی کاسل بابەتێکم بـڵاوکـردەوە لە سـەر باری نالەباری پەنابەرانی کورد لە ئێران و چۆن من وەک پزیشکێکی تەنیاباڵ ناتوانم یارمەتیان بدەم، باسی ئەو نامانەشم کردبو کە بۆیان دەنوسیم بۆ کۆمەک. دوای بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتەم، چەند کەسێکی خێرخوازی ئەڵمانی پەیوەندیان پێوەکردم و لەگەڵیان دانیشتنم سازکرد. ڕێکەوتین لە سەر ئەوەی من ناونیشانی پۆستیی پەنابەرەکان بدەم بە ئەڵمانیە خێرخوازەکان و ئیتر ئەوان خۆیان یارمەتیەکە بنێرن و من پەیوەندیم نەبێت بە ناردنەکەوە. ڕێگایەکی زۆر سـەرکەوتوبو، ئەڵمانیە خێرخوازەکان پەنجا مارکیی کاغەزیان دەشاردەوە لە تویی کارتی ئەستوری جەژنە پیرۆزە بۆ ئەوەی دیارنەبێت و دەیان نارد بۆ ناونیشانی کەسەکە لە کەمپی پەنابەران یا لە دەرەوەی کەمپەکە. پەنابەرەکانیش لە ئێرانەوە نامە و کارتی سوپاسگوزاریان بۆ کەسە ئەڵمانیەکە دەنارد و منیش لە دانیشتنم لەگەڵیان بە دەم قاوە خواردنەوەوە بۆم دەکردن بە کوردی، پەیوەندیەکی ئینسانیی خۆش دروستبو بو لە نێوانیان هەر سێ لادا: من و ئەلمانیەکان و ئاوارەکانی خۆمان لە ئێران. جارێک توشی جۆرێک لە شەرم بوم بە هۆی نامەی ئاوارەیەکی هەڵبجەییەوە چونکە ئەو لە نامەکەیدا بۆ خانمێکی ئەڵمانیی خێرخوازهاتبو بە پەسن و پیاهەڵدانی (هیتلەر) دا. ئەو نەیدەزانی ئەڵمانیەکان هەر شەرم دەکەن بە ناوهێنانی هیتلەر و ناوەکەی هەر کوژاوەتەوە لە فەرهەنگی ناوە ئەڵمانیەکاندا. بەم جۆرە توانیمان یارمەتیی دەیان خێزانی پەنابەر بدەین و منیش لە کاسل و دەوروبەری چەند هاوڕێیەکی زۆر باشی ئەڵمانیم بۆ پەیدابو. هاوسۆزیی ئینسانی لەمپەر و تخوبەکانی نەتەوە و ئاین و کولتور ناناسێ و دەیان بەزێنێ!

## له ڕۆژنامەی پزیشکاندا!

له یەکێ له سەفەرەکانم بۆ کوردوستان که گەڕامەوە بۆ کاسل، لەسەر باری تەندروستیی خەڵک کۆڕێکم گرت و بە درێژی باسی دۆخی نالەباری تەندروستیی خەڵکم کرد. دوای کۆڕەکە ژنێک لە ئامادەبوان ناونیشانی خۆی پێدام و داوای لێکردم بابەتی کۆڕەکە بکەم بە نوسینێک و بینێرم بۆ ئەو تا بۆم بڵاوبکاتەوە. دواتر بابەتەکەم نوسی و لە ڕۆژنامەی پزیشکانی ئەڵمانی (Aerzte Zeitung) وەک مانشێت لە لاپەڕەی یەکەمدا بە تایتلێکی گەورە بڵاوکرایەوە. شتێک کە هەرگیز بەخەیاڵم دا نەهاتبو ئەوەبو لە پاداشتی ئەو بابەتەدا پێنج سەد مارکیان بۆ خستمە سەر ژمارەی حسابەکەم، بە ڕاستی شتێکی خۆشی چاوەڕوان نەکراو بو.

## تورکی سوپەرمان!

له شاری کاسل پەیوەندیەکی بەهێزم دروستکرد لە گەڵ پارتی سەوزەکان و سۆشیال دیموکراتەکان و کۆمۆنیستەکان و سەندیکای کرێکارانی ئەڵمانیا. دەچومە کۆڕ و بۆنەکانیان و بەشداریم دەکرد لە چالاکیە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانیان. ئەوەی کە دوکتۆر بوم و بەردەوام کارم هەبو قورساییە کی زۆرتری پێدەدام لە ناو ئەو کۆڕ و کۆمەڵانەدا. لە کاسل کرێکارێکی چەپی تورکی ئەسڵم ناسی ناوی (مێمەد) بو، دواتر بوین بە هاوڕیی نزیک. جارێک ئەمەی بۆ گێڕامەوە: لە قوتابخانە لە تورکیا هەر لە منداڵیەوە بەردەوام دەیخەنە مێشکی خوێندکارانەوە کە مرۆڤی تورک بەهێزترین مرۆڤە و کەس چاری ناکات. (مێمەد) ی داماو وەک خوێندکارەکانی تر بڕوا بەم درۆیە دەکات. کاتێک دێتە ئەڵمانیا و وەک کرێکارێکی جەستەیی کاری زۆر قورس دەدەن بە سەریا و دەبێت بیکات، زۆر جار ناتوانێ کارەکە بکات و ناچار دەبێت کرێکارێکی ئەڵمانیی سور و سپیی بەهێزتر لە خۆی بانگ بکات بۆ یارمەتیدانی. (مێمەد) وتی ئا لەو شوێنکاتانەدا بۆم دەرکەوت مامۆستا تورکەکان چ درۆ و فیشاڵێکیان خستۆتە مێشکمان! لە کاسل خولێکی فێربونی زمانی تورکیم خوێند هەتا بتوانم باشتر لە نەخۆشە تورکەکان تێبگەم چونکە هەرچەندە دەیان ساڵ بو لەو وڵاتە دەژیان زۆریان ئەڵمانیان نەدەزانی.

## پردێکی هاوکاری بۆ کوردوستان

لە دوای ڕاپەرین و دروستکردنی حکومەتی هەرێمی کوردوستان بەشێکی زۆری چالاکیەکانی ڕێکخراوەکانی کوردانی گۆتنگن و دارمشتاد و فرانکفۆرت، تەرخانکرا بۆ کۆکردنەوەی پارە بۆ ئاوادانکردنەوەی کوردوستان. بۆ نمونە چەند هەزار مارکێک گەیەندرایە کوردوستان بۆ دروستکردنی قوتابخانە لە (گوندی تیمارلە قەرەداخ) و لە (گوندی سابوراوای لای سورداش). لە ساڵەکانی ١٩٩٢ و ١٩٩٣ پارە ی کاش دابەشکرا بە سەر پەنابەرانی گەرمیانی لە (کامپی سمود) و (سەید سادق) و (سەریاس) ی نزیک شاری پاوە. شوێنەوارناس (عەبدولرەقیب یوسف) مان کردە سەرۆکی لیژنەیەک بۆ سەرپەرشتیی دابەشکردنی پارەکان. حسەینی برام لە هەمو ئەم چالاکیانەدا بەشدار بو. کوردانی گۆتنگن لە چاو شوێنەکانی تری ئەڵمانیا زۆر چالاک بون، یەکێ لە هۆکان بونی چەند کەسێک لە گۆتنگن کە ڕۆشنبیر و خاوەن ڕابوردوی خەباتی سیاسی و پێشمەرگانە بون، ئەمانە وەک هەوێن و بزوێنەر ڕۆڵیان دەگێڕا. هۆیەکی تر ئەوەبو کە (ڕێکخراوی گەلانی ژێر هەرەشە) بنکە سەرکیەکەی لە گۆتنگن بو، ئەم ڕێکخراوە پشتگیریەکی باشی لە کورد دەکرد و هەندێک جار هاوکاریی ئێمەی دەکرد. ئێمە پەیوەندیەکی نزیکمان هەبو لە گەڵ دو کەسی دەستڕۆیشتو و ناسراوی ئەو ڕێکخراوە کە ناویان (Thilmann Zülch) و (Alexander Sternberg) بو. هەر لەو ڕۆژانەدا ئێمە پەیوەندیەکی نزیکمان هەبو لە گەڵ ڕێکخراوێکی نادەوڵەتیی ئەڵمانی بەناوبانگ کە پشتگیریی کوردی دەکرد و ناوی (medico international) بو، بنکەکەی لە شاری فرانکفۆرتی سەر ڕوباری ماین بو. لە ناوmedico دا پیاوێکی زۆر چالاک هەبو بە ناوی Hans Brandscheidt، ئەم کەسە پشتگیریی کوردی زۆر دەکرد. ئەو کاتەی دەرکەوت چەند کۆمپانیایەکی ئەڵمانی وەک Karl and Korp هاوکاریی عێراقیان کردوە لە دروستکردنی چەکی کیمیاوی، لە گۆتنگنەوە چەندین چالاکی دژی ئەو کۆمپانیایانە ڕێکخرا. لە شاری Bonn لە بەردەم نوێنەرایەتیی نەتەوە یەکگرتوەکان و وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا و نوسینگەی سەرەکیی حیزبی لیبرال دیموکرات ی وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا (گینشەر - Genscher).... چەندین گردبونەوە وخۆپیشاندانی سەرکەوتومان ئەنجامدا. جارێکیش لە گۆتنگن کۆڕیکمان بۆ شاعیری گەورەی کورد (شێرکۆ بێکەس) ڕێکخست. گۆتنگن چیرۆک و بەسەرهات و قسەی خۆشیشی زۆربو. سەماگا (دیسکۆ) یەک هەبو ناوی (Tagenta) بو، (س.) کوڕێکی ڕەبەنی کورد

بو زۆر بۆی دەچو، بەردەوام لەوێ کەوتبو، کە باسی شوێنێک دەکرا لە گۆتنگن (س.) دەیپرسی ئەو شوێنە ئەکەوێتە کوێی (Tagenta) وە، بۆئەو (Tagenta) ڕۆڵی قیبلەنمای دەبینی! جارێک (ش.) کە برا بچوکی (س.) بو پێی دەڵێت لێبوردنی گشتی دەرچوە و من دەڕۆمەوە، تۆش واباشە لەگەڵ من بێیتەوە، ئیتر ئەم غەریبیە بەسە. (س). تورەدەبێت و پێی دەڵێت "وەلا من حکومەتی ئەڵمانیاش بڕوخێ هەر ناگەڕێمەوە عێراق».

## بایەقوشێکی شوم لە گۆتنگن!

دەمەو بەهاری ساڵی ١٩٨٨، ئێمە لە گۆتنگن هەمو جەستەمان بوبو بە چاو و گوێ، بە دوای هەواڵە شومەکانی جەنگی بەردەوامی ئێران - عێراق و جەنگی ڕژێمی سەدام دژی کورد، دەگەڕاین. بایەقوشی هەواڵێکی ترسناک، بە جادە و کۆڵانەکانی گۆتنگن دا کەوتە گەڕان بە دواماندا، دو هەواڵی پێ بو بۆمان کە خورپەیان لەدڵمان دا: یەکەم ئەوەی سوپای سەدام هەڵەبجەی کیمیاباران کردوە و هەزاران کەسی شەهید و بریندارکردوە، دوهەم ئەوەی بەهۆی نزیکبونەوەی هێرشی ئێران لە شاری سلێمانی، ڕژێمی سەدام ئابلوقەی سلێمانیی داوە بۆ ئەوەی کیمیابارانی بکات و کەسی لێدەرنەچێ. ئەی خوایە گیان چ هەواڵگەلێکی تۆقێنەرن ئەم بایەقوشە لەم غەریبیەدا دەیدا بە گوێماندا. وردە وردە دڵنیابوین لە ڕاستیی هەواڵی کیمیابارانی هەڵەبجە. هاوڕێکانم وەک من کەوتینە دۆخێکی دەرونیی واوە کە هۆش و هەستمان بە خۆمان نەما، سڕو واقوڕماو و سەرسوڕماو تەماشای یەکترمان دەکرد و لە خۆمان و لە یەکترمان دەپرسی: ئیتر دوای کارەساتی هەڵەبجە ژیانمان لێرە بۆچیە و چ نرخ و چ تامێکی هەیە ؟

## وێنەکان: ڕون و زەلال لە ARD وە

من وا هەژابوم و لەخوم بێئاگابوم ئێستاش نازانم چۆن پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢٢ ی ٣ ی ١٩٨٨ لەگەڵ هاوڕێکانی گۆتنگن بە دو ئۆتومبێل خۆمان گەیاندە شاری دارمشتاد. نازانم چۆن لەگەڵ هاوڕێکانم دا خۆمم بینیەوە لە کۆبونەوەدا لە ژێرخانیماڵێکی خوێندکاران لە شاری دارمشتاد، کە دیارە یەکێک لە بەشداربوانی کۆبونەوەکە

خوێندکاری زانکۆ بو و لەو ماڵە دەژیا. لە و ژێرخانەدا بەدەوری چەند مێزێکدا دانیشتبوین و باسی ئەوەمان دەکرد چۆن چالاکیەکی گەورە ئەنجام بدەین دژی دەسگایەکی ڕژێمی سەدام لە ئەڵمانیا. سەعات ٨ ی شەو تەلەفیزۆن داگیرسێنرا وهەمومان ڕومان تێکرد. لە کەناڵی سەرەکیی تەلەفیزۆنی ئەڵمانیەوە ARD هەواڵەکان دەستی پێکرد، یەکەم هەواڵ کیمیابارانی هەڵەبجە بو. وێنەکانی قوربانیانی کیمیاویی هەڵەبجە ڕەپ و ڕون یەک لە دوای یەک تەلەفیزۆنە شومەکە پیشانیداین، لەگەڵ تەواوبونی هەواڵەکە نەمان هێشت بچێتە سەر هەواڵی دوهەم یەکسەر کوژانمانەوە. هەندێکمان بە قوڵپی گریانەوە کەوتینە ڕاوێژ و وتووێژێکی ئاگرین، نزیکەی هەمومان بڕیارماندا سبەی بەیانی بچینە سەر (نوسینگەی هێڵی ئاسمانیی عێراق) کە لە ناوەڕاستی شاری فرانکفورت بو. کۆبونەوەکە وا کەوتەوە کە من ڕۆڵێکی سەرەکیم تێیدا بینی.

## کە پەیڤ دەبێتە تەرەقە بۆ سەر TNT!

کەسێک بە ناوی (ق.و.) تازە هاتبوە ناو کۆبونەوەکە و من پێشتر نەم بینیبو. کاتێک ئێمە هەمومان بڕیاری چالاکیەکەمان دا، (ق.و.) بە تەوسەوە و بێ هیچ پێشەکیەک پرسیاری کرد و وتی: «باشە مەگەر ئێوە نازانن شەقاوەی عەرەبی مەغریبی و جەزائیری بە دەمانچەوە بە نهێنی پارێزگاریی نوسینگەکە دەکەن؟ ناترسن تەقەتان لێبکەن؟ «. هەستم کرد وەک سەهۆڵاو بکەیت بەسەر بەشێک لە بەشداربواندا، کەشی جۆش و خرۆشی کۆبونەوەکە خەریک بو سارد دەبۆوە. ڕوم کردە (ق.و.) و ئینجا چاوم گێڕا بە سەر بەشداربواندا و وتم: «هاوڕێیان ئێمەش خۆ بۆ پیاسە و دڵداری ناچین، بۆیە دەبێت وریا و توندوتۆڵ بین و ئامادەبین بە هێزی جەستەمان بەرگری لە خۆمان بکەین. ئەگەری ئەوەی کارمەندانی نوسینگەکە یا پاسەوانە نهێنیەکانیان تەقەمان لێبکەن زۆر لاوازە، چونکە ئێمە پەلاماری ئەوان نادەین و شەڕناکەین. ئێرەش عێراق نیە، ئەگەر هەر تەقەشیان لێکردین و بریندایان کردین، لە ماوەی چەند خولەکێک دا ئەمبولانسی فریاکەوتن دەمان گەیەنێتە باشترین نەخۆشخانە. ئەگەر بە تەقەکەش کوژراین ئێمەش وەک ئەو هەزاران بێتاوانەی هەڵەبجە». دوای من (خەسرەو باسیرە) ڕویکردە (ق.و) کە دیاربو دەیناسی، پێی وت: «کاک (ق.) لەوەتەی من تۆ دەناسم لەم ئەڵمانیایە هیچ چالاکیەکت نەبوە و هەر خەریکی سارکردنەوەی

خەڵک بویت «. لەم چرکەکاتەدا (دیاری) ی هاوڕێی منداڵیم هاتە تەنیشتمەوە و چپانی بە گوێمدا: «هەژار ئەم (ق.و.) سەر بە پارتی یە و وەرگێڕی ڕەسمیشە لای پۆلیس، دەبێت بترسین پێش ئەنجامدانی چالاکیەکە خەبەری پۆلیسی ئەڵمانی مان لێبدا «. لەو دۆخە زۆر گرژ و تاوسەندوەدا، وێنەی قوربانیانی هەڵەبجە کە پێش سەعاتێک لە تەلەفیزۆنەکەوە بینیبوم ڕون و زەلال هاتنەوە پێش چاوم. لەو شوێنکاتەدا کارلێکی قسەکەی (دیاری) لە سەرم وەک ئەو تەرەقەیە وابو کە تۆپێک T.N.T. دەتەقێنێتەوە، تۆپێک لە خەم، خەفەت، نائومێدی، گرژی، تورەیی وهەستکردن بە تەنیایی میلەتێک. چاوم گێڕا بە سەر بەشداربواندا تا نیگام لەسەر (ق.و.) لەنگەری گرت و ئینجا وتم: "ئێمە چالاکیەکە بە هەر نرخێک بێت هەر دەیکەین، هیوادارم کەس خەبەری پۆلیسمان لێ نەدات و نەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی چالاکیەکەمان، ئەوەشی خەبەری پۆلیسمان لێبدات گەووادە گەووادە گەوواد ". لە ناو هەمو بەشداربواندا (ق.و.) بە تورەیی و پەشۆکاویەوە هەستایە سەرپێ و وتی: "بیل فیعل ئەوەی خەبەرتان لێبدات گەوادە "، ئینجا بێ خواحافیزی ڕۆشت. بەڕاستی پێم ناخۆش بو کە بە دڵی شکاوەوە کۆبونەوەکەی جێهێشت، بەڵام چار نەبو، خەتای خۆی بو. حەزم دەکرد دوای چالاکیەکە بم بینیایە و دڵنەواییم بکردایە، بەڵام بەداخەوە هەرگیز نەم بینیەوە. سەیر بو! کەس لە بەشداربوانی کۆبونەوەکە کە نزیکەی ٢٠ کەس دەبوین، یەک وشەیان نەدوڕان لە سەر (ق.و) و هیچ بەرگریان لێنەکرد. ئێ باشە لە ناو هەمواندا بۆچی ئەو هەستا؟ خۆمن بە ناو ناوی ئەوم نەهێنا؟ ئەی باشە ئەو کە تەمەن و ئەزمونی ئەڵمانیای لە من زۆر زۆرتر بو، نەیدەتوانی بە جۆرێکی تر وەڵام بداتەوە؟ بۆچی بە بەڵگە و بە زانیاری قەناعەتی پێ نەهێنایین کە نیگەرانیەکەی ئەو لە سەر چالاکیەکە ڕاستە؟

## تیمێك وەك پورەی هەنگ!

دوای ڕۆشتنی (ق.و) تین و تاوهاتەوە ناو کۆبونەوەکە و تا نیزک سێی شەو درێژەمان پێدا. دەربارەی چالاکیەکەمان و کارەساتی هەڵەبجە بەیانێک و چەندین دروشم و پلاکاتمان بە ئەڵمانی چاپ و ئامادەکرد. ژنە ئەڵمانیەکەی نەوزاد قەفتان (Silke) لە مەدا زۆر هاوکارمان بو. بڕیارماندا دوازدە کەس بچینە ناو نوسینگەکە و ئەوانی ترمان (دیاری و کریستینای هاوژینی، فەتاح و ئاریی برای، ئاسۆی برام

و....) له دەرەوەی نوسینگەکە بەیانەکە بە سەر خەڵکدا دابەش بکەن و دروشمەکان بە دەنگی بەرز بڵێنەوە. لە بەر ئەوەی دەمانزانی کە دەگیرێین، کەمێکیش ترسی ئەوەمان هەبو پۆلیس بمانگێرنەوە بۆ دەست ڕژێمی سەدام، بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەم ئەگەرە ترسناکە، بە تەلەفون ئاگاداری پارێزەر Bernd Waldmann-Stocker مان کرد لە چالاکیەکەمان و مەترسیەکانی سەرمان، ئەو نوسینگەکەی لە گۆتنگن بو و زۆر شارەزای کێشەی کورد بو. بۆ پەیوەندی لەگەڵ ئەم پارێزەرە (فازل کەریم) مان دانا کە نەهاتبو بۆ چالاکیەکە و لە گۆتنگن مابۆوە. کۆبونەوەکە تەواوبو و بۆ خەوتن بەسەر چەند ماڵێکی کورد دا دابەش بوین.

## دەتانەوێ بە ژەهری ڤالیۆم بمانکوژن؟

بەیانی نانمان خوارد و بۆ ئەوەی پۆلیس گومانمان لێنەکات بە دو قیتار چوین بۆ فرانکفۆرت. لە سەعات دەی بەیانی وردە وردە لە بەردەم نوسینگەکەدا گردبوینەوە و لەپڕ خۆمانکرد بە ناویدا و لە دیوی ناوەوەی دەرگاکەیمان داخست. دو کارمەندی پیاوی عێراقی و ژنێکی ئەڵمانیی لێبو، زۆر ترسان. بەڵام ئێمە بە شێوازێکی جوان و دۆستانە ڕەفتارمان لەگەڵ کردن و هۆ و مەبەستی چالاکیەکەمان بۆ ڕونکردنەوە. کە برێک ئارامبونەوە، پێیان وتین فەرمون دانیشن با قاوەتان بۆ بێنین، منیش وتم نا هیچ شتێکی ئێوە ناخۆین، دەتانەوێ ژەهرخواردومان بکەن بە (ڤالیوم) وەک هی زۆرکەستان کرد لە سەفارەتەکانتان! من بە زمانی عەرەبی بروسکەیەکی توندم نوسی بۆ حکومەتی عێراق و دامە دەست یەکێ لە پیاوەکان کە هەر ئێستا بینێرێ بۆ بەغداد، لێی وەرگرتم کە بە فاکس بینێرێت. بەداخەوە من نە کاتم هەبو نە دەمزانی چۆن دڵنیابم لەوەی کە فاکسەکەی کردوە، ئەویش بەم نەزانینەی منی زانی و بەدرۆ وتی ناردومە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت نەیناردبو. بە تەلەفونی نوسینگەکە کەوتینە تەلەفون بۆ چەندین ڕادیۆ و کەناڵی تەلەفیزۆن و ڕۆژنامەی ئەڵمانی. وردە وردە خەڵکێکی زۆر لە شوێنەکە کۆبۆوە، چەند ڕادیۆ و کەناڵی تەلەفیزۆنی ئەڵمانی و هەواڵنێری ڕۆژنامە هاتنە شوێنەکە و کەوتنە تۆمارکردنی ڕوداوەکە و وتووێژ لەگەڵ هاوڕێکانمان لە دەرەوە. ئێمە دەمان ویست لە نوسینگەکە زۆر بمێنینەوە بۆ ئەوەی زۆرترین ڕۆژنامەنوس و هەواڵنێر بێن لە سەر ڕوداوەکە زانیاری بڵاوبکەنەوە. پۆلیسیش کە وردە وردە ژمارەیان زۆرتر و کاردانەوەیان توندتردەبو، دەیانویست

زو ئێمە بێینە دەرەوە و کۆتایی بە چالاکیەکە بهێنن و نەیەڵن گەورەتربێت. بڕیار نەبو (پەیمان) ی هاوژینم بێتە ژورەوە، بەڵام ئەو خۆی و کێوان کە تەمەنی چوارساڵ و چوارمانگ بو هاتبونە ژورەوە، زۆرم پێناخۆش بو بەتایبەتی لەبەر کێوان. پەیمان وێنەی سەدام ی لە دیوارەکە کردبۆوە و لە ژێرپێی نابو. پۆلیس بە چەند سەگێکی گەورەوە هاتنە شوێنەکە و کەوتنە هەڕەشە و چاوسورکردنەوە کە ئەگەر بەخۆشیی خۆمان دەرگاکە نەکەینەوە ئەوان دەیشکێنن. کێوان زۆرترسا و کەوتە گریانێکی نائومێدانە، منیش خستمە سەر شانم و کەوتمە ژێرکردنەوە و ئارامکردنەوەی. ئێمە لە ناوەوە لەوەدا بوین بە ویستی خۆمان دەرگاکە بکەینەوە، بەڵام بەداخەوە پۆلیس ئارامی و ئۆقرەی لێبڕا ! بە کێوانەوە لە سەر شان و ملم لەم دیوی جامە شوشەییەکە ڕاوەستابوم، هەر ئەوەندەم زانی جامەکە زۆر لە نزیکمانەوە هاڕەی کرد، پۆلیس بە تەور جامی دەرگاکەی شکاند، هەر باشبو تەورەکە بەر سەری کێوان نەکەوت. پۆلیس بە لێشاو هاتنە ژورەوە و کۆتاییان بە چالاکیەکە هێنا.

## «هەزار دەبەسە ئیتر ئەوە چیتە ؟»

ئێمە هەموئەوانەی لە ناوەوە ی نوسینگەکە بوین گرتیانین و بردیانین بۆ پۆلیسخانە. من و پەیمان و کێوانیان لە ژورێکی کارمەندانی خۆیان لە سەرەوە ڕاگرت. ئەم هاوڕێ یانە یان بردە زیندان ی ژێرزەمینی پۆلیسخانەکە: سەلام عەبدوڵا خانەقینی، لالە گەشە(جەلال پێنجوێنی)، نەوزاد قەفتان، پۆلا خانەقا، شیخ باهیر کەرکوکی، ئومێدی سەعید گەوهەر، دڵشاد ماربین و شێرکۆ ماربین، بساز، مەردان زەندی، سەباح کەرکوکی، وشیار هەولێری...هتد. لە سەر کورسیەکی درێژ لەگەڵ پەیمان و کێوان دانیشتبوم، وێنە کارەساتبارەکانی مندالانی هەڵەبجە کە دوێنێ شەو لە تەلەفیزون بینیمن، یەک یەک وەک لە فیلمی سینەما هاتنەوە پێش چاوم. پاشان وێنەی کێوانی کوڕم هاتەوە پێش چاو چۆن پێش سەعاتێک ڕوداوەکە خستبویە گریانێکی بەکوڵ و تاڵەوە. هەمو ئەم وێنانە بە دەنگەوە یەک لە دوای یەک هاتنەوە پێش چاوم: زریکە و هاواری کێوان، پۆلیس و سەگە هارەکانیان، شریخەی شکانی جامە شوشەکەی پشت من و کێوان، هاواری هاوڕێکانمان و نەڕە نەڕی پۆلیس. ئینجا وێنە بیکوتاییەکانی تری خەباتی ڕابوردوی ئەم گەلە کۆڵنەدەرەش هاتنە سەری. وێنەکانی پێشمەرگایەتیی خۆم.... دیمەنەکان هەر دەهاتن و چۆڕبڕ

نەدەبون، خوایە گیان! دەڵێی لە سینەمادا دانیشتوم و فیلم دوای فیلم دەبینم! ڕوباری وێنە و دیمەنەکان درێژەیان کێشا تا ئەو چرکەکاتەی چاوانی ماندو و لە بێخەویدا پەنماوم، بونە دو کانیاوی تازە تەقیوی بەهاری کوردوستان، چاوانی ماندوم بەجۆرێک قوڵپە قوڵپی گریانیان لێ هەستا کە کێوان بەو منداڵیە ی خۆی دەیویست منی باوکی ژێربکاتەوە: «هەژار هەژار! دەبەسە ئیتر، ئەوە چیتە «. چەند سەیرە ! پیش سەعاتێک من کێوانم لەسەر شانم دانابو و ژێرم دەکردەوە، ئیستا ئەو لە تەنیشتی من دانیشتوە و ژێرم دەکاتەوە! پۆلیسەکان دەیان ویست لە بەر پەیمان و کێوان ڕەفتاری خێزانێکمان لەگەڵ بکەن و چەند پرسیارێکمان لێبکەن و بەرمان بدەن. بەلام من پێم شەرم بو هاورێکانم لە زیندان دا بمێنن و منیش ئازادبم، بە تایبەتی کە ترسی ئەوەم هەبو بیان نێرنەوە بۆ عێراق. بۆیە بەچاوی پرفرمێسکەوە یەکسەر هەستامە سەرپێ و بە پۆلیسەکانم وت دەمەوێ بمبەنە لای هاورێکانم. پۆلیسەکان زۆر سەیریان بە داواکەم هات، کە زانیان من بەڕاستمە و پێداگریی لەسەر دەکەم، یەکێکیان بە ڕقەوە هاتەلام ومەچەکی زۆر بە توندی گوشیم و لە سەر کورسیەک دایبیشاندم. لە هەر چوارلاوە کەوتە وێنەگرتنم، وەک چۆن وێنەی تۆمەتباری ڕاستەقینە دەگرن، ئینجا بردمیە خوارەوە بۆ ژێرزەمینەکە بۆ لای هاورێ زیندانیەکانم. باش بو دوای نزیکەی دو سەعاتێک هەمومان بەردر اين.

## وێنەکان ڕونتر دەدوێن!

چالاکیەکەمان یەکەم چالاکی بو لە سەر ئاستی دنیا لە دژی تاوانی کیمیابارانی هەڵەبجە. لە کەنالی یەک ARD و دوی تەلەفیزۆنی ئەڵمانی (ZDF) و لە RTL و لە SAT١وە ڕوداوەکەیان بە ڤیدیۆ کلیپ و بە وێنە بڵاوکردەوە. کێوانیان پیشاندابو بەسەر شان و ملی منە وە کە چۆن دەگری و هاواردەکات. لە ڕۆژنامەکاندا وێنەی سەدام پیشاندرا بو لە ژێر پێی پەیمان دا. لقی (پارتی سەوز) لە فرانکفۆرت هەر لە کاتی چالاکیەکەدا یەکسەر پەیامی پشتگیریان بۆ ناردین. زۆرکەس بە تەلەفون دەستخۆشیان لیکردین. داواکاری گشتیی ئەڵمانیا سکاڵای دژی هەمومان تۆمارکرد، بەلام دواتر بەرامبەر ئەوەی یەکی ٣٠٠ مارکی ئەڵمانی بدەینە دادگا سکاڵاکەیان

سرکرد و بەدوایدا نەچون، دواتر وازیان لە پارەکەش هێنا و بێ ئارەق لێی دەرچوین. دیاربو دادوەری بەرپرسیار لە دۆسیەکەمان کە ژنێک بو، ڕەوابونی چالاکیەکەمانی بۆ دەرکەوتبو، بەتایبەتی لەگەڵ پاریزەرەکەمان باسی ئەوەی کردبو کە چالاکیەکە نایاسایی بوە، بەڵام بێ زیانی گەورە و توندوتیژی بەڕێوە چوە، بۆیە نایەوێ سزامان بدات.

## هەستم کرد لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵیانکەندم !

سێ مانگ بو لە نەخۆشخانەیەکی دەرونیدا کارم دەکرد، دوای نانی ئێوارە لە تەلەفیزۆنی ئەڵمانیەوە سەیری دەنگ و باسم دەکرد، هەواڵەکان هاتە سەر کوردوستان و کورد. لەپڕ وێنە و دیمەنە ناخ هەژێنەکانی کارەساتی کۆڕەوی پیشاندا. بۆ یەکەم جار لە ژیانم دا هەستم کرد لە ڕەگوڕیشەوە هەڵیانکەندم، هەستم کرد تەواو ئیتر لە نیشتمان دەرکراین و هەرگیز نابینینەوە. سەیر بو! من پێشتریش هاوسۆزیم لە گەڵ فەلەستینیەکان هەبو، بەلام ئەو هاوسۆزییەی ئێستا لەگەڵیان هەستی پێدەکەم هەستێکی قوڵتر بو، هەستێک بو دەربڕی مان و نەمان، هەستێک دەربڕی هاوئازاریەکی قوڵ لەگەڵیان. بۆ بەیانی یەکسەر چومە لای بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکەم کە ناوی Dr.Johannes Kipp بو، بە گەروی پڕ لە گریانەوە و بێ پێشەکی وتم دەمەوێ بڕۆم بەهانای گەلەکەمەوە. وەک مەزەنەم دەکرد ئەویش لە تەلەفیزۆنەوە کارەساتەکەی بینیبو، بە سەرسوڕمان و هەستی سەرسامیەک بە من، وتی: "هەر بە ڕاست دەتەوێ بچیت بۆ فریاکەوتنی ئەو ئاوارانە"، وتم بەڵێ، جوامێرانە وتی: "لێت تێدەگەم، حەقی خۆتە، فەرمو بڕۆ و خەمی ئیشەکەت نەبێ". بە تەلەفون پەیوەندیم کرد بە (خاچی سوری ئەڵمانی) یەوە و وەک دوکتۆرێکی کوردی عێراق خۆمم پێناساندن. تکام لێکردن بەهانای گەلەکەمەوە بچن. پێشنیازم کرد هاوکاریم بکەن بۆ وەرگرتنی ڤیزای ئێران تا هەرچی زوترە بچم بە هانای ئاوارەکانەوە لە سنورەکانی ئێران-عێراق. کە پێم وتن من جگە لە کوردی، زمانەکانی ئەڵمانی و ئینگلیزی و فارسی و عەرەبی دەزانم، ئیتر یەکسەر پێشنیازەکەمیان قوبولکرد. وێنەکانی کۆڕەو دنیا بینیبوی، ویژدان زیندوانی دنیای ڕاچڵەکاندبو، پێویستی بە وتوویژی درێژ نەدەکرد بۆ قەناعەت پێکردنی خێرخوازان، وتراوە: وێنەیەک بە هێندەی کتێبێک دەدوێ و دە ڕدەبڕێ.

## وەك تۆپی یاریی باسکە!

بە پۆستی تومارکراو پەساپۆرتەکەم نارد بۆ خاچی سوری ئەڵمانی. ئەوان خۆیان ڤیزای ئێرانیان بو وەرگرتم، بلیتی (Lufthansa) یان بۆ کڕیم و لە گەڵ دو پیاوی کارمەندی خۆیان ناردیانم بۆ ئێران. نزیکەی (هەشت هەزار مارکێک) م پێبو هی خۆم و برادەرانی ئەڵمانیام کە بۆ خزمەکانیان ناردبو، نزیکەی سی کیلۆ دەرمانم پێبو کە کۆمکردبۆوە. لە فرانکفۆرت سواری فڕۆکە بوین ولە (فڕۆکەخانەی میهراباد) ی تاران دابەزین.

من لە دوای دو ئەڵمانیەکەوە لە ڕیزی کۆنترۆلی پەساپۆرت ڕاوەستابوم، ئەوان تێپەڕین. سەرە هاتە سەر من، کابرای ئەفسەرسەیری پەساپۆرتەکەمی کرد و ئینجا کەوتە ڕوانین بە ناو فایلێکی گەورەدا. پاش تۆزێک بە ڕویەکی ئاسایی و بێلایەن، بی دەربڕینی هیچ هەست و سۆزێک کە وا لە من بکات گومانی خراپی لێبکەم، وتی: بڕۆ لە پشتمەوە لە سەر ئەو کورسیە دانیشە. دوای چەند خولەکێک، پیاوانی پۆلیسی مەدەنی و ئاسایشی فڕۆکەخانە، وەک تۆپی یاریی باسکە دەستا ودەستیان پێکردم تا گەیندمیانە بەردەم هەمان ئەو فڕۆکەیەی پێش سەعاتێک لە ناویدابوم.

من زۆر تاسەی کەس و کارم دەکرد، حەوت ساڵ بو کوردوستانم جێهێشتبو، زۆر دڵم بەوە خۆش بو دەگەڕێمەوە کوردوستان و لەگەڵ ئەڵمانیەکان دا لە سەر سنور نەخۆشخانەیەکی مەیدانی دەکەینەوە. ئەم فەنتازیا و هەستە خۆش و جوانانەی ناو دەرونم، نەیان هێشتبو گومان و ترس لە دڵ و بەشەکانی تری دەرونمدا کنە بکات. بۆیە ئەوەی بە خەیاڵمدا نەدەهات ئەوە بو ئێرانیەکان نەهێڵن بێمە خاکەکەیان، ئێ خۆ ڤیزای ڕەسمیی ولاتەکەیانم پێبو، ئیتر بۆ بترسم؟ ئیتر بۆ نەیەڵن، ها؟

چەند کارمەندێکی مەدەنی پێیان وتم: فەرمو سەرکەوە بۆ ناو ئەو فڕۆکەیە، بە نەرمی و دۆستانە وتم: ئاغا سەرناکەوم، من ڤیزای ئێرانم پێیە، ناگەڕێمەوە بۆ ئەڵمانیا، تکایە ڕێگام بدەن بێمە ولاتەکەتان، من پزیشکم و بۆ هاوکاریی ئاوارەکانی کوردوستان هاتوم کە لەدەستی ڕژێمی سەدام ڕایانکردوە. کاتێک بینیم کارمەندەکان هیچ تێگەیشتن و نەرمیەکی ئینسانیان پیشان نەدا، لە ترسی ئەوەی نەوەک بە زۆر و پاڵ بمخەنە ناو فڕۆکەکە، توند باوەشم کرد بە ئەستونێکدا لە نزیک فڕۆکەکە. کارمەندێکیان بە بی سیمەکەی کەوتە قسەکردن، لەولاشەوە فڕۆکەکە پڕبوە و مەکینەکەی کردۆتەوە و چاوەڕیی منە، پەردەی پەنجەرەکانی دەبینم چۆن لادەدرێن، دیارە ڕێبوارەکان بێزار بون لە چاوەڕوانیی من!

## تاران: له زیندانی ئەوین!

هەرئەوەندەم زانی جیبێکی پڕ له پاسدار له بەردەمم دا وەستا، چەند پاسدارێک دابەزین، فەرماندە ڕیشنە کەیان هاتە پێشەوە لێم و بە تورەییەوە بە فارسی وتی: یالا پێشم کەوە بۆ ناو فڕۆکەکە. برێک ئارامم کردەوە و بە فارسی پێموت: ئاغا گیان کارمەندەکان هەڵەیان کردوە، من ڤیزای ئێرانم پێیە، فەرمو سەیری پەساپۆرتەکەم بکە و بە چاوی خۆت ببینە. پەساپۆرتەکەی لێوەرگرتم و تۆزێ سەیریکرد و مات بو، هەستم کرد بۆ چەند چرکەیەک ڕوە ئینسانیەکەی درەوشایەوە، لە پڕ گەڕایەوە بۆ ناسنامەی پاسداریەکەی و فەرمانە سەربازیەکەی سەرو خۆی بیرکەوتەوە، بەڵام چۆن بیرکەوتنەوەیەک! بە هەڕەشەیەکی ترسناکەوە بە دەستی ڕاستی ئاماژەی بۆ فڕۆکەکە کرد و وتی: «پێشم دەکەویت یان...». (تازە هۆشم بەبەرخۆم هاتبۆوە، هەمو ئەندامەکانی جەستەم دەیان زریکاند، یەک دو زیندانی دەورەیان دابوم، لێم پرسین ئێرە کوێیە؟، وتیان: «بەدبەخت ئێرە زیندانی ئەوینە»، بە شلەژاوی گیرفان و شوێنە نهێنیەکانی پارەم تیا شاردبۆوە گەڕام، دیم هەموی دزرابو، بەخۆمم وت لای خاوەن پارەکان حەیاشت چو، باوڕت پێدەکەن؟). لە پڕ پاڵە توندەکانی کابرای پاسدار ڕایچڵەکاندم و بە ئاگای هێنامەوە، لە خەیاڵی ترسناکی زیندانی ئەوینەوە گێڕایمەوە بۆ فڕۆکەخانەی میهراباد! خۆمم لە بەردەم پەیژەی فڕۆکەکە بینی. بێ بەرگریی زیاتر بە پەیژەکەدا سەرکەوتم. تیمی خزمەتگوزاری و گەشتیارەکان چاویان تێبڕیم، لە سەر کورسیەک دانیشتم. تا پتر لە سەعات و نیوێک فڕین، نە وشەیک لەدەمم هات، نە توانیم شتێک بخۆم یا خواردنەوەیەک بخۆمەوە. فڕۆکەکە بە ئاسمانی تورکیادا تێدەپەڕی، خانمێکی خزمەتگوزار بە ڕویەکی خۆشەوە خواردن و خواردنەوەی بۆ هێنام، بە سوپاسەوە لێم وەرگرت. بەدەنگێکی تۆزێ بەرز بۆ ئەوەی دەوروپشت گوێیان لێبێت بە فارسی پێم وت: منیان لەسەر مادەی هۆشبەر دەرنەکرد، من پزیشکێکی کوردم و دەمویست لە ڕێی ئێرانەوە بچمەوە کوردوستان بۆ فریاکەوتنی ئاوارەکانی دەست ڕژێمی سەدام، بەداخەوە نەیان هێشت. ئێستاش بڕوام وایە ئەو دەرکردنەم یەک ساڵ لە تەمەنمی کورت کردەوە ! هۆی گێڕانەوەکەم ئەوەبو لە هاوینی ١٩٨٥ کە ئێرانم جێهێشت، وەک هەر پەنابەرێکی تر پەیماننامەیەکیان پێ پڕکردبومەوە کە جارێکی تر نابێت بێمەوە ناو ئێران.

## یەکەم گەڕانەوەم بۆ کوردوستان

تاسەم بۆ بینینەوەی کەس و کار و بۆ شادبون بە کوردوستانی ئازاد پاڵیان پێوەنام هەوڵێکی تری گەڕانەوە بدەم. لە تورکیا و سوریا وە ڕێگە نەبو، ناچاربوم جارێکی تر ئێران تاقیبکەمەوە! نۆ مانگ دواتر و لە مانگی ١ ی ١٩٩٢ جارێکی تر ڤیزای ئێرانم وەرگرت، سێسەد دۆلارێکم ئامادەکرد وەک بەرتیل بیدەم بە کابرای کۆنترۆلی پەساپۆرت لە فڕۆکەخانەی میهراباد. وەک یەکەم جار و لە هەمان شوێندا ئەفسەرێک تەماشای هەمان فایلی ناوەکانی کرد، سەرێکی ڕاوەشاند و وتی بڕۆ. زۆر سەیر بو چونکە دڵنیام ئەمیش ناوەکەمی بینیبو، بەڵام ڕێگریی لێنەکردم، بۆچی؟ نازانم! بە ئۆتومبیل تا مەریوان و باشماخ هاتم، بە هۆی بەفری زۆرەوە ڕێگە بڕابو، بە پێ لە گەڵ چەند کەسێکی کاسب سنورەکەم بڕی و گەیشتمە پێنجوێن. لەگەڵ چەند کەسێکی تردا بە لاندکرۆزەرێک خۆمان گەیاندە سلێمانی، ئیتر تاریکی داهاتبو. تاکسیەکم گرت، لە خۆشیدا ئەوەندە هەژاو و شڵەژا بوم، شوێن و جادە و کۆڵانەکانم لێ تێکچوبون، دوای گەڕانێکی زۆر توانیمان ماڵی کاک حسەینی برام لە بەختیاری بدۆزینەوە. ئای چ خۆشی وشادیەکم هەست پێکرد. خزم و کەس پێش نۆ مانگ بیستبویان لە ئێران گەڕاندومیانەتەوە، بە تەمای هاتنەوەی من نەبون، بۆیە بۆ ئەوان خۆشی و شادییەکە گەورەتر بو.

## پاڕەزان بێ داگیرکەران

دوای دو هەفتە لە شادبون بە دیداری کەس وکار، سەردانێکی گوندی (پاڕەزان)م کرد، خەڵکە کە لیم کۆبونەوە، دیدارێکی گەلێک خۆش بو. بێ ترسی کۆپتەر و تۆپباران، وتوویژێکی خۆشمان کرد، ئینجا لێم پرسین حەزدەکەم خزمەتێکی بچوکتان پێبکەم، چیتان نوقسانە کە لە سەر حسابی خۆم بۆتان پڕبکەمەوە؟ هەمویان وتیان خانوی قوتابخانەکەمان پێویستیی بە گەچکاری و نوێکردنەوەی سەربانەکەیەتی کە دڵۆپەدەکات بەسەر منداڵەکانماندا. گەڕامەوە سلێمانی، لەگەڵ مامۆستا ڕەوف عوسمانی برام لە بازاڕی دارەکە دارچناری دارەڕامان کڕی، وەستای گەچکاریمان پەیداکرد و لە ماوەیەکی کورتدا ئیشەکەمان بۆ تەواوکردن. خەڵکی پاڕەزان خزمەتی ئێمەی (پ.م) یان زورکردبو، شایستەی لەوە زۆرتربون.

## «لێگەڕێ دوکتۆر خۆمان کارەکە دەکەین !»

کاک حسەینی برام لە بەشی پلاندانانی بەڕیوەبەرایەتیی پەروەردەی سلێمانی کارمەند بو، لە ڕێی ئەوەوە خوێندنگایەکی سەرەتاییان پیشاندام کە زۆر پێویستیی بە کورسیی خوێندکاران بو، داوام لێکرا کورسیان بۆ دابین بکەم. لە دارتاشخانەی (کۆمەڵەی نابیسایان) بە چەند ڕۆژێک ژمارەیەکی زۆر کورسیان بۆ دروستکردین. لەگەڵ دو مامۆستا لە پێش خوێندنگەکە ڕاوەستابوین کاتێک لۆریەک کورسیەکانی هێنا. من وتم با کۆڵبەرێک پەیدابکەین کورسیەکان داگرێت و لە پۆلەکانا داینێت، مامۆستاکان وتیان کاک دوکتۆر پێویست ناکات، خۆمان کارەکە دەکەین! ئەمە زۆر ناخۆشبو بۆ من، چونکە دیاربو مامۆستاکان نەداربون و دەیانویست خۆیان پارەی کۆڵهەڵگریەکە وەربگرن. بێگومان من بە شەرمێکەوە بە زیادەوە حەقی خۆیانم پێدان. سەردەمی بێموچەیی و برسێتی بو، تێچوی هەمو کارەکە لە پارەی ڕێکخراوی (مندالانی کورد لە تەنگانەدا) خەرجکرا.

## حسەینێك لە کەربەلای هەڵەبجەدا!

کاتێک لە سلێمانی بوم داوام لێکرا هاوکاریی منداڵێکی قوربانیی کیمیابارانی هەڵەبجە بکەم کە لە گوندی (سەرکران) ی نزیک (پاوە) دەژیا و ناوی (ڕێباز ئەحمەد قادر) ە. لە گەڕانەوەمدا بەرەو ئەڵمانیا بە هاوکاریی (حەمەئەمین قادر) ی مامی (ڕێباز) سەردانی (سەرکران) م کرد، (ڕێباز) لەگەڵ دایکیدا لەو دێیە دەژیان. لە کیمیابارانی هەڵەبجەدا (ڕێباز) باوکی و پوری و خوشک و برایەکی شەهید بوبون، خوشکێکی شیرەخۆرەی بزربوبو، دایک و پورێکی باوکی شەهیدبوبون. باپیری ڕێباز (حاجی سەید قادری هانەسورەیی) پێش چواردە ساڵ لە ٢٦ ی ٤ ی ١٩٧٤ لە بۆمبارانی هەڵەبجەدا بە بۆمبای ناپاڵم ی ڕژێمی بەعس شەهید بو بو. کە من (ڕێباز) م بینی تەمەنی ٧ ساڵ بو، زۆر لاواز بو، زۆر بە قورسی هەناسەی بۆ دەدرا، گازە ژەهراویەکەی سەدام زیانی گەورەی بە سییەکانی گەیاندبو، بەڕاستی بەسەرهاتەکەیان زۆر هەژێنەر و تاسێنەربو.

## چەکی هزر وسۆز!

بە نیازی وەرگرتنی ڤیزای ئەڵمانیا بۆ ڕێباز بۆ چارەسەرکردنی پزیشکی و بۆ(حەمەئەمین) ی مامی، لەگەڵ (حەمەئەمین) خۆم گەیاندە لای کونسولی ئەڵمانیا

له تاران، که پێشتر نەم دەناسی ونەم دیبو. خۆمم پێناساند، به ئەڵمانیەکی پاراو، به هەمو هەست وسۆز و زیرەکی و هێزی دەرونیم، بەسەرهاتی (ڕێباز) و خێزانەکەیم بۆ گێڕایەوە. ئینجا بۆ ئەوەی وەک ئەڵمانیەک هەست به گوناه له دڵیدا بهوروژێنم، ناوی ئەو کۆمپانیا ئەڵمانیانەم باسکرد که بەشداربون له هاوکاریی سەدام بۆ دروستکردنی گازی ژەهراوی. به ناڕاستەوخۆ و به شێوەیەکی نەرم و جوان تێمگەیاند که وڵاتەکەی ئەویش (ئەڵمانیا) بەشداره له تاوانی کیمیابارانی هەڵەبجەدا، لەوتاوانەدا که یەکێ له قوربانیەکانی ئەوەتا له بەردەمیدایە!

کونسول پیاوێکی تەمەن ٣٠ ساڵ بو، له زمانی جەستەی و له قسەکانیدا هەستم به هاوسۆزی و هاوغەمیەکی ڕاستەقینه کرد بەرامبەر (ڕێباز)، ئەو بێ پرسیار و مەرجدانان و ئاڵۆزکردن یەکسەر بەڵێنی پێدان ڤیزا بدات به (ڕێباز) و مامی. ئینجا پێم وت من نوێنەری ڕێکخراوی (منداڵانی کورد له تەنگانه) دام، دەگەڕێمەوە بۆ ئەڵمانیا. پرۆسەی ڤیزاوەرگرتنەکه (حەمەئەمین) له تاران بەدوایدا دەچێت، ئێمەش له ئەڵمانیا نەخۆشخانەی تایبەت به چارەسەری نەخۆشیەکانی سی و هەناسەدان دەدۆزینەوە، بۆ ئەوەی که گەیشته ئەڵمانیا یەکسەر بخەوێنرێت.

## شەپۆلی هاوغەمی و هاوسۆزی

له مانگی سێی ١٩٩٢ (ڕێباز) و (حەمەئەمین) ی مامی به فڕۆکه گەیشتنه هانۆڤەر، پۆلا خانەقا و ئومێدی سەعید گەوهەر به ئوتومبیل هێنایانن بۆ گۆتنگن. (ڕێباز) له سەر پارەی ڕێکخراوەکه مان یەک مانگ له نەخۆشخانەیەکی ئەهلیی سی و هەناسەدان چارەسەری وەرگرت. پرۆفیسۆره ئەڵمانیەکه ی ڕێباز پێی وتین (گازه ژەهراویەکه زیانێکی وای به سیەکانی گەیاندوه وەک ئەوەی سییەکانی هی پیاوێکی هەشتا ساڵ بن نەک هی منداڵێکی حەوت ساڵان!). ئەو پرۆفیسۆره له هەقی ماندوبونی خۆی خۆش بو و هیچ پارەی وەرنەگرت. وێنه و چیرۆکی تراجیدیای ڕێباز و ماڵباتەکەی له ڕۆژنامەکانی گۆتنگن بڵاوکرایه و هاوسۆزیەکی بەربڵاوی بۆ کێشەی کورد له ناو ئەڵمانەکاندا بەرهەم هێنا.

## ئەگەر زیرەك بین کورد تەنها نیە !

بۆ ئەوەی بتوانین ڤیزای تر بۆ مندالی تر بە ناوی ڕێکخراوەکەمان وەربگرین، نەمانویست لە ئەلمانیا داوای پەنابەری بۆ ڕێباز و مامی بکەین. بۆیە کە (ڕێباز) تەندروستیی جێگیر بو، لە گەڵ مامی بە ئۆتومبیلەکەی خۆم بردمن بۆ هۆڵەندا. لەوێ مافی پەنابەری و جنسیەی هۆڵەندیان وەرگرت. دواتر لە پرۆسەی دادگاییکردنی تاوانبارانی کیمیابارانی هەڵەبجە لە دادگای Den Haag، پزیشکان و کیمیازانانی هۆڵەندی بەوردی تێڕوانینیان بۆ(ڕێباز) کرد و بە بەڵگەی زانستی سەلماندیان کە ئەو کەرەسە و مەوادە کیمیاویانەی بازرگانی هۆڵەندی (Frans van Anraat) بە ڕژێمی سەدامی فرۆشتوە، بەکارهێنراون بۆ دروستکردنی ئەو بۆمبا کیمیاویانەی بە سەر هەڵەبجەدا بارێنراوە. بەم شێوەیە (ڕێباز) بوبە شاهیدی زیندو بەسەر (Frans van Anraat) کە بە ١٧ ساڵ زیندانی حوکمدرا. لە دەسپێک و جوڵاندن و بەدواچون و سەرکەوتنی ئەم دۆسیەیە، ئەم کەس و لایەنانە ڕۆڵی گرنگیان بینی: ئارنۆلد کارسکین ی ڕۆژنامەنوسی هولەندی، پارتی سۆشیالیستی هۆڵەندی، فیدراسیۆنی کوردانی ئەمستردام، ڕێکخراوی (ناوەندی چاک - CHAK)، عەلی سیاسی (عەلی مەحمود محەمەد)، مارتین، کریستا، ڕێباز خۆی و حەمەئەمینی مامی، دیانا عەلی، ئەمیر قادر، عەلیی ڕەحیمی. ڕێباز ئێستا لە پاڵ حەمەئەمین و ژن و منداڵەکەیدا لە شارێکی هۆڵەندا دەژی.

## ئێمەشی لە ئەڵمانیا کوشت !

بە ڕاستی ئەوەی لە شۆڕشی چەکداریی دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥، لە ژێر ڕابەرایەتیی سەرکردەی حیزبە کوردیە بەشەڕهاتوەکان لە ژێر ناوی (کوردایەتی) ڕویدا و کرا، بەشێکی زۆری (نەک هەموی) خەباتێکی خوێناویی پڕ لە ڕق و کینە و ڕۆحی تۆڵەسەندن بو لە یەکتری. هەروەها بیرچونەوە و گوێ پێنەدانی ئێش و ئازاری کۆمەڵانی خەڵک بو لە ژێر ستەمی دڕندانەی ڕژێمی بەعس. ئەم ئەنجامگیریە بۆ هەردو قۆناغی شەڕی براکوژی ڕاستە: قۆناغی یەکەم: لە ١٩ ی ١٠ ی ١٩٧٦ تا ڕۆژی ڕاگەیاندنی بەرەی کوردوستانی لە ٢ ی ٥ ی ١٩٨٨. لە ١٩ ی ١٠ ی ١٩٧٦فەرماندەی سەربازیی یەکێتی لە بادینان نەقیبی ئەندازیار (ئیبراهیم عەزۆ محەمەد) بە پیلانی بێبەزەییانەی پارتی، لە گەڵ ٨ (پ.م) دا لە کوردوستانی تورکیا

کوژران. قۆناغی دوهەم: لە سەرەتای مانگی ئایاری ١٩٩٤ وە تا پایزی ١٩٩٨ کە بە سەرپەرشتیی (مادلین ئولبرایت) ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا مەسعود بارازانی و جەلال تاڵەبانی لە واشینگتۆن ڕێکەوتنیان واژوکرد. بە داخەوە دوای ڕاپەڕین، حیزبە ئیسلامیە کوردیە توندڕەوەکانیش، کاتێک بە هاوکاریی ئێران و سعودیە و وڵاتانی خلیج بونە خاوەنی پارە و چەک، ئەوانیش کەوتنە شەڕی براکوژی لە دژی یەکێتیی نیشتمانی. ئیسلامی سیاسیی کوردی دەریخست، لە مەسەلەی دەسەلاتخوازی و بەستراوەبون بە بیگانە و داگیرکەرانی کوردوستانەوە، جیاوازیەکی بنەڕەتیان نیە لە حیزبە نائاینیەکانی کوردوستان. توندڕەوی بە هەمو جۆرەکانیەوە یەکێکە لە هۆ سەرەکییەکانی هەمو شەڕەکان.

مەخابن! کاتێک دەنگدانەوەی گوێکەڕکەر و ناسازی یەکەم گولەی شەڕی براکوژی لە قەلادزێوە لە سەرەتای مانگی ٥ ی ١٩٩٤گەیشتە گوێمان، ئیتر ئێمە پشتمان شکا و هەوری ڕەشی نائومێدی باڵی گرانی کێشا بە سەر دڵ و دەرونماندا و لە پەل و پۆی خەباتی خستین. ئای چەند هەواڵێکی کوشندەبو! ئیتر کەس وزە و ورە و هیوای بە هەریمی کوردوستان نەما، هەر یەکە کەوتە ئاوڕدانەوە لە ژیانی خۆی. منیش درێژەمدا بە کاری خۆم وەک دوکتۆر و دەستم کرد بە خوێندنی دەرونناسیی پزیشکی و چارەسەری دەرونی کە لە ماوەی پێنج ساڵی خوێدا دوکتورام وەرگرت تێیاندا.

## بنکەی پێشمەرگە چیدەکات لە نزیك بروکسل ؟

لە ساڵی ١٩٩٨ وە تا ٢٠٠٩ کە بە یەکجاری گەڕامەوە کوردوستان، بەردەوام بەرنامەی تەلەفیزونیم پێشکەش کردوە لە بواری ڕۆشنبیریی دەرونناسیی پزیشکی دا لەو کەناڵە کوردیانەی لە ئەوروپا وە پەخش دەکران وەک. MEDYA TV / Roj TV Tishk TV /: لەم بوارەدا کارکردن بە تایبەتی لەگەڵ کوردانی باکوری کوردوستان چێژێکی تایبەتیی هەبو. کە دەچوم بۆ شوێنی پەخش و تۆمارکردنی بەرنامەکانم لە شارۆچکەی Denderleew لە نزیک شاری بروکسل ی پایتەختی بەلجیکا، ئازادیی تەواویان پێدەدام لە چۆنێتیی پێشکەشکردنی بەرنامەکەمدا کە زۆر جار ڕۆژانی یەکشەمە بو لە هەفتەدا. پەیوەندیی کۆمەلایەتی و شێوەی ژیانی بەڕێوەبەرانی تەلەفیزۆنی میدیا کە دواتر بوبە تەلەفیزۆنی ڕۆژ، لەو ناوەندەدا وەک ئەوە وابو تۆ

لە بنکەیەکی پێشمەرگەدا بیت لە کوردوستانی دایەگەورەمان. هەستێکی زۆر خۆشبو کاتێک من لایف بەرنامەم پێشکەش دەکرد و هاونیشتمانیەکی کورد لە (سنە) ی ڕۆژهەڵاتی کوردوستانەوە لە دوریی پێنج هەزار کیلۆمەترەوە پرسیاری پزیشکی و دەرونیی لێدەکردم و منیش وەلامم دەدایەوە. بە ڕاستی MEDYA TV / Roj TV شۆڕشیکی نەتەوەیی گەورەیان لە هزر و هونەر و سیاسەت و ڕۆشنبیریی کوردیدا بەرپاکرد و ئێستاش جێگرەوەکەیان Sterk TV هەر بەردەوامن.

تەلەفیزۆنی تیشک نزیکبون لە (حدکا)، لە پاریسە وە بەرنامەکانیان پێشکەش دەکرد. بە هاوکاریی (د. سدیق زەرزا) ی حیزبی دیموکرات، یەک دو جار لە پاریسەوە چەند بەرنامەیەکی دەرونیم پێشکەشکەش کرد. بەداخەوە ئەمان لە ڕوی داراییەوە توانای ئەو بەردەوامییەی تەلەفیزۆنەکانی کوردانی باکوریان نەبو.

## دوکتۆر مامە خەمە!

من لە شێوەزاری کرمانجی باش تێدەگەم و کەمێکیش قسەی پێدەکەم، هەروەها خولێکی فێربونی زمانی تورکیشم لە ئەڵمانیا بە سەرکەوتویی ئەنجام دابو و کەمێک تورکیش تێدەگەیشتم. بۆیە لە هەر شوێنێکی ئەڵمانیا کە وەک دوکتۆری دەرونی کارم دەکرد، زو پردێکی پەیوەندیی باشم بۆ دروست دەبو بەتایبەتی لەگەڵ ئەو کوردانەی باکور و ڕۆژاوا کە لەو شوێنە نیشتەجێ بون. مەزەنە دەکرێت پتر لە نیو ملیۆن کوردی باکور لە ئەڵمانیا بژین! دوکتۆرە ئەڵمانەکانیش زوزو هانایان بۆ من دەبرد بۆ چارەسەری ئەو نەخۆشە کوردانەی ئەڵمانیان نەدەزانی، کە بەداخەوە ئەمانە زۆرینە بون. زۆرجار نەخۆشە کە ئەڵمانیشی بزانیایە دوکتۆرە ئەڵمانیەکان هەر بۆ لای منیان دەنارد، چونکە ئەوان وەک من کە خۆم کورد م، لە پاشخانی کۆمەلایەتی و کولتوری و دەرونی و سیاسیی نەخۆشە کوردەکانان تێنەدەگەیشتن. ئەمانە وای کردبو جۆرە ڕۆلێکی (مامە خەمە) یان پێ بەخشیبوم.

## «دەمەوێت ئاپۆ ڕزگاربکەم!»

شوێن:نەخۆشخانەیەکی دەرونیی گەورە لە نزیک شاری Kleve، دوکتۆرە ئەڵمانیەکەی هاوڕێم: "دوکتور مەعروف فریامان کەوە، نەخۆشێکی کورد زۆر

توندوتیژه و بۆمان کۆنترۆل ناکرێت". (ع.) کوڕێکی تەمەن ۲۲ ساڵ بو، خەڵکی باکوری کوردوستان بو. ڕزگار کردنی "سەرۆک ئاپۆ" لە زیندان بوبو بەخولیای ژیانی و توشی خەمۆکیەکی توندی کردبو، پەنای بۆ (کۆکائین) بردبو بۆ زاڵبون بە سەر خەمۆکیەکەی و بۆ چونە ناو دنیای خەیاڵێک کە بتوانێ ئاپۆ لە دیلیی تورک ڕزگار بکات. بینیم دەورەدراوە بە چەند دوکتۆر و کارمەندی پزیشکیی ئەڵمانی. "سلاڤ هەڤال ع.، ئەز ژی کورمانجم، کوردم وەک تە". کە گوێی لە قسەکانم بو یەکسەر لە پڵنگێکی هەڵمەتبەرەوە بوبە کۆترێکی ئاشتیی بێوەی. چەند هەڵە و بێواتایە کەسی نەخۆشی دەرونی ببەیتە وڵاتێک کە زمانەکەی نەزانێ، ئاخر زمان و کولتوری هاوبەش کلیلی کردنەوەی دەرگای داخراوی دەرونی نەخۆشە لەگەڵ دوکتۆردا. هەڤال ع. چێشتخانە سەرکەوتوەکەی ئیهمال کردبو و بەردەوام لەماڵەوە لە بەردەم لاپتۆپەکەیدا خەریکی ئینتەرنێت بو. بیرێکی ناڕاست (وەهـم) ی (delusion) لا چەساپابو کە لە ڕێی ئینتەرنێتەوە دەتوانێ پەیوەندی بکات بە زیندەوەرە سوپەرمانەکان لە ئەستێرەکانی ناو گەردونی بێکۆتایی و بیانهێنێتە خوارەوە بۆ ئازادکردنی سەرۆک ئاپۆ لە دورگەی ئیمرالی. دوای شەش هەفتە خەواندن، توانیمان لە کۆکائین و لە وەهمەکەی و لە خەمۆکییەکەی ڕزگاری بکەین و بینێرینەوە ماڵەوە و بۆ سەر ئیشەکەی. دواتر هەڤال ع. بوبە برایەکی هێژا و بەوەفا. بانگێشتنێکی شاهانەی بۆ کردم لە ماڵەکەیاند نەک لە چێشتخانەکەی، دایکی پێی وتبو دەبێت خواردنی کوردیی تایبەتیی بۆ بکەم.

**«فریامکەون لێرەش وازم لێناهێنن!»**

(م.) کوڕێکی تـەمـەن ۲۰ سـاڵی بـاکـوری کـوردوسـتـان بـو. تـازە لـە بەشی نەشتەرگەریەوە گواستبویانەوە بۆ لای من لە بەشی دەرونیی نەخۆشخانەکەمان لە شـاریGronau. لە ژورەکەیدا لە کەمپێکی پەنابەران بە تەنیا پاڵکەوتوە، لە پڕ دەکەوێتە ترس و تۆقانێکی زۆر و هاوارکردن: "ئەها ئەها... پۆلیسی تورک بە چەکەوە هەڕەشەم لێدەکەن ولە پەنجەرەکەوە دەیانەوێ بێنە ژورێ و بمکوژن، لێرەش وازم لێناهێنن، فریامکەون.. فریام کەون". لەو دۆخەدا کە (م.) بیری ناڕاست (delusion) و هەستشێوان (hallucination) ی هەبو، بۆ ئەوەی بە ساغی نەکەوێتە دەست پۆلیسە تورکە خەیاڵیەکان کە بۆ ئەو خەیاڵی نیە و حەقیقەتە، پڕئەکات بە چەقۆیەکدا و بەنیازی خۆکوشتن چەند چەقۆیەک لە مەچەکی چەپی دەدات. (م.) چەند مانگێک

لەمە پێش بەشداریەکی گەرم و گوڕی لە نەورۆزی ئەو ساڵەی ئامێد کردبو و بەهۆی ئەوەوە گرتبویان و ئەشکەنجەیەکی زۆریاندابو و ئینجا ئازادیان کردبو. خزم وکەسی بە پارەیەکی زۆر ناردبویانە ئەڵمانیا. ئەمیشمان وەک (ع) خەواند و پاش چەند هەفتەیەک لە دۆخێکی باشدا ناردمانەوە کەمپەکەی. (م.) دوای چەند ڕۆژێک کە هۆشێکردەوە و منی وەک دوکتۆرێکی کورد ناسی، زۆر دڵی خۆش بو، ئەو ئیتر پێی نەدەوتم دوکتۆر، بەڵکو بانگی دەکردم (ئاپۆ). ئەم دۆخە دەرونیە پێی دەڵێن (خورپە یا ئازاری دەرونی). (م.) لە کاتی ئەشکەنجەدانیا لە تورکیا بە تەوژمی زۆربەهێز ئاوی ساردیان پێداکردبو. (م.) ئیتر بە هیچ جۆرێ نەیدەویست دوش بە ئاوی سارد بکات چونکە تەوژمی ئاوە ساردەکەی کاتی ئەشکەنجەدانی بیردەخستەوە و دەبوە هۆی ترسی زۆر و کۆنترۆل لەدەستدان.

### بیرهاتنەوەیەك وەك لە فیلم!

(س.) کوڕێکی ۲۰ ساڵەی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردوستانە، لە وڵاتێکی ئەوروپی دەژی، هێشتا مافی پەنابەریان نەداوەتێ. ئەمیش کە خەڵکی شاری (ب.) یە، بە هۆی خەباتی کوردایەتی دەگیرێ و ئەشکەنجەیەکی دڕندانە دەدرێ و پاش ماوەیەک ئازاددەکرێ. بە یارمەتیی خزم و کەس خۆی دەگەیەنێتە ئەوروپا. ڕۆژێک پیاسەدەکات لە سەر شەقامێکی پڕ لە دوکانی ئەو شارەی تیا دەژی لە بەلجیکا. لە بەردەم جامخانەی شوشەی دوکانێکدا ڕاوەستاوە و سەیری شتەکانی ناوی دەکات. چەند بوکەڵەیەکی جۆراجوری هەڵواسراو دەبینێ کە بۆ ڕازانەوەی جامخانەکەیان دایان ناوە. بوکەڵە هەڵواسراوەکانی ناو جامخانەکە، دیمەنی هەڵواسینی خۆی و هاوخەباتەکانی لە زیندان دێنێتەوە یاد. توشی دۆخێکی بێئۆقرەیی و نائارامی و ترس و تۆقین دەبێت و کۆنترۆل لەدەست دەدات. بە شڵەژان و شپرزەییەکی زۆر خۆی لە دوکانەکە دوردەخاتەوە و بە ڕاکردنێکی زۆر خێرا دەگەڕێتەوە ژورەکەی لە کەمپی پەنابەران. هەمو خەڵکی سەر جادەکان بە سەرسوڕمانەوە سەیریدەکەن و هەندێکیان وادەزانن دزیی لە دوکان کردوە و دەیەوێ خۆی دەربازبکات. ئەم حاڵەتەش هەر (خورپە یا ئازاری دەرونی) یە. دوای چەندین دانیشتنی چارەسەری دەرونی لەگەڵمدا دۆخەکەی باشتر بو. (س.) بۆی گێڕامەوە چۆن لە زینداندا بۆ پێدانی زانیاری لە سەر هاوخەباتەکانیان هەڕەشەی دەسدرێژیی جنسی لە گیراوەکان دەکەن چ ژن چ پیاو.

جارێک کوڕێکی پاڵەوانی خەباتی ژێرزەمینی لە شاری (ب.) دەگرن، بەرگەی هەمو ئەشکەنجەکان دەگرێت، کاتێک دێتە سەر دەسدرێژیی جنسی، ئەوەندە بە توندی سەری خۆی دەدات بە دیوارەکەی پێش خۆیدا، دەبورێتەوە و ئیتر ئاگای لە خۆی نامێنێت چیی لێدەکەن یا نایکەن.

## «دوکتۆر من تۆ دەناسم !»

لە نەخۆشخانەکەم لە شاری (Gronau)، دایک و باوکێکی کورد کچە کەیان (ن.) هێنا بۆ لام، تەمەنی ٢٤ساڵ دەبو. (ن.) نەخۆشیەکی دەرونیی درێژخایەنی هەبو، کە هێنایان بۆ لای من بیری خۆکوشتنی هەبو. پێم وت حەزدەکەیت بە تەنیا قسەت لەگەڵ بکەم، وتی بەڵی. کە بە تەنیا کەوتمە دوان لەگەڵی، یەکەم شت لێم پرسی ئەوە بو: چۆنە دەیەوێ بە تەنیا لەگەڵم قسەبکات لە کاتێکدا ئەو من ناناسێ و پێشتر نەیدیوم. وتی: دوکتۆر من تو دەنسام، زۆر جار سەیری بەرنامە دەرونیەکانتم کردوە و یەکێ لە هۆکانی ئەوەی تا ئێستا خۆم نەکوشتوە ڕێنماییە دەرونیەکانی تۆ بوە. بەڕاستی ئەمە زۆر دڵی خۆشکردم و زۆرتر هانی دام بەردەوام بم لە پێشکەشکردنی بەرنامەی دەرونی لە تەلفیزۆن و ڕادوێ کوردیەکاندا. لە ڕاستیدا یەکێ لە ئەرکەکانی هەمو دوکتۆرێک ئەرکی گشتیی پێدانی زانیاریی پزیشکیە لە پسپۆڕیەکەی خۆی.

## «بمزانیایە مردوە......»

لە نەخۆشخانەکەم لە شاری (Gronau) ژنێکی دایکی سێ زارۆکیان هێنا بۆلام. ئەو تەمەنی ٢٥ ساڵ دەبو، ناوی (ز.) بو، خەڵکی باکوری کوردوستان بو. توشی خەمۆکیەکی زۆر قورسی وا هاتبو کە تروسکاییت نەدەبینی لە بیر وهەست و هۆشیدا. هەستم کرد بیر و نیازی خۆکوشتنی هەیە، خزم و کەسەکانی هەستەکەمیان پشتڕاست کردەوە. مێردی (ز.) لە کاردانەوەی ئەوەی داوای پەنابەریەکەیان قوبوڵ نەکردوە، ڕۆژێک لە ماڵەکەی خۆیدا خوی هەڵدەواسێ و دەمرێت. یەکسەر (ز.) م لە بەشەکەی خۆم خەواند. سێ هەفتە بەسەر خەواندنیا تێپەڕی، دەرمانی بەهێزی دژی خەمۆکیم دەدای و زوزو دڵخۆشیم دەدایەوە، بەڵام خەمۆکیە کە بەری نەدەدا، لە ئاسمانی دەرونیدا نەک ڕۆژ بەڵکو مانگ و ئەستیرەش نەدەبینرا، دنیاکەی بیابانێکی تاریکستان بو. ڕۆژێک لە گەڵ

سەرۆکی بەشەکەمان و دوسێ یاریدەدەری پزیشکی چوینە لای، خەمە نەبڕاوەکانی (ز.)م بۆ سەرۆک بەش وەردەگێرایە سەر ئەڵمانی، (ز.) بە هەنسک و گریانەوە وتی: «کە مێردەکەمم بە هەڵواسراوی بینی، خێرا دراوسێکانم ئاگادارکردەوە، لەگەڵما دایانگرت و لەماوەی ۳ خولەکدا ئەمبولانسیان هێنایە سەری، دوکتۆر بۆی دەرکەوت مردوە. ئەگەر پێشتر بمزانیایە مردوە، لە باڵکۆنەکەوە خۆم فڕێ دەدایە خوارەوە، وام زانی دوکتۆر چارەسەری دەکات.» (ز.) ئەوەندە بە کوڵ دەگریا، ئیتر پێویست بە وەرگێڕانی تر نەبو، منیش کۆنترۆلم لە دەستدا و لەگەڵ ئەو «خوڕ خوڕ ڕۆحم «کەوتە گریان، بەوەشەوە نەوەستام، بە قوڵپی گریانەوە باوەشم پیاکرد و کەوتمە دڵدانەوەی. وەک دیمەنێکی درامی بو کە ئەڵمانیەکانی دەوروبەرمان بە هاوسۆزییەوە سەیریان دەکردین. دوای چەند هەفتەیەکی تر ئینجا وردە وردە (ز.) خەمۆکیەکە بەریدا و توانیمان بینێرینەوە ماڵەوە.

## مەلا کەی خەڵکی بۆسنیا ؟

ڕۆژێک بەڕێوەبەری تەندروستیی Gronau تکای لێکردم لەگەڵ مەلایەکی ئەڵمانیزان و تورکیزانی موسوڵمانی بۆسنیا یی بڕۆم بۆ لای خێزانێکی تورک کە هەمو ئەندامەکانی باری دەرونیان زۆر ناجێگیر و شێواوە. لە گەڵ مەلا دا بە پێی ئەو کاتەی دیاریکرابو چوین بۆ ماڵە تورکەکە. ئامانج ئەوە بو من وەک پسپۆڕێکی دەرونی دۆخەکە ڕونبکەمەوە و بزانم کێ نەخۆشی دەرونیی هەیە و کێ نیەتی و چارەسەر پێشنیازبکەم بۆ کەسی نەخۆش. مەلاش لە کارەکەمدا هاوکاریم بکات و کەسەکان ئارام بکاتەوە. چوینە ماڵەکە و دەستمان کرد بە گفتوگۆ. هەستم کرد کەش و هەوای ماڵەکە زۆر نائارام و ناجێگیر و پڕ لە نهێنی و گومان بو. هەستم کرد ڕەفتار و بیر و هزری پیاوی ماڵەکە لە هەمویان ناسروشتی تر بو. کەوتمە گفت وگۆ لەگەڵی، لەم کاتەدا سەرنجمدا مەلا بە شڵەژاوی و ترسەوە کەوتە ڕوانین بەدەوری خۆیدا و تەماشاکردنی دیوار و بنمیچ و سوچ و گۆشەکانی ماڵەکە. مەلا لای کردەوە بەلای منەوە و پێی وتم زۆر دەترسم، هەمو ماڵەکە پڕە لە خێو و جنۆکە و دەترسم بێنە ناو جەستەی منیشەوە و شێتم بکەن، لە پڕ هەستایە سەرپێ و بە پرتاو ماڵەکەی جێهێشت.منیش نەم ویست بەتەنیا درێژە بە کارەکەم بدەم، بەڵام کاتێکم دا بە پیاوی ماڵەکە ڕۆژی دواتر بێتە نەخۆشخانە بۆلام بۆ تێڕوانینی دەرونی و چارەسەرکردنی.

نەخۆشیەکی دەرونی هەیە بە فەرەنسی پێی دەڵێن Folie à deux، واتای وشە

به وشەیی دەبێتە (شێتیی دوقوڵی)، واتا زانستیەکەی دەبێتە ئەو جۆرە لە نەخۆشیی وەهم (بیری ناراست و نا لۆجیکی) کە لە کەسی نەخۆشەوە دەگوازرێتەوە بۆ کەسی نزیکی نەخۆشەکە کە بەردەوام لەگەڵیدا دەژی. گومانی ئەوە دەکەم کە پیاوی ماڵەکە ئەم نەخۆشییەی هەیە و گوازراوەتەوە بۆ ئەندامانی تری خێزانەکە، بەڵام ئەوان هەموویان، بە مەلا بۆسنیا یەکەشەوە، کێشەکە بە جنۆکە تێدەگەن و تەفسیری دەکەن.

نە لە ئەڵمانیا و نە لە هیچ وڵاتێکی پێشکەوتوی ئەم دنیایە، نە ساغ نە نەخۆشی دەرونی، یەک کەس نا بینی کێشە و نەخۆشیە دەرونیەکان ببەستێتەوە بە بیروباوەڕە ئاینییەکانی وەک جنۆکە و شەیتان و چاوی پیس و نزا و جادو یا هەر بیروباوەڕێکی تری خەرافیی نائاینی. ئەم بیروڕایانە هیچ بنەمایەکی زانستیان نییە و هەرگیز کەس نەیتوانیوە بیان سەلمێنێ.

## «دوکتۆر ئەندام بونت پیرۆز بێ»

لە سەر داوای خۆیان، زۆر جار ڕاپۆرتی دەرونیم بۆ نەخۆشە کوردەکانم دەنوسی، ئەوان سودیان لەم ڕاپۆرتانە دەبینی بۆ قبوڵکردنی پەنابەریەکەیان یا بۆ گواستنەوەیان بۆ ئەو شارانەی حەزیان لێی بو. ڕاپۆرتەکانم زۆر پیشەییانە بۆ دەهۆنینەوە، ئینجا دوم بێ و کڵاش بۆ خۆی بکات ! دیار بو وردە وردە ناوم وەک کەسێکی هیومانیست و وڵاتپارێز گەیشتبوە گوێی بەرپرسانی ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکانی کورد (بە تایبەتی کوردی باکور و ڕۆژاوا) لە ئەڵمانیا.

ڕۆژێک چەند هاوڕێیەکم تەلەفونی پیرۆزبایی ئەوەیان لێکردم کە بومەتە ئەندامی (کۆنگرەی نەتەوەیی کوردوستان – K.N.K). بەڕاستی من خۆم ئاگام لەم بەئەندامکردنە نەبو و پێشیان نەوتبوم. من بە هۆی کاری پزیشکیمەوە نەم دەتوانی ئەرک و ئیشەکانم وەک ئەندامی K.N.K بەجێ بگەیەنم. بۆیە خێرا تەلەفونم بۆ کردن و پێم وتن من سوپاسیان دەکەم بۆ پێزانینی چالاکیەکانی من و شانازی دەکەم کە شەرەفی ئەندامبونیان لە K.N.K پێ بەخشیوم، بەڵام بە هۆی کاری دوکتۆریمەوە ناتوانم ئەرکەکانی K.N.K بەجێ بگەیەنم، بۆیە تکایە ناوی من لابەرن. ئەوانیش سوپاسیان کردم و تێگەیشتنیان پیشاندا بۆ هەڵوێستەکەم و ناوەکەمیان لابرد.

**کۆتایی**

## سەرچاوەکان:


١. ئەزمون وياد : پشکۆ نەجمەدین
٢ . پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن: نەوشیروان مستەفا
٣ . خولانەوە لە بازنەدا: نەوشیروان مستەفا
٤ . ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک: محمد حاجی مەحمود
٥ . چەپکێک لە مێژوی کۆمەڵە: ئیبراهیم جەلال
٦ . ڕۆژە تەماویەکان: ڕەفعەتی مەلا
٧ . ڕێگە باریکەکان، یاداشتەڕۆمان: ئاوات قارەمانی
٨ . یادەوەرییەکانم: ئەحمەد بانیخێلانی
٩ . هەواڵنامەی کوردوستانی عێراق، ئامادەکردنی : نەوزاد عەلی ئەحمەد
١٠ . مامۆستا پێشڕەو شەهیدی ڕەنجدەران: کەس وکاری شەهید
١١ . لە تویێشوی پزیشکیکی پێشمەرگەوە: دوکتۆر فایەق محەمەد گوڵپی
١٢ . یادەوەرییەکان: مستەفا چاوڕەش
١٣ . لە شنروێ وە بۆ ستوکهۆلم: حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی
١٤ . ئەو ڕۆژانەی نیشتمان هی هەموان بو: هەڤاڵ کوێستانی
١٥. بەخەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ: مامۆستا جەعفەر
١٦ . هەورێکی نەزۆک و مێژوویەکی ناکۆک: مامۆستا جەعفەر
١٧. خیانەتەکانی قیادە مووقت بە نەتەوەی کورد: لە بڵاوکراوەکانی ئنتیشارات و تبلیغاتی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردوستانی ئێران، ١٦ ی ٩ ی ١٩٨١
١٨ . کۆماری دیموکراتی کوردوستان، ١١ مانگ و ٢٠ ڕۆژ بەختەوەری، نوسین و ئامادەکردنی سمایلی ماملێ ، پاریس ٢٠١٢
١٩ . لە بری بیرەوەری: مەلا بەختیار
٢٠ . A first-rate madness / Nassir Ghaemi



دایک و باوکی نووسەر



دایک و خوشک و براکانم

لەڕاستەوە: خەدیجە، عەلی، حسەین، دایکم، یاسین، ڕەووف، عائیشە



ئاسۆی برام- فرانکفۆرت ٢٠١٦



١٩٧٧ کۆلێجی پزیشکی- زانکۆی بەغداد
لەڕاستەوە: کەمال عبدالرحمن، جمال محمد زەکی، نووسەر، محمد ئارام مراد، مەحمود فەقێ رەسوڵ



١٩٧٨- نووسەر بەبۆنەی تەواوکردنی خوێندنی کۆلیجی پزیشکی



گوندی چۆڵکراوی بیدەڵان- مانگی ١٠ی ١٩٧٩
لەبەردەم ژوورە تاریک و کۆماوەکەی ناومان نابوو نەخۆشخانەی شۆڕش



سەردەشت- ناوەڕاستی مانگی ٣ی ١٩٨٠
نووسەر بۆ ئەگەری شەهیدبوون وەک پۆستەر



هاوینی ١٩٨٤
وەستاوەکان: حاکم سەردار حاجی سەعید، د. حەسان، سیروان و ............



لەڕاستەوە: د. حەسان «کەمال عبدالرحمن»، فەرمیدونی تاهیر عبدالقادر، نووسەر



دانیشتووەکانی پێشەوە لەراستەوە: نەناسراو، شۆڕش ئیسماعیل، نووسەر،
ریزی دواوە: سورکێو، وەهاب



دانیشتووەکان لەڕاستەوە: نووسەر، نەناسراو، حاکم عومەر عەزیز، ئەبەز
وەستاوەکان: عومەر شیرمەڕی، نەناسراو، مامە حەمەکەریم



لەڕاستەوە: د. قادر حەمەشەریف، نووسەر، نەناسراو، مامە حەمەکەریم، نەبەز، د. شاخەوان «غەفور»، حەمە ئاوات، پشکۆ نەجمەدین
هەر بەڕاستی ژێرمان خاک بوو، پێڵاومان لاستیک بوو!



نووسەر لەگەڵ وەهاب «بەهادین پیرخدری»



هاوینی ١٩٨٤
لەگەڵ پشکۆ نەجمەدین



هاوینی ١٩٨٤، گوندی شوکێ لە شارباژێڕ، لەگەڵ هاوڕێنی پێشووم پەیمان مستەفا کونجرینی



لەگەڵ «پەیمان» لەبەردەم رەشماڵەکەمان لە گوندی گورگەیەری شارباژێر، هاوینی ١٩٨٤



هاوینی ١٩٨٤، گوندی شوکێ لە شارباژێر، لەگەڵ پەیمان مستەفا کونجرینی



**هاوینی ١٩٨٤، مێرگەپان، کۆنفرانسی ٣ی کۆمەڵە**
**لەڕاستەوە: د. حەسان، د. قادر حەمەشەریف، نووسەر، عەباس حاجی مەمۆ**



**بەهاری ١٩٨٤ سیتەک**
**لەڕاستەوە: نەناسراو، بورهانی مستەفا کونجرینی، نووسەر، سێ پێشمەرگەی نەناسراو**




له چه‌په‌وه‌: د. حه‌سان له‌ كاتی ددان هه‌لكیشانی پێشمه‌رگه‌یه‌كدا



وستاوەکان لەڕاستەوە: خۆشناو، سیروان شێخ کەریم بەکر، حاجی رەحمان، شەهید کەمال، بەکری حاجی سەفەر، حاخی کەریم رەحمان، خاڵە کەریم.
دانیشتووەکان: جەبار، دارا جەمیل نەقشبەندی، د. هەژار، شەهید شەریفی قورئانی، مەنسوری ئەنوەر بەگ، شەهید شێخ تاهیر



لەگەڵ حاجی کەریم ڕەحمان پێنجوێنی- ١٩٨٢ گوندی پاڕەزان



گوندی پاڕەزان ١٩٨٢
لەڕاستەوە: تۆفیق، نووسەر، هیوای خوشکەزام، شارای خوشکی هیوا



١٩٨٦ ئەڵمانیا، Schweinfurt، خۆپیشاندن بۆ مافی پەنابەران. لەڕاستەوە یەکەم



١٩٨٦ ئەڵمانیا، Schweinfurt، خۆپیشاندن بۆ مافی پەنابەران.
لەناوەڕاستدا نووسەر کۆمەڵێک بڵاوکراوەی بەدەستەوەیە



**١٩٨٧ ئەڵمانیا،نۆرنبێرگ، کاتی چوونە ناو خانووی پارێزگای نۆرنبێرگ بەبۆنەی بۆمبارانکردنی کیمیاویی بالیسان**
**لەڕاستەوە کە رووخساریان دیارە: شێخ باهیر کەرکوکی، تەنیشتی ئەو نووسەر**



**١٩٨٨ ئەڵمانیا، لەبنکەی حزبی لیبراڵی وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا دیتریت گێنشەر، نارەزایی بەرامبەر بۆمبارانی کیمیاویی هەڵەبجە.**
**لەڕاستەوە: کێوانی «٤» ساڵی کوڕم، پەیمان، نووسەر، شێخ باهیر، باربارای هاوڕێی**




**ئەڵمانیا فرانكفۆرت، نووسینگەی هێڵی فڕۆكەوانی عیراق- ١٩٨٨/٣/٢٢**
**شێخ باهیر كەركوكی و پەیمان و كەسێكی تر وێنەی سەدام حسێن لێدەكەنەوە**



**ئەڵمانیا فرانكفۆرت، نووسینگەی هێڵی فڕۆكەوانی عیراق- پێشنیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٢**
**پەیمان و كەسێكی تر لەسەر وێنەی سەدام حسێن ڕاوەستاون**




ئەڵمانیا فرانکفۆرت، بەردەم نووسینگەی هێڵی فڕۆکەوانی عیراق- ١٩٨٨/٣/٢٣
سێ چالاکوان بە دروشمەکانیانەوە راوەستاون



ئەڵمانیا فرانکفۆرت، نووسینگەی هێڵی فڕۆکەوانی عیراق- نیوەڕۆی ١٩٨٨/٣/٢٣
لەڕاستەوە: نەوزاد قەفتان، پەیمان، موەفەقە «پشتی لە کامێرایە»



ئەڵمانیا فرانکفۆرت، نووسینگەی هێڵی فرۆکەوانی عیراق- نیوەڕۆی ڕۆژی ۱۹۸۸/۲/۲۳ لەو چرکەساتەدا کە پۆلیسی ئەڵمانی بە تەور دەرگای شووشەی نووسینگەکەیان شکاندوو هاتنە ژوورەوەو ڕاپێچیان کردین بۆ بنکەی پۆلیس. پۆلا خانەقا لە تەنیشتەوە دیارە، نووسەر لای چەپی وێنەکەوەیە قەمسەڵەی ڕەشی لە بەردایەو کێوانی کوڕی لە باوەشدایە




١٩٨٦ ئەڵمانیا، ناوەڕاستی شاری Schweinfurt
لەچەپەوە: دلێر ئەسعەد کەرکوکی، نووسەر، ملازم سمکۆ دزەیی

Amtsgericht Frankfurt am Main

50 Js 9778/88

95 Cs 124

Othman Maaruf Abdulrahman
Süntelweg 8

34oo Göttingen

التاريخ ١٩٨٩/٢/٨

رقم القضية
رجاء ذكر هذا الرقم دائما

## امر الجزاء

| تاريخ ومكان الولاده | المرافع / المشتركون الفرعيون |
|---|---|
| مقر النيابة العامه | |

النيابة العامه تتهمك،

بأنك في ١٩٨٨/٣/٢٢ وذلك في فرانكفورت /ماين

وبالاشتراك مع آخرين

قد اقتحمت مقر عمل شخص آخر بشكل غير قانوني، وبقيت فيها دون صلاحية، ولم تتركها، بالرغم من أن هذا الآخر قد طالبك بذلك.

ففي حوالي الساعة العاشرة صباحا اقتحمت بصحبة ١٥ شخصاً آخر وبناء علي نية مسبقة ومخطط مشترك، مكتب شركة الطيران العراقية، للاحتجاج علي هجوم الطيران العراقي علي القري الكردية. وبعد اقتحام المقر أغلقته من الداخل، ووضعت تمثالا طوله حوالي ١٧٠ سم أمام المدخل. لمنع النفاذ إليه من الخارج. وبقيت هناك حتي بعد أن طالبتك الشاهدة كونتسيمان-كوزيلك بذلك، إلي أن حضرت الشرطة حوالي الساعة الثانية عشرة ظهرا وأرغمتك علي إخلاء المكان.

جنحة يعاقب عليها بناء علي المادة ١٢٣ والمادة ٥٢ فقرة ١ من قانون العقوبات.

وتم تقديم البلاغ في الوقت المحدد له قانونا.

بناء على طلب النيابه العامة فقد ثبت عليك ولهذا السبب :

☐ عقوبة ماليه (اجماليه) قدرها ———— دخل يوم بمعدل دخل اليوم الواحد ———— مارك الماني

☐ حرمانك من السفر لفترة قدرها ———— شهرا ولجميع انواع السيارات (ماده ٤٤ كتاب قوانين العقوبات)

☐ سحب السماح بالسفر وسحب الرخصه

| رقم القائمة | بتاريخ | صادرة من قبل |
|---|---|---|
| يقام على اعلام السلطات الادارية لعدم اعطاء رخصة سفر قبل نهاية ———— (المواد ٦٩، ٦٩أ كتاب قوانين العقوبات) | | |

☐

المبلغ الاجمالي

StP 86 Strafbefehl (§ 409 StPO) - arg-(arab. Übersetzung)
JVA Darmstadt 08.82 (2-seitig)

**سکاڵای حکومەتی ئەڵمانیا لەمن بەهۆی گرتنی نووسینگەی هێڵی فڕۆکەوانی عیراق لە فرانکفۆرت.**

**لەئەڵمانیا من ناوم «عبدالرحمن»ە.**

**DIE GRÜNEN IM RÖMER**

6000 Frankfurt am Main
Tel.: 069 / 28 37 02 – (
Zimmer 335 und 3
Tel. im Rathaus: 62
Ffm, den 23.3.198

**Solidaritätsadresse der GRÜNEN IM RÖMER an die kurdischen Besetzer und Besetzerinnen des Büros der Irak Airlines in Frankfurt.**

Liebe Freundinnen und Freunde,

wir versichern Euch unserer Solidarität und unseres Verständnisses für Eure Besetzungsaktion.
In diesem Moment denken wir an die Bilder, die gestern um die Welt gingen, Bilder eines Massakers, das der irakische Giftgasangriff auf kurdische Dörfer herbeigeführt hat.

Wir trauern mit Euch um die zahllosen Kinder, Frauen und Männer Eures Volkes, die auf so entsetzliche Weise als Geiseln des Golfkrieges ihr Leben verloren.

Wir bitten Euch, trotz Eurer Wut und Trauer über das Verbrechen an Eurem Volk, Eure Aktion des Protestes gegen dieses Unrecht friedlich durchzuführen.

Mit freundlichen Grüßen

L. Sikorski

Lutz Sikorski

**نامەی پشتگیریی پارتی سەوز لقی فرانکفۆرت**
**لەچالاکی گرتنی نووسینگەی هێڵی فڕۆکەوانی عیراق لە فرانکفۆرت**

SONDERSEITE 30

# Ärzte Zeitung

Der neue Wirtschafts-Tip

Die Praxis-Hilfe



Gedemütigt, verfolgt, ermordet – in Kurdistan leidet ein ganzes Volk

Komfortable Entschädigungen in Brandenburg / 211 200 DM für den ersten Vorsitzenden

## KV zahlte in 1993 Vorständlern und Bezirksstellenchefs fast 700 000 DM

Neurochirurgie

Ist die Übertragung fetaler Hirnzellen ethisch vertretbar



Prof. Detlef Linder Medizinrat

لەژێر تایتلی «زەلیلکراو، چەوسێنراو، کوژراو، لەکوردستان گەلێک هەمووی دەناڵێنێ»
ڕۆژنامەی پزیشکان لەسەر دۆخی نالەباری تەندروستی خەڵک لە کوردستانی عیراق
بابەتێکی درێژی منی بڵاوکردەوە لە ١٩٩٥/٢/٦

---

12-6-1991
IRAN-Taja Abab

Dear Mr.

Thank you very much for sending me such a kind help.
I have received it as a bright symbol of your humane and kind heart.

yours sincerely
Shaho Moetasim Sdik

Note

Es ist (50 MARK) DM angekommen

and These money I devoting to my People poor tomorrow because today I change these mony to Ihy IRAN mony.

I got your adress from Mr. A. Maroof. I am very sorry about the fate of your people and hope, that money can help you a bit.

With best wishes

Marlies Herden

لەتوێی ئەم کارتەدا ژنێکی ئەڵمانی «٥٠» مارک بۆ پەنابەرێکی کورد لەئێران لەدوای کۆڕەوەکە دەنێرێ و غەمی خۆی دەردەبڕێ بۆ گەلی کورد.
پەنابەرەکەش لەلای چەپی کارتەکە سوپاسنامەی بۆ دەنێرێ.



iran
27-7-1993

بەڕێزان Hans and mary پێشی هەموو شتێک
عەرزی سڵامەتان هەیە بۆتان یەک یەک..
داواکاریی هەمیشە ڕێزتان زیاد بێت لالمان
وە لای هەموو کەسێک سەرکەوتوو بن لە
ژیانتانا بەخۆشیو کامرانی بژین بێ ئەوەی
ئیشو ئازار لە ژیانتانا. بەڕێزان نامەکەتان هات
لەگەڵ دیاریەکە زۆر پێی خۆشحال بووین وە
مبلغی 100 Mark بو لە ڕۆژی 24-7-1993
Vielen Dank 100 Mark angekommen.
بەڕێزان لە نامەکەتان دا نووسیوتانە کە بنالەکان
فێری ئینگلیزی ببن بەلام بەداخەوە کە لە ئێران
ئینگلیزی ناخوێنن بە شێوەیەکی زۆر کەم ئەوێش
بەڵێ دەرزە هەفتەی دوو سعات لە پۆلی شەش،
بە رۆتر زورتر ئینگلیزی ئەخوێنن بەلام تا ئاگادار بێ
کە هیچ ئەو هەتیامێک نادەن بە ئێمە ممکینە
کاک دکتور عبدالرحمن باش بزانێت کە ئەمان
دوستێکی کوردنێک بەلام بۆ سیاسەتی
خارجی ئێمە یان داناوە بەبێ ئەوەی هیچ
یارمەتێک مان بەدەن. ئەوە نەبێت

**سوپاسنامەی خێزانێکی ئاوارەی هەڵەبجەیی لەکەمپێکی پەنابەران لەئێران، بۆ ژن و مێردێکی ئەڵمانی کە لەتوێی کارتێکدا «١٠٠» مارکیان بۆ ناردبوون. بەمجۆرە توانیم یارمەتی لەهاوڕێ ئەڵمانیەکانمەوە بۆ دەیان خێزان دەبین بکەم.**



# ڕێزنامە

تیمە تەندروستییەکانی بەرەکانی جەنگ فریادرەسی ژیانی پێشمەرگەن

بەڕێز ( دکتۆر هەژار عثمان معروف )

هەماهەنگی و پشتیوانیتان بەرز دەنرخێنین کە بەردەوام ڕۆڵی دڵسۆزانەتان هەبووە لە هاوکاری کردنی تیمە تەندروستییەکانی بەرەکانی جەنگ بۆ خزمەتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ئاوارەکان و کارەساتە سروشتییەکان.

| | | |
|---|---|---|
| د.میران محمد عباس | ئاوات محمود بابکر | هاوژین عثمان محمد |
| بەڕێوەبەری گشتی تەندروستی سلێمانی | سەرپەرشتیاری تیمە تەندروستییەکانی بەرەکانی جەنگ | سەرۆکی لقی سلێمانی سەندیکای کارمەندانی تەندروستی |



ئەڵمانیا- ١٩٩٦ نووسەر لەگەڵ کێوانی کوڕیدا



ئەڵمانیا- فڕۆکەخانەی دۆسڵدۆرف ٢٠٠٩، لەگەڵ پەیمان و کەنیی کچم دا



٢٠١٦، لەنۆرینگەکەم، لەگەڵ محەمەد مەجیدی چاڵە خەزێنەیی
«پاڵەوانە گومناوەکان»



٢٠١٤ سلێمانی، نۆرینگەی راوێژکاریی عەلی کەمال، نووسەر وەک مامۆستای کۆلیجی پزیشکی لەگەڵ دەستەیەک خوێندکاری قۆناغی شەش



کێوانی کوڕم و لاڤا محەمەد قادری هاوژینی و یارای کچیان



**لەگەڵ «کەتان»ی کچم و «دالیا فوئاد سەراف»ی هاوژینم**

**سلێمانی، ٢٠٢٠/١٠/٢١**



" که له جەنگەڵی تاریک و ترسناکی ئەگەرە بەد و نەگریسەکانی خەباتی چەکداری گیرم دەخوارد و ڕێی دەرچونم لێ دەگیرا، ئیتر کۆللارەی منالّیی خەیالّم بەرزدەبۆوە بۆ ئاسمان، بۆ نێو تەنکە تەمێکی سپی وەک تارای بوک ، که له ناویدا (یار) ی ئاوات چاوبرکێ و سەرەتاتکێی لەگەڵ دەکردم، ئاواتی برانەوەی شەڕ و جێگیربونی ئاشتی، ئاواتی سەرکەوتنی یەکجاری و گەیشتن بە ئامانجەکانی شۆڕش، ئاواتی شادبونەوە بە ئازیزان، ئاواتی پیرۆزکردنی یادی شەهیدە نەمرەکان و وەفا بۆ کەس و کاریان، ئاواتی بژاردنی زیانی ماددی و نامادديی زیانلێکەوتوانی شۆڕش، ئاواتی ژیانێک شایستەبێت بە شکۆی مرۆڤەکان ".

2020